

93

نیکۆس کازانتزاکیس

# زۆربا

رۆمان

# ZORBA



وەرگێرانی:
رەووف بێگەرد

چاپی سێیەم
2006

نیکۆس کازانتزاکیش

# زۆربا

وەرگێڕانی لە فارسییەوە:

ڕەووف بێگەرد

چاپی سێیەم

سلێمانی ..............................٢٠٠٦

# پێشەكی:

نیكۆس كازانتزاكیس (١٨٨٥–١٩٥٧) شاعیرو گەورە نووسەری یۆنانی لەشاری (كاندی)ی دوورگەی كریت لەدایك بوە، حقوقی لە زانكۆی ئەسینا خوێندوە، پاشان چوە بۆ پاریسو لای برگسۆن خوێندویەتی. گەڕاوەتەوە یۆنانو بەرهەمی شیعرو فەلسەفەی سەرەتایی نووسیوە. هەر بۆ مەبەستی دەوڵەمەند كردنی ئەزموونو بیری خۆی سەری لەولاتانی ئیسپانیا، ئینگلتەرە، چین، ڕوسیا، میسر، ژاپۆن داوە. لەدواییدا هەموو ئەم گەشتانەی بوونەتە كەرەسەی جوانی نووسینو هونەری.

ساڵی ١٩٤٥ تێكەڵ بەژیانی سیاسی یۆنان بوە، كراوەتە سەرۆكی ئەنجومەنی باڵای پارتی سۆشیالیستو پاشان بوە بە وەزیری رۆوناكبیری یۆنان. بەڵام وازی لەو كارانە هێناوەو گەڕاوەتەوە بۆ دنیای ئازادی نووسینو چالاكی ئەدەبی. ساڵی ١٩٤٧ بۆ ماوەیەك لە فەرەنسادا نووسینگەی وەرگێڕانی كلاسیكی ئینسانی سەر بەیۆنسكۆی بەڕێوە بردوە.

لەتەمەنی لاویدا كازانتزاكیس هەواداری سۆشیالیزم بوەو زۆرجار لەلایەن دەوڵەتی یۆنانەوە كەوتۆتە ژێر{ گوشاری چاوەدێریو سووسەكردنەوە. بەڵام بەگشتی ئەوەی لە بەرهەمەكانیدا ڕەنگی داوەتەوە ئەو گەورە نووسەرە پابەندی هیچ ئایدیۆلۆژیایەكی دیاری كراو نەبوە، گیانی مرۆڤ دۆستیو ئازادیو خۆشەویستیو یەكسانی چینەكانی خەڵكی دیارترین مانان لەكارەكانیدا. ئەگەرچی خوێنەری ڕۆمانەكانی هەندێك جار هەست بە ئارەزووی مەسیحیەتو گیانی خودی مەسیحی تیا دەكات، بەڵام ئەنجام گوزارشتە ئاینیو چەمكە فیكریە میسالیەكانی ناو كتێبە ئاسمانیەكانو بەتایبەت لە ئاینی مەسیحیەتدا دەگۆڕێتەوە بۆ دنیای واقیعو زیندوی سەر زەویو، هەموو ئەوانە دوور لەگیانی ڕاستەقینەی مرۆڤو هەستە ئینسانیەكانی بە ناكاملو مردوو دەداتە قەڵەم.

لە بەرهەمە هەرە دیارەكانی كازانتزاكیس: داستانی ((ئۆدیسەیە)) بەشیعر كە ٣٣,٠٠٠ بەیتە. ڕۆمانی ((مەسیحی جارێكی دی لەخاچ دراو)) ((ئازادی یا مەرگ)) ((دوا

ختوورەکانی مەسیح)) ((ئولیسیس)) ((وێڵی ڕێگای هەق)). هەردوو ڕۆمانی ((تودار بارا))و ((باخی پەرژین))یشی ڕاستەوخۆ بە زمانی فەرەنسی نووسیوە.

لەبواری وەرگێڕانیشدا کازانتزاکی گەلێك شاکاری لە زمانی فەرەنسیو ئیسپانیو ئینگلیزیو ئیتالیو ئەڵمانیەوە کردوە بە یۆنانی، وەك: ((کۆمیدیای ئیلاهی)) دانتیو((فاوست))ی گۆتەو ((زەردەشت وای گوت))ی نیچە.

کازانتزاکیش چەند جارێك بۆ خەڵاتی نۆبڵ کاندید کرا.

* * *

ڕۆمانی ((زۆربای یۆنانی)) لە شاکارە هەرە دیارەکانی نیکۆس کازانتزاکیسە کە بۆ زۆربەی زمانی دنیا وەرگێڕاوە، ناوی زۆربا کە پاڵەوانی سەرەکی ڕۆمانەکەیە وەك کەسایەتیێکی نائاسایی ژیانی باو بوەتە سمبولێی هەرە دیاری ناوکەسانی کۆمەڵو نیشانەیەك بۆ گیانی شکۆمەندی نووسەرو وڵاتی یۆنانیش.

ئەوەیش لە ڕوانگەی ئەو پەیوەندیە هەرە تایبەتیەی زۆرباوە کە لەگەڵ دەوروبەرو بیرو ئاکارو ئاینو دیاردە کۆمەڵایەتیەکانی تردا هەیەتی. ئەو کاریزمایەکە بۆ پەیرەوی لێ کردنو وەرگرتنی بیرە زیندوەکانی کاریزمایەکی، خۆڕسکی دوور لە ئارایشتی تیورەو بیرو بۆچوونی وشکی ناوکتێب. کە هەندێك جار ڕەفتارەکانی لە سنووری عەقڵ دەترازێتو مەنتیقە باوەکان دەبەزێنێت، ئێمەیش وەك مرۆڤ ئاسایی لەسەر دوا بڕیاری لەیەکتر جیاواز سەقام گیر دەبین کە : زۆربا یان ڕۆحێکی هەرە مەزنە یان کەسێکی شێتە.

زۆربا هەر بە غەریزە هەست بەدیاردەکان دەکات، ماناکان دەخوێنێتەوە، بڕیاری تایبەتیو سەر بەخۆی خۆی دەدات، مەترسیەکان دەبینێت، کێشەکان چاردەکات، تاسەرێنێسك پڕ لەبەزەییو مرۆڤ دۆستیو لەکاتی خۆیشیدا سەرکێشو دڵڕەقە. لەژیانی ئاساییدا کەسایەتیەکی دەگمەنە.

کەکاری کرد بەوپەڕی جیدیو دڵسۆزیەوە ڕای دەپەڕێنێت، کارلای زۆربا پرۆسەیەکی زیندوی سەربەخۆیە نەك پەراوێز کراو، کارەکان تێکەڵ بەیەکدی ناکات. لەکاتی خۆشەویستی کردنو هەوەس بازی ئافرەتدا بەهەموو هەستو هۆشیەوە، بێ خولیایەکی تر کارەکە ئەنجام دەدات، کەدەیش ڕواتە نێو کانزاکەوە ئیدی بێجگە لە خولیای تونێل

لێدان و کرێکارو قازمەو وردە کاریەکان دی لەگەڵ هیچی تردا ناژی. لەوکاتانەدا تەنانەت ئاوڕ لەئافرەتیش ناداتەوە. کە دەیشخواتەوە ئیتر دەکەوێتە سەنتوور لێدان و گۆرانی وتن و سەماکردن. کە قسەیش لەسەر ئاین و ڕەوشە مەزهەبیەکان و خواو هێزەکانی شەڕ دەکات دەبێت بەرانبەرەکەی بەهەموو توانای بیستن و بیرکردنەوەو هەست و نەستیەوە گوێی لێ بگرێت و لێوەی فێربێت.

زۆربا بەڕواڵەت کەسێکی دنیاییەو بۆ جەستەی دەژی، بەڵام لە جەوهەردا هەموو چالاکی جەستەی بۆ گەشەپێدانی ڕۆح و بەرز ڕاگرتنیەتی، دەیەوێت مرۆڤ لەهەردوو لایەنی مادی و ڕۆحی بەرخوردار بێت. هەریەکەیان ئەوی تر تەواو بکات و پێکەوە وجودێک بۆ بوونەوەر دروست بکەن کە تەزی بێت بەگیانە ئینسانی و بەها مەزنەکانی. وەک خۆی چەند جارێک دەڵێت: *پێم بڵێ چی بەو خواردنە دەکەیت کە دەیخۆیت تا پێت بڵێم تۆ کێیت.*

من وا دەزانم کە کازانتزاکیس زۆربای وەک کەسایەتیەک بەرجەستە کردبێت کە خۆی ئێرەیی پێ دەبات، یان ڕۆحی زۆربا ڕۆحی خودی کازانتزاکیسە، چونکە کەسایەتی-سەرۆک- کە کەسی دوەمی سەرەکی ڕۆمانەکەیە وێنەیەکی فۆتۆکراوی کازانتزاکیسی نووسەرو ڕوناکبیرە، کە نوقمی دنیای مەعناو عیرفانە، سەروکاری لەگەڵ بودای پەیامبەرو دانتی شاعیرو سروشت و جوانیە ڕۆمانسیەکانە. هەمیشە کتێبی بەدەستەوەیەو دەنوسێت و کاغەز ڕەش دەکاتەوە. هەر لەبەر ئەم هۆیەشە ناوی (مشکی کاغەزخۆر)یان لێ ناوە. بەڵام ئەوەیش دەزانێت کە ژیان هەرلەسەر ئەم تاقە پێیە نەوەستاوەو واقیع و ئەزموونەکانی ژیان و کۆمەڵیش دروستکەری مرۆڤی چەلەنگ و کاریگەری وەک زۆربان، بۆیە لەگەڵ هەموو ئەو تێزو چەمکە فیکری و فەلسەفیانەی کە هەیەتی زۆردار- ئەگەر نەڵێم هەمووجارێک- لەبەردەم بیرو بۆچوونی زۆربادا دادەمێنێت و شکست دەخوات. بڕوا بە بیروڕاکانی زۆربا دەهێنێت و ئەو بیرۆکە وشکانەی لەناو کتێبدا خوێندویەتیەوە بۆ دۆزەخی ڕەوانە دەکات.

کازانتزاکیس دەیەوێت بڵێت: کاریگەری مرۆڤ لەوەدا نیە کە چەندی کتێب خوێندۆتەوە، چەندی لاپەڕە هەڵداوەتەوەو چەند شارەزای زانستەکانە، بەڵکوو لەوەدایە کەچەند لەگەڵ عەقڵیدا هەستیشی لەکاردا یەو، بەوردی لە دیاردەکان ڕادەمێنێت و لێ یان دەکۆڵێتەوە، ئایا وەک زۆربایەکی نەخوێندەوار دەتوانێت هەموو ڕۆژێک سەرنج لەو شتانە

بداتەوە کە چەندان جاری تر دیویەتیو لەدوا ڕاماندا مانایەکی تازەی بۆ بدۆزێتەوە؟ ئەگەر وانیە ئەی تیورەو تەزا زەینیە وشکەکان چ مانایەك بەژیان دەبەخشن؟

زۆربا کەسە ڕاستەقینەکەی هەموومانە، زۆرمان خۆش دەوێت، گەلێکمان حەزی بەو گیانە پڕو زیندوەیە، بەڵام ناتوانین ببین بەئەو، لەڕوو دادەمێنین، شەرم دەکەین، لەپلەو پایەی کۆمەڵایەتیمان دەترسین، کۆیلەی دابو نەریتی باوینو سڵ دەکەین. ناتوانین مێگەل نەبینو بەڕاستو دروستی وەك مرۆڤێکی ئازاد خۆمان بخەینەڕوو، ئێمە هەمیشە وەك مەلۆتکە نیوە درۆکەی خۆمان لەباوەشدایەو لەگەڵ خۆماندا دەیگێڕین. زۆرجار، نیوەڕاستەکەمان هۆشداریەکمان دەداتێ، ڕامان دەگرێت، ڕاستی و درۆکانمان دەخاتە بەردەست، بەڵام کەسمان وەك زۆربا حەقیقەتەکان وەك خۆی نالێیت، زۆرمان نازانین خواچیەو کەچی دەیپەرستینو خەڵکیشی لەسەر دەکوژین. نازانین مرۆڤایەتی یانی چی کەچی بانگەشەی درۆی بۆ دەکەین، بەزمانی کتێب قسەدەکەینو لەپراکتیزەو ژیانی ڕۆژانەو مامەڵەدا بێ سەوداین.

بەڵام زۆربا ئەوەی دەیکات هەر ئەوەیە کە لەڕۆحیایەتیو بڕوای پێ هەیە، کەدەگری بەڕاستی دەگریو ڕەنگە هەموو دەوروبەرەکەی پێ بکەنن، کەپێش دەکەنێت هەموو شانەو گەردیلەکانی لەشی دەیکەنە هەرا، عەشقی هۆمونیزمانەی زۆربا لەسنووری ئەم وتەیەی خۆیدایەتی:

((خوا ئەوەندە گەورەیە لەحەوت تەبەقەی ئاسمانو حەوت تەبەقەی زەویدا جێگای نابێتەوە، تەنیا لەدڵی مرۆڤدا جێگای دەبێتەوە، بۆیە ئاگاتان لەخۆ بێت دڵی کەس مەشکێنن))

واتا گەورەیی خواو دڵیمرۆڤێك لە ئاستی یەکتردان.

لەخوێندنەوەی چەند جارەی ڕۆمانی زۆربای یۆنانیدا هەستم بە پاکبوونەوەی خۆم کرد، بەتازە بوونەوەی ژیانو خۆشویستنێکی گەورەتری، هەستم کرد تۆوی زۆرباویەت لەزەمینەی گیانو دڵی زۆربەماندایە، دەشێت دڵۆپێك بارانو گزنگێکی خۆری بەس بێت بۆ چەکەرەو گەشەکردن، تا لە زەمینەو زەمانی خۆیدا ئەوڕۆحانە ببنە مرۆڤی کاریگەرو ڕێڕەوێك بۆ خۆیان دروست بکەن دوور لە چاولێ کەری کەسانی ترو پەیڕەوی لێ کردنی

کوێرانەی باو. من دەمێکە عاشقی چەکەرەکردنی ئەو تۆوەی ناوەوەی خۆمم، حەزیش دەکەم بۆ کارێکی وا نۆرتربین، بۆ ئەوەی لەمە زیاتر شەرم نەکەینو ڕاستیەکانمان نەشارینەوە. هەر لەبەر ئەم هۆیانەیە کەزۆربام کرد بەکوردی. بێگومانم کورد گەلێک زۆربای شەرمنی خۆی هەیەو ئیتر پێویستی بەخۆشاردنەوە نەماوە.

من رۆمانەکەم لەدەقی وەرگێڕاوی فارسیەکەی مامۆستا –محەمەدی قازی–یەوە کردۆتە کوردی کەوەرگێڕێکی ناودارو دەست پاکی دنیای وەرگێڕانە. هەندێک جاریش، ئەگەر تەمو مژێکم لە پەرەگراف یان بڕۆکە دیبێت، یان ڕستەیەکی تەواو نەگونجاوم بەرچاو کەوتبێت تەماشای هەردو وەرگێڕانی ((مەحمود موسا حبیب)) بە فارسیو ((جورج تەرابیش))م بەعەرەبی کردوە. ئەگەر گومانیشم لەمانیەك بوو بێت، یان وشەو ڕستەی پەڕیو لەدەقەکەی (قازیدا) ڕوویدابێت ناچاربووم بەودووەقەی تردا پڕی بکەمەوەو کەمو کورتیەکان نەهێڵم.

لەگەڵ ئەمانەیشدا دەشێت کەمو کورتی لەوەرگێڕانەکەمدا هەبێت، پێشەکی سوپاسم بۆ ئەو بەڕێزانەی کە ئاگاداری ئەو بۆشاییانەم دەکەنو بەچاوی دڵسۆزانەوە حەز بەکامل بوونی هەرکارێکی داهێنەرانە دەکەن.

**ڕەووف بێگەرد**

**ئەیلولی ٢٠٠٠**

— ١ —

بۆ یەکەمین جار ئەوم لە (پیرە)[1] دابینی، من چوبوومە ئەو بەندەرە تاسواری کەشتی بمو بەرەو -کریت- رێکەوم، تازە بەیانی دابوو، باران دەباری، بایەکی وشكو گەرم توند هەڵی کردبوو، پرێشکی شەپۆلەکان دەگەیشتنە کافتریا گچکەکە، دەرگا شووشەییەکانی کافتریاکە داخرابوون،و، هەواکەی بۆنی هەناسەی مرۆڤو گیای (گوڵە مریەم)[2] کوڵاوی لێ دەهات، لە دەرەوە هەوا ساردو تەمی هەناسەکان شووشەکەیان لێڵ کردبوو، پێنج شەش دەریاوان کە هەموو شەوەکەیان بەبێداری بەسەر بردبوو، خۆیان پێچابوە باڵاپۆشێکی قاوەییەوە کەلە مووی بزن دروست کرابوو، قاوەو گوڵە مریەمەی کوڵاویان دەخواردەوەو لەپشت شووشە تەماویەکانەوە تەماشای دەریایان دەکرد. ماسیەکان کە زەبری شەپۆلو تەوژمی دەریا گێژی کردبوون، لە قوڵاییە هێورەکاندا پەنایان گرتبوو، چاوەڕوانی ئارام بوونەوەی سەرەوەیان دەکرد، ڕاوچیە کۆمەڵ گرتوەکانی ناو کافتریا کەیش چاوەڕێی دامرکانەوەی زریانەکە بوون، تاماسیە ئارام گرتووەکان بگەڕێنەوە سەر ئاوەکەو دەم لە چەشەی قولاپەکان بژەنن، ماسیە پانکەکان (زبیدە)و (حەلوا) لە گەڕانی شەوانەیان دەگەڕانەوە، ئێستا خۆر لە هەڵاتندا بوو.

---

[1] Piree یان Piraeus شارێکی یۆنانەو پێش بەندەری ئەسینایە، نزیکەی ٤٥٠ ساڵ پێش زاین دروست کراوە. رێگایەك بەدرێژایی هەشت کیلۆ مەتر، لە نێوان دوو دیواری هاو تەریب بە ئەسینای دەگەیەنێت. -وەرگێڕ-

[2] گوڵە مریەم یان مریەمە گیایەکە لە تیرەی نەعنا، دەکوڵێنرێت و بۆ هەندێك نەخۆشی وەك لەرزین و لاوازی و قورگ ئێشە باشە. گوڵە بۆن خۆشەو داماگیشی پێ دەڵێن. - وەرگێڕ -

دەرکە شووشەییەکە کرایەوەو کرێکارێکی بارهەڵگر، کورتە باڵایەکی چوارشانەی خوڕنەنگازە سەرو پێڕووت‌و لەش قوڕاوی خۆی بەژووریدا کرد، دەریاوانێکی پیر کە بالاپۆشێکی شینی ئاسمانی لەبەردابوو بانگی‌لێ کرد:

—هێی، کوستاندی، چۆنیت، هاوڕێ؟

کوستاندی تفی لە زەوییەکە رۆکردو بەڕوویەکی تاڵەوە پێی وت:

—ئەتەوێت چۆن بم؟ بەمەیش دەڵێن ژیان، رۆژ بەرەو مەیخانەو شەو بۆ ماڵەوە، بەیانی بەیانی بەرەو مەیخانەو شەو بۆ ماڵەوە، کارلەکوێ دەستگیر دەبێت!

هەندێک لە دانیشتوان پێکەنین‌و هەیشیان بوو بەدەم سەر جووڵاندنەوە کەوتە جوێن دان.

سمێڵ بابرێک کە دەرسی فەلسەفەی لە قوتابخانەی (قەرەگوێز)[2] خوێندبوو وتی:

—دنیا زیندانێکی هەمیشەییە، ئەرێ، زیندانی هەمیشەیی، بەنەعلەت بێت.

رووناکییەکی هێوری شینی مەیلەو سەوز لەپشت شووشە تەڵخەکانی پەنجەرەکەوە هاتە نێو کافتریاکەو، کەوتە سەر دەست‌و لووت‌و تەوێڵی دانیشتوەکان، پاشان کەوتە سەر ئەو مێزە درێژەی شتی لەسەردانرابوو بوتڵەکانی دەرخست، گڵۆپەکان ڕووناکیان پەڕی‌و، خاوەن کافتریا خەواڵوەکە دوای بێ خەوی ئەوشەوەی دەستی درێژ کردو گڵۆپەکانی کوژاندەوە.

ماوەیەک لە بێدەنگی تێپەڕی، هەموو سەریان بەرز کردەوەو تەماشای دنیا تارو مارەکەی دەرەوەیان کرد، دەنگی هێرشی شەپۆلەکان بۆسەر کەناری دەریاکەو قوڵتە قوڵتی نێرگەلەکانی ئاوەوە لە گوێ دەخزان، دەریاوانە پیرەکە هەناسەیەکی هەڵکێشاو وتی:

—باشە بەبڕوای ئێوە دەشێ چ بەڵایەک بەسەر (لیمونی) کەشتیەواندا هاتبێت؟ خوا بیپارێزێت.

[2] قەرەگوێز وشەیەکی تورکیە بەمانای (چاوڕەش) مەبەست لەو لیبوکانەیە کە لە چایخانەکانی وڵاتانی عەرەب‌و تورکیاو ئەفریقای باکوردا نمایشی دراماتیکیان ساز دەکرد. —ف—

به توڕەییەوە تەماشایەکی دەریای کردو هاواری لێ هەستا:

-ئەی شەپۆلە نەعلەتیەکان کە ئافرەت بێوە ژن دەکەن، نەفرەتتان لێ بێت.

ئەمەی وتو کەوتە کرۆشتنی سمێڵە ڕەنگ خۆڵەمێشیەکەی.

من لەپەنایەکدا دانیشتبووم، لەسەرماندا داوای پیاڵەیەکی تری گوڵمریەمم کرد، حەزم دەکرد بڕۆمو بنووم، بەڵام بەرەنگاری خەوو ماندوویەتیو ناخۆشی ئەو بەرە بەیانیەم دەکرد، لەپشت شووشە تەم گرتووەکانی پەنجەرەکەوە تەماشای ڕابوونی بەندەر، دەنگی شووتی کەشتیەکانو هەراو زەنای گالێسکەوانو بەلەمەوانەکانم دەکرد، ئەمەندەی لێ ڕامام تۆڕێکی نادیاری لە ئاوی دەریاو بارانو بیری سەفەری خۆم چنراو دڵمی بەتاڵە توندەکانیەوە ئاڵاندو. چاوم لە پێشەوە کەشتیەکی ڕەشو گەورە بڕیبوو، تەواوی جەستەی کەشتیەکە هێشتا لە تاریکیدا چەپۆکانی بوو، باران دەباریو من تەماشای تاڵەکانی بارانەکەم دەکرد کە ئاسمانی بەقوڕو لیتەی زەویەکەوە درو بوو، سەیری کەشتیە ڕەشەکەو سێبەریو بارانەکەم دەکردو خەم ئەوکی دەگرتم، یادگارە دێرینەکانم وەبیر دەهاتنەوە، لەو هەوا نمناکەدا وێنەی هاوڕێیەکی خۆشەویستم لەبەرچاو بەرجەستە دەبوو کە ئاوێتەی بارانو حەسرەت بوو، ئایا ئەوە پار بوو؟ لە دنیایەکی تردا بوو؟ دوێنێ بوو؟ کێ بوو کە من بۆ بەڕێ کردنی هاتبوومە ئەم بەندەرە؟ لەبیرمە کە ئەو بەیانیەیش هەر باران دەباریو دنیا سارد بوو، بەیانیەکی زۆر زوو بوو، ئەوسایش هەرئاوا دڵم گیرابوو. ئای کە لەسەرخۆ دوورکەوتنەوە لە هاوڕێ خۆشەویستەکان چەندە تاڵە! چاکترە یەکسەر لێ یان دابڕێیتو گۆشەگیربیت، چونکە تەریکی دەوروبەرێکی سروشتیە بۆ مرۆڤ، بەڵام من لەو بەرە بەیانە باراناویەدا پێم خۆش نەبوو لەو هاوڕێیەم جیا ببمەوە (هەڵبەتە پاشان، بەداخەوە زۆر درەنگ تێ گەیشتم هۆی چی بوو)

لەگەڵ ئەودا سواری کەشتی بووم، لەژوورەکەیداو لەنێوان جانتا پرشو بڵاوەکانیا دانیشتم، کە خەیاڵی بۆ لایەکی تر پەرت دەبوو من بەوردی تاماوەیەك لێی ڕادەمام، وەك بمەوێت تەواوی سیمای دەمو چاوی لەیادوەریمدا بهێڵمەوە، چاوە درەوشاوەکانی کە ڕەنگە شینەکەیان بەلای سەوزدا دەیڕوانی، ڕوە پڕو جوانەکەی، زیرەکیو بەدەماریەکەی،

لەسەرووی ئەمانەیشەوە دەستی خانەدان هەڵکەوتوی کە بەپەنجەی درێژو باریک کۆتاییان دەهات.

لە چرکە ساتێکدا ڕامانە پڕ لەمەبەستو هێورەکەی منی غافڵگیر کرد بەو حاڵەتە گاڵتە ئامێزەی کە لەخۆی دەگرت، کاتێك کە دەیویست هەڵچوونە دەروونیەکانی خۆی بشارێتەوە. ڕووی بۆلام وەرگێڕا. تەماشای کردمو تێگەیشت. بۆ ئەوەی خەمی جیابوونەوەکەمان بخاتە لاوە بەتەوسەوە بزەیەکی کردو وتی :

—ئاخر تاکەی؟

—چی تا کەی؟

—تاکەی کاغەز ئەجویتو خۆت بەمەرەکەب پیس ئەکەیت؟ وەرە، مامۆستای خۆشەویستم، لەگەڵما دەچینە قەوقاز، لەوێ هەزاران کەسی هاوڕەگەزمان لە مەترسیدان، وەرە با بچین ڕزگاریان بکەین.

دەستی بە پێکەنین کرد، وەك ئەوەی گاڵتەی بەو دەورە مرۆڤ دۆستانەیەی خۆی بێت، پاشان لەسەری ڕۆیشت.

—ڕەنگە نەیشتوانین رزگاریان بکەین، بەڵام بە هەوڵدان بۆ ڕزگارکردنی خەڵکی دی خۆمان ڕزگار دەکەین، مەگەر تۆ، مامۆستام، لەپەندو قسەکانتا ئەمەت نەدەوت کە : ((تاقە ڕێگا بۆ ڕزگارکردنی خۆت خەباتە بۆ ڕزگارکردنی کەسانی تر)) کەواتە دەی مامۆستا، تۆ کە ئەم ئامۆژگاریانەت دەکردین فەرموو پێشکەوە، بتبینم.

من وەڵامم نەبوو، بیرم لای سەرزەمینی پیرۆزی خۆرهەڵات بوو کە دایکی خواکانەو، لای ئەوچیا بڵندانەی هاواری (پرومیسۆس)ی[٤] بەتاشە بەردەوە بەسراو دەنگی تیا دەداتەوە، هاو ڕەگەزەکانی ئێمەیش کەوەك ئەو بەو تاوێرە بەردانەوە بەسرابوونەوە

---

[٤] Prometheus لە ئاینی یۆناندا دێوێکە کە مرۆڤی لەگڵ دروست کرد، بەپێچەوانەی فەرمانی زیوسەوە (خوای خواکان) ئاگری لە ئاسمان دزیو هێنایە سەر زەوی. زیوس تووڕە بوو، بە تەنیا بەتاشە بەردێکەوە لە قەفقاز بەستیەوە. لەوێ هەموو ڕۆژێك هەڵۆیەك دەهاتو جگەری دەخواردو شەو جگەرەکەی بۆ دەهاتەوە. ئەم ئەشکەنجەیە ماوەیەکی زۆر دەوامی کرد تا هیرقەل رزگاری کرد. —ك—

هاوارو ناڵەیان بوو. ئەو سەرزەویە جارێكی تر كەوتبوە مەترسیەوەو هاواری یارمەتی لە منداڵەكانی دەكرد، من بێ ئەوەی كارم لێ بكات گوێم لەو ناڵینە دەگرت. وەك ئەوەی ئەو دەردو ئازارە زیاد لە خەونێك چی تر نەبێتو، ژیانیش شانۆیەكی پڕ لەكارەسات بێت كە بێجگە لە ساویلكەو تلپەكان كەس نەتوانێت دەوری تیا ببینێت.

هاورێكەم بێ ئەوەی چاوەڕێی وەڵام بێت لەجێی خۆی هەستا، بۆ جاری سێیەم كەشتیەكە شووتی لێدا، ئەو دەستی بۆ ڕاكێشام، دیسان هەڵچوونە دەروونیەكەی خۆی لە پەردەیەكی گاڵتە ئامێزدا شاردەوەو وتی:

–خوات لەگەڵ مشكی كاغەز خۆر!

دەنگی دەلەرزی، هەستی بە شەرمەزاری دەكرد كە ناتوانێت كۆنترۆڵی ئیحساساتی خۆی بكات. فرمێسك ڕشتن، ووشەی پڕ لەسۆز، ڕەفتاری بەدەر لە یاساو ویقار، قسەی هەڵەتو پەڵەت، هەموو ئەمانە لای ئەو لاوازیەك بوون بەدەر لە پلەوپایەی مرۆڤ. ئێمە كە ئەوەندە هاوڕێی یەكتری بووین، هەرگیز قسەیەكی خۆشەویستانەمان لەگەڵ یەكتریدا نەكردبوو، پێكەوە یاریمان دەكردو وەك دڕندە سەروچاوی یەكدیمان دەڕنیەوە، ئەو مرۆیەكی زیرەكو قسە قدخۆشو بەڕەوشت بوو، بەڵام من دڕندە بووم، ئەو كۆنترۆڵی خۆی پێ دەكرا، دەیتوانی بەئاسانی هەموو هەستە ڕۆحیەكانی لە بزەیەكی سەرلێویا دەربخات، بەڵام من زوو خۆم لە دەست دەداو، قاقایەكی وەحشیانەی بێ جێم بۆ دەكرد.

منیش ویستم هەڵچوونە دەروونیەكەی خۆم لە چەند وشەیەكی قورسدا بشارمەوە، بەڵام شەرمم پێ ئەهات، نا، بەڕاستی نەك لەبەر شەرمەكەم، بەڵكو شەرم لەبەر ئەوەی توانای ئەو كارەم نەبوو. دەستیم گوشی، دەستیم گرتبوو بەرم نەدەدا، ئەو بەسەر سامیەوە لێی دەڕوانیم، وەك ئەوەی بیەوێت زەردەخەنەیەك بكات، پێی وتم:

–نا ئارامیت؟

لەسەر خۆ وەڵامیم دایەوە: بەڵێ.

وتی: بۆ؟ قەولو قەرارمان چی بوو؟ مەگەر چەند ساڵێك لەمەو بەر پێكەوە بڕیارێكمان نەدابوو؟ ئەم ژاپۆنیانەی كە تۆ زۆر بە هاوڕێیان دەزانیت دەڵێن چی؟ بەوتەی ئەوان

((فودفشین))° واتا ئارامیو دڵنیایی. دەمامکێك بەدەمو چاوەوە کە پێ دەکەنێت بەڵام هیچ نابزوێنێت، ئیتر لە پشتی ئەو دەمامکەوە چی هەیە گرنگ نیە.

من کە نەم دەویست خۆم لەڕستەیەکی دورو درێژ بەگیربێنم بۆیە هەر ئەوەندە وەڵامم دایەوە کە بڵێم: (بەڵێ) چونکە لەوە دڵنیا نەبووم کە تۆنی دەنگم لەرزینی تێ ناکەوێتو من بە سەریدا زاڵ دەبم.

شووتی کەشتیەکە لێی داو ئەوانەی بۆ بەڕێ کردن هاتبوون لە ژوورەکان وەدەرکەوتن، باران نم نم دەباری، هەوا پڕ بوو لەوشەخەم ئەنگێزەکانی ماڵ ئاوایی، لەبەڵێنو سوێند، ماچی دورو درێژو ڕاسپاردەی بەپەلەو هانکە هانك، دایك ئاوێزانی کوڕەکەی دەبوو، ژن مێردەکەی و هاوڕێ هاوڕێکەی، وەك هەموو لەگەڵ یەکتردا دوا ماڵ ئاوایی بکەن، یان ئەم لەیەك دابڕانە کاتیە لێك دابڕانە گەورەکەیان یاد بخاتەوە وابوو. لەپڕا لەنێو ئەو هەوا شێدارەوە دەنگی نەرمو ناسکی زەنگ لەپشتی کەشتیەکەوە تا پێشی گرتەوە، هەر لە دەنگی زەنگی پرسە دەچوو، تەزوویەکم تێ گەڕا، هاوڕێکەم چەماوەیەو بەدەنگی نزم وتی:

–گوێ بگرە، هیچ ختوورەیەکی ناخۆش بەدڵتادێت؟

دیسان وتم (ئەرێ)

–بۆ تۆ بڕوات بەخورافات هەیە؟

بەدڵنیاییەوە وتم (نا)

–کەواتە؟

پێویستی بە(کەواتە) نەدەکرد، چونکە من بڕوام پێی نەبوو، بەڵام دڵم ترسێکی تیابوو. هاوڕێکەم بەئەسپایی دەستی چەپی خستە سەر ئەژنۆم، ئاسایی ئەم کارەی کاتێ دەکرد کە لە گەرمەی گفتو گۆیەکی دۆستانەدا بوینایە، من ئەم ویست بڕیارێك بدات، وەڵێ ئەو بەرگری دەکردو گوێی نەدەگرت، تا لە ئەنجامدا خۆی بەدەستەوە دا، ئیتر ئەوە ئەو کاتە بوو کە دەستی لەسەر ئەژنۆم دادەنا، وەك بڵێت:

---

° Foudoshin

((بەسەر چاو، لەپێناوی هاورێیەتیدا چی بڵێی دەیکەم))

دوو سێ جار پێڵوی پێکداداو دیسان لێم ڕامایەوە، زانی من بێ حەوسەڵەم، بۆیە لە بەکارهێنانی چەکە ئاساییەکەمان کەپێکەنین‌و گەپ‌و گاڵتە بازیە خۆی گرت، وتی:

–چاکە، دەستتم بدەرێ، هەرکاتێك یەکێکمان تووشی مەترسی مردن هات..

وەستا، وەك تەریق بێتەوە. ساڵانێك بوو ئێمە گاڵتەمان بەباوەڕە میتافیزیکیەکان دەهات، بەو کەسانەی ڕوەك خۆرن‌و ئەوانەی رۆح دێننەوە بەرچاو، سۆفی‌و ئەوانەی بڕوایان بەگەوهەری تاك هەیە. بەمحاڵە پێدەکەنین، من کە دەم ویست لەبن دێڕی قسەکانی بگەم پێم وت:

–باشە، ئەی دوایی؟

ئەو بۆخۆ ڕزگار کردن لەو ڕستە پڕ لەکێشەیەی بەسەر زمانیا هاتبوو لەپڕا وتی:

–بەڕاست چۆنە مەسەلەکە هەر بەگاڵتە بگرین ؟ ئەگەر یەکێك لەم دوانەمان روو بەڕووی مەترسی مەرگ بوەوە، تەواوی بیرو هەستی بخاتە سەر ئەوی تر، تا لەهەر جێگایەك بێت لە حاڵی ئەم بە ئاگابێت.. ڕازیت؟

ویستی پێ بکەنێت، بەلام لێوی وەك بەستبێتی بێ جووڵە مانەوە، من وتم: ڕازیم.

هاورێکەم لەترسی ئەوەی نەکا ئاڵۆزیەکەی زۆرپێوە دەربکەوێت بەناچاری وتی:

–هەڵبەتە من بە هیچ جۆرێك بڕوام بەم پەیوەندی کردنە رۆحیانەوە نیە...

لەبەر خۆمەوە وتم: گرنگ نیە، با وابێت...

–زۆر چاکە، با وابێت، وێڵیکە.. ڕازیت؟

دیسان وەلامیم دایەوە: ڕازیم.

ئەمە دوا قسە بوو کە پێکەوە کردمان، ئیتر بێ ئەوەی هیچ بڵێین دەستی یەکترمان گوشی، بەگەرمی پەنجەمان تێك ئالاند، کەچی لەپڕا لێك ترازان، من وەك ئەوەی بەدوامەوە بن، بێ ئەوەی ئاوڕ بدەمەوە، گورج رۆیشتم، جارێك ئارەزووم کرد ئاوڕبدەمەوەو بۆ دواجار هاورێکەم ببینم، بەلام خۆم گرت‌و فەرمانم بەخۆمدا : ((مەگەرێوە، برۆ)).

گیانی مرۆڤ کە خزاوەتە نێو قاوغی لەشەوە، هێشتا ناکامڵو نادروستە، بەو کەمو کاستیەی خۆیەوە ناتوانێت پێش بینی ئاییندەیەکی ڕوونو بەلەز بکات، ئەگەر بیتوانیایە ئەم لێك دابڕانە شێوەیەکی تری لە خۆ دەگرت.

*

تا دەهات دنیا زیاتر ڕووناك دەبوەوە، ئێستا ئەم دوو بەیانیە ئاوێزانی یەکتری ببوون، من دەمو چاوی هاوڕی خۆشەویستەکەمم لە ژێر بارانو دۆخی بەندەرەکەدا بەخەمباریو بێ دەنگی چاکتر دەبینی، دەرگای کافتریاکە کرایەوە، دەریا لرفەی دەهاتو دەریاوانێکی کورتە بالای لنگ فشو فۆڵو، سمێڵ شۆڕ هاتە ژورێ، دانیشتوەکان بەشادیەوە دەنگیان بۆ هەڵبڕی:

—سڵاو، کەشتیەوان، لیمونی.

من دیسان چوومەوە پەنایەکەوەو، هەوڵمدا جارێکی تر ئەو خەونانە لەزەینی خۆمدا بەرجەستە بکەم، بەڵام تازە ڕووی هاوڕێکەم لە بارانەکەدا تواوەوە.

تا دەهات ڕۆژ زیاتر روناك دەبوەوە ، لیمۆنی کەشتیەوان تەزبیحە کارەباییەکەی خۆی دەرهێناو، بەبێدەنگیو دەموچاوێکی مۆنەوە دەستی بەتەزبیحات کرد. من هەوڵمدا هیچ نەبینمو نەژنەومو، ئەو تۆزە خەونەی کە دەیویست لەبەرچاوم ون بێت لە زەینما بیهێڵمەوە. خۆزگا جارێکی دی ئەوساتە وەختەم دەبینیەوە کە هاوڕێکەم بە ((مشکی کاغەزخۆر)ی ناو بردمو، من بەشەرمەوە تووڕە بووم.

لەوەو دوا، من هەربیرم لەوە دەکردەوە کە هەموو رقو نەفرەتیەکانی ڕابووردووی تەمەنم لەو ڕستەیەدا بەرجەستە بوون، منێك، کە بەو ڕادە زۆرە ژیانم خۆش ویستوە، چۆن بەوە قایل بووم ماوەیەکی دوورو درێژ لەژێر هەرەسی کتێبو کاغەزی ڕەش نووسدا خەفەبم؟ ئەو لەیەکدی جیابوونەوەیەی ئەو ڕۆژەی هاوڕێکەم بە ئاگای هێنامەوە، چاوی زیاتر کردمەوە، هەستم بەبارسوکی کرد، لەوەو دوا کەناوی نەگبەتیەکەی خۆم زانی ئێتر تارادەیەك دەمتوانی بە ئاسانی بەسەریا زاڵ بم، ئیدی ئەم نەگبەتیە نادیارو سیحراوی نەبوو، بەڵکو لەناو وتەیەکدا بەرجەستە ببوو، بۆ منیش بەرەنگاری کردنی ئاسان بوو، بەڕاستی ئەم وتەیە کاری سەختی لەناخم کرد، بۆیە لەوەو دوا بۆ پاساوێك دەگەڕام تا واز

لە کاغەزو کتێب بێنمو بکەومە ناوجەرگەی کارو ژیانەوە، قێزم لەوە دەهاتەوە کە مشکی نەگبەت بۆتە هاو ناوی من، تا پێش مانگێك ئەو دەرفەتەم بۆ ڕەخسا کەبەو مەبەستەم بگەم، لە شوێنێکی کەناری دوورگەی کریتدا، بەرانبەر بەلیبا، کانزایەکی کۆنو تەریکی خەڵوزی ((لینیت))م بەکرێ گرت، وا ئێستا دەچمە ئەوێ تا لەگەڵ خەڵکێکی سادە، واتا لەگەڵ کرێکارو جوتیاردا دوور لە ڕەگەزی کاغەز خۆران بژیم.

بەشەوقو زەوقێکی زۆرەوە باری سەفەرم بەست، دەت وت ئەم سەفەرە نهێنیەکی لەخۆیدا شاردۆتەوە، بڕیارم دابوو شێوەی ژیانی خۆم بگۆڕم، بەخۆم دەوت:

((گیانی من، تۆ تا ئێستا بێجگە لە تارمایی هیچی ترت نەدەبینیو دڵیشت پێی خۆش بوو، بەڵام من ئێستا تۆ بەخودی جەستە دەگەیەنم)) ئیتر خۆت ئامادە کرد، ڕۆژی پێش سەفەرەکەم کە بەنێو پەڕە کاغەزەکانمدا گەڕام، دەست نووسێکی ناتەواوم دۆزیەوە، بەگومانەوە هەڵمگرتو تەماشام کرد، دووساڵ بوو لە قووڵایی وجودما ئارەزوویەکی گەورە هەڵدەچوو، ئارەزوویەك وەك تۆو چێنرا بوو، ئارەزووی بودا، لەهەر چرکەساتێکا هەستم دەکرد ئەو ئارەزوە ناوەوەی من دەخوات، گەشە دەکاتو گەورە دەبێت، دەجووڵیو بۆ هاتنە دەرەوە بە ئەسپایی لەسنگم دەدات، ئیتر نەم دەتوانی لە کۆڵ خۆمی بکەمەوە، ئەسڵەن تواناى کارێکی وام نەبوو، تازە بۆ لەباربردنی ئەو بیرە گەلێك درەنگ بوو.

لەوکاتەدا کە بەگومانەوە دەست نووسەکەم لەناو لەپمدا گیردابوو، لەپڕا زەردەخەنەی هاوڕێکەم کە پڕ بوو لەگاڵتەو خۆشەویستی ئەو ناوەی داگرت، بەنیگەرانیەوە وتم: ((من ئەمە لەگەڵ خۆمدا دەبەم، پێ مەکەنە، هەردەیبەم)).

دەست نووسەکەم وەك منالێکی شیرە خۆرەی قۆناغە کراو بەچاکی پێچایەوەو هەڵمگرت.

دەنگی ڕەقو ناجۆری لیمونی کەشتیەوان بەرز بوەوە، من گوێم گرت، باسی لەو دێوو درنجانە دەکرد کە لەکاتی زریاندا سەرکەوتبوونە سەر بادەوانەکەیو کەوتبوونە لستنەوەی، دەی وت:

—ئەو دێوو درنجانە نەرمو لینجن، کەمرۆڤ دەستیان لێدەدات دەستی دەسوتێت، من جارێك خۆم باداو، بەدرێژایی ئەو شەوە وەك شەیتان پزیسك لەڕووم بوەوە، ئەوسا وەك

ئەوەی پێم وتن ئاو هاتە ناو کەشتیەکەوەو بارە خەڵوزەکەمی تەڕکرد، بارەکە هێند قورس بوو لەوەدا بوو کەشتیەکە سەرو بن بێت، تا دەیشهات پڕ تر دەبوو، لەوکاتەدا یەزدانی مەزن بەزەیی بەمندا هاتەوە، هەورە تریشقەیەکی وای نارد کە دەرگای تەختەی ئەمباری کەشتیەکەی لێ کردەوەو هەموو خەڵووزەکەی ڕژانە نێو دەریاکەوە، دەریا پڕ بوو لە خەڵووز، کەشتیەکە سووك بوو، لاسەنگیەکەی نەماو ڕاست بوەوە، بەو شێوەیە من ئەمجارەیش ڕزگارم بوو.

کتێبەکەی (دانتی)م لەگیرفانم دەرهێنا کە ((هاورێی سەفەر))م بوو، پایپەکەمم پێ کرد، پاڵم بەدیوارەکەوە داو ئاسوودە پێم لێدرێژ کرد. کەمێك تیا مام کە لە کوێی شیعرەکانەوە دەست پێ بکەم، لە قیرە سووتێنەرەکانی دۆزەخەوە، یان لە بڵێسە فێنكو پاکژکەرەوەکانی بەرزەخەوە؟ یان ڕاستەوخۆ خۆم بخەمە سەر بەرزترین چینی (ئومێدی مرۆڤ)[6] ەوە، ئەبوو یەکێك لەمانە هەڵبژێرم. کتێبە بچکۆلەکەی دانتیم بەدەستەوە بوو، چێژم لەوە دەبرد کە ئازادم لەم هەڵبژاردنەدا، چونکە ئەو شیعرانەی کە ئەو بەیانیە بۆ خوێندنەوەی خۆمم جیاکردەوە جۆش و ئاهەنگێکی تەواوی دەدایە هەموو ڕۆژەکەم.

خۆم دابوو بەسەر لاپەڕە پڕ لەنووسینەکانی کتێبەکەدا تا بڕیارەکەم بدەم، بەڵام دەرفەتی ئەوکارەم بۆ نەڕەخسا، لەپڕا بەنیگەرانیەوە سەرم بڵند کرد، نازانم بۆ وام هەست کرد کە دوو کون بوونەتە تەپڵی سەرم، زوو ڕووم وەرگێڕاو لە دەرگا شووشەییەکەوە لەپشت سەری خۆمم ڕوانی، ئومێدێکی دێوانە ئاسا کە دەشێت هاوڕێکەم ببینمەوە وەك بروسکە بەمێشکما گوزەری کرد، وام هەست کرد کەموجیزەیەك دەبینم، بەڵام موجیزە ڕووی نەدا، غەوارەیەکی تەمەن نزیك شەست ساڵە، باڵابەرزێکی باریكو چاو بز، لووتی نووساندبوە شووشەکەوەو تەماشای منی دەکرد، توربەیەکی بچووکی لەبن دەست بوو.

ئەوەی زیاد لە هەرشتێك کاری لێ کردم چاوی بوو، چاوی خەماویو نیگەران، گەپ بازو پرشنگ هاوێژ. ئیتر واهاتبوونە بەر چاوی من.

---

[6] ئاماژەیە بە فەسڵە جیاوازەکانی کتێبی (کۆمیدیای خوایی) دانتی.-ف-

کەنیگای هەردووکمان پێك گەیشت– وەك ئەوە لەدڵی گەڕابێت کە ئەوکەسەی ئەو بەدوایدا وێڵە من بم– بێ دوودڵی دەستی درێژکردو دەرگای کردەوە، بەهەنگاوی درێژو خێرا بەلای مێزەکاندا تێ پەڕی، کە گەیشتە بەردەمم وەستا، لێی پرسیم:

–دەچیتە سەفەر ؟ خوا بیکات بۆ کوێ؟

–دەڕۆم بۆ کریت، بۆ دەپرسیت؟

–منیش دەبەیت؟

بەوردی لێم ڕوانی، ڕوومەتی تێك قوپاوی، چەناگەی پانی، ئێسکە دەرپەڕیوەکانی دەمو چاوی، مووی خۆڵەمێشیو لوولی، دووچاوی درەوشاوەیش.

–تۆ بۆ؟ چیت لێ بکەم؟

شانی هەڵتەکاندو بەتەوسەوە وتی:

–بۆ! بۆ! یەعنی مرۆڤ بێ وتنی (بۆ) ناتوانێت کاربکات؟ ناتوانێت بەدڵی خۆی کارێك بکات؟ باشە، لەگەڵ خۆتمابەرە، ئیتر.. وەك چێشت لێنەرێك، من گۆشتاوی وا دروست دەکەم لە تەمەنتا نەخواردبێتو نەبیستبێت.

دامە قاقای پێکەنین، خۆشم لە ڕەفتارو قسەی هات، حەزیشم لە گۆشتاوبوو، بیرم کردەوە بردنی زەلامێکی وا سادە بۆ ئەو کەنار دەریا دوورو تەریکە ڕەنگە کارێکی خراپ نەبێت، هیچ نەبێت گۆشتاوو ڕابواردنێکی تیایە، لەڕواڵەتیا ئەوە دیاربوو کە گەلێك دەریای بڕیبێتو سەندبادێکی بەحری بێت بۆ خۆی.. خۆشم پێی هات.

سەرە زلەکەی لەقاندو زۆر خۆمانە وتی:

–بیر لەچی دەکەیتەوە؟ سەیرە! دیارە تۆیش بەسەنگو تەرازوو لێکی دەدەیتەوەو تا دوا مسقاڵ دەی کێشیت، وانیە؟ دەی کاکی من بڕیار بدە، ئازابە.

ئەم کابرا چەتەوڵە بەسەر سەرمەوە وەستابوو، من لەوە ماندوتربووم سەر بەرزبکەمەوەو قسەی لەگەڵدا بکەم، کتێبەکەی دانتیم لێك ناو پێم وت:

–دانیشە، حەز دەکەیت پیاڵەیەك گوڵ مریەمەی کوڵاو بخۆیتەوە؟

دانیشتو توربەکەی بەپارێزەوە لەسەرمێزەکەی تەنیشتی دانا، بەتەوسەوە وتی:

–گوڵم مریەمەم؟ ئادەی رۆڵە پێکێك ئارەقم بۆبێنە.

ئارەقەکەی قوم قوم هەڵدەداو، هەرقومێکیشی بۆ ماوەیەك لەناو دەمیا ڕادەگرت تاتەواو تامەکەی بچێژێت، پاشان لەسەرخۆ نۆشی دەکرد تا دەرونی گەرم بکاتەوە. بەخۆم وت : ((مرۆیەکی لەزەت پەرستە بێگومان کارامەو بە ئەزمونیشە)) لێم پرسی :

—چ کارەیت؟

—هەموو شتێك، بەپێ، بەدەست، بەسەر، بەهەموو شوێنێکم، ئەوەندە بەسە کە پێم بڵێیت چی بکەم.

—بەم دواییە لە کوێ کارت دەکرد؟

—لەکانێکدا، من کانزاییەکی چاکم، دەزانیت؟ هەموو جۆرە کانزاییەك باش دەناسم، دەتوانم ڕەنگو ڕیشەی کان بدۆزمەوە، تونێل لێدەمو بچمە ناو بیرەوە ، هیچ ناترسم، لەوێ کاری باشم دەکرد، سەرکاربوومو گلەیم لە ژیان نەبوو، بەڵام لە پڕا شەیتان دەستی خستە ناو کارەکەمەوە . عەسری شەممەی رابووردوو کەمێك سەرم گەرم بوو، خاوەن کارەکە کە ئەو ڕۆژە بۆ پشکنین هاتبوە کارگەکە گرتمو چاکم کوتا.

—لێتدا؟ بۆ؟ چی لەگەڵتا کردبوو؟

لەگەڵ منا؟ هیچ. باوەڕبکە هیچی لەگەڵ مندا نەبوو، تەنانەت ئەمە یەکەمجار بوو من ئەو پیاوە ببینم، ئەو بێچارەیە جگەرەیشی بەسەرماندا دابەش کرد.

—ئەی بۆ؟

—ئا! . تۆیش زۆر پرسیار دەکەیت! ئیتر براله وام بەسەراهات، تۆ چیرۆکی ژنی ئاشەوانت[٧] بیستوە، ها؟ چاکە، دەشێت مرۆڤ لە گەڵو گیپاڵی ژنە ئاشەوانەوە فێری خوێندن بێت؟ عەقڵی ئادەمیزادیش تەواو وەك گەڵو گیپاڵی ژنی ئاشەوانە، من دەربارەی عەقڵی مرۆڤ زۆر پێ ناسەم خوێندۆتەوە. بەڵام ئەمەیانم لە هەموو ئەوانی دی پێ سەیرو دیارتربوو، بۆیە پێم خۆشبوو.

---

[٧] ئاماژەیە بە چیرۆکێك کە پیاوێك بۆ ئارد کرین دەڕواتە ئاشێك، ژنی ئاشەوانەکە بۆ هەڵگرتنی ئاردەکە دائەنەوێت و خوارەوەی دەر ئەکەوێت، پیاوەکە لەو دیمەنە دەخرۆشێت و خۆی بۆ ناگیرێت. —ك—

بە پەرۆشەوە تەماشای هاورێ تازەکەمم کرد، دەمو چاوی پڕ لە چرچو لۆچی وەك خۆرە لێی دابێت وابوو، دەت وت ڕەشەباو باران خواردویانە. چەند ساڵ دوای ئەوە دیسان دەمو چاوێکی تری لەو بابەتە وەك داری خۆرە لێ دراوو ناجۆری هێنایەوە یادم، ئەویش دەمو چاوی پانا ئیت ئیستراتی بوو[8]

لێم پرسی:

–چی لە توربەکەت دایە؟ خۆراك؟ جلو بەرگ؟ یان ئامرازی کار؟

هاورێکەم شانی هەڵتەکاندو بەپێکەنینەوە وتی:

–بێ چاوێنی بێ هوشیار دێیتە بەرچاو.

بەقامکە درێژو درشتەکانی توربەکەی کردەوە، پاشان کەوتەوە قسە:

–نا، ئەمە سەنتورە.

–سەنتور؟ مەگەر تۆ سەنتوریش دەژەنیت؟

–بەڵێ، کەلات دەبم دەکەومە چایخانەو مەیخانەکانو سەنتور لێ دەدەم، ئاوازە کۆنەکانی ماکدۆنیا دەڵێمەوە، پاشان بەم کڵاوەمەوە کە دەیبینی خولێك دەخۆمو داوادەکەم، تا کڵاوەکەم پڕدەبێت لە دراوی قەبە.

ناوت چیە؟

ئالیکسیس[9] زۆربا. هەندێك جار بەهۆی درێژی باڵاْو سەرە پانەکەمەوە بۆ گاڵتە پێکردن بە (کەرەك)[10] ناوم دەبەن، بەڵام هەموو کەسێك ئازادە بەهەرناوێکەوە کە بیەوێت بانگم بکات، ناوێکی ترم (پاسوتیمپو) یان (کات بەسەر بردن)ە، چونکە سەردەمێك ناوکە

---

[8] Panati istrati (١٨٨٤–١٩٣٥) نووسەری ڕۆمانی کە تووشی نەخۆشی سیل هات، بەزمانی فەرەنسی دەینووسی، شاکارەکانی (ماڵی تورنیگا ١٩٣٣)و بەرگی یەکەمی ژیانی ئادریان زوگرافی (مرۆی بێ ئیمان)ە.

[9] Alexis Zorba

[10] کەرەك: دارێکی درێژی سەرپانە لەفرنەکاندا کولێرەو سەموونی پی تاوو توێ دەکەن. کەلۆژیشی پێ دەڵێن .–ك–

کوولەکەی برژاوم دەفرۆشت، ناوێکی ترم (ئافات)ە، چونکە ڕێم بکەوێتە هەر جێگایەك تووشی بەڵای دەکەم، ناوو نازناوی تریشم هەیە، بەڵام باسی ئەوانە بۆ کاتێکی تر.

—چۆن فێری سەنتور لێدان بوویت؟

—تەمەنم بیست ساڵان بوو، لە جەژنێکی گوندەکەماندا کە دەکەوێتە دامێنی چیای ئۆلەمپەوە، بۆ یەکەمین جار بیستم یەکێك سەنتور لێ دەدات ئەوەندەی ڕاکێشام کە هەناسەم لەسینەمدا وەستاو هەمووگیانم بوو بەگوێ‌و تاسێ ڕۆژ هیچم بۆ نەخورا. شەوێك باوکم خوا لێی خۆش بێت لێی پرسیم: ((چیە؟ چ مەرگتە؟ وتم: (دەمەوێت فێری سەنتور لێدان بم) وتی: ((شەرم ناکەیت؟ بۆ تۆ قەرەجیت؟ دەتەوێت ببیتە لۆتی؟))

وتم: ((دەمەوێت فێری سەنتور لێدان بم))

کەمێك پارەم پاشەکەوت کردبوو کە زەماوەندی پێ‌بکەم، ئەوسا من هەرزەکار بووم، جۆش‌و خرۆشی گەنجیەتیم بوو، منی هەژارو گەمژە دەمویست ژن بێنم، هەرچیەکم هەبوو بەکەم‌و کەسرێکەوە دام بەسەنتورێك، ئەمە ئەو سەنتورەیە کەئێستا دەی بینیت، بەم سەنتورەوە کەوتمە گەڕان، هەر ڕۆیشتم تا گەیشتمە —سالۆنێك—لەوێ تورکێکم پەیدا کرد بەناوی (ریتسیپە فەندی)[١١].کە مامۆستای سەنتور ژەندن بوو، کەوتم بەسەر پێیدا، وتی چیت دەوێت بەچکە گاور؟ وتم: دەمەوێت فێری سەنتور لێدان بم. وتی : باشە بۆ خۆت دەخەیتە سەر پێم؟ وتم: چونکە پارەم نیە لەباتی فێر کردنەکەم بتدەمێ. وتی کەواتە تۆ شێت‌و شەیدای سەنتور لێدانیت؟ وتم: بەڵێ، وتی: باشە، بمێنەرەوە ڕۆڵە، من چاوم لە پوڵی تۆ نیە.

ساڵێك لای مامەوەو فێری سەنتور لێدان بووم، ڕەنگە ئەو ئێستا مردبێت. خوالێی خۆش بێت، خوایەك کە دەرگای بەهەشتەکەی لەسەر سەگەل دەکاتەوە با لە سەر ریتسپە فەندیشی بکاتەوە، من لەوکاتەوە فێری سەنتور لێدان بووم بوومەتە مرۆڤێکی تر، کە خەم دام دەگرێت یان بێ پارە دەبم سەنتور لێ دەدەم، واهەست دەکەم باری لەشم سووکتر

[١١] Retsep Effenai

دەبێت، لەکاتی سەنتور لێداندا ئەگەر قسەم لەگەڵدا بکەن هیچ نازنەوەمو ئەگەر بیشی ژنەوم ناتوانم قسە بکەم، هەڵبەت دڵم دەیەوێت بەڵام ناتوانم.

لێم پرسی: بۆ؟ زۆربا.

—ئای! ئیتر بە ئارەزوو.

دەرگا کرایەوە، دیسان دەنگی هاژە هاژی دەریا خۆی کردەوە بەناو کافتریاکەدا، دەستو پێی هەموومان لەسەرماندا بەستبووی، من زیاتر خۆم خزاندە گۆشەکەمەوەو پاڵتاوەکەم لەخۆمەوە پێچا، هەستم بەخۆشیەکی زۆری ئەو حاڵەتە کرد. بەخۆم وت: (بۆ کوێ بچم؟ لێرەدا ئاسوودەم، خۆزگا ئەمە چەند ساڵێکی دەخایاند))

تەماشای ئەو مرۆڤە سەیرەم دەکرد کە بەرانبەرم دانیشتبوو، چاوی تێ بڕیبووم، چاوە بچووکو خڕەکانی کە تەواو ڕەش بوونو لەسپێنەکەیدا وردە دەماری سوور دەبینرا، هەستم کرد ئەو چاوانە بەقوڵایی مندا ڕۆدەچنو ناوەوەم هەڵدەکۆڵن.

وتم: باشە، دوای ئەوە؟

جارێکی تر زۆربا شانە ڕەقو تەقەکانی هەڵ تەکاندو وتی :

—ئیتر واز لەم باسە بێنە، ئەتوانیت جگەرەیەکم بدەیتێ؟

جگەرەیەکم دایە، لەگیرفانی هێلەکەکەی بەردە چەخماخێکو ئەستێیەکی دەرهێناو جگەرەکەی داگیرساند، وەك نیشانەی قایل بوون چاوی نیوە نوقاو بوون.

پرسیم: ژنت هێناوە؟

بەتووڕەییەوە وتی:

—بۆنا؟ منیش پیاوم، وانیە، پیاویش یەعنی کوێر، منیش وەك هەموو پیاوانی دی بەسەرەوە کەوتمە نێو چاڵەکەوەو ژنم هێنا، پاشانیش خراپ لێژ بوومەوە، یەعنی بوومە سەرۆکی خێزان، ماڵێکم دروست کردو بووم بە خاوەنی منداڵو دەردی سەری، بەهەر حاڵ دروود بۆ سەنتور.

—یەعنی بۆ نەهێشتنی خەمو خەفەت لەنێو ماڵدا سەنتورت دەژەند؟

—ئاه! دیارە تۆ ناتوانیت هیچ سازێك بژەنیت! ئەم قسانە چیە دەیکەیت؟ لەنێوماڵدا دنیایەك ناخۆشی هەیە، ژن هەیە، مناڵ هەیە، بیر لەوە دەکەیتەوە چی بخۆن؟ چی لە

بەرکەن؟ ئاینده چۆن دەبێت؟ ئای لەو دۆزەخە! نا گیانەکەم ..نا، دەبێت بۆ سەنتورلێدان خەیاڵت ئاسوودە بێت، دەبێت لەبیری هیچی تردا نەبیت. کە ژنەکەم زۆر بڵێی بکات چۆن چاوەڕێی ئەوە دەکەیت بتوانم سەنتور لێ بدەم! کەمناڵەکانم لەبرساندا زروقەیان بێت کەی دڵو دەماخی سازلێدانم دەبێت؟ بۆ سەنتورلێدان دەبێت مرۆڤ هەموو هۆش و گۆشی لای سەنتورەکەی بێت نەك لە جێگای تر، تێ دەگەیت؟

بەڵێ، لەوە گەیشتم زۆربا ئەو کەسەیە کە ماوەیەکی درێژ بوومن بەدوایدا دەگەڕام و نەم دەدۆزیەوە، پیاوێکی دڵ زیندو، نەوسن و چلێس، گیانێکی گەورەو سەرکێش کە هێشتا پەیوەندی لەگەڵ دایکی سروشتا نەبڕیبوو، ئەم پیاوە کرێکارە مانای وشەکانی هونەر، خۆشەویستی، جوانی، پاکژی و ئارەزووی بە سادەترین وشەی ئینسانی بۆ من ڕاڤە دەکرد.

تەماشای دەستە زبرو قلێشاوو دەماراویە ناقۆڵاکانیم کرد، کە دەیانتوانی هەم بێڵ کاری بکەن و هەم سەنتور لێبدەن. زۆر بەهێوری و سۆزەوە، وەك کراس لەبەر ژنێك دابکەنێت توربەکەی کردەوە، سەنتورێکی کۆن کەبڕەنی زەمانە بریقەی دابێتێ، بەکۆمەڵێك ژێی لەمس و عاج دروست کراو کە بە گوڵینگەیەکی سووری ئاوریشمین ڕازێنرابووەوە دەرهێنا، بەپەنجە درشتەکانی لەسەر خۆو ئارام کەوتە نەوازشی سەنتورەکەی، وەك ژنێك بلاوێنێت وابوو. پاشان جارێکی تر وای لەتوربەکەدا پێچایەوە دەت وت لەشی خۆشەویستەکەیەتی و نایەوێت سەرمای بێت. دیسان بەپارێزەوە توربەکەی لەسەر کورسیەکە دانا، لەبەرخۆیەوە وتی:

—ئەمەیە سەنتورەکەی من.

وا ئێستا کەشتیەوانەکان پێکەکانیان لێك دەدەن و قاقاپێ دەکەن، کاپتنە پیرەکە مستێکی خۆشەویستانەی بەپشتی لیمونی کەشتیەوانەدا کێشاو پێی وت:

بێگومان زۆر ترسایت، وانیە لیمون؟ ڕاست بڵێ، خوا دەزانێت چەند دانە مۆمت نەزری نیکۆلای[12] پیرۆز کردوە!

---

[12] Saint nicholas قەشەیەکی سەدەی چوارەمە، کە لە سەرانسەری دنیای مەسیحیەتدا جێگای ستایش و ڕێز لێنان بوو. —ك—

کەشتیەوانەکە برۆ پڕەکانی هێنانەوە یەك و وتی:

-کوڕینە، من بەم دەریایە سوێند بۆ هەمووتان دەخۆم، کە ڕوو بەڕووی مەرگ بوومەوە نەحەزرەتی مریەمم بیرکەوتەوەو نەدەستم بەداوێنی نیکۆلاوە گرت، تەنیا ڕووم بەرەو سالامین[١٣] وەرگێڕا، ژنەکەمم بیر کەوتەوەو هاوارم کرد:

((ئای کاترینای میهرەبانم، خۆزگا ئێستا لەناو جێگاکەتدا دەبووم))

دیسان کەشتیەوانەکان دایانەوە قاقای پێکەنین و لیمونی کاپتنیش پێکەنی، دووبارە کەوتەوە قسە: بڕوانن، ئەم ئادەمیزادە چ دەعبایەکی سەیرە! ئیزرائیل بەشمشێری ڕووتەوە بەسەر سەریەوە وەستاوەو کەچی ئەو بیری لەو شوێنەیە کەوتم، هەر ئەو شوێنە نەك جێگای تر. دەك بەر لەعنەتی شەیتان کەویت هەی بەرازی پۆخڵ.

دەستی بەیەکدا داو هاواری کرد:

-دەی ڕۆڵە، ریزێك خواردنەوە بۆ هەموو برادەران بێنە.

زۆربا گوێچکە گەورەکانی بۆ قسەکان تەکاندبوو، پاشان ڕووی بەلای کەشتیەوانەکاندا وەرگێڕا، ئەنجا لەمن ڕاماو پرسی:

-ئەم برادەرە مەبەستی لە کوێیە؟ باس لەچی دەکات؟

لەپڕا تێگەیشت و ئاخێزێکی بۆ کرد، بەدەنگێکی ئافەرین ئامێزەوە وتی:

-ئافەرین هاوڕێ، ئەم کەشتیەوانانە ئاگاداری نهێنیەکانن، ئەشێ لەبەر ئەوەبێت کە شەوو ڕۆژ چنگاوشی مەرگن.

مستە تۆپزەیەکەی لەهەوادا چەرخاندو پاشان وتی:

-باشە ئەمە چیرۆکێکی ترە، با بگەڕێینەوە سەرباسەکەی خۆمان، ئێستا من بڕۆم یان بمێنمەوە؟ تۆ بڕیاری خۆت بدە.

وتم! زۆربا (ئەوەندە لێم هاتبوە پێشەوە خەریك بوو بکەومە ئامێزی)) تۆ لەگەڵ مندا وەرە، من لە کریت کانی خەڵوزی بەردم هەیەو تۆیش دەبیتە چاودێری سەرکرێکارەکان،

---

[١٣] Salamis سالامیس یان سالامین دوورگەیەکە لەرۆژهەڵاتی یونان و رۆژئاوای ئەسینا لە کەنداوی سارونیك.

شەوانە بەجووتە لەسەر لمی کەناردەریا پاڵ دەکەوین. من لەم دنیایەدا نەژنم هەیە نەمنداڵو نەسەگیش، پێکەوە دەخۆینو دەخۆینەوە، دوایی تۆ سەنتور دەژەنیت.

—بێگومان ئەگەر سەرو دڵم خۆش بن، ئەگەر لەسەر خۆم بم. دەربارەی کارکردنم تابڵێیت کاردەکەم، چونکە دەبمە پیاوی تۆ، بەڵام سەنتور لێدان باسێکی ترە، سەنتور گیاندارێکی کێویەو پێویستی بەئازادیە، ئەگەر من کەیفم سازبێت سەنتور لێ دەدەمو گۆرانیش دەڵێم، سەمای زئیم بکیکۆ[١٤] و هاساپیکو[١٥] و بیندوزالیس[١٦] دەکەم. بەڵام باهەر لەم سەرەتایەوە پێت بڵێم هەموو ئەمانە کاتێك دێنە دی کەمن بەتەواوی کەیفم سازبێت، برادەریمان لەولاوە بوەستێت، هەرشتێك بەکاتی خۆی، ئەگەر بتەوێت بەزۆر پێم بکەیت ئەوا پێکەوە ناگونجێین. ئەبێت ئەوە بزانیت بۆ ئەم جۆرە شتانە من مرۆڤێکم بۆ خۆم.

—مرۆڤێك؟ مەبەستت چیە؟

—مەبەستەکەم ئاشکرایە، یەعنی ئازادم.

بانگم کرد.

—گارسۆن، پێکێك ئارەقی تر.

زۆربا هاواری لێ هەستا:

بیکە بەدووپێك، تۆش دەبێت بخۆیتەوە، دەبێت پەرداخەکانمان لێك بدەین، گوڵ مریەمەی کوڵاوو ئارەق پێکەوە ناگونجێن، دەبێت تۆیش پێکێك ئارەق بخۆیتەوە تا ڕێکەوتنەکەمان کۆك تر بێت.

هەردووکمان پەرداخەکانمان لێکدا، ئیتر تەواو ڕۆژ ببوەوە، کەشتی شووتی لێدا، بەلەمەوانێك کە جانتاکانی منی هێنابووە ناو کەشتیەکەوە ئاماژەی بۆ کردم، بەدەم هەستانەوە وتم:

—خوامان لەگەڵ با بڕۆین.

زۆربا خوێن ساردانە وتی:

—شەیتانیش.

داموکایەوەو توربەی سەنتورەکەی نایە بن باڵی، دەرگاکەی کردەوەو یەکەم کەس بوو چووە دەرەوە.

---

[١٤] Zeimbekiko سەمایەکی میللی یەکێك لەخێڵە کەناریەکانی ئاسیای بچووك.

[١٥] Hassapiko سەمای قەسابان

[١٦] Pendozaliیان Pentozali سەما جۆراو جۆرەکانی گەلی کریت.

—۲—

دەریاو، هەوای خۆشی پاییزیو، دوورگەکانی پڕ لە ڕووناکیو، پەردەیەکی ناسکی وردە بارانی لەسەر خۆ کە هەمیشە یۆنانە ڕووتەکەی دادەپۆشی هەموومانی ئەفسوناوی کردبوو. بەخۆم وت:

((خۆزگەم بەوکەسەی کەپێش مردنی لەگەشتی نێو دەریای ئیجە تێربوە))

خۆشبەختیەکانی ئەم دنیایە زۆرن، ژن، میوە، بیرو باوەڕ، بەڵام بەلای منەوە هیچ خۆشیەك بەئەندازەی گەشتی نێو ئەم دەریایە، لە هەوای سازگارو پاکیزەی پاییزدا، کە لەبەرخۆتەوە ناوی هەریەکێك لەدوورگەکان بهێنیت دڵی مرۆڤ ناخەنە ناو قوڵایی بەهەشتی تامو چێژەوە، مرۆڤ لە هیچ جێگایەکی تری ئەم دنیایە ئەوەندە هێورو ئاسان لەواقیعەوە هەنگاو نانێتە ناو خەونەوە. لێرە سنوورەکان دەپێچرێنەوەو لە ئەستوندەگی کۆنترین کەشتیدا گوڵو میوە دەروێن، دەڵێی لێرە، لەیۆنان، موجیزە بەری دارێکە کەپێویستی ژیانە.

نزیکی نیوەڕۆ بوو کە بارانەکە خۆشی کردەوە، خۆر هەورەکانی لەیەکدی دابڕی، خۆیشی ناسكو دلۆڤانو تازە شۆراو دەرکەوت، بەتیشکەکەی خاكو ئاوە خۆشەویستەکانی لاواند، من لەپێشی کەشتیەکەدا وەستابووم، مەستی موجیزەکانی سروشت بووم کە تا کۆتایی ئاسۆ دیاربوو.

کەشتیەکە یۆنانی تیابوو، کەسانێك کە لەشەیتان دەچوون، چاویان بزو، مێشکیشیان وەك کاڵاکۆنەکانی بازاڕ وابوو، سەرگەرمی بێنەو بەردەی سەوداو مامەڵە بوون، لەپیانۆیەکی ناسازو ژنانی لەخۆباییو بەدگۆ بەڵام بەڕواڵەت داوێن پاك دەچوون، هەموو ئەم دیمەنانە دۆخێکی لادێیانەی ناشرینیان بەو ناوە دابوو، حەزت دەکرد ئەمسەرو ئەوسەری کەشتیەکە بگری، نوقمی ناو دەریاکەی بکەیتو زۆر چاك بیتەکێنیت، تا ئەوجانەوەرانەی کەشتیەکەیان پیس کردووە، لەمرۆڤەوە بیگرە تا مشكو مێروو هەمووی

خالی بکەیتە نێو دەریاکەوە، پاشان کەشتیەکە بشۆیت‌و بەڕەنگ‌و ڕوویەکی تازەو خاڵیەوە بیخەیتەوە ڕێ.

بەڵام من هەندێک جار بەزەیی بەرۆکی دەگرتم، بەزەییەکی بودایی، سارد وەک دەرئەنجامەکانی باس‌و خواسی میتافیزیکی، بەزەیی نەک تەنیا بەحاڵی مرۆڤەکان، بەڵکو بۆ هەموو ئەو دنیایەی کە دەجەنگن، هاواردەکەن، دەگرین، ئومێدیان هەیەو کەچی ئەوە نابینن کە هەموو شتەکان بێجگە لە خەیاڵی پووچ‌و بێ مانا چی ترنین. بەزەیی بە یۆناندا، بەکەشتی‌و دەریاو بەخۆم‌و بەکانی خەڵوزو بەو دەست نووسە ناتەواوەی منیشدا کە دەربارەی بودایە. بە هەموو ئەو پێکهاتە بێهودانەی ڕووناکی‌و تاریکی کە لە پڕا دێن‌و هەوای پاک‌و بێگەرد پیس دەکەن.

تەماشای زۆربام کرد، کە بەدەم‌و چاوی قوپاوو ڕەنگی پەڕیویەوە لەپێشەوەی کەشتیەکەو لەسەر بەستە گوریسێک دانیشتبوو، لیمۆیەکی بۆن دەکردو، گوێ زلەکانی لەبگرەو بەردەی ئەوانە گرتبوو کە یەکێکیان بەرگری لە شا دەکردو ئەوی تریان لەڤینزولیس[١٧]، سەری دەلەقاندو تفی ڕۆدەکردە سەر زەویەکە، گاڵتەی بەقسەکان دەهات‌و لەژێر لێوەوە دەی وت:

—ئەم کاڵا کۆنانە چین! تەریق نابنەوە!

پرسیم: زۆربا، مەبەستت لە کاڵای کۆن چیە؟

—مەبەستم هەموو ئەم شتانەیە: دەوڵەت، دیموکراسی، ریفراندۆم، نوێنەران، هەموو ئەم شتە هەڵیت‌و پەڵیتانە.

بەبڕوای زۆربا ڕووداوە هاوچەرخەکان کۆن ببوون، چونکە ئەو لەبڕیاری ناوەوەی خۆیدا بەسەر هەموویاندا تێ پەڕیبوو، لەزەینی ئەودا تەلگراف‌و کەشتی هەڵم‌و ڕێگای ئاسن‌و ڕەوشتی باوو وڵات‌و ئاین شت گەلێک بوون لەبابەتی تفەنگە کۆن‌و ژەنگ لێ دراوەکان. گیانی زۆربا لەدنیا خێراتر بۆ پێشەوە دەڕۆشت.

---

[١٧] Venizelos سیاسەتمەداری یونانی کە لەشاری کانە-کریت-١٨٦٤-١٩٣٤ لەدایک بووە، لە ساڵەکانی ١٩١٠تا ١٩١٥و ١٩٢٨تا ١٩٣٢و ١٩٣٣تا ١٩٣٥ سەرەک وەزیری یۆنان بوە. ف

گوریسەکان بە ئەستوندەگەکانەوە جیرە جیریان بوو، ڕۆخەکان سەمایان دەکرد، ڕەنگی ژنەکانی ناو کەشتی لە لیمو زەردتر بوو، هەموو چەکی ژنانەیان، واتا سوراوو سپیاوو کۆرسێتو سنجاقی سەرو شانەیان دانابوە سەر زەویەکە، لێویان بێ ڕەنگو نینۆکیان شین داگەڕابوو، قژقەڕە پیرەکانیان پەڕیان لێ دەبوەوە، پەڕە خوازراوەکانیان دادەکەوت، وەك قردێلەو برژانگی دەستکردو خاڵی کوتراوو ملوانکەکانیان، کە مرۆڤ چاوی پێیان دەکەوت هێڵنجی دەهاتیو لەهەمان کاتدا زۆری دڵ پێیان دەسووتا. زۆربایش زەردو پاشان سەوز داگەڕاو چاوە گەشژەکانی لیڵ بوون، تەنیا لە دەوەروبەری عەسردا بوو کە بەر چاوی کرانەوە، دەستی درێژکردو دوو دۆلفینی پیشاندام کە لەئاوەکەدا هەر هەڵبەزو دابەزیان بوو، پێ بەپێی کەشتیەکە دەهاتن، بەخۆشیەوە وتی:

—تەماشای ئەو دۆلفینە بکە.

لەوکاتەداو بۆ یەکەمین جار پەنجەی دۆشاو مژەی دەستی چەپیم بینی کە لە ناوەڕاستا قرتابوو، ڕاچەنیمو پێم ناخۆش بوو، هاوارم لێ هەستا: زۆربا ئەوە پەنجەت چیەتی؟

لەبەر ئەوەی لە بینیی دۆلفینەکان من خۆشحاڵی خۆم دەرنەبڕیبوو، بەساردیەوە وتی : هیچ.

من سوور بووم لەسەر پرسیارەکەمو پێم وتەوە! مەکینە پەنجەتی وردکردوە؟

—مەکینەی چی؟ من خۆم بڕیومە.

—خۆت؟ بۆ؟

بەدەم شان هەڵتەکاندنەوە وتی:

—تۆ ناتوانیت تێ بگەیت، سەرۆك، من پێم وتیت هەرکارێك تۆ بیلێیت کردومە. ماوەیەکیش گۆزەم دروست دەکرد، شەیدای ئەم کارەیان بووم، دەزانیت مرۆڤ مشتێك قوڕ هەلگرێو چی دڵی بوێت لێی دروست بکات چ مانایەکی هەیە! فڕ ڕ ڕ چەرخەکە دەسوڕێنیو وەك شێت قوڕەکەیشی لەگەڵدا دەسوڕێت، لەگەڵ ئەوەیشدا کەتۆ بەسەر سەریەوە وەستاویتو دەڵێی: ئێستا گۆزە دروست دەکەم، ئێستا دەفر دروست دەکەم،

ئێستا چراوگێك دروست دەكەم. بە كورتی چی دڵم بیەوێت دروستی دەكەم، بەمەدەڵێن: بوون بە مرۆڤ، واتا ئازادی.

ئیتر دەریاكەی لەبیركردبوو، گازی لە لیمۆكەی دەستی نەدەگرت و چاویشی روونا كتر بوون.

پرسیم: ئاخر پێت نەوتم پەنجەت بۆ وای لێهاتووە؟

—هیچ، كەلەسەر چەرخەكە كارم دەكرد رێگای لێ دەگرتم، لە هەموو دیزەیەكدا ئەسكوێ بوو، كاری لێ تێك دەدام، منیش رۆژێك تەورێكم هەڵگرت و...

—ئازارت نەبوو؟

—چۆن ئازارم نەبوو، خۆ دارو بەرد نیم مرۆڤم، بێگومان ئازاریدام، بەڵام وەك پێم وتیت دەستی هێنایە رێم و منیش بڕیم.

خۆر ئاوابوو، دەریاكە بۆ ماوەیەك هێور بووەوەو هەورەكان لێكدی دابڕان، یەكەمین ئەستێرەی شەو هەڵهات، من تەماشای ئاسمان و دەریام كردو كەوتمە بیركردنەوەو، مرۆڤ هێند عاشقی كارێك بێت كەبەتەور پەنجەی خۆی بۆ ببڕێتەوەو ئازار بچێژێت... وەلێ ناخۆشیەكەی خۆمم شاردەوەو بەدەم زەردەخەنەوە وتم:

—بەڵام زۆربا، ئەمە كارێكی خراپە، ئەم كارەی تۆ چیرۆكێكم بیردێنێتەوە كە لە ئەفسانە ئاڵتونیەكاندایە[18]، رۆژێك زاهدێكی خەڵوەتكێش ژنێكی بینی، ژنەكە ختورەیەكی لەدڵ خست و لەوەدابوو لەرێی لابدات، زاهیدەكە تەورێكی هەڵگرت و...

زۆربا كە دەی زانی كۆتایی چیرۆكەكە چۆن دێت قسەكەی پێ بڕیم و وتی:

—ئەو زاهیدە عەجەب كەرێك بووە، چۆن مرۆڤ ئەوشتەی خۆی دەبڕێت! بەڕاستی كەر بووە، چونكە ئەو ئەندامە بێچارەیە هیچ رێگایەكت لێ ناگیرێت.

من لەسەر ئەوە سوور بووم كە: چۆن رێ ناگرێ! هەر زۆریش رێگرە،

---

[18] Goldenlegend كۆمەڵێك ئەفسانەیە لەبارەی ژیانی قەشەكانەوە كە لەسەدەی ١٣ی زاینیدا یاكوبی ڤرازینی نووسیویەتی، كتێبەكە بەزمانی لاتینی نووسراوەو وەرگێراوەتە سەر زمانەكانی تر. لەڕوانگەی فۆلكلۆری سەدەكانی ناوەڕاستەوە نرخی زۆریان هەیە. هەموو حیكایەتەكای لەبارەی ژیانی پاك و پیرۆزەوەیە.

–ڕێگری چی؟

ڕێگره له چوونه ناو بەهەشتی خواوه.

زۆربا مۆڕەیەكی لێ كردمو بەتەوسەوه وتی:

–بەڵام كەرەگیان ئەو خۆی بەڕاستی كلیلی بەهەشته.

سەری بڵند كردو بەووردی لێم ڕاما، ئەی ویست لەوه بگات كه ئاخۆ من لەبارەی ئەو مەسەلانەوه ، مەسەلەی ژیانی ئەو دنیا، فریشتەكانی ئاسمان، ژنو قەشەكان چۆن بیردەكەمەوه، بەڵام واپێ دەچوو هیچی زیادەی دەست گیر نەبووبێت، سەره زلو مووماشو برنجیەكەی له قاندو وتی:

–ئەوانەی ئەو ئەندامانەی لەشیان نیه ناچنه بەهەشتەوه.

پاشان بێدەنگ بوو.

من بۆ ئەوەی ڕاكشێم چوومه ژوورەكەی خۆمەوه، كتێبێكم بەدەستەوه گرت، هێشتا بیرو باوەڕەكانی بودا كاریان لێ كردبووم، دەستم كرد بەخوێندنەوەی –گفتو گۆی بوداو شوان–كه لەم ساڵانەی دواییدا دڵنیاییو ئاسودەیی ڕۆحیان پێ دەبەخشیم:

شوان: خۆراكم ئامادەیەو مەڕەكانم دۆشیوه، دەرگای كوختەكەم كیلۆن كردوەو ئاگرم كردۆتەوه، تۆیش ئەی ئاسمان، هەرچەندێكت دەوێت ببارێنه.

بودا: من ئیتر نەپێویستم بەخواردنەو نه بەشیر، بایەكان بوونەته كۆختمو ئاگریشم كوژاوەیه، تۆیش ئەی ئاسمان، هەرچەندێكت دەوێت ببارێنه.

شوان: من گاو مانگام هەن، مێرگەلانی باوو باپیرانم بۆ ماوەتەوەو گایەكیش كەهەموو مانگاكان ئاوس دەكات، تۆیش، ئەی ئاسمان، هەرچەندێكت دەوێت بیبارێنه.

بودا: من نه گام هەیەو نه مانگا، مێرگەلانم نیەو هیچ شتێكی تریش، له هیچ شتێكیش ناترسم، تۆیش ئەی ئاسمان، هەرچەندێكت دەوێت ببارێنه.

شوان: من ژنێكی گوێ ڕایەڵو وەفادارم هەیه كه ساڵانێكه هاوسەرمه، شەویش به دەست بازی لەگەڵ كردنیا خۆشم لێ دەگوزەرێ، تۆیش ئەی ئاسمان، هەرچەندێكت دەوێت ببارێنه.

بودا: من گیانێکی گوێ ڕایەڵو ئازادم هەیە، ساڵانێکە فێری دەکەم یاریم لەگەڵدا بکات، تۆیش ئەی ئاسمان هەرچەندێکت دەوێ ببارێنە.

هێشتا ئەو دوو دەنگە لەگوێما دەزرنگانەوە کە خەو زۆری بۆ هێنام، با هەڵی کردبوو، شەپۆلەکان شووشە گەورەکەیان دەکوتا، لەنێوان خەوو بێداریدا وەك دووکەڵ لوولم دەخوارد، زریانێکی توند هەڵیکرد، مێرگەڵانەکان ژێر ئاوکەوتن‌و گاو مانگاو کەڵەگا هەموو نوقم بوون، باکە سەربانی کوختەکەی هەڵگرت‌و بردی، ئاگرەکە کوژایەوە، ژنەکە هاوارێکی لێ هەستاو کەوتە ناو قوڕو لیتەکەوەو مرد. شوان کەوتە گریان، هاواری دەکردو من گوێم لێ نەبوو چی دەڵێت، بەڵام ئەو دیسان هاواری دەکردەوە، منیش وەك ماسیەك بۆ نێو دەریا داکشێت بەردەوام بەرەو خەونێکی قووڵ ڕۆ دەچووم.

کە بەرە بەیان لە خەو بەئاگاهاتم دوورگەیەکی گەورەی سەر بڵند، شکۆمەندو سەرکێشم لەلای ڕاستەوە بینی، ریزە چیایەکی گوڵ ڕەنگ لەپشت تەم‌و لەژێر خۆرە پاییزیەکەوە زەردی دەهاتێ، دەریا شینەکەی دەوری ئێمەیش هەر لەلرفەو چەپۆکاندا بوو.

زۆربا کە خۆی لەلێفەیەکی قاوەییەوە پێچابوو چاوی لە کریت نەدەگوێزایەوە، نیگای لە کێوەکانەوە دەپەڕیە سەر دەشت‌و پاشان بەدرێژایی ڕۆخەکە ورد دەبوەوە، دەت وت هەموو ئەوزەوی‌و دەریایانە بەچاوی ئاشنان‌و، واجارێکی تر شادمانە بەوەی کە بەخەیاڵ پێیان لەسەر دادەنێتەوە.

لێی نزیك کەوتمەوە، دەستم نایە سەرشانی‌و پێم وت:

– بێگومان ئەمە یەکەمین جارنیە بێیت بۆ کریت، زۆربا، تۆ بەچاوی هاوڕێیەکی کۆنەوە لێی دەڕوانیت.

زۆربا وەك لەشی داهێزرابێت باوێشکی‌دا، هەستم کرد تاقەتی قسە کردنی نیەو نایەوێت هیچ بڵێت، زەردەخەنەیەکم بۆ کردو پێم وت:

– حەز لە قسەکردن ناکەیت زۆربا؟

لەوەڵامدا وتی:

– نا، سەرۆك، نەك حەزی لێ ناکەم، بەڵکو کارەکەیشم پێ دژوارە.

– دژوار ؟ بۆ؟

ئەو یەکسەر وەڵامی نەدامەوە، دیسان چاوی بەسەرتاپای کەناردەریاکەدا گێڕا. شەو لەسەر عەرشەی کەشتیەکە نوستبوو، شەونم لە قژە لوولو ماشو برنجەکەی دەچۆڕا، خۆرە هەڵاتووەکەیش هەموو چرچو لۆچەکانی ڕوومەتو چەنەو گەردنی دەرخستبوو.

دوایی، لچو لێوە ئەستورو شۆڕەکانی کە لە لچو لێوی سابرێن دەچوون کرانەوە . وتی:

–من ناتوانم بەیانیان بئاخڤم، زۆرم لاناخۆشە، داوای، لێ بوردن دەکەم.

بێدەنگ بوو، دیسان چاوە بچووکو خڕەکانی لەکریت بڕیەوە.

زەنگی نان خواردنی بەیانی لێیدا، دەمو چاوە ترشاوەکان، ڕەنگی زەردی مەیلەو سەوز وردە وردە لە ژوورەکانەوە هاتنە دەرێ. ژنەکان بەقژی بژەوە لەسەر مێزێکەوە بۆ لایەکی دی خۆیان بەکێش دەکرد، بۆنی ڕشانەوەو کۆلۆنیایان لێ دەهات، ڕوانینیان ترس لێ نیشتو گەلۆرانە بوو.

زۆربا کە بەرانبەر بە من دانیشتبوو بە ئیشتیهایەکی تەواوەوە قاوەکەی فڕدەکرد، کەرەو هەنگوینی بەسەر نانەکەیدا ئەساویو دەی خوارد، وردە وردە دەمو چاوی کرایەوەو ئارام بوو. لۆچەکانی دەوری دەمی کرانەوە، ئەو ساتەی لەسەرخۆ بەرگی خەواڵویەتی لەبەرخۆی دادەماڵیو چاوی لەجاران زیاتر دەدرەوشایەوە من لەژێرەوە لێم دەڕوانی. جگەرەیەکی داگیرساند، زۆر تامەزرۆیانە مژی لێداو، لەکونە لووتە پڕ لەمووەکانیەوە هەورێکی دووکەڵی شین هاتەدەرێ، قاچی ڕاستی لەژێر خۆیدا نوشتاندەوەو وەك ڕۆژهەڵاتیەکان بەڕەحەتی دانیشت. ئیتر ئامادەی قسەکردن بوو، وادەستی پێ کرد:

–وتت ئەمە یەکەمجارە کەمن بێم بۆکریت؟ (بەچاوە نیوە کراوەکانیەوە لە پەنجەرەی ژوورەکەوە تەماشای چیای ((ئیدا))[١٩]ی کرد کە لە پشتمانەوە ون دەبوو)) نا، ئەمە یەکەمجارم نیە، لە ساڵی ١٨٩٦دا من پیاوێکی تەواو بووم، مووی سمێڵو سەرم ڕەنگی واقیعی خۆیان، واتا ڕەش وەك پەڕی قەلەڕەش وابوو، ئەوسا هەرسیو دوو دانەکەمم

---

[١٩] Ida

هەبوو، کە دەم خواردەوە لەپێشا هەموو مەزەی عەرەقەکەم دەخواردو پاشان خواردنم بەسەرا دەکرد. هەر تەواو لەو کاتەیشدا بوو کە شەیتان ویستی لە کریتا شۆڕشێك هەڵگیرسێت:

﴿ ئەوسا من لەمەکدۆنیا چەرچی بووم، لەگوندێکەوە دەچوومە گوندێکی ترو وردەواڵەم دەفرۆشت، لەباتی پارە پەنیرو خوریو کەرەو کەرویشکو گەنمەشامیم وەردەگرت، پاشان هەموو ئەو شتانەم دەفرۆشتەوەو دوو ئەوەندەم قازانج دەکرد، شەوانیش ڕێگام بکەوتایەتە هەر گوندێك دەمزانی لە چ ماڵێکدا بنووم، لەهەر گوندێکدا هەمیشە بیوەژنێکی دڵسۆز هەبوو، من یان بەکرەی دەزوو یا شانە یا سەرپۆشێکی ڕەشم بەیادی مێردە خواڵێ خۆشبوەکەیەوە دەدایەو لەگەڵیا دەخەوتم، ئەمە هیچی تێ نەدەچوو، بەڵێ، سەرۆك، دەبینیت کە ڕابواردن لە سەر من زۆرگران نەدەکەوت، بەلام وەك پێم وتیت کریت جارێکی دی چەکی هەڵگرتەوە، بەخۆم وت: ((تف لەم بەختە، بەمەیش دەڵێن ژیان، بۆ کریت دەهێڵێت هیچ کاتێك هەناسەیەکی ئاسودە هەڵکێشین!)) ئەوسا شانەو بەکرەم نایە لاوە، تفەنگێکم هەڵگرت، چوومە ڕیزی شۆڕشگێڕەکانەوە، هەموو پێکەوە بەرەو کریت چووین ﴾

زۆربا بێدەنگ بوو، لەو کاتەدا ئێمە لە پاڵ کەنداوێکی شێوە کەوانەییو هێدیدا کە ڕۆخێکی لمینی هەبوو پێش ڕەویمان دەکرد، لەوێدا شەپۆلەکان ئارامو لەسەر خۆ بڵاودەبوونەوە بێ ئەوەی بەرشتێك بکەون، تەنیا بەدرێژایی ڕۆخەکە کەفێکی ناسکیان لەدوای خۆیانەوە جێ دەهێشت. هەورەکان پەڕاگەندە بوون، خۆر دەدرەوشایەوەو کریتی مۆنیش بە دڵنیاییەوە زەردەخەنەی دەهاتێ.

زۆربا سەری وەرگێڕاو نیگایەکی گاڵتە جاڕانەی تێ گرتم، پاشان وتی:

—سەرۆك، تۆ وادەزانیت من ئێستا ژمارەی سەری بڕاوی تورکانت پێ دەڵێم؟ یان ژمارەی گوێچکەی بڕاوی ئەو تورکانەی کە دەم خستنە عەرەقەوە؟ ( چونکە لە کریت ئەم کارە باوە) نا گیانە، من هیچ ناڵێم چونکە ئەم باسە بێ حەوسەڵەم دەکاتو تەریقی دام دەگرێت، ئەمە کە چ شێتیەکە؟ ئێستا کە کەمێك عەقڵم تێ گەڕاوە بە خۆم دەڵێم: ئەمە چ

شێتیەکە بێ هۆ پەلاماری یەکێك بدەین کە لە هەموو تەمەنیا خراپەی لەگەڵدا نەکردبین؟ دوایی گازی لێ بگرین، لووتی ببڕین، گوێی هەڵکەنین، ورگی ڕادەین، بۆ ئەنجامدانی هەموو ئەم کارانەیش داوای یارمەتی لە خوا بکەین؟ بابڵێم، داوا لە خوا ئەکەین ئەویش لووتو گوێ ببڕێو سك هەڵدڕێ؟

((بەڵام ئەوە بزانە کەمن لەو سەردەمەدا خوێنم دەکولاو نەم دەتوانی دەست لەسەر دەست بکەومە شەنو کەوی مەسەلەکە. مرۆڤ بۆ ئەوەی بتوانێت بەڕاستیو شەرافەتمەندانە بیربکاتەوە دەبێت لەسەر خۆ بێتو تەمەنێکی تێ پەڕاندبێتو ددانی نەمابێت، کە مرۆڤ ددانی نەبوو بە ئاسانی دەتوانێت بڵێت: ((منالینە، تەریق ببنەوە، گاز مەگرن)) بەلام کەسیو دوو ددانەکەی لەجێی خۆیدا بێت بڵێم چی.. مرۆڤ لە گەنجیدا گیاندارێکی دڕندەیە، بەڵێ سەرۆك، گیاندارێکی دڕندەی مرۆڤ خۆر))

زۆربا سەری لەقاندو دیسان کەوتەوە ئاخاوتن:

—مەڕیش دەخوات، مریشكو بەرازیش هەر دەخوات، بەلام تا گۆشتی مرۆڤ نەخوات تێر نابێت.

پاشماوەی جگەرەکەی لەژێر فنجانە قاوەکەیدا کوژاندەوەو لەسەری ڕۆشت:

—نا، تێر نابێت، ئەی تۆ لەم بارەیەوە دەڵێی چی هۆ بلیمەتی زەمانە؟ بی ئەوەیش چاوەڕێی وەلام بێت، هەر بەدەم تێ ڕوانینمەوە وتی:

—لەم بارەیەوە تۆ دەڵێی چی؟ ئەوەندەی من بزانم هەرگیز جەنابت برسیەتیت نەچەشتووە، قەت کەست نەکوشتوە، هەرگیز دزیت نەکردووەو هەرگیز لەگەڵ ژنی تردا نەنوستویت، کەواتە تۆچی لە دنیا دەزانیت؟

پاشان بە سوکایەتی پێکردنێکی ئاشکراوە لەژێر لێوەوە وتی:

—عەقڵێکی بێ گوناهت هەیەو لەشێکیش کە هەرگیز هەستی بەگەرمی خۆر نەکردوە.

بەڕاستی من لە دەستی نەرمو شلو دەمو چاوی ڕەنگ پەڕیوو ژیانی خۆم کە خوێنو لیتەیەکی بەرنەکەوتووە تەریقی دای گرتم.

زۆربا دەستی قورسی وا بەسەر مێزەکەدا هێنا دەت وت بەئیسفنجێك پاکی دەکاتەوە، ئینجا وتی:

–با وا بێت، من دەمویست پرسیارێکت لێ بکەم، بێگومان تۆیەکی زانا کە چەندان کتێبت هەڵگێڕو داگێڕ کردوە دەشێ بزانیت...

–چی بزانم، بیلێ، زۆربا!

–سەیرە، سەرۆك، زۆر سەیرە، ئەوەی سەری منی بەگێژ هێناوە! ئەم هەموو تاوانە، ئەم هەموو دزیو کوشتو کوشتارەی کە ئێمەی شۆڕشگێڕ کردمان بۆ هێنانی شازادە جۆرج بو بۆ یۆنانو بۆ بەدەست هێنانی ئازادی!

بە هەردوو چاوی کەلەسەر سامیا کرابوونەوە تەماشای کردمو لەبەر خۆیەوە وتی:

–ئەمە لەخۆیدا مەتەڵە، مەتەڵێکی گەورەیش، کەواتە بۆ ئەوەی دنیا ئازاد بێت پێویستە ئەم هەموو گوناهو تاوانە بکرێت؟ ئەگەر من بمەوێت هەموو ئەو نامەردیو پیاو کوژیانەی خۆم کردومن بۆ تۆی بگێڕمەوە مووی سەرت دەبێتە سووژن، باشە، ئەم کارانە چیان لێ کەوتەوە؟ ئازادی! خوا لە جیاتی ئەوەی بە هەورە بروسکەکانی بمانسوتێنێت ئازادی داینێ، بەڕاستی من لەم کارە سەر دەرناکەم!

وام لێ ڕامابوو وەك ئەوەی داوای هاوکاری کردنیم لێ بکات، دیاربوو ئەم مەسەلەیە زۆری ئازار پێ گەیاندوەو نایشتوانێت بگاتە ئەنجام.

بە دوودڵیەوە پرسی:

تۆ، سەرۆك، تۆ هیچ لەم مەسەلەیە تێ دەگەیت؟

من چی تێ بگەم؟ چی پێ بڵێم؟ یان دەبێت ئەوەی ئێمە ناوی خوامان لێ ناوە وجودی نەبێت، یان ئەوەی ئێمە ناوی گوناهو تاوانی لێ دەنێینو لەپێناوی خەباتو ئازادی دنیادا دەکرێن دەبێت کارێکی پێویست بن.

دەمویست بۆ تێگەیاندنی زۆربا ڕستەیەکی سادەتر پەیدا بکەم، وتم:

–چۆن گوڵ لەناو پەینو پیسیا ڕەگ دادەکوتێو دەڕوێت؟ زۆربا، تۆیش هەروای دابنێ کە پەینو پیسیەکە مرۆڤەو گوڵیش ئازادیە.

زۆربا مستێکی بەمێزەکەدا کێشاو وتی:

—ئەی تۆو چیە؟ بۆ ئەوەی گوڵێك سەوز بێت پێویستە تۆوەکەی هەبێت، کێ تۆوێکی وای لە هەناوی پۆخڵی ئێمەدا داناوە؟ ئەی بۆ ئەو تۆوە لەگەڵ چاکیو پاکیا پێ ناگات؟ بۆ دەبێت خوێنو پیسی سەوزی بکات؟

سەرم لەقاندو وتم:

—نازانم.

—ئەی کێ دەزانێت؟

—هیچ کەس.

زۆربا هاوارێکی نا ئومێدانەی لێ هەستاو بەترسەوە لە هەموو لایەکی ڕوانی.

—کەواتە تۆ بە تەمای من بەم کەشتیو مەکینەو بۆینباخانەتەوە چی بۆ تۆ بکەم؟

دووسێیەك لەو گەشتیارانەی کە دەریا ماندوی کردبوونو لەپشت مێزێکی نزیکمانەوە قاوەیان دەخواردەوە تەواو کڕبوون، پشوویەکیان گرتو وەك ئەوەی هەست بەکێشەیەك بکەن گوێیان هەڵخستبوو.

زۆربا ئەو دیمەنەی لا خۆش نەبوو، دەنگی نزم کردەوەو وتی:

—با واز لەو مەسەلەیە بێنین، کاتێك کە بیری لێ دەکەمەوە دڵم دەیەوێت هەرچیەکم بەر دەست بکەوێت، لەکورسیەوە تا چرا هەمووی بشکێنم، یان سەرم بەدیواردا بکێشم، پاشان، تازە ئەمانە بەمن چی؟ گۆڕ بەگۆڕ چم، یان دەبێت باجی ئەو شتە شکاوانە بدەم یان بچمە دەرمانخانەیەك تا سەری شکاوم بۆ بپێچن. خۆ ئەگەر خوایەکیش هەبێت ئەوە خراپتر، ئەوسا حسابمان دەبێتە بۆش، چونکە بێگومانم لەو سەرەوە لەژێرەوە تەماشام دەکاتو لەپێکەنینا دەکوڵێت.

وەك ئەوەی مێشێك لە خۆی دەربکات لەپڕا کەوتە دەست ڕاوەشاندنو بەدەنگێکی بێزاریەوە وتی:

—ئێستا دەمەوێت ئەوەی مەبەستمە پێت بڵێم" کە کەشتی شاهانەی بە ئاڵاو واڵا ڕازاوە گەیشتە بەندەرو، تۆپەکان بۆ پیرۆزبایی هاتنی تەقینو شازادە پێی نایە سەر زەوی کریت... تۆ تا ئێستا میللەتێکت دیوە کاتێك کە ئازادی بەدەست دێنێت چۆن هەموو شێت دەبن؟ نەت دیوە؟ کەواتە تۆ ئەی سەرۆکی بێچارەی من بە کوێری هاتویتە

دنیاوەو بەکوێرییش بەجێی دێڵێت، ئەگەر من هەزار ساڵی تربژیم، ئەگەر بێجگە لەپلە گۆشتێك هیچی تر لە منا بەزیندویی نەمێنێت ئەوەی لەو ڕۆژانەدا دیومن هەرگیز لەیادیان ناکەم، ئەگەر لەو دنیا هەموو کەسێك ئازاد بێت کە بەخوایشتو ئارەزووی خۆی بەهەشتێك هەڵبژێرێت — کە بەڕاستیش دەبێت وا بێتو، من تەنیا بەهەشتێکی بەو جۆرە بەبەهەشت دەزانم— بەخوا کەم دەڵێم:

((یەزدانی مەزن، دەمەوێت بەهەشتەکەی من-کریت-ێك بێت ڕازاوە بە چڵە مۆردو ئاڵا، حەزیش دەکەم ئەو دەقیقەیەی شازادە جورج پێ دەنێتە سەر زەوی کریت چەند سەدەیەك درێژە بکێشێت، ئەمە بۆ من بەسە))

دیسان زۆربا بێدەنگ بوو، سمێڵی باداو پەرداخەکەی لێوان لێو کرد لە بەفراوو یەکژەمی بەسەریەوەنا.

پرسیم: زۆربا، چی لەکریتا ڕوویدا؟ باسیکە.

زۆربا بە ناجۆریەکەوە وتی: هاوڕێ من نامەوێت بەزمانی ئەدەبیو وشەی بریقەدار قسەبکەم، من پێم وتیت ئەم دنیایە مەتەڵەو مرۆڤ بێجگە لە جانەوەرێکی کێوی هیچی ترنیە.

((جانەوەرێکی کێوی گەورەو خوایەکی گەورە. یەکێك لەو زەلامە شۆڕشگێڕانەی لە مەکدۆنیاوە لە گەڵما هاتبوو ناوی یۆرگابوو٢٠، لەو لاتانە بوو کە تەنیا بۆ دار بڕین دەستی ئەدا، یان بڵێم چی، بەرازێکی پیس بوو بینیم دەگریا، لێم پرسی: (ها.. یۆرگای نەعلەتی بۆ دەگریت؟ خۆیشم وەك هەوری بەهار کەوتبوومە فرمێسك هەڵڕشتن، ئای بەرازی پیس بۆ دەگری؟ بەڵام ئەو دەستی کردە ملمو کەوتە ماچ کردنم، وەك منداڵیش هەر دەگریا، پاشان ئەو کابرا پیسە ، کیسەی پارەکەی لە گیرفانی دەرهێناو ئەوپارە زێڕانەی لە تورکەکانی دزیبوو لە کۆشیا خاڵی کرد، ئەنجا بەمشت پارەکانی بەهەوادا هەڵدەداو دەی وت: ئازادی یەعنی ئەمە، تێ ئەگەی سەرۆك؟))

---

٢٠ Yorga

من هەستام‌و چوومە سەر سەکۆی کەشتیەکە تا لەشم بدەمە بەر بای دەریاکە، بۆ خۆم بیرم کردەوە:

((بەڕاست ئەمەیە ئازادی! بەدی هاتنی ئارەزوویەك، کۆکردنەوەو لەسەر یەك خستنی دراوی زێڕ، دوایی زاڵ بوون بەسەر ئارەزووتاو بەفیڕۆدانی ئەوەی کە کۆت کردۆتەوە، خۆ ئازاد کردن لە کۆتێك‌و کەوتنە داوی ئارەزوویەکی لەو چاکترەوە، بەلام ئاخۆ هەر ئەمەیش لە خۆیدا جۆرێك نیە لە کۆیلایەتی؟ لەبەر خاتری بیرو باوەڕێك، یان گەلەکەت، یان لەبەرخاتری خوا خۆت بکەیت بەقوربانی؟ یان چەندە پلەو پایەی سەرۆك بەرزبێت دەبێت پەتی گەردنی کۆیلە درێژتربێت؟ بەم حاڵەوە کۆیلە چاکتر دەتوانێت دەست‌و پێ بهاوێژێت‌و لەمەیدانێکی فراوانترا زیاتر هەڵس‌و کەوت بکات بۆ ئەوەی هەست بەپەتی سێدارەکەیش بکات بمرێت، ئایا ئەمەیە مانای ئازادی؟

لەدوا نیوەڕۆیەکی درەنگا گەیشتینە کەنارە لماویەکەمان، لمێکی وردو سپی دەت وت بێژراوەتەوە، داری ژاڵە کەهێشتا گوڵیان پێوە بوو لەگەڵ داری هەنجیرو، خڕنوکی شامی، کەمێك دوورتریش ، لەلای ڕاستەوە تەپۆلکەیەکی ڕەنگ خۆڵەمێشی کە هیچ درەختێکی پێوە نەبوو، لەدەم‌و چاوی ژنێك دەچوو ڕاکشابێت، لەژێر چەناگەو بەر گەردنیەوە دەماری قاوەیی ڕەنگ خەڵوزی لینیت خۆی ڕاکێشابوو، پاییزە با هەڵی دەکرد. لەسەر خۆ پەڵە هەورەکان تێ دەپەڕین‌و سێبەری سەرزەویەکەیان خۆش دەکرد، پەڵە هەوری تر هەبوون بە تووڕەیی ڕوویان لە ئاسمان دەکرد، ڕووی خۆر دەگیراو دەکرایەوە، ڕووی زەوییش وەك ڕووی زیندەوەرێکی بەتەنگ هاتوو لەگەڵ ئەودا روناك‌وتاریك دەبوو.

بۆ ماوەیەکی کەم لەسەر لمەکە وەستام‌و تەماشام کرد، بێدەنگیەکی پیرۆز، خەمبارو سەرنج ڕاکێش وەك بیابان لەبەردەمدا خۆی ڕاکێشابوو، ئەو گۆرانیە بودابیە لە دڵی زەویەکەوە هەستاو بە قوڵایی وجودی مندا ڕۆچوو.

((کەی منیش تەنیاو بێ یارو یاوەر، بێ خۆشی‌و ناخۆشی، تەنیا بەم یەقینە پیرۆزەوە کە هەرچیەك خەوو خەونە، دەخزێمە کونجی تەنیایی خۆمەوە؟ کەی بەبەرگێکی دڕاوەوە، شادو بێ ئارەزوو لە چیایەکدا دەچمە خەڵوەتەوە؟ کەی ، ئەگەرچی جەستەی من بێجگە

لە نەخۆشی‌وگوناهو پیری‌و مەرگ هیچی تر نیە، ئازادو بێ ترس‌و بەدڵێکی پڕ لەخۆشیەوە لە دارستانێکا پەنا دەگرم؟ کەی؟ کەی؟)

زۆربا بە سەنتورەکەی بن دەستیەوە لێم نزیک کەوتەوە:

من بۆ شاردنەوەی هەڵچوونەکانی ناوەوەی خۆم پێم وت:

—ئەمەیش کانزای لینیت!

دەستم بۆ ئەو گردۆڵکەیە درێژکرد کە لەدەم‌و چاوی ژن دەچوو، بەڵام زۆربا بێ ئەوەی سەیری ئەو بەر بکات برۆی لێکناو وتی:

—پاشان، سەرۆک، ئێستا کاتی نیە، دەبێت لەپێشەوە زەوی لە جم‌و جوڵ بکەوێت، زەوی نەحلەتی هێشتا لە جووڵەدایە، سۆزانیە، وەك پردی کەشتی لە سەرکەوتن‌و داکەوتنایە، با لەپێشەوە بچینە ناو گوند.

ئەمەی وت‌و بەهەنگاوی گورج، وەك دوا بڕیاری دابێت بەڕێ کەوت، دوو مێرد منداڵی پێ پەتی، خۆر ئەنگاز وەك بەچکە عەرەب کەوتنە پێشمان‌و جانتاکانیان بۆ هەڵگرتین، یەکێك لە پیاوانی گومرگ، زلەیەکی چاوشین، لە کوختێکی دارینداکە نووسینگەی گومرگ بوو نێرگەلەی دەکێشا،بەلاچاوێك تەماشای کردین، بێ بایەخ پێدان سەیرێکی جانتاکانیشی کردین، کەمێك لەسەر کورسیەکەی جووڵا وەك بیەوێت هەستێت، بەڵام توانای نەبوو، لەسەر خۆ لوولەی نێرگەلەکەی لابردو بەدەنگێکی خەواڵوانەوە وتی:

—بەخێربێن.

یەکێك لەمێرد منداڵەکان هاتە تەکمەوە، بەچاوە ڕەشەکانی کە لە زەیتوون دەچوون چاوی لێ داگرتم‌و بەگاڵتە پێ کردنەوە وتی:

—یارۆ کریتی نیە، ها! پیاوێکی تەمەڵە.

—یەعنی کریتیەکان تەمەڵ نین؟

مناڵە کریتیەکە وەڵامی دایەوە:

—بۆ؟ بۆنا؟ ئەوانیش تەمەڵن، بەڵام بەجۆرێکی تر..)

—ئاوایی لێرەوە دوورە؟

—ئا! هەر بە ئەندازەی مەودای فیشەكی تفەنگێك، بڕوانە، پشت ئەوباخانە، لەنێو دەربەندێكایە، گوندێكی جوانە، سەرۆك، ناوچەیەكی بەپیتو فەڕە. لەخرنووكەوە بیگرە تا هەلۆژە، نۆك، زەیتونو شەراب، لەخواریشەوە، لەناولمەكەدا خەیارو تەماتەو باینجانو كاڵەكیش دەڕوێنن، كاڵەكی كریتی زۆر زووپێ دەگات، چونكە بای ئەفریقای بەسەرا دێتو زوو پێی دەگەیەنێت. تۆ، سەرۆك، ئەگەر شەو لەبێستانێكدا بنوویت گوێت لەدەنگی خرچە خرچی كاڵەكەكان دەبێت كە دەیانەوێت لەتوێكڵ بێنە دەرێ.

زۆربا لەپێشەوە بەلارە لارە دەڕۆیشت، هێشتا سەری دەسوڕا، هاوارم لێ كرد:

—ئازابە، زۆربا، ئیتر ناخۆشیمان تەواو بوو، نەترسیت!

ئێمە خێرا دەڕۆیشتین، سەرتاپای زەویەكە لمو گوێچكە ماسی بوو، ناوە ناوەیەكیش درەختێكی گەز، هەنجیرە كێویلەیەك، چەند قامیشەڵانێكو چەند شەوكەرانێك دەهاتنەڕێ، هەواكەی خەفەخان بوو، هەورەكان زیاتر بەرەو خوار دەبوونەوە، بایەكەیش خستبووی.

بەپاڵ دار هەنجیرێكی گەورەدا تێپەڕین كە قەدەكەی ببوە دوولقی پێچاو پێچو پیری كلۆری كردبوو، یەكێك لەمنداڵەكان وەستا، بە چەناگەی ئاماژەی بۆ درەختە پیرەكە كردو وتی:

—ئەم دار هەنجیرە هی خانمەكەی ئێمەیە.

من سڵەمیمەوە، لەسەر زەوی كریتا هەر دارو بەردێك بگریت مێژوویەكی خەمناكی خەمێكی تایبەتی خۆی هەیە. وتم:

—خانمی ئێمە؟ یەعنی چۆن؟

وتی: لەسەر دەمی باوە گەورەی مندا كچە خانەدانێكی ئەم دەڤەرە حەز لە كوڕە شوانێك دەكات، بەڵام باوكی كچەكە قایل نابێت شووی پێ بكات. كچە دەگری، هاوار دەكاو دەپاڕێتەوە، بەڵام پیرەی باوكی لەسەر ڕاكەی خۆی سوور دەبێت. تا شەوێك كچو كوڕەكە دیارنامێنن، ڕۆژێكو دوانو سیانو هەفتەیەك بەدوایاندا گەڕانو نەیان دۆزینەوە، تا وردە وردە كوڕو كچەكە بۆگەنیان كرد، ئەوسا بەدەم بۆنەكەوە چوونو لەژێر ئەم دار هەنجیرەدا كە هەردوو كیان لە ئامێزی یەكتردا پێكەوە قرسا بوون دۆزیانەوە، تێ ئەگەیت؟ بەهۆی بۆگەنەكەیانەوە دۆزرانەوە.

منداڵەکە دایە قاقای پێکەنین. گوێمان لەژاوە ژاوی ناوگوندبوو، سەگەل دەوەڕین، ژنان لە هەراوزەنای خۆیاندا بوون، کەڵەشێرەکان هەواڵی وەختیان ڕادەگەیاند، بۆنی تلپەی ترێ کە لە مەنجەڵی دلۆپاندنی ئارەقەوە دەهات هەموو ئەو ناوەی پڕ کردبوو. هەردوو مێرد منداڵەکە بەجووتە هاواریان کرد:

—ئەوە گوندەکەیە.

هەر ئەوەندەی بەدەوری تەپۆڵکە لمەکەدا سوڕاینەوە گوندە بچکۆلەکە کە کەوتبوە داوێنی دەربەندەکەوە دەرکەوت. خانووەکانی نزمو هەیواندارو بەگەچ سپی کرابوونەوە، هەموویشیان پاڵیان بەیەکەوە دابوو لەبەرئەوەی پەنجەرە کراوەکان پەڵەیەکی ڕەشیان دروست کردبوو خانوەکان لەو کاسە سەرە سپیانە دەچوون کە لەنێوان تاوێرەکاندا بەپاڵ یەکەوە دانرا بن. خۆم گەیاندە زۆرباو پێم وت:

—زۆربا، ئاگات لە خۆت بێت، کە دەچینە ناو دێ هەڵس‌و کەوتت لەجێی خۆیدا بێت، نابێت بۆنی شتێك بکەن، دەبێت بزانن کەئێمە پیاوی کاراو ڕاساڵین، من خاوەنی کارم‌و تۆ سەرکاری کرێکاران، ئەوەیش بزانە کە خەڵکی کریت گاڵتەو ماڵتە نازانن، هەر ئەوەندەی تەماشات بکەن یەکسەر پەی بەخاڵە لاوازەکانت دەبەن‌و نازناوێکت لێ دەنێن کە هەرگیز لێت نابێتەوە، ئەوسا وەك سەگێکت لێ دێت کە تاوەیەکیان بەکلکیەوە بەستبێت‌و ئەویش هەر ڕابکات.

زۆربا سمێڵی لە مشت گرت‌و کەوتە بیرکردنەوە، پاشان وتی:

—گوێ بگرە سەرۆك، ئەگەر لە گوندەکەدا بێوەژنێك هەبێت پێویست ناکات نیگەران بیت، خۆ ئەگەر بێوەژنی تیا نەبێت...

هەر لەو کاتەدا لەبەرایی گوندەکەدا ژنە سواڵکەرێکی شڕۆڵە پێشی لێ گرتین‌و دەستی لێ پان کردینەوە، ژنێکی خۆرئەنگاز، چڵکن، سمێڵێکی ڕەش‌و باریکی بەپشت لێوەوە بوو، هاواری لەزۆربا کرد:

—هێی مامۆ، مامۆ! تۆ ویژدانت هەیە؟

زۆربا وەستاو بەجیدی وەڵامی دایەوە:

—بەڵێ هەمە.

–کەوایە پێنج –دراخما–[21] م بدەرێ.

زۆربا جزدانێکی چەرمی کۆنەی لەگیرفانی دەرهێناو وتی:

–وەرە .. بیگرە.

بزەیەك کەوتە سەر لێوە بەبارەکانی زۆرباو سەری وەرگێڕاو وتی:

–لەوە دەچێت دینو ئیمان لێرە هەرزان بێت، ویژدانێك بەپێنج دراخما.

سەگی دێ بەرەو ڕوومان هاتن، بۆ تەماشاکردنمان ژنان لەسەربانەوە خۆیان شۆڕکردەوە، منالان بەدەنگی بەرز لەگەڵ یەکا دەدوانو دوامان کەوتبوون، هەیان بوو وەك سەگ دەوەڕی، هەیان بوو وەك ماشێن هۆڕنی لێدەدا، هەندێکیش پێشمان دەکەوتنو بەچاوی ئەبڵەقو سەیرەوە لێ یان دەڕوانین. گەیشتینە مەیدانی سەرەکی گوندەکە، دوو ئەسپینداری گەورەی لێ بوو، لەدەوروبەریانداو هەر لە قەدی دار دوو کورسی کەلو کۆم دروست کرابوون، بەرانبەریش چایخانەیەك هەبوو، لەسەر تابلۆیەکی کاڵەوە بوو ئەم چەند وشەیە نووسرابوو: چایخانەو قەسابخانەی شەرافەت.

زۆربا لێی پرسیم:

–سەرۆك بۆ پێدەکەنیت؟

من دەرفەتی وەڵامدانەوەم نەبوو. لەدەرگای چایخانە–قەسابخانەوە پێنج شەش چەتەوڵ بەپانتۆڵی شینی تێرو پشتێنی ڕەشەوە هاتنە دەرێو بانگیان کرد:

–بەخێربێن، هاوڕێیان، فەرموون وەرنە ژوورەوە، پێکێك ئارەقی تازە هەڵدەن، هێشتا گەرم گەرمەو تازە لەمەنجەڵی دڵۆپاندن هاتۆتە دەرێ. زۆربا زمانی لستەوەو وتی:

–سەرۆك تۆ دەڵێی چی؟

تەماشای کردمو چاوی لێ داگرتم:

–پێکێك نەخۆینەوە؟

---

[21] Drachma پارەیەکی کۆنی یونانیەو ئێستایش بەکاردێت، وشەی درهەم لە دراخماوە هاتوە.

پێکێکمان خواردەوە، هەناوی سوتاندین، خاوەنی چایخانە-قەسابخانە کە هاتە لامانەوە، پیاوێکی پیر بەڵام هێشتا بەتواناو تەندروست بوو، کورسی بۆ هێناین، پرسیم: دەتوانین لەکوێماڵێك پەیدا بکەین؟

یەکێکیان وتی: بڕۆنە ماڵی هورتانس خانم[٢٢]

بەلامەوە سەیر بوو، پرسیم:

-ئەم خانمە فەرەنسیە؟

وتیان: خوا دەزانێت لەکوێوە هاتوە! ژنێکە هەموو دنیا گەڕاوەو ئاوی هەموو جێگایەکی پیا هەڵپژاوە، بەپیری هاتۆتە ئێرەو کەلو پەلەکانی هێناوەو میوانخانەیەکی کردۆتەوە.

مێرد منالێکی تر ئەمەی لێ زیادکرد: شیرینیش دەفرۆشێت.

منالێکی تر وتی: سوراوو سپیاویش دەکات، ڕەفتەیەك دەئالێنێتە ملیو.. توتیەکیشی هەیە.

زۆربا پرسی: بێوە ژنە؟

کەس وەلامی نەدایەوە.

زۆربا کەدەمی پڕببوو لەئاو دیسان پرسیەوە: بێوەژنە؟

چایچیەکە ڕیشە پڕو ماشو برنجیەکەی خۆی لەدەست گرتو وتی:

-هاوڕێ چەند تاڵ موو لەم ڕیشەی منا دەبینیت؟ چەند؟ باشە، ئەوژنەیش ئەوەندەجارە شووی کردووەو بێوەژن کەوتووە، تێ گەیشتی؟

زۆربا زمانی بەلچو لێویا هێناو وتی:

-بەلێ تێگەیشتم.

-ڕەنگە سەری تۆیش بخوات.

پیاوێکی پیر بانگی لێکرد: وایە هاوڕێ، ئاگات لەخۆت بێت!

هەموو دەستیان بەپێکەنین کرد.

---

٢٢ Mme Hortense

چاپچیەكە جارێكی تر لە سینیەكدا پێكی دووەمی بۆ هێنایەنەوە، نانی جۆو پەنیری بزن‌و هەرمێ لەسەر سینیەكە بوو، رووی لە دانیشتوەكان كردو بەدەنگی بەرز پێی وتن:

—دەی، برۆن‌و واز لە میوانەكان بێنن تا بحەسێنەوە، ئەمشەو ناچنە میوانخانەی ئەو ژنەوەو هەرلێرە دەنوون.

پیاوە پیرەكە بە چاپچیەكەی وت:

—كوندو مانولیو[٢٣] ئەمشەو من ئەیانبەمەوە ماڵی خۆم، من مناڵم نیە، خانوەكەم گەورەیەو ژووری زۆر تیایە.

چاپچیەكە دەمی لەگوێی پیرەمێردەكە نزیك خستەوەو وتی:

—ببوورە ئاپۆ ئاناگنوستی[٢٤] من پێش دەستیم كرد.

ئاناگنوستی پیر وتی: ئەویان بۆ تۆو پیرەمێردەكەشیان دەبەمە لای خۆم.

زۆربا تەنگە گرتی‌و بەتوورەییەوە وتی:

—كێ پیرە مێردە؟

ئاماژەم بۆ زۆربا كرد كە توورە نەبێ‌و وتم:

—من‌و تۆ پێكەوەین‌و لەیەكتر جیانابینەوە، دەچینە میوانخانەكەی هورتانس.

* * *

خۆش هاتن، خۆش هاتن.

ژنێكی كورتە باڵای ڕوخۆش، قەڵەویلكەیەكی قژ زەرد كردبوو.لە ژێر چنارەكانەوە دەركەوت، بەقاچە خوارەكانیەوە هێدی هێدی دەهات‌و هەردوو دەستی بۆ پێشەوە درێژكردبوو، چەند تاڵە موویەك كە لەمووی بەراز دەچوون، لەخاڵەكەی سەر چەناگەیەوە هاتبوونە دەرێ‌و جوانیەكیان پێ بەخشیبوو، ڕەفتەیەكی ئاوریشمی سووری بەگەردنیەوە ئاڵاندبوو، پۆدرەیەكی ئەرخەوانی لەسەر گۆناسیسەكانی دابوو، چەند تاڵە موویەكی نەرم‌و

---

[٢٣] KondoManolio

[٢٤] Anagnosti

شل بەسەر تەوێڵیەوە یاریان دەکردو، هەر لەو پیرەژنە دەچوو کە سارابرنا[٢٥] ی ژنە ئەکتەر لە شانۆگەری (بەچکە هەڵۆ)دا دەوری ئەوی دەبینی.

من هەر لەخۆمەوە سۆزێك گرتبوومیو بەتەواوی خۆشحاڵیەوە ویستم دەستی ماچ بکەم، لەوەڵامیدا وتم:

–بەناسینتان خۆشبەختم هورتانس خانم.

لەوکاتەدا ژیانم وەك چیرۆکێك، وەك یەکێك لەکۆمیدیاکانی شکسپیر، بۆ نموونە (زریان) هاتە بەرچاو، دەت وت دوای غەرق بونێك، بەسەرتاپای لەشی تەڕمانەوە لەکەشتی دا بەزیوینو کەوتوینەتە سەرو سۆراخی کەنارە سەر سورهێنەرەکانو، بەڕێو ڕەسمی تایبەتیەوە سلاو لە دانیشتوان دەکەین، بەڕای من هورتانس خانم وەك شاژنی دوورگە، یان جۆرێك لە سەگلاوی ئاوی ڕەنگ خورماییو بریقەدارم هاتە بەرچاو کە خەریك بێت بۆن بکاتو عەتری لەخۆی دابێت، بەو سمێڵەوە کەوتبێتە ئەو کەنارە لمینەوە، لەدوایشیەوە (کالیبان)[٢٦] بەچەند سەرێکی پیسو پۆخڵی پڕ لە گۆڤەندەوە وەستاوەو بەفیزو سووکیەوە تەماشای ژن دەکات.

زۆربایش خۆی وەك شازادەیەك گۆڕیبوو، چاوی ڕامانی بەو شازادەیەدا کرابوەوە، وەك هاورێیەکی کۆن، یان کەشتیە جەنگیەکان کە لە دەریا دوورەکاندا جارێك شەڕی بردبێتەوەو تاوێك تێك شکابێت، پەنجەرەکانی شکابنو کۆڵەکەکانی وردبووبن، بایەوانەکانی پارچەپارچە بووبێتنو ئێستایش.. هەموو لەشی شەقار شەقارو کون بێتو بەکرێمو پۆدرە کونو کەلەبەرەکانی گرتبێتو کشابێتەوە بۆ ئەم کەناری دەریایەو چاوەڕێ بێت. بێگومان چاوەڕێی زۆربای کابتنی سەدان زام تێبوو، منیش لەبینینی ئەم دوو ئەکتەرە کەلە ئەنجامدا لەسەر ئەم شانۆ سادەیەی کریتا بەدیداری یەکدی شاد دەبن زۆر شادمان بووم.

---

[٢٥] Sarah Bernhandt ژنە ئەکتەری ناوداریفەرەنسی کە زیاتر لە شانۆنامە تراژیدیەکاندا دەوری دەبینی (١٨٤٤–١٩٢٣).

[٢٦] Calibanلە کەسە خەیاڵیو ئەفسانەییەکانی شانۆگەری (زریان)ی ولیم شکسپیرە، کالیبان چەتەوڵێکی ترسێنەرەو نموونەی هێزێکی ناجۆرە. بەڵام ناچارە سەر بۆ هێزێکی بە تواناتر دابنەوێنێتن بەردەوام لەگەڵ ئەو هێزە بەتواناترەدا لەسەرکێشیو مل ملانێدایە.–ف–

لەو کاتەدا کەسەرم لەبەرانبەر ژنە ئەکتەرێکی پیری خۆشەویستا دانەواند وتم:

– ئێمە دوو قەرەوێڵەمان گەرەکە، هورتانس خانم، دوو قەرەوێڵەی بێ ئەسپێ.

ماوەیەك لێم ڕاماو وەك بەرەنگاریم بکات وتی:

– ئێرە ئەسپێی نییە، نا، ئەسپێی نیە.

دەمی (کالیبان)ەکان بەگاڵتەجاڕیەوە هاواریان کرد:

– ئەسپێ هەیە، هەیە.

ژنەکە بەقاچە قەڵەوو خەپلەکانیەوە کە لەجوتێ گۆرەوی چنراوی شینو جوتێ پێڵاوی دڕاودا بوونو گوڵینگەیەکی بچووکی ئاوریشینمی پێوەبوو، بە بەردەکانیدا کێشاو زۆر بەڕەهایی دووبارەی کردەوە: کە ئەسپێ نیە، نیە.

کالیبان دیسان دایەوە لەقاقای پێکەنین کە:

تفت لێ بێ پریمادونا[٢٧]، گۆڕ بەگۆڕ چیت.

بەڵام هورتانس خانم کەهەموو گیانی ویقار بوو دەڕۆیشتو ڕێگای بۆ دەکردینەوە، بۆنی پۆدرەو سابونی هەرزانی لێ دەهات. زۆربا لەدوایەوە دەڕۆیشتو وای چاو تێبڕیبوو دەیویست بیخوات، بەدەنگی نزم پێی وتم: تەماشایکە، سەرۆك، سۆزانیە چۆنی بادەدا، تەپ، تەپ، هەردەڵیی مەڕی دووگ شۆڕە.

دووسێ دڵۆپی گەورە بارینو ئاسمان تاریك بوو، بروسکە شینەکان شمشێریان بەڕووی چیادا کێشا، کچۆڵەکان، کەخۆیان لە کەوڵێکی سپی مەرەزەوە پێچابوو، بەپەلە مەڕو بزنەکانیان بەرەوماڵەوە کردەوە. ژنەکانیش لەبەردەم زۆپاکاندا چوارمشقی دانیشتبوونو ئاگری شەویان دەکردەوە.

زۆربا بێ ئەوەی چاو لەسمتو کەفەڵی خانم کەلا بخات لەتاوا سمێڵە پڕەکەی دەگەزی، لەپڕا هەناسەیەکی هەڵکێشاو لەبەر خۆیەوە وتی:

ئای لەم دنیا سۆزانیە کەهەرگیز هەگبەکەی لە ڕێکەوتو پێشهاتە سەیرەکان خاڵی نییە!

---

٢٧ – Prima donna زاراوەیەکی لاتینیە بەمانای _کەیبانوو) مەبەست لەیەکەمین ژنی گۆرانیبێژی ئۆپێرایە. –ن–

—٣—

میوانخانه بچووکەکەی هورتانس بریتی بوو لە ڕیزە ژوورێکی کۆنو بچووکی ساردی حەمام، ژووری یەکەمیان دووکان بوو، نوقڵو شیرینیو جگەرەو چواله کێویلەو پلیتەی چراو کتێبی ئەلفو بێو مۆمو جەوی تیا دەفرۆشرا، چوار ژوورەکەی تەنیشتی یەکتر ژووری نووستن بوون، حەوشەی پشتەوە چێشتخانەو جل شۆرو کولانەی مریشکو کەروێشکی تیابوو، لەدەوری خانوەکەو لەناو وردە لمەکەدا قامیشی چڕو هەنجیرە کێویلە روا بوون، تێکڕای ئەم شتانە بۆنی دەریاو تەپاڵەو میزیان لێ دەهات، بەڵام جارناجارێك کە هورتانس بەوێدا تێدەپەڕی بەتەواوی بۆنو بەرامەکە دەگۆڕا، وەك بڵێی لەگەنی سەرتاشت لەبەر لووتا خاڵی کرابێت وابوو.

هەر کەجێگایان ڕاخست پاڵ کەوتینو تا بەیانی بەئاگا نەهاتین، لەبیرم نیە چ خەوێکم بینی، بەڵام کە بەئاگا هاتم ئەوەندە لەشم سووكو حەساوەبوو دەتوت تازە لە مەلەکردنی ناو دەریا گەڕابومەوە.

ئەو ڕۆژە یەکشەممە بوو، دەبوو بۆ دەست بەکارکردن لەکانزاکەندا بەیانی ڕۆژی دوایی کرێکار لەگوندەکانی ئەو دەوروبەرەوە بهاتنایە، من ئەوەندەم کات بەدەستەوە بوو کەئەو ڕۆژە سەروبنێکی ناوچەکە بکەمو بزانم ڕێکەوت ئێمەی بەکوێ گەیاندووە. تازە دەیویست بەیان بدات لەمیوانخانەکە هاتمە دەرێ، بەپاڵ باخەکاندا تێپەڕیم، بەدرێژایی کەنار دەریاکەدا ڕۆیشتم، بەپەرۆشەوە لەخاكو ئاوو هەوای شوێنەکەم کاڵیەوە، گیا خۆڕسکەکانم رنی، ناولەپم بۆنی خۆشی پونگەو گوڵەمریەمو نەعنای گرت، چوومە سەر تەپۆڵکەیەكو تەماشای هەر چوار دەورم کرد، دنیایەکی رووت بوو، تەنیا بەردی گرانیتو قسڵی ڕەقو داری ڕەنگ تاڵی خرنوكو زەیتونی سپیو درەختی هەنجیرو مێو هەبوون، لەو دەربەندانەدا کە با نەی دەگرتنەوە داری نارنجو لیمۆو گوێژو، نزیك بەکەناری دەریایش

سەوزەوات هەبوو، لەباشورەوە، دەریاكە هێشتا تووڕەو خرۆشاوو، هەراوو، لەرۆخەكانی ئەفریقاوە دەهات، هێرشی دێناو رۆخەكانی كریتی دەخوارد، لە مەودایەكی زۆر نزیكەوە، دوورگەیەكی زیخەڵانی نزمو بچووك، لەبەر گزنگی خۆردا پرشنگی دەدا.

ئەم دیمەنەی كریت لەبەرچاوی مندا هەر لەپارچە پەخشانێكی سادەو چڕ دەچوو كەتوندوتۆڵ داڕێژرا بێت، دووربێت لەزۆر لەخۆكردن‌و بەسادەترین وشە مەبەستی سەرەكی دەربڕێت، دوور لە گاڵتەجاڕی خۆنواندن‌و ئەملاو ئەولا كردن ئەوەی مەبەستی بوو بەكورتی‌و پوختی دەیوت. بەڵام لەنێوان دێڕە وشك‌و جیدیەكانیدا هەستت بەسۆزێكی چاوەڕوان نەكراو دەكرد، لەدۆڵە كپەكاندا، داری لیمۆو نارنج هەواكەیان پڕ لەبۆنی خۆش دەكرد، لەوێ دوورتر، دەریایەكی بێ سنوور كەسەرچاوەیەكی بێ‌كۆتایی شیعرو ئیلهام بوو.

لەبەر خۆمەوە دەم وت: كریت، كریت،و لەدڵە كوێتیشدا بووم.

لەتەپۆڵكەكە دا كەوتم‌و چوومە كەناری ئاوەكە، كچانێك بەدەسرۆكەی سپی وەك بەفرو جزمەی زەرد رەنگ‌و كراسی هەڵكراوەوە، بەدەم قسەو پێكەنینەوە دەركەوتن، بۆ نوێژ خوێندن دەچوون بۆ دێرێكی داوێن كەلەرۆخی دەریاكەداو لەسپیاتیدا دەبریسكایەوە، وەستام، ئەوانیش كەمنیان بینی لەپێكەنین كەوتن، لەبینینی پیاوێكی غەریبە رەنگیان تەواو تێك چوو، لەسەریانەوە تا پەنجەی پێیان هەڵوێستێكی بەرگری‌كردنیان لەخۆ گرت، بەتووڕەییەوە پەنجەیان لەسەر دوگمەی داخراوی بلوزەكانیان دانا، ترس‌و هەراس كەوتبووە خوێنیانەوە. بەدرێژایی كەنارەكانی كریت كە ڕووبەڕووی ئەفریقایە لەسەردەمانی زووەوە، دزەكانی دەریا هێرشی كت‌و پڕیان كردوەو مەڕو ماڵات‌و ژن‌و منالیان فڕاندووە، ئەو دزانە بە پشتێنە سوورەكانیان دەست‌و پێیان دەبەستن‌و فڕێیان دەدانە گەنجینەی كەشتیەكانەوە، پاشان چارۆكەی كەشتیان هەڵدەداو بۆ فرۆشتنی دیلەكانیان بەرەو جەزایرو ئەسكەندەریەو بیروت دەكەوتنە ڕێ، ئەم دەریایە. بەدرێژایی چەند سەدەیەك پڕ لەگریان‌و ناڵینی كچانێك بوو كەدزەكان پرچی رەشیان دەبڕین‌و فڕێیان دەدایە كەناری دەریاكە، من تەماشام دەكردن كەچۆن لەنزیكمەوە بەواق وڕماوی خۆیان پێكەوە نووساندبوو، وەك ئەوەی بیانەوێت دیوارێك دروست بكەن كەتوانای بڕینی

نەبێت، بێگومان ئەم هەڵوێستە بۆ سەردەمانی پێشوو پێویست بوو، بەڵام ئەمڕۆ هیچ ئەنگێزەیەك بۆ دووبارەبوونەوەی ئەو دیاردە لەناوچوانە نەمابوو.

لەوکاتەدا کە کچەکان بەبەردەممدا تێپەڕین من لەسەرخۆو بەپێکەنینەوە لەسەر ڕێگاکەیان لامدا، ئەوانیش وەك ئەوەی زۆر زوو هەستیان بەوە کردبێت کە سەردەمانێکە ئەو مەترسیە ڕەویوەتەوەو ئەم سەردەمەی ئێمە سەردەمی ئاسایش‌و دڵنیاییە ڕوویان بەپێکەنین پشکوت، ئەو ڕیزە پێکەوە قرساوەی دەتوت ریزی جەنگیە کرایەوە، هەموو پێکەوە، بەدەنگێکی پاك‌و شادەوە سڵاویان لێ کردم. لەو کاتەدا زەنگی دێرە دوورەکە، بەدەنگێکی پڕ لەخۆشی‌و شادمانیەوە ئەو ناوەی پڕکرد.

کەمێك خۆر بەرەو ئاسمانە بێگەردەکە سەرکەوتبوو، من وەك مەلێکی باڵ سپی کە لە کون‌و کەلەبەرێکدا پەنای گرتبێت، لەناو تاوێرە بەردەکاندا هەڵکورمام، کەوتمە تەماشاکردنی دەریاکە، هەستم کرد لەشم لێوان لێوە لەهێزو نوێ بوونەوەو ئامادەی کارکردنە، بیریشم لەگەڵ شەپۆلەکانی دەریادا ببوە شەپۆل‌و، بێ بەرگری کردن هاوئاهەنگی هەڵچوون‌و داچوونی دەریا ببوو.

وردە وردە دڵم پڕبوو، کۆمەڵە دەنگێکی نادیار، وەك فەرمانم پێ بدەن یان بپاڕێنەوە بەجۆشیان دەهێنام، دەمزانی کێ بانگم دەکات. من کەچرکە ساتێك تەنیا دەبووم، ئەم دەنگە لەمندا دەخرۆشاو چاوەڕێی ئەوەی لێ دەکردم کە لە پێش بینیەیە پڕ لە مەترسی‌و ترسناکەکان، ئەو ترسانەی کە شێتیان لەگەڵدایە، بیپارێزم‌و رزگاری بکەم.

من زوو کتێبەکەی دانتی ((هاوڕێی سەفەر))ی هەمیشەییم کردەوە، بۆ ئەوەی گوێم لەودەنگە نەبێت‌و، ئەو شەیتانی ترسە لەخۆم دوور بخەمەوە. کەوتمە پەڕە هەڵدانەوەی کتێبەکە، لێرەدا بەیتێك‌و لەوێوە پەرەگرافێکم خوێندەوەو تەواوی سروودەکانم وەبیرهاتنەوە، دەتوت لەنێو پەڕە ئاگرینەکانەوە شەیتانەکان دەقروسکێنن، لەسەروی ئێرەوە گیانە ماندوەکان هەوڵیان دەدا لەچیایەکی بەرزی پڕ لەهەڵدێرەوە سەرکەون، لەسەروترەوە گیانە پیرۆزەکان، وەك گوڵە ئەستێرە، لەمێرگە زمرۆتیەکاندا دەگەڕان، من لەوێدا، لەو ساختمانە پڕ لەترسەدا سەروخوارم دەکردو، ئازادانە وەك لەماڵی خۆمدا بم، بەدۆزەخ‌و بەهەشت‌و بەرزەخدا دەگەڕام، من کە بەتەواوی شەیدای ئەو شیعرە

سەرسورهێنەرانە ببووم، ئازارم دەکێشاو ئومێدم پەیدا دەکردو لەبەختەوەری ژیانی نەمری چێژم وەردەگرت.

لەپڕا کتێبەکەی دانتیم داخستو سەیری دەریام کرد، یەکێك لەباڵندە ماسی خۆرەکان سنگی بەشەپۆلەکەوە نابوو، لەگەڵ شەپۆلەکاندا سەردەکەوتو دادەکەوتەوە، زۆری چێژ لەوە وەردەگرت کەخۆی دابوە شەپۆلەکان. مێرد منداڵێکی ڕەش داگەڕاوی پێ پەتی، بەدەم وتنی گۆرانیی دەست عاشقانەوە لەکەنارەکەوە دەرکەوت، ڕەنگە زانیبێتی چ سۆزو ناڵەیەك لەو ئاوازەدا هەیە، چونکە هێدی هێدی وەك دەنگی بارە کەڵەشێرێك گریەکی تێدەکەوت.

ساڵانێك، بەڵکو سەدان ساڵ، شیعرەکانی دانتی هەر بەو جۆرە لەوڵاتی خودی شاعیردا دەوتران، وەك چۆن گۆرانیی خۆشەویستی کوڕو کچ بەرەو ئەوینو ئەویندارى دەکێشێت. شیعرە بەسۆزەکانی ئەم شاعیرە فلورەنسیەیش لاوە ئیتاڵیەکانی بۆ ئازادی ڕادەهێنا. بەجۆرێك کەهەموو، نەوە دوای نەوە، بەڵێنیان بەگیانی شاعیر دەدا کەدیلیەتی خۆیان بەئازادی بگۆڕنەوە.

لەپشتەوە گوێم لەپێکەنینێك بوو، یەکسەر لەلووتکە بەرزەکانی شیعری دانتیەوە داکەوتم، ئاورم دایەوە، زۆربام بینی لەپشت سەرمەوە وەستاوەو واپێدەکەنی دەمی تا پەنا گوێی ڕەویبووەوە، بانگی لێکردم:

ئەمە چیە سەرۆك؟ چەند سەعاتێکە بەدواتا ئەگەڕێمو نەمدەزانی لەکوێیت.

کەبینی من بێ دەنگو جووڵەم دیسان دەستی پێکردەوە:

سەعاتێك لەنیوەڕۆ لایداوەو مریشکەکەیش پێگەیشتوە، دەترسم پرزۆڵ بێت، تێدەگەیت؟

تێ دەگەم، بەڵام من برسیم نیە.

زۆربا توند بەسەر ڕانی خۆیدا کێشاو وتی:

برسیت نیە؟ بەڵام تۆ لەبەیانیەوە تائێستا هیچت نەخواردوە، ئاخر دەبێت تۆ خەمی لەشی خۆتت هەبێت، بەزەییت پیا بێتەوە، سەرۆك، شتێکی بدەرێ بیخوات، بەڵێ، دەبێت ئاگات لەجەستەت بێت، چونکە جەستە کەری ئێمەیە، دەزانیت؟ ئەگەر تۆ خواردن

بەکەرەکەت نەدەیت لەناوەڕاستی ڕێگادا بەجێت دێڵێت. من ساڵانێك لەزەتی لەشم بەسووك دەگرتو ئەگەر بمتوانیایە خۆراکیشم لەبەرچاوی خەڵکی نەدەخوارد، وەك ئەوەی بەعەیبی بزانم.

بۆ ئەوەی زۆربا هاواری لێ هەڵنەسێت وتم:

– زۆر چاکە، دێم.

بەجووتە بەرەو گوندەکە بەڕێکەوتین، سەعاتی نێوان ئەو بەردانە وەك سەعاتی ئەوین بەخێرایی بروسکە تێپەڕیبوو، هێشتا من لەخۆمدا هەستم بەهەناسەی گەرمی شاعیری فلۆرەنسی دەکرد، زۆربا بەکەمێك دوودڵیەوە وتی:

سەرۆك، بیرت لەخەڵووزی لینیت دەکردەوە؟

بەپێکەنینەوە وتم: ئەی بۆ دەتەوێت بیر لەچی تر بکەمەوە؟ ئێمە بەیانی دەست بەکار دەبین، دەبوو من حساباتێکم بکردایە.

زۆربا بەلایەکی چاو تەماشای کردمو بێدەنگ بوو، دیسان لەوە گەیشتم کەدەیەوێت تاقیم بکاتەوە، هێشتا لەوە دوودڵ بوو کەبڕوا بەقسەکانم بکات یان نا، هەر بەو ڕاڕاییەوە لێی پرسیمەوە:

باشە ئەنجامی حساباتەکەت چی دەرچوو؟

وادەرچوو کەلەسێ مانگی بەرایی کارماندا دەبێت ڕۆژانە دە تەن خەڵوز دەربێنین بۆ ئەوەی خەرجی کارەکەمان دەربکەیین.

دیسان زۆربا تەماشای کردمەوە، بەڵام تەماشای ئەمجارەیانی هاوکات بوو لەگەڵ دوو دڵیدا، دوای کەمێك وتی:

بۆ ئەم حساباتە چووبوویتە کەناری دەریا؟ ببورە، سەرۆك، بۆیە پرسیاری وات لێ دەکەم، چونکە بەڕاستی من سەری لێ دەرناکەم، کاتێك کەدەکەومە نێو ژمارەوە حەزئەکەم خۆم لەکونێکی ژێر زەوی بنێم تا هیچ شتێك نەبینم، چونکە ئەگەر لەوکاتەدا سەرم بەرزبکەمەوەو چاوم بەدەریا، یان درەختێك، یان بەژنێك –ئەگەر پیریش بێت– بکەوێت ئیتر حسابو مسابو ژمارەو ممارەم وا لەدەست دەردەچێت وەك پەڕو باڵیان گردبێت وایە.

بۆ ئەوەی سەربکەمە سەری پێم وت:

بەڵام زۆربا ئەمە هەڵەی خۆتە، مانای وایە تۆ ناتوانیت بەتەواوی هۆش بدەیتە کارێك.

نازانم، سەرۆك، ئەشێ تۆ ڕاست بکەین، دیارە هەندێك حاڵەت هەیە تەنانەت سلێمانی حەکیمیش.. بڕوانە سەرۆك، ڕۆژێك بەلای گوندێکدا تێپەڕیم، پیرێکی نەوەد ساڵەم بینی نەمامێکی چوالەی دەناشت، پێم گوت:

((ها ، باوەڵێ! داری چوالە دەنێژیت؟)) هەر بەپشتە چەماوەکەیەوە ڕووی تێکردمو وتی: ((بەڵێ، کوڕم، من واکار ئەکەم، وەك ئەوەی کەهەرگیز نامرم)) لەوەڵامدا پێم وت: ((وەڵێ، باوکە، من واکاردەکەم وەك ئەوەی ڕەنگە هەر ئێستا بمرم)) ئێستا سەرۆك، لەم دوانە کاممان ڕاستین؟

سەرنجێکی سەرکەوتوانەی تێگرتمو وتی:

ئاوا وەگیرت دێنم!

من بێدەنگ بووم، ئەشێ دوو ڕێگای سەختو هەڵەت بگەنە لووتکەیەك، ئەو بیرکردنەوەیەی کەهەرگیز مەرگ لەئارادا نیە، یان ئەو خەیاڵەی کەهەموو ساتێك مەرگ لەکەمینایە، ڕەنگە هەردووکیان وەك یەك وابن، بەڵام ئەوکاتەی کەزۆربا ئەو پرسیارەی لێکردم من نەمزانی.

زۆربا بەتەوسەوە وتی:

ها، چی بوو؟ سەرۆك، خۆت سەغڵەت مەکە، ئەم باسە بەئەنجامێك ناگات، با لە مەسەلەیەکی تر بدوێین، من لەم کاتەدا لەبیری نیوەڕۆژەی مریشكو پلاوێکدام کەدارچینیان پێوەکردبێت، ئێستا وەك مەنجەڵی پلاو هەڵم لەسەرم هەڵدەستێت، باجارێ بچینو نانەکەمان بخۆین، پاشان لێی دەدوێین، هەرشتەو کاتی خۆی هەیە، وائێستا برنجمان لەبەردەستایەو پێویستە بیر لەپلاو بکەینەوە، سبەی خەڵووزی لینیتمان دێتە بەرچاوو دەبێت بیر لەویان بکەینەوە، نابێت کار بەناتەواوی بکرێت، تێ دەگەیت؟

چووینە ناودێوە، ژنان لەبەردەرگای ماڵەکانیاندا دانیشتبوونو سەرگەرمی قسەو قسەڵۆك بوون، پیرەمێردەکان خۆیان دابوە سەر گۆچانەکانیانداو بێدەنگ بوون، لەژێردار هەنارێکا کەبەری زۆری گرتبوو پیرێژنێکی لاوازو پەرپووت سەری نەوەکەی ئەدۆزی،

لەبەردەم چایخانەکەدا پیرەمێردێکی بالاڕێکی بەخۆوە، بەلوتێکی قوولێنگیو سیمای پیاوێکی گەورەوە وەستابوو، ئەم پیاوە ناوی (ماڤراندونی)[٢٨] بوو، ریش‌سپیو جێبڕوای گوندو هەر ئەویش کانزای خەلوزی بەکرێ پێدابووین، شەوی پێشتر هاتبووە میوانخانەکەی هورتانس تا بمانباتە ماڵەکەی خۆی. پێی وتین:

بەڕاستی بۆ ئێمە زۆر شوورەییە ئێوە لەمیوانخانەدا بن، وەك ئەوەی کەس لەم گوندەدا نەبێت میوانداریتان بکات.

پیاوێکی بەویقارو قسەکانی دانسقە بوون، ئێمە داوەتەکەیمان رەت کردەوە، ئەو کەمێك دلتەنگ بوو، بەلام زۆری لەسەر نەڕۆشت، لەڕۆیشتنا وتی:

من ئەرکی خۆم بەجێ هێنا، ئێوەیش ئازادن.

دوای کەمێك دوو سەلك پەنیری گەورە، سەبەتەیەك هەنار، گۆزەیەك کشمیش‌و هەنجیری وشك‌و نیو قەڕابە ئارەقی بۆ ناردین، نۆکەرەکەی کەئەم شتانەی لەسەر پشتی کەرەکەی دێنایە خوارێ وتی:

پالەوان[٢٩] ماڤراندونی سلاوی لێ دەکردن‌و دەیوت ئەم شتە کەمانە شایانی رێزی ئەوان نییە، بەلام نیشانەی دلفراوانیو گەورەیی ئەوانە. ئێمە بەهەست‌و نەستێکی خۆشەویستانەوە سلاومان بۆ کوێخای گوند ناردو، نۆکەرەکەیش دەست لەسەر سنگ وتی:

تەمەن‌و گەورەییتان هەر زیاد بێت.

بێدەنگ بوو، زوربا لەبەر خۆیەوە وتی:

یارۆ حەزی بەزۆر بلێی نیە، خۆی بەشت دەزانێت.

وتم: مرۆیەکی سەنگینە، من خۆشم لێ‌دێت.

ئیتر وا گەیشتبووین، پەڕەی لووتی زۆربا لەخۆشیاندا دەلەریەوە.

---

[٢٨] Mavrandon

[٢٩] پالەوان لێرەدا وەرگێڕانی وشەی Capetanە کە بەپیاوانی ئازاو جوامێرو خۆنەویست دەوترێت -ف-

هورتانس خانم که ئێمەی لەبەردەم دەرگاکەدا بینی سووکە قریوەیەکی لێ هەستاو خۆی بەچێشتخانەکەدا کرد.

زۆربا، مێزەکەی لەحەوشەکەداو لەژێر دار مێوێکی رووتا دانا، نانی لەت لەت کرد، شەرابی هێناو قاپو کەوچكو چنگاڵی دانا، پاشان سەری وەرگێڕاو تەماشایەکی زۆڵانەی کردو ئاماژەی بۆ مێزەکە کرد، سێ قاپی دانابوو، لەژێر لێوەوە وتی: دەبینیت، سەرۆك؟

لەوەڵامدا وتم: ئەبینم، زۆڵی فێڵباز، ئەبینم.

بەدەم لێو لستنەوەوە وتی:

گۆشتاوی مریشکی پیر خۆشە، من شتێك لەم بارەیەوە دەزانم.

زۆربا گورجو گۆڵ هەڵدەسوڕا، چاوی پرشنگی ئەداو لەژێر لێوەوە گۆرانیە کۆنەکانی ئەوینی دەوت:

ئەمەیە ژیان، سەرۆك، یەعنی دەبێت مرۆڤ خۆش بژی، بڕوانە من ئێستا وای دائەنێم کەدوای دەقیقەیەکی تر دەمرم، پەلەی ئەوەیشمە مردنەکەم پێش مریشك خواردنەکە نەکەوێت.

هورتانس خانم فەرمانی پێ داین.

بفەرموونە سەر مێز.

مەنجەڵەکەی هەڵگرتو هێنایە بەردەممان، بەڵام کتو پڕ سڵەمیەوە، چونکە چاوی بەسێ قاپەکە کەوت، لەخۆشیا سوور هەڵگەڕا، تەماشایەکی زۆربای کردو، چاوە وردو تیژو شینەکانی درەوشانەوە، زۆربا لەسەرخۆ پێی وتم:

ژنێکی زۆر حەشەریە، ها!

پاشان زۆر بەئەدەبەوە رووی لەخانمەکە کردو وتی:

ئەی فریشتەی جوانی دەریا، ئێمە کەشتی شکاوێکینو دەریا فڕێی داوینەتە قەڵەمڕەوەکەی تۆوە، فەرموو هاو سفرەمانبە.

ژنە گۆرانیبێژی پیری مەیخانەکان باڵەکانی تەواو کردنەوەو، پاشان هێنانیەوە یەك، وەك بیەوێت هەردووکمان لەئامێز بگرێت، ئەوسا بەنەرمو نیانیەکی تایبەتەوە پێچو تاوێکی بەلەشیدا، دەستی بەسەروچاوی زۆرباو پاشان بەهی مندا هێناو لەنجەولارێکی

بەرەو ژوورەکەی خۆی کرد. دوای کەمێک، بەڕووی گەش و خەندانەوە گەڕایەوە، جوانترین بەرگی لەبەرکردبوو، کراسێکی مەخمەڵی سەوزی کۆن کە بەچەند شریتێکی زەردی رەنگ بووردووەوە رازێنرابووەوە، یەخەی کراسەکەی تەواو کراوەو، گوڵێکی دەستکردی سووری لەسەر سنگی دابوو، قەفەزی توتیەکەی بەدەستەوەو، بەدارمێوەکەوەی هەڵواسی، ئێمە ئەومان لەناوەڕاستی هەردووکماندا دانا، زۆربا لای راستیەوەو منیش کەوتمە دەستی چەپی، هەر سێکمان پەلاماری خواردنەکەمان دا، بێ ئەوەی کەسمان قسەیەک بکات، ماوەیەکی زۆرمان تێپەڕاند، جانەوەری لەشمان خۆراکی هەڵدەلووشیو بەشەرابیش تینویەتی دەشکاند، خواردنەکە لەوجودماندا زۆر زوو دەبوو بەخوێن، دنیا لەبەر چاوماندا جوان دەی‌نواند، ئەو ژنەی لەپاڵماندا دانیشتبوو هەموو چرکەیەک لەبەر چاوماندا جوانتر دەبوو، لۆچەکانی دەم‌و چاوی نەدەمان، توتیەکەیش کەبە بەرگی سەوزو زەردیەوە بەرانبەرمان بەدارەکەوە هەڵواسرابوو هەموو جارێک بۆ تەماشاکردنمان دادەنەوی، لەبەرچاوماندا جارێک وەک مرۆیەکی ئەفسوون لێکراو تاوێک وەک گیانی ئەو ژنە گۆرانی بێژە پیرەی بەبەرگی سەوزو زەردەوە دانیشتبوو جوان دەی نواند، دارمێوە بێ گەڵاو داروبارەکەیش لەپڕا بۆڵ بۆڵ ترێ رەشەی دەگرت.

زۆربا چاوێکی گێڕاو باڵی تادواکشانی واڵاکرد، دەتوت حەزی لێیە هەموو شتێک لەئامێز بگرێت، بەسەرسامیەوە دەنگی ڕادا:

چی ئەبینم، سەرۆک؟ کەمرۆ لێوانێکی بچووک شەراب دەخواتەوە واهەست دەکات دنیا بەدەوری سەریا دەسووڕێت، کەواتە سەرۆک گیان ئیتر ئەمەیە ژیان، توو دینت ئەوەی بەسەرمنەوە شۆڕبۆتەوە بۆڵە ترێیە یان فریشتە؟ من ناتوانم باش لێکیان بکەمەوە، یان هەر هیچ نیەو هیچ شتێک وجودی نیە. نەمریشک هەیە، نەفریشتەی دەریاو نەکریت؟ قسە بکە. سەرۆک دەی قسە بکە، ئەگینا شێت دەبم.

زۆربا وردە وردە لەمەستی‌دابوو، مریشکی خواردبوو، بەتاسەوە لە هورتانس خانمی دەڕوانی، چاوی تێبڕیبوو، لەسەریەوە تاپێی، وا لەسنگە هەڵتوقیوەکەی رادەما وەک دەستی پیا بگێڕێت وابوو، چاوە بچووکەکانی خانمە دلۆڤانەکەی ئێمەیش دەدرەوشانەوە. کەیفی بەشەرابەکە دەهات‌و چەند پێکێکی لێ هەڵدابوو، لەوەی دەکرد شەیتانی خواردنەوە

بۆ زەمانی کۆنی گێڕابێتەوە، ئێستا، کەجارێکی تر سۆزو خۆشەویستی تێ گەڕایەوە، هەستایە سەرپێ. دەرگای دەرەوەی میوانخانەکەی داخست تا دێهاتیەکان یان وەك خۆی دەیوت ((وەحشیەکان)) نەیبینن، جگەرەیەکی داگیرساند، لە لووتە بچووکەکەیەوە بەشێوەی لووتی فەرەنسیەکان ئەڵقە ئەڵقەی دووکەڵەکەی بۆ دەرەوە ڕادا.

لەکاتی وادا هەموو دەرگاکانی بوونی ژن دەکرێنەوە، پاسەوانەکان دەنوونو تەنیا وتەیەکی خۆشو دڵگیر بەئەندازەی زێڕ یا خۆشەویستی هێزو توانا دەبەخشن، بۆیە منیش پایپەکەم داگیرساندو ئەم قسە خۆشەم کرد:

هورتانس خانم، تۆ —سارابرنا—ت بەبیری ئێمە هێنایەوە، ئەو کاتەی هێشتا جوان بوو، من هەرگیز بیرم بۆ ئەوە نەدەچوو کەلەجێگایەکی وادوور لەشارستانیەترا ئەم هەموو شیك پۆشیو ناسکیو جوانیو مرۆڤ دۆستیە ببینم، ئەمە کام شکسپیر بوو تۆی هاویشتە ناو ئەم وەحشیانەوە؟

چاوە وردو ڕەنگ پەڕیوەکانی تەواو کردەوەو وتی:

شکسپیر؟ کام شکسپیر؟

هەر زوو بیری بۆ ئەو شانۆگەریانە چوو کەدیبونی، لەچاوتروکانێکا گەڕایەوە بۆ هەموو ئەو ڕستوران و مەیخانانەی کە گۆرانی تیا وتبوون، لەپاریسەوە بیگرە تا بیروت، لەوێوە بەدرێژایی کەناری ئاسیای بچووکدا ڕۆیشت، لەپڕا یادی ئەسکەندەریەی کەوتەوە، لەوێ تەلارێکی گەورەی بینەران هەبوو، چل چراو کورسی مەخمەڵیو ژنو پیاوی پشت رووتو عەترو گوڵاوو لەپڕا پەردە لادرا بوو، قولەڕەشێکی ترسێنەر هاتبووە ژوورێ..

هەوای ئەو بیرهاتنەوەیە دیسان پرسیارەکەی پێ کردەوە..:

کام شکسپیر؟ ئەوەی کە پێیشی دەڵێن ئۆتیللۆ؟

بەڵێ، خۆیەتی، خانمی خانەدان، کام شکسپیر تۆی خستە نێو ئەم تاوێرە بەردە وەحشیانەوە؟

تەماشایەکی ئەملاو ئەولای خۆی کرد، دەرگاکان داخرابوون، تووتیەکە نووستبوو، کەروێشکەماڵیەکان عیشقبازیان دەکردو ئێمەیش تەنیا بووین، ئەو کەقسەکانی من کاریان

تێکردبوو وردە وردە دەرگای دڵی خۆی بۆ کردینەوە، وەك چۆن سندوقچەیەکی کۆنی پڕ لەعەترو نامەی زەردی عاشقانەو بەرگی کۆن دەکەیتەوە.

زمانی یۆنانی چۆن بۆ بهاتایە وا قسەی پێ دەکرد، سەرو گوێی وشەکانی دەشکاند، لەبڕگەکاندا دەوەستاو تێکەڵو پێکەڵی دەکردن، بەڵام ئێمە تەواو تێی دەگەیشتین، هەندێك جار بەزەحمەت پێشمان لەپێکەنینی خۆمان دەگرت، جاری تریش لەبەر ئەوەی زۆرمان بادە خواردبووەوە.. یەکسەر دەمان‌دایە گریان.

باشە (ئەمە تا ئەندازەیەك دەقی قسەکانی ئەو فریشتە پیرەیە کەلەحەوشە عەتراویەکەی خۆیدا پێی وتین) چاکە، منێك کەئێستا لەگەڵ ئێوەدام قسەدەکەم هەرگیز گۆرانی‌بێژی مەیخانەکان نەبووم، نا، هەرگیز، بەڵکوو هونەرمەندێکی بەناوبانگ بووم، من کراسو ژێرکراسێکی ئاوریشمیم لەبەر دەکرد کەلەشێوەی تۆڕی ئەسڵدا دروست کرابوون، بەڵام خوا خۆشەویستی بگرێت کە..

هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشاو جگەرەیەکی تری بەجگەرەکەی زۆربا داگیرساندا.

من عاشقی دەریاسالارێك بووم، ئەوسا کریت لەجۆشو خرۆشی شۆڕشا بوو، پاپۆڕە جەنگیەکانی وڵاتە گەورەکان لەبەندەری ((سودا))[٣٠] دا لەنگەریان گرتبوو، چەند ڕۆژێك دوای ئەوە، منیش هەر لەوێ لەنگەرم گرت، ئای چ شکۆمەندیو مەزنیەك بوو! خۆزگا ئێوەیش ئەو چوار دەریاسالارە ئینگلیزیو فەرەنسیو ئیتاڵیو روسیەتان دەدی کەهەموویان میداڵو نیشانی زێڕیان پێوە بوو، پێڵاویان دەبریسکایەوەو، وەك کەڵەشێریش پەڕێکیان بەکڵاوەکانیانەوە کردبوو، لەو کەڵەشێرە گەورانەی هەریەکەیان هەشتا تا سەد کیلۆ دەبن. چ ریشێکیش! لوول، نەرم وەك ئاوریشم، گەنم رەنگ، خۆڵەمێشی، زەرد، چ بۆنێکی خۆشیان لێ‌دەهات! هەر یەکەیان عەترێکی تایبەتی خۆی هەبوو، منیش هەر بەو جۆرە شەوانە بەبۆنی عەترەکانیان لەیەکتریم جیا دەکردنەوە. ئینگلیزەکە بۆنی کۆلۆنیای لێ دەهات. فەرەنسیەکە بۆنی وەنەوشە، روسیەکە بۆنی میسكو ئیتاڵیەکە... ئاه . بڵێم چی! بۆنی ئیتاڵیەکە وەك بۆنی عەنبەر وابوو، ئای لەو ریشانە! خواگیان، چ ریشێك

٣٠. Sauda

بوون! ((ئێمە زیاتر لە كەشتی فەرماندەییا كۆدەبووینەوەو لە بارەی شۆڕشەوە دەدواین، دوگمەی كراسەكانیان هەموو كرابوونەوە، منیش تەنیا كراسێكی تەنكی ئاوریشمینم لەبەر دەكرد كەبە لەشما دەنووسا، چونكە ئەوان كراسەكەمیان بەشەمپانیا تەڕ دەكرد، وەرزی هاوین بوو، تێ ئەگەن! باشە، هەموو باسی شۆڕشیان دەكردو لەمەسەلە گرنگەكان دەدوان، من ڕیشم دەگرتن‌و داوام لێ دەكردن كریتیە ئازیزو بێچارەكان گوللەباران نەكەن. ئێمە لەدوورەوە بەدووربین كریتیەكانمان بەسەر تاشە بەردەكانی نزیك بە ((كانە))[٣١] وە دەبینی كەبەمێرووله دەچوون‌و هەموو پانتۆڵی شین‌و چەكمەی زەردیان لەپێدابوو، هاواریان دەكردو هووڕایان دەكێشا، ئاڵایەكیشیان پێ بوو...))

قامیشەڵانی چواردەوری حەوشەكە كەوتنە جووڵە، پیرێژنە خەبات گێڕەكە ترساو بێدەنگ بوو، لەنێو قامیشەكانەوە چاوە شەیتانیەكان دەبریسكانەوە، منداڵانی گوند بەو ئاهەنگە خۆشەی ئێمەیان زانیبوو، بۆیە كەوتبوونە چاودێریمان، ژنی گۆرانی‌بێژ هەوڵیدا هەستێت بەڵام نەیتوانی، چونكە زۆری خواردبوەوەو زۆریشی خواردبوو، ناچار بەو هەموو ئارەقەی لەشیەوە دانیشتەوە، زۆربا بەردێكی هەڵگرت‌و لەمناڵەكانی كردە هەرا، پاشان كورسیەكەی خۆی كەمێك نزیكتر كردەوەو وتی:

بەردەوامبە، گوڵەكەم، بەردەوامبە، ماڵەكەم.

بەڵێ، من لەگەڵ دەریا سالارە ئیتاڵیەكەدا زیاتر هەستم بەئازادی خۆم دەكرد. كەڕیشم دەگرت پێم دەوت: ((كاناڤارۆی ئازیزم —ناوی كاناڤارو بوو— كاناڤارۆی كوڕژیلەم، توو خوا، نەبم.. بم.. بكەو نە تاق‌و تریق))

((منێك كەئێستا قسەتان بۆ ئەكەم چەند كریتیم لەدەست مەرگ ڕزگاركردبێت چاكە! چەند جار تۆپ هاوێژەكان لەتۆپ هاویشتنا بوون كە من یش دەریا سالارم دەگرت‌و نەمدەهێشت بم.. بم.. بكات. بەڵام كێ ڕێز لەمن دەگرێت؟ لەباتی نیشان‌و میداڵ...))

هورتانس خانم لەبێ ویژدانی خەڵکی تووڕە بوو، بەمستە نەرمو بچووکو پڕ لە چرچو لۆچەکەی بەسەر مێزەکەیدا کێشا، زۆربا دەستە فێربوەکانی بۆسەر ئەژنۆ گراوەکانی خانم درێژکردو،بەهەڵچوونێکی خوکردەوە ئەژنۆی گرتو هاواری کرد:

بوبولینا[٣٢] کەم، تکایە تۆیش بم.. بم مەکە!

خانمە خاسەکەمان وەك مریشك کەوتە کرتە کرتو وتی:

دەستت لادە، تۆ بەکێم دەزانیت؟

تەماشایەکی تێکشکاوانەی زۆربای کرد:

پیرەی فێڵباز وتی: خەم مەخۆ، بوبولیناکەم، خوایەك بەو سەرەوە هەیە، مەترسە ئازیزی دڵم، ئێمەیش لێرەین.

فریشتەی پیر چاوە تیژو شینەکانی هەڵبڕیو تووتیە سەوزەکەی بینی لەقەفەزەکەدا نوستبوو، عاشقانە کەوتە گمەگمو لەژێر لێوەوە وتی:

– کاناڤارۆکەم، کاناڤارۆ، کوڕژیلەکەم.

تووتیەکە کەگوێی لەدەنگە ئاشناکە بوو چاوی کردەوە، خۆی بە شیشی قەفەزەکەیەوە ئاوێزان کردو بەدەنگێکی گیراوەوە کەهەر لەدەنگی مرۆڤێك دەچوو لەکاتی خنکاندا کەوتە هاوارکردن:

– کاناڤارۆ، کاناڤارۆ.

زۆربا بەدەم دەست خستنەوە سەر ئەو ڕانانەی کەئەو هەموو خزمەتەیان کردبوو و، ئەمیش دەیویست بیانکاتە هی خۆی، بەدەنگی بەرز وڵامی تووتیەکەی دایەوە: بەڵێ.

گۆرانی بێژە پیرەکە لەسەر کورسیەکەی سوڕاو، جارێکی تر دەمە بچووکو چرچەکەی کردەوەو وتی:

منیش ئازایانە دەستەو یەخە جەنگیوم، بەڵام ڕۆژە ناخۆشەکان زوو گەیشتن، کریت ئازادبوو، کەشتیە جەنگیەکان فەرمانی گەڕانەوەیان پێ درا، من هەر چوار ریشەکەم گرتو هاوارم کرد: ((ئەبێ من چ قوڕێك بەسەر خۆمدا بکەم؟ ئێوە کە من لێرە جێ دەهێڵن بۆ

---

[٣٢] Bouboulin a ژنە قارەمانی شەڕی ئازادی یۆنان (١٨٢١-١٨٢٨) وەك کارناریسو میولیس ئازایانە لەدەریادا جەنگی.

کوێ دەچن؟ ئاخر من فێری نازو نیعمەت بووم، خووم بەشامپانیو مریشکی سوورەوە کراوەوە گرتوە، لەگەڵ سەلامی سەربازە دەریاوانە لاوەکاندا ڕاهاتووم، ئێستا کەلەچوار دەریاسالاری گەورەی خۆم بێوەژن دەکەوم چیم بەسەر دێت؟))

((بەڵام ئەوان پێ دەکەنینو گاڵتەیان پێ دەهات، داد لەدەست ئەو جۆرە پیاوانە! ئەوان منیان نوقمی لیرەی ئینگلیزیو ئیتاڵیو ڕۆبڵی روسیو دراوی ناپلیۆنی کردبوو، من پارەکانم دەخستە ناوگۆرەویو، یەخەی کراسەکەمو پێڵاوەکانمەوە، دواشەو ئەوەندەم شیوەنو گریان کرد کەدەریاسالارەکان دڵیان پێم سووتا، ئەو حەمامەیان پڕ لەشامپانیا کردو منیان تێخست —ئێمە لەگەڵ یەکتردا زۆر راهاتبووین— پاشان هەموو شامپانیاکەیان لەچاوی من خواردەوەو سەرخۆش بوون، دوای ئەوەیش چراکانیان کوژاندەوە...

((سەر لەبەیانی ئەو شەوە بۆنی هەموویانم گرتبوو، بۆنی وەنەوشە، بۆنی کۆلۆنیا، بۆنی میسكو بۆنی عەنبەر، من هەر چوار دەوڵەتە گەورەکەم گرتبوو، — ئینگلیزو فەرەنساو ڕوسو ئیتاڵیا— ئالێرەدا گرتبوومن، بەئەژنۆکانم، ئاوام لێ دەکردن! تەماشاکەن، ئاوا))

لێرەدا هورتانس خانم باسکە کورتو گۆشتنەکانی لێك کردنەوەو، لەخوارەوە بۆ سەرەوە بەرزی کردنەوە، هەر تەواو، وەك لەسەر ڕانی سەما بەمنداڵێك بکات وابوو.

— تەماشامکەن، ئابەم جۆرە! ئاوا!.

((کەخۆر هەڵهات دەستیان بەتۆپ تەقاندن کرد، من درۆ ناکەمو بەشەرەفم سوێند دەخۆم ئەمە ڕاستە، دوایی، بەلەمێکی سپی لەگەڵ دوانزە سەوڵ لێدەردا هاتن، منیان هەڵگرتو بردمیانە کەنار دەریاکە))

دەستەسڕە چکۆلانەکەی دەرهێناو هێند بەکوڵ گریا دانەدەمرکایەوە، زۆربا کەتەواو بەتەنگ هاتبوو هاواری لێ هەستا:

چاوت بنووقێنە، بوبولیناکەم، چاوت بنووقێنە، ماڵەکەم، من کاناڤارۆم،

خاتوونە دلۆڤانەکەمان جارێکی تر بەنازەوە لەزوربای خوڕی:

پێم وتیت دەستت لادە! تەماشا کە! کوا نیشانە ئاڵتونیەکانی سەرشانت؟ کڵاوە سێ گۆشەکان؟ ڕیشە عەتراویەکان؟ ئاهـ.. ئاهـ...

بەهێواشی دەستی زۆربای گوشیو دیسان کەوتەوە گریان.

هەواکە ساردی کردبوو، کەمێك بێدەنگ بووین، لەپشت قامیشەکانەوە دەنگی دەریا ئارامو لەسەرخۆ دەهات، بایەکە خستبووی‌و خۆر ئاوا ببوو، دوو قەلەڕەشی شەوگەڕ بەسەرماندا تێ‌پەڕین‌و دەنگی باڵیان هەر لەدەنگی دادڕینی پارچەیەك ئاوریشم دەچوو، وەك ئەوەی کەکراسە ئاوریشمینەکەی خانمی گۆرانی‌بێژ بدڕێت وابوو.

زەردەی خۆرئاوا دەتوت گەردی ئاڵتوونەو بەسەر حەوشەکەدا پەخش کراوە.. گوارە پلپلەدارەکەی هورتانس خانم رەنگی ئاگری گرتبوو، شیباکەیش هێنابوویە سەما، وەك بیەوێت بفڕێ‌و ئاگر بەسەر سەری دراوسێکاندا بکات وابوو. سنگە نیوەکراوەکەی، ئەژنۆ لێك هەڵاوێردەکانی کەپیری شل‌و شاوی‌کردبوون، چرچی ملی، دەمپا (نەعل) کۆنەکانی بەزەردەی خۆرئاوابوونە کە ڕەنگی زێڕیان گرتبوو.

فریشتە پیرەکەمان لەرزی، چاوەبچووکەکانی کەفرمێسك‌و شەراب سووری کردبوون‌و نیوەکراوەبوون جارێك تەماشای من‌و تاوێك تەماشای زۆربای پێ ئەکردن. زۆربا بەلێوی وشکەوە لەسنگی رامابوو، تادەهات دنیایش تاریکتر دەبوو، ئەو وەك لەپرسیار لەخۆکردندا بێت سەیری هەردووکمانی دەکرد، دەتوت لەهەوڵی ئەوە دایە بزانێت کاممان (کاناڤارۆ)ین.

زۆربا کە ئەژنۆی بەئەژنۆیەوە نووساندبوو، بەئارەزوویەکی پڕەوە دەمی نابووە پەناگوێیو دەی‌گوت:

– بوبولیناکەم، بێگومانبە نە خواهەیەو نەشەیتان، سەرەبچوکەکەت هەڵبڕە، دەستە جوانەکانت بخەرە سەر ڕومەتت‌و گۆرانیەکمان بۆ بڵێ. بژی ژیان‌و مەرگ بۆ مردن.

زۆربا گڕی گرتبوو، لەوکاتەدا کەدەستی چەپی بەسمێڵیا دەهێنا دەستی ڕاستی بەسەر لەشی گۆرانی بێژە سەرخۆشەکەوە بوو، قسەی دەکردو هەناسە بڕکێی بوو، چاویشی شلوێ بوو، بێگومان ئەم ژنەی کەئەو ئێستا لەبەرانبەر خۆیدا دەی‌بینی ئەو پیرێژنە مۆمیاکراوەی پێشوو نەبوو کەئارایشتێکی خەستی دەکرد، بەڵکوو ئەو ((ڕەگەزی مێ))یە بوو کەئەو ئاسایی بەژنی دەوت. ئیتر مەسەلەکە تەنیا کەسێك‌و دەم‌و چاوێك نەبوو، ئیتر گەنج یان پیرو ناشیرین، یان جوان گرنگ نەبوون. ئێستا لەپشت دەم‌و چاوی

هەر ژنێکەوە وێنەی پیرۆزو پڕ لەنهێنی ((ئەفرودەیت))[٣٣] هەیە. ئەمە ئەو دەمو چاوە بوو کەزۆربا دەیبینیو قسەی لەگەڵدا دەکردو حەزی لێیبوو. شێوەی هورتانس خانم تەنیا دەمامکێکی کاتیو شەفاف بوو کەزۆربا دەیدڕی بۆ ئەوەی دەمی نەمری ماچ بکات.

زۆربا جارێکی تر بەهەناسەی گیرو پاڕانەوە ئامێزەوە وتی:

– ئەو گەردنە بەفرینەت راست بکەرەوە،ماڵەکەم، تێ چریکێنە بەگۆرانی.

پیرەی گۆرانیبێژ روومەتی نایە ناو دەستە لاوازەکانیەوە کەجل شتنی زۆر شەقار شەقاری کردبوو، چاوی خوماربوو، ناڵەیەکی بەسۆزو وەحشیانەی لێ هەستاو، لەکاتێکدا کەبەچاوە شلویو نیوە کوژاوەکەیەوە تەماشای زۆربای دەکرد – دیاربوو ئەوی هەڵبژاردبوو– دەستی بەو گۆرانیە کرد کەخۆی حەزی لێ بوو و، هەزاران جاریش وتبووی:

لەکۆتایی رۆژانی تەمەنما

بۆ بەتۆ گەیشتم...[٣٤]

زۆربا لەجێگاکەی راست بوەوە، رۆیشتو سەنتورەکەی هێنا، وەك تورکەکان لەسەر زەویەکە دانیشت، سازەکەی لەکیسەکە دەرهێنا، نایە سەر ئەژنۆیو دەستەزلەکانی درێژکرد.

– ئاخ.. ئاخ بوبولینا، چەقۆیەك بهێنەو سەرم ببڕە.

کەتاریکی داکەوتو، ئەستێرەکانی دوای خۆرئاوابوون لەسوچو کەنارەکانی ئاسمانەوە دەرکەوتن، دەنگی سەنتوری شادو دڵنەواز بەرزبوەوە، هورتانس خانم کە تاگەرووی برنجو مریشكو بادامی برژاوو شەرابی تێکردبوو.. مەستو قورس کەوتە سەر شانی زۆرباو ئاخێکی قووڵی هەڵکێشا، بەهێواشی خۆی بە کەلەکە ڕەقەکانی زۆرباوە قرساند، باوێشکی داو دیسان ئاخی هەڵکێشایەوە.

زۆربا ئاماژەی بۆ من کرد، بەچرپە پێی وتم:

– سەرۆك، ئەم ژنە زۆر حەشەریە، ها! وەرە وەك هاوڕێیەکی باش بڕۆو بەتەنیا جێمان بهێڵە.

---

[٣٣] Aphrodaitخوای خۆشەویستی لای یۆنانیەکان، کەهەمان ئەستێرەی زوهرەیە.

[٣٤] شیعرەکە لەدەقە ئەسڵیەکەدا بەزمانی فەرەنسیە.

—٤—

بەیانی کەچاوم کردەوە زۆربام لەبەرانبەر بەخۆم دی، لەخوار تەختی نووستنەکەیەوە لەسەر هەردوو ئەژنۆی دانیشتبوو، جگەرەی دەکێشاو لەبیرکردنەوەیەکی قوڵدا بوو، چاوە خڕو بچووکەکانی بڕیبووە پەنجەرەکەی بەرانبەری کەلە بەر رووناکی گزنگدا رەنگی سپی شیری لەخۆ گرتبوو، چاوی ئاوسابوو، ملە ڕووتو لاوازە زۆر درێژەکەی کەهەر بەملی باڵندەڕاویەکان دەچوو لەیەخەکەیەوە هاتبووە دەرێ.

شەوی پێشتر من زوو ماڵئاوایم لێ کرد، زۆربام لەگەڵ ئەو فریشتە پیرەدا تەنیا هێشتەوە، لەکاتی رۆیشتنما پێم وتبوو:

زۆربا، من دەڕۆم، تۆ ڕابوێرە، هیوادارم خۆشت لێ بگوزەرێت.

ئەویش لەوەڵامدا وتبووی:

خوات لەگەڵ، سەرۆك، لێگەڕێ با ئێمە کارەکەمان ئەنجام بدەین، شەوباش، سەرۆك، خەوێکی خۆش.

لەوە دەچوو کاری خۆیان کردبێت، چونکە من وەك لەخەودا گوێم لەدەنگێك بووبێت وەك گمەگمی کۆترو دەنگی هەناسەبڕکێو، تاوێکیش هەستی ئەوەم کردبێت کەژوورەکەی تەنیشتم ئەوەندە تەکانی تیا دەدرێت کەوتبێتە لەرزین، پاشان خەوم لێ کەوتبووەوە، ماوەیەکی زۆری دوای نیوەشەو، زۆربا لەسەر خۆو بەپێی پەتی بۆ ئەوەی من بەئاگا نەیەم گەڕایەوە ژوورەکەو لەسەر تەختی نووستنەکەی ڕاکشا. ئێستا، لەم بەرەبەیانەدا هەر لەوێ دانیشتبوو، هێشتا نیگاکانی چاوی خامۆش بوون، بەڵام لەڕووناکیەکی دووری دەڕوانی، لەوە دەچوو هێشتا سست بێت، هێشتا چاوی خەواڵوو بوون، هێورو بێ دەربەست خۆی دابوە دەست شەپۆلێکی خەستی هەنگوین ئاسا. دنیا، لەخاكو ئاوەوە بیگرە تا بیرو مرۆڤەکان، هەموو بەرەو دەریایەکی دوور دەڕۆیشتنو، زۆربایش شادو بێ خەم، بێ هیچ بەرەنگاریو بێ هیچ چۆنو بۆچیەك لەگەڵ دنیادا دەڕۆشت.

ورده ورده گونده‌كه به‌ئاگا ده‌هات، چونكه هه‌راو زه‌نای كه‌ڵه‌شێر به‌رازو گوێ درێژو خه‌ڵكی له گوێ ده‌گه‌ڕان، ویستم له‌سه‌ر ته‌ختی نووستنه‌كه بێمه خواریّو هاواربكه‌م:

((ده‌ی زۆربا، ئه‌مڕۆ رۆژی كاری ئێمه‌یه)) به‌ڵام منیش كه‌بێ چه‌ندو چوون خۆم دابوه ده‌ست نهێنیی‌و سرووته‌كانی ئه‌و به‌ره به‌یانه هه‌ستم به‌تام‌و چێژێكی زۆر ده‌كرد. له كاتێكی وا ئه‌فسوناویدا، هه‌موو ژیان وه‌ك په‌رێكی سووك‌و جوان خۆی نمایش ده‌كات، زه‌وییش وه‌ك ئه‌و په‌ڵه هه‌ورانه‌ی به‌ده‌م باوه شه‌پۆل ده‌ده‌ن‌و شێوه‌یان ده‌گۆڕێت ئه‌ویش هه‌ر له گۆڕاندایه..

سه‌یری جگه‌ره كێشانه‌كه‌ی زۆربام كردو خۆیشم حه‌زم لێ بوو دووكه‌ڵێك بكه‌م، ده‌ستم درێژ كرد، پایپه‌كه‌م هه‌ڵگرت‌و به‌تاسه‌یه‌كی زۆره‌وه لێم ڕوانی، پایپه‌كه‌م پایپێكی گه‌وره‌و به‌قیمه‌تی ئینگلیزی بوو، هاوڕێیه‌كم به‌دیاری دابومیه—ئه‌و هاوڕێیه‌م چاوی شین‌و به‌لای سه‌وزدا ده‌یڕوانی‌و قامكی جوان‌و باریك بوون— ئه‌مه ڕووداوی ساڵانێكی پێشتر، له ده‌ره‌وه‌ی وڵات‌و له نیوه‌ڕۆیه‌ك دابوو، هاوڕێكه‌م كه خوێندنی ته‌واو كردبوو عه‌سری ئه‌و ڕۆژه بۆ یۆنان ده‌گه‌ڕایه‌وه، پێی وتم:

((وه‌ره واز له جگه‌ره كێشان بێنه، تۆ جگه‌ره‌یه‌ك پێ ده‌كه‌یت، نیوه‌ی ده‌كێشی‌و نیوه‌كه‌ی تری وه‌ك سۆزانیه‌ك كه ئیتر كارت پێی نه‌مابێت فرێی ده‌ده‌یت، ئه‌مه خه‌جاڵه‌تیه، وه‌ره‌و ببه‌ره هاوده‌می پایپ، چونكه پایپ ژنێكی وه‌فاداره، كه بۆماڵ ده‌گه‌ڕێیته‌وه ئه‌و بێ ئه‌وه‌ی له جێگای خۆی ترازابێت چاوه‌ڕێته، تۆ دای ده‌گیرسێنی‌و له دووكه‌ڵه‌كه‌ی ڕاده‌مێنیت‌و یادی منیش ده‌كه‌یته‌وه)).

نیوه ڕۆ بوو كه له مۆزه‌خانه‌ی به‌رلین به‌ده‌ركه‌وتین، هاوڕێكه‌م بۆ ئه‌وه چو بوه ئه‌وێ تا جارێكی تر دیده‌نی له‌تابلۆ خۆشه‌ویسته‌كه‌ی بكات، تابلۆی ((جه‌نگاوه‌ر))ی ڕامبیرانت[٣٥] كه كڵاو خوده‌یه‌كی برونزی له‌سه‌ردایه‌و ڕوومه‌تی تێك قوپاون. نیگایشی پڕ له ئازارو ئیراده‌یه ئه‌و هه‌ر به‌و جۆره‌ی كه له‌و جه‌نگاوه‌ره سه‌ركێش‌و نائومێده ڕامابوو

---

[٣٥] Remborandt شێوه‌كارو هه‌ڵكۆڵه‌رو هێڵ كاری ناوداری هۆڵه‌ندی (١٦٠٦-١٦٦٩) كه ده‌وڵه‌مه‌ندی ڕه‌نگ تێكه‌ڵ كردن‌و هونه‌ری سێبه‌رو روناكی له‌كاره‌كانیدا كردیه گه‌وره‌ترین مامۆستای شێوه‌كاری كلاسیك، ئه‌و شاكاری زۆری له مۆزه‌خانه‌كانی ئه‌ورووپادا هه‌یه. و-ف

لەبەرخۆیەوە وتی: ((ئەگەر لە هەموو تەمەنما کارێکی چاکی ئینسانیم لەدەست بێت ئەوا خۆم بەقەرزارباری ئەم کارە هونەریە دەزانم)).

هەردووکمان لە حەوشەی مۆزەخانەکەدا وەستاین و پاڵمان بە ستونێکەوەدا، بەرانبەر پەیکەرێکی برونزی ژنێکی ڕووت بوو، بەجوانیەکی فرەوە سواری ئەسپێکی کێوی ببوو، باڵندەیەکی بۆری گچکە کە لە کلك هەڵتەکێنە دەچوو، کەمەکێك بەسەر ژنە ئەسپ سوارەکەوە نیشتەوە، تەماشایەکی ئێمەی کرد، چەند جارێك کلکی هەڵتەکاند، دوو سێ جار دەنگێکی ناخۆشی لێ بەرز بوەوە، ئەنجا باڵی پێکداداو ڕۆیشت.

مووچڕکێکم پیاهات، سەیری هاوڕێکەم کردو پێم وت:

—تۆ گوێت لە دەنگی باڵندەکە بوو؟ لەوەی دەکرد بیەوێت شتێکمان پێ بڵێت.

هاوڕێکەم زەردەخەنەیەکی کرد، لەوەڵامدا شیعری گۆرانیەکی میللی خوێندەوە کە دەڵێت: *((ئەمە باڵندەیە، لێی گەڕێ با گۆرانی بڵێت، ئەمە باڵندەیە، لێی گەڕێ با قسەبکات)).*

نەم زانی چۆن لەو چرکە ساتەدا، لەگەڵ هەڵاتنی خۆرو لەو کەناری دەریای کریتەدا، بەو تاکە شیعرە خەم ئەنگێزە یاوەریەکم بیر کەوتەوە کە وەك تاڵاو ڕژایە گیانمەوە؟.

لەسەر خۆ پایپەکەم پڕ لە تووتن کردو دام گیرساند لەگەڵ خۆمدا بیرم لەوە دەکردەوە کە لەم دنیایەدا هەرشتێك مانایەکی نهێنی خۆیشی هەیەو، مرۆڤو گیاندارو درەختو ئەستێرەکان بێجگە لە چەند هێڵێکی هیرۆ گلیفی[٣٦] هیچی تر نین، ئەو کەسەی دەیان خوێنێتەوەو پەی بەمانایان دەبات بەڕواڵەت شادمانە، بەلام ئای کە بەد بەختە کە تەماشایان دەکات شتێك لە مانایان تێ ناگات، وا دەزانێت ئەمانە مرۆڤو گیانلەبەرو درەختو ئەستێرەن، بەلام سالانێکی دواتر، یەعنی زۆر درەنگ لەمانا ڕاستەقینەکانیان تێ دەگات. ئەو جەنگاوەرە کلاو برونزیە، ئەو هاوڕێیەم کە لەبەرهەتاوی ئەو نیوەڕۆیەدا پاڵی بە ئەستووندە کەوە دابوو، ئەو کلك هەڵتەکێنەیەی بە زمانی جیك جیك شتێکی بە ئێمە وت، ئەو شیعری گۆرانیە خەماویە، لەهەموو ئەمانەدا من ئەمڕۆ وای بیر لێدەکەمەوە کە مانایەکی شاراوە هەبێت ، بەلام چ مانایەك ؟

---

[٣٦] Hieroolyphes نووسینی میسری کۆن، لێرەدا مەبەستی هەرشتێکە کە بەنهێنی و تەمو مژاوی بێت و زلنینی ئاسان نەبێت. و-ف

من چاوم هەر بە دوای ئەو دووکەڵەوە بوو کە لەو تاریك و ڕوونی بەیانەدا لەسەرخۆ لوولی دەخواردو ڕوونتر دەبووەوە ، گیانیشم بەرەو دووکەڵەکە دەڕۆشت و لە ئەڵقە شینەکانیدا دەتوایەوە ، ماوەیەکی زۆر تێپەڕیو من بێ کۆمەکی مەنتیق و بە یەقینێکی تەواوەوە هەستم کرد کە دنیا چیە و چۆن دروست بوەو چۆنیش لە ناو دەچێت ، هەر لەوەی دەکرد کە بێ لە قسەی هەڵخەڵەتێنەرو بێ ئەوەی بەشداری یاریەکی پاڵەوان بازیانەی فیکری هاتبم جارێکی تر نوقمی (بودا) بووبێتمەوە ، دەت وت دووکەڵەکە پوختەی دەستوورەکانی بودایە و مارپێچە تواوەکانیش خودی ئەو ژیانەن کە لە سەرخۆ وئاسان بەرەو نوختەی کۆتایی و بەختەوەری نیرڤانا[٢٧] دەچن .

(ئیتر بیرم نەدەکردەوە ، لە هەڵپەی هیچ شتێکدا نەبووم و هیچم نەبوو ، ئیتر لەیەقینی تەواودا دەژیام[٢٨]).

هەناسەیەکی لەسەرخۆمدا، وەك ئەوەی ئەم هەناسەیە منی هێنابێتەوە لای چرکە ساتی ئێستا تەماشای دەوروبەری خۆم کرد ، ئەم کوختە تەختە نابوودە ، ئەم ئاوێنە بچووکەی بە دیوارەکەیەوە هەڵواسراوە و تازە یەکەم پرشنگی خۆر کەوتبوە سەری و بریسکەی دەدا .

بەرانبەرم زۆربا لەسەر دۆشەکەکەی دانیشتبوو ، پشتی لە من و جگەرەی دەکێشا .

لە پڕا ڕۆژی پێشوم بەهەموو خۆشی و تاڵیەکیەوە هاتەوە یاد ، عەترە بۆن خۆشەکەی وەنەوشەو کۆڵۆنیا و میسك و عەنبەر و تووتیەکەیش، یان ئەو گیانلەبەرە تا ڕادەیەك مرۆڤەی کە ببوە تووتی و باڵی بە شیشی قەفەزەکەیدا دەکێشا و ناوی عاشقێکی کۆنی

---

[٢٧] Nirvana– بە زمانی سانسکریتی بە مانای نەمان یان بەدبەختیە ، لە ئاینی بودادا قۆناغی تەواو پێگەیشتن و لە ناو چوونە ، ئەمەیش لە ئەنجامی دامرکاندنی ئاگری ئارەزووەکانی نەفسەوە بە دەست دێت کە مرۆڤ دەگەیەنێتە بەختەوەری ئەودنیا .

[٢٨] –ڕستەی نێوان کەوانەکە لەوەرگێڕانە ئینگلیزیەکەدا نەبوە و لەوەرگێڕانە فەرەنسیەکەوە وەرگێڕاوە . –ف–

دێنا ، ئەو کۆنە کەشتیە[٣٩] کە تاقە پاشماوەی دەزگای جەنگیەو چیرۆکی شەڕە کۆنەکانی دەریای دەگێڕایەوە .

زۆربا گوێی لە دەنگی هەناسە هەڵکێشانەکەم بوو، سەری بەرەو لای من وەرگێڕاو لە سەرخۆ وتی :

-سەرۆك ، شێوەی ڕەفتاری ئێمە زۆر خراپ بوو ، زۆر خراپ، تۆ کردتە گوڵمەزو منیش هەروا ، ئەو داماوە هەستی پێ کرد ، دواییش ، بێ ئەوەی تۆ قسەیەکی خۆشی لەگەڵدا بکەیت بە جێت هێشت و ڕۆیشتیت .وەك ئەوەی پیرێژنێکی هەزار ساڵە بێت ، بەڕاستی شەرمە، ئەمە بێ ئەدەبیە، سەرۆك، لێم ببوورە پێت بڵێم کە ئەم جۆرە ڕەفتارە کاری پیاو نیە،هەرچیەك بێت ئەو ژنە،وانیە؟ مرۆڤێکی لاوازی چاو بەفرمێسکە، باش بوو لە بەردڵی ئەو من مامەوە.

بە پێکەنینەوە پێم وت:

-ئەم قسانە چیە دەیانکەیت زۆربا ؟ بە ڕاستی تۆ لەو باوەڕەدایت کەهەموو ئافرەتێك ئەمەی لەژێر سەردایە ؟

-بەڵێ سەرۆك، باوەڕت بێت ژنان بێجگە لەوە هیچیان لە مێشکا نیە ، من هەمووجۆرو هەموو ڕەنگێکم دیوەو لەگەڵیاندا بووم و زیاد لە خەڵکی تر لەم بارەیەوە ئەزموونم هەیە . ژن بێجگە لەم باس و خواسە هیچی تری لە سەردانیە، لە منی وەربگرە کە ئەو گیانلەبەرێکی نەخۆشەو زۆر زوودەداتە گریان، ئەگەر پێی نەڵێی خۆشت دەوێت و دەتەوێت دەگری ، ئەشێ داخوازێت ڕەت بکاتەوە، ڕەنگە هیچ خۆشیی لێت نەیەت ، تەنانەت ڕەنگە لێشت بێزار بێت ، ئەمە باسێکی ترە ، بەڵام هەموو ئەو پیاوانەی کە ژن دەبینن دەبێت خوازیاری بن ، ژنی داماو ئەوەی دەوێت ، بۆیە لەسەر پیاو پێویستە کە هەوڵی دڵخۆش کردنی بدات .

((من نەنکێکی تەمەن نزیك بە هەشتا ساڵیم هەبوو ، سەرگورشتەی ئەم پیرێژنە چیرۆکێکە بۆ خۆی ، گرنگ نیە ، ئەمەیش هەر بۆخۆی چیرۆکێکە ، بەڵێ تەمەنی نزیك بە

[٣٩] - مەبەست لە (کۆنە کەشتی) هورتانس خانمی پیرێژنی خاوەنی میوانخانەکەیە -ف-

هەشتا ساڵ بوو . بەرانبەر ماڵی ئێمە كچێكی جوانی تەڕو تازەی وەك گوڵ هەبوو ، ناوی ((كریستالو)) [٤٠] بوو ، ئێمەی هەرزەكارو بێكاری دێ هەموو شەوێكی یەك شەموان دەچووین دەمان خواردەوە تا سەر خۆش دەبووین ، ئەوسا چلێك ڕێحانەمان لە پشت گوێ دەنا ، ئامۆزایەكی من گیتارەكەی هەڵدەگرت و تێكڕا دەچووینە بەرماڵی كریستالوو ، بۆئەوەی بە مۆسیقا ژەندن خۆشەویستیمانی پێ بگەیەنین ، ئای چ شەوق و زەوقێكمان هەبوو، چ عەشقو ئارەزوویەك! وەك گا دەمان بۆڕاند، هەموو ئەو كچەمان دەویست، هەموو شەوێكی یەك شەموان وەك مێگەل دەچووینە ئەوێ تا حەز لەیەكێمان بكات.

((باشە، سەرۆك، تۆ بڕوا بە قسەكانم دەكەیت؟ ئەمە ڕازێكی سەیرە! زامێك لە وجودی ژندا هەیە هەرگیز سارێژ نابێت، هەموو برینێك دەرمانی هەیە، بەڵام ئەمیان، گوێی لە قسەی ناو كتێبەكانی تۆ نیە، هەرگیز چاك نابێتەوە، تەنانەت ئەگەر ژنێكی تەمەن هەشتاساڵیش بێت، دەمی برینەكە هەر بەكراوەیی دەمێنێتەوە.

((بەڵێ ئەم پیرێژنە هەموو شەوێكی یەكشەموان ڕایەخەكەی دەبردە لای پەنجەرەكەوە، بەدزیەوە ئاوێنە بچوكەكەی دەرهێنا، دەستی دەكرد بەشانە كردنو جیاكردنەوەی ئەو چەند تاڵە مووەی بەسەریەوە مابوو، زۆر بەوریایی تەماشای ئەم لاو ئەولای خۆیشی دەكرد تاكەس بەو جۆرە نەی بینێت، خۆ ئەگەر یەكێكی لێ نزیك بكەوتایەتەوە، ئەوا بەهێمنی وەك پاكیزەیەك لەكاتی خوا پەرستیدا بێت خۆی گرمۆڵە دەكردو دەیدایە نووستن، بەڵام كەی خەو دەیبردەوە؟ ئەو چاوەڕێ بوو لاوەكان بگەنوئەویش گوێ بۆ گۆرانیە عاشقانەكانیان رادێرێت، لەهەشتا ساڵیا! بڕوانە سەرۆك، ژن چ گیانلەبەرێكی پڕ لەنهێنیە! ئێستا كەبیری لێ دەكەمەوە دەمەوێت بگریم. بەڵام من ئەوسا زۆر سەرچڵ بوومو هیچم نەدەزانی، بۆیە پێكەنینم بەو باسە دەهات.

ڕۆژێك لەدەست نەنكم توورە بووم، ئەو تەشەری لێدام كە بۆچی دوای كچان دەكەوم، منیش ناچار بووم چیم لەدڵابوو ڕاستو ڕەوان پێم وت، وتم: (تۆ بۆ هەموو شەوێكی یەكشەموان توێكڵە گوێز بەلێوتا دێنێتو قژت شانە دەكەیت؟ ناشێ تێ گەیشتبێتی كە

---

– [٤٠] Krystalo.

ئێمە گۆرانی بۆ تۆ دەڵێین‌و مۆسیقات بۆ دەژەنین؟ نا، ئێمە ئەوە بۆ کریستالو دەکەین، تۆ تازە بۆنی مردووت لێ دێت))

((سەرۆك بڕوا دەکەیت، ئەو ڕۆژە دوو دڵۆپ فرمێسکی درشت لە چاوی نەنکمەوە هاتنە خوارێ، ئەوە یەکەمجار بوو بزانم ژن یەعنی چی!

وەك دێڵە سەگ لە سووچێکدا گرمۆڵە بوو، چەناگەی لەرزی، بۆ ئەوەی چاکی گوێ لێ بێت لێی نزیك بوومەوەو هاوارم کرد: ((کریستالو، تێدەگەیت، کریستالو)) لاویەتی جانەوەرێکی دڕندەو نائینسانیە کە لەهیچ ناگات، نەنکم دەستە وشکەڵاتوەکەی بەرەو ئاسمان بەرزکردەوەو هاواری کرد: ((بڕۆ بەنەعلەت بیت، لەناخی دڵەوە نەعلەتیت دەکەم))

ئەو پیرێژنە داماوە لەو ڕۆژە بەدواوە دایە کزی، تادەهات لێژ دەبوەوەو هێزی نەدەما، تا دوای دوو مانگ کەوتە گیانەڵا، لەوکاتەدا چاوی پێم کەوت، وەك کیسەڵ فیشکاندی‌و دەستە وشکەڵاتوەکانی بۆ درێژ کردم تا چنگم لێ گیر بکات، وتی:

((ئەلیکسیس[٤١] تۆ منت کوشت، بەنەعلەت بیت، نەفرەتت لێ، دەخوازم چ دەردو بەڵایەك بەسەر من هات بەسەر تۆیش بێت))

زۆربا زەردەخەنەیەکی کرد، لەوکاتەدا کەدەستی بە سمێڵیا دەهێنا وتی:

بەڕاستی دوعای پیرێژنەکە گیرابوو، وا بزانم تەمەنم شەست‌و پێنج ساڵە، بەڵام ئەگەر ببمە سەد ساڵیش هەر عاقڵ نابم، ئەوسایش هەر ئاوێنەیەکی بچووکم لەگیرفاندا دەبێت‌و هەر دوای ژنانیش دەکەوم.

جارێکی تر پێکەنی، پاشماوەی جگەرەکەی لە پەنجەرەکەوە تووڕدایە دەرەوەو باوێشکێکیدا. ئەنجا وتی:

-من دنیایەك عەیب‌و عاری ترم هەیە، بەڵام ئەمیان ئاخری دەمکوژێت.

لەتەختی نووستنەکە هاتە خوارێ‌و وتی:

-ئیتر بەسە، زۆرمان قسە کرد، دەبێت ئەمڕۆ کار بکەین.

[٤١] Alixes

بەپەلە خۆی گۆڕی، پێڵاوی لە پێ کردو چوە دەرێ.

من سەرم داخستبوو بیرم لە قسەکانی زۆربا دەکردەوە، لەپڕا شارێکی دووری بەبەفر داپۆشراوم هاتەوە یاد، لەپێشانگایەکی –رودان–[٤٢]دا تەماشای دەستێکی گەورەی لە برونز دروست کراوم دەکرد کە بە (دەستی خوا) بەناوبانگە، دەستەکە نیوە کراوەیەو، لەناو لەپیدا ژنو پیاوێك بە شەوقو خۆشیەوە لەیەکتری ئاڵاون.

کچێکی جوان لێم نزیك کەوتەوەو لەپاڵما وەستا، ئەویش بەسەر سوورماویەوە تەماشای ئەوتێکەڵ بوونە بەجۆشو خرۆشە نەمرانەیەی ژنو پیاوەکەی دەکرد، کچێکی باریکەلەی شیك پۆش بوو، قژی پڕو زەرد باوو چەناگەی پتەوو لێوی ناسك بوون، قەڵافەتێکی خۆ گرو پیاوانەی هەبوو ، من کە حەز بەوە ناکەم لەخۆمەوە یەکێك بدوێنم نازانم چی ئەم کارەی پێ کردم، ڕووم تێ کردو پێم وت:

–بیر لەچی دەکەیتەوە؟

–لەژێر لێوەوە بەناڕەزایی وتی:

–خۆزگا بمانتوانیایە هەڵبێین!

–بۆ کوێ؟ چارنیە، دەستی خوا لە هەموو شوێنێکدا هەیەو ڕزگار بوون نیە، بۆ بەم خۆشەویستیە نەمرە قایل نیت؟

–نا، ڕەنگە خۆشەویستی مەزنترین بەختەوەری ئەم دنیایەبێت، بەڵێ، ڕەنگە، بەڵام من کە ئێستا دەستێکی برونزی دەبینم حەز بە هەڵاتن دەکەم.

–یەعنی تۆ ئازادیت لا باشترە؟

–بەڵێ.

–ئەی ئەگەر ئازاد بوون تەنیا ئەوکاتە بێتەدی کە لەم دەستە برونزیەوە فەرمان وەربگرین ئەوسا چی؟ تۆ وای دابنێ کە وشەی خوا ئەو مانا سادەیەی نیە کە خەڵکی عەوام بۆیان داناوە، ئەوسا چی؟

---

[٤٢] Rodin (ئوگست) پەیکەر تاشی گەورەی فەرەنسی (١٨٤٠–١٩١٧) کە لەشێوەی ریالستو ئیمپرسیونیستا مامۆستایەکی بەتواناو خاوەنی شاکاری گەورەیە. هەندێك بە مایکل ئینجیلوی دەچوێنن، لەکارە ناودارەکانی (ئادەمو حەوا) (ماچ) (دەستی خوا) بیرمەند)٥.–و–

کچۆڵەکە بە نیگەرانیەوە لێی ڕوانیم، چاوی ڕەنگی خۆڵەمێشیەکی کانزایی گرتبوو، لێوی وشکو تاڵ بوون، وتی:

–من تێ ناگەم.

وەك ترسابێت دوورکەوتەوە، ونبوو، لەوساوە ئیتر هیچ کاتێك نەهاتبوەوە بەر زەینی من، بەم جۆرە ئەو کچە لە وجودی مندا، لەدوو توێی سنگما هەر بەزیندویی مابوەوە، وائێستا، ئەمرۆ، لەم کەنارە تەریکەی دەریادا، بەڕەنگی پەڕیوو ناڵەو زاریەوە، لە قووڵایی وجودی منەوە هاتبوە دەرێ.

وایە، زۆربا ڕاستی کردو من لەگەڵیا باشم ڕەفتار نەکردبوو، ئەم دەستە برونزیە بیانووی چاك بوو، یەکەمین پێك گەیشتن چاك هاتە پێشو قسەی خۆشەویستانەمان کرد، ئێمە دەمانتوانی وردە وردە بێ ئەوەی بەخۆ بزانین بکەوینە ئامێزی یەکترەوەو، بەئاسانی لەنێو لەپی خوادا ببینە یەك، کتو پڕ من لەسەر زەویەوە پەڕیمە ئاسمانو ژنی بێچارە ترساو ڕای کرد.

کەڵەشێری پیر لە حەوشی میوانخانەکەی خاتو هورتانس خانما کەوتە خوێندن، ئێستا تیشکی خۆر تەواو سپیو لە پەنجەرە بچووکەکەوە دەهاتە ژورێ، من بەرزەپێ لەناو پێخەفەکەمەوە وەدەرکەوتم.

کرێکارەکان بەبێڵو قازمەو نوێڵەوە دەگەیشتن، گوێم لەزۆر بابوو دەستووری دەدانێ، ئەو بێ ورینگەدان دەستی بەکار کردبوو، هەستت دەکرد بەڕێوەبەرێکە حەزی بە بەرپرسیاریەتیە.

سەرم لە پەنجەرەکەوە بردە دەرێو زۆربام بینی وەك چەتەوڵێك لەنێوان سی کرێکاری لاوازی شرۆڵەو ڕەنگ پەڕیوی باریکدا وەستابوو، وەك فەرمان بدات دەستی ڕادەداو فەرمانەکانیشی کورتو ئاشکرابوون.

پاشان پشت ملی مێرد منالێکی گرت کە هەر منگە منگی دەکردو بەدوو دڵیەوە دەچوەپێشێ. بەسەریا نەڕاندی:

—ئەگەر قسەت هەیە بیلێ، بەدەنگی ئاشكراو بەرز بیلێ چونكە من حەزم لە منگە منگ نیە، بۆ ئەوەی كاربكەیت دەبێت خۆت ئامادەكەیت، ئەگەر نایكەیت فەرموو بۆ چاخانە.

لەوكاتەدا هورتانس خانم بە قژی ئالۆزو ڕوومەتی پف كردووی بێ ئارایشتەوە، بەكراسێكی دەڵبو چڵكنو دەم پا (نەعل)ی درێژو كۆنەوە كە بەكێشی دەكرد، دەركەوت، وەك گۆرانی بێژە پیرەكان كۆكەیەك گرتی كە دەنگە ناخۆشەكەی هەر لەزەڕەی كەر دەچوو، وەستاو بەكەشو فشێكەوە لە زۆربای ڕوانی، چاوی لێڵ بوون، جارێكی تر بۆ ئەوەی زۆربا گوێی لێ بێت كۆكیەوە، لەكاتێكدا كە بەلەنجەولارەوە كەفەڵی دەجووڵاند بەلای زۆربادا تێ پەڕی، ئەوەندەی لێ نزیك كەوتەوە موویەكیان مابوو كە قۆڵی هەراوی كراسەكەی بەر زۆربا بكەوێت، كەچی زۆربا تەنانەت بۆ تەماشا كردنی ڕووی وەرنەگێڕا، تیكەیەك نانو مشتێك زەیتونی لەكرێكارێك وەرگرتو هاواری كرد:

—دەی كوڕینە، خاچێك بكێشنو بابڕۆین.

ئەوسا بەهەنگاوی فراوان بەرەو چیاكە پێش تیپەكە كەوت.

من لێرەدا باس لەكاری كانزا (معدن) ناكەم، چونكە ئەمە حەوسەڵەیەكی دەوێت كە ئێستا من نیمە، ئێمە لەپاڵ دەریاكەدا كوختێكمان لە قامیشو بیو تەنەكەی نەوت دروست كرد. لەبەرە بەیاندا زۆربا هەڵدەستا، قازمەكەی هەڵدەگرت، پێش كرێكارەكان دەچوە سەر كانزاكە، دەستی بە هەڵكەندنی ڕاڕەوێكی تونێل ئاسا دەكرد، وازی لێ دەهێنا، دەماری خەڵوزێكی بەردینی دەدۆزیەوە كە وەك ڕۆنی زەیتوون دەبریسكایەوە، لە خۆشیاندا دەكەوتە سەما، بەڵام دوای چەند ڕۆژێكی تر دەمارەكە وون دەبوو زۆربا لەسەر زەویەكە دەكەوتە تەپو تل، قاچی بەرەو ئاسمان هەڵدەناو بەئاماژەی دەستو پێی نەفرەتی لەزەویو زەمان دەكرد، ئەو زۆر بەگەرمی لەگەڵ كارەكەیدا پەیوەندی بەستبوو، تەنانەت ڕاوێژی بەمنیش نەدەكرد، هەر لە ڕۆژە بەراییەكانەوە هەموو دڵسۆزیو بەر پرسیاریەتی لەمنەوە چوبوە لای ئەو، ئیتر ئەو بڕیاری دەداو كاری بەڕێ دەخست، من تەنیا پارەدانم لەسەر بوو- ئەو شتەی لای خۆیشم خراپ نەبوو- چونكە وام هەست

دەکرد کە ئەو چەند مانگە خۆشترین رۆژانی تەمەنی من بوون. بەڵێ، بەلەبەر چاو گرتنی هەموو لایەنێك، وام دەزانی بەختەوەری خۆم بەنرخێکی هەرزان دەکرێم.

باپیرم لەدایکمەوە کە لە گوندێکی بچووکی کریتا دەژیا، هەموو شەوێك چرا فانۆسەکەی هەڵدەگرتو بەناوگوندا دەگەڕا، تا بزانێت ئاخۆ بەڕێکەوت غەریبێك هاتۆتە ناوگوندەکە، ئەگەر یەکێکی وای بدیایە دەیبردەوە ماڵەوە، خواردن‌و خواردنەوەی زۆری ئەدایە، پاشان خۆی لەسەر کورسیەك دادەنیشت، سەبیلە درێژەکەی دادەگیرساند، ڕووی لەمیوانەکە دەکرد کە کاتی قەرزدانەوەکەی گەیشتبوو، وەك فەرمانی پێ بکات دەی گوت:

–دەی بۆم باس بکە.

میوانەکە دەیوت:

–چیت بۆ باس بکەم باوە موستویورگی؟[٤٣]

–پێم بڵێ تۆچیت‌و کێیت؟ لە کوێوە هاتوویت، کام شارو گوندت بەچاوی خۆت بینیوە؟ بەکورتی هەموو شتێکم بۆ باس بکە، یا الله دەی. ئیتر میوانەکە دەستی پێ دەکرد، لەم لاوە دەیبردە ئەولاو ڕاست‌و درۆی بەسەریەکدا دەترشاند، باپیرم مژی لەسەبیلەکەی دەداو لەسەر کورسیەکەی گرمۆڵە دەبوو، گوێی لێ دەگرت‌و هێدی هێدی سەفەرەکەی لەگەڵدا دەکرد.

ئەگەر میوانەکەی بەدڵ بوایە پێی دەگوت:

–سبەیش لێرە بمێنەوەو مەڕۆ، هێشتا زۆرت پێیە بۆم بگێڕیتەوە.

باپیرم هەرگیز لە گوندەکەی نەچوبوە دەرێ، تەنانەت بۆ کاندی[٤٤] و کانەیش[٤٥] سەفەری نەکردبوو، دەی وت: ((بچم بۆ ئەوێ چی بکەم؟ کاندیەکان‌و کانەییەکان هەمیشە بێرەدا تێ دەپەڕن، کاندی‌و کانە خۆیان سەربەماڵما دەکەن‌و من پێویستم بەچوون نیە))

منیش ئەمڕۆ لەم کەناری کریتەدا پەیڕەو لەو شێتیەی باپیرم دەکەم.

---

[٤٣] Maustoyorgi

[٤٤] Candia

[٤٥] Canee گرنگترین شاری دوورگەی کریتە کە دەکەوێتە کەناری بەشی باکورەوە. و.ف

منیش میوانێکم پەیداکردوە، وەك ئەوەی بەچراوە لەدووی گەڕابێتم و دۆزیبێتمەوە، ناهێڵم بڕوات، ئەو بۆ من زۆر لە شێوی شەوێك زیاتر دەکەوێت، بەڵام ئەهێنێت. من هەموو شەوێك، دوای تەواو بوونی کارەکان چاوەڕێی دەکەم، بەرانبەر بە خۆم دایدەنێم، پێکەوە شێو دەکەین، پاشان کەوەختی قەرزدانەوەی دێت پێی دەڵێم: ((دەی بۆم باس بکە)) پایپەکەم پێ دەکەمو گوێی لێ دەگرم. ئەم میوانە بەدنیادا چاك گەڕاوەو باش چۆتە ناو رۆحی خەڵکیەوە، من لە گوێ لێ گرتنی تێرنابم، پێی دەڵێم:

—بۆم باس بکە، زۆربا، بۆم باس بکە.

ئیتر کە دەست بەگێڕانەوە دەکات مەکدۆنیام دێتە پێش چاو، چیاو دارستانو لافاوو کۆمیتەچیەکان[٤٦] ژنانی زەحمەت کێشو پیاوانی ڕق ئەستورو بەهەیکەل، هەموویان لەو هەندۆکە جێگایەی نێوان منو زۆربادا بلاودەبنەوە، چیای —ئاتۆس— یش[٤٧] بەبیستو یەك دێرەکەیو جبەخانەو ڕاهیبە تەمەڵو بێکارەکانیەوە دەردەکەون. زۆربا ملی بادەداو ئەوکاتەی چیرۆکی قەشەکانی دێری دەگەیاندە کۆتایی بە پێکەنینەوە دەیوت: ((سەرۆك، خوا لە پاشی بارگیرو لە پێشی قەشەت بپارێزێت))

هەموو شەوێك زۆربا بەیۆنانو بولگارستانو کوستەنتەنیەدا دەمگێڕێت، چاو دەنوقێنمو دەڕوانم، ئەو بەچاوە بچوکە هەڵۆ ئاساکانی کە زۆرجار لەسەر سامیا تەواو دەکرانەوە هەموو باڵکان، باڵکانی پڕ لە ئاژاوەو ماندووی دیوە، ئەو شتانەی لای ئێمە ئاسایی بوونو بەسانایی بەسەریاندا تێ دەپەڕین لای زۆربا پڕ لەڕازو ترسناك بوون. ئەو کە ژنێکی ڕێبوار دەبینێت ماتو سەرسام دەوەستێتو دەپرسێت:

—ئەمە چ نهێنیەکە! ژن چ مەوجودێکە کەوامان لێ بکات سەر بۆبینینی گڕ بدەین؟ من لە تۆ دەپرسم ئەمە چیە؟

---

[٤٦] کۆمیتەچی: بەوانە دەوترا کە ئەندامانی یەکێتیو ئەنجومەنەکانی جوتیارانی مەکدونیا بوون، زیاتر بە ئەسڵ بولگاری بوون، لە سەرەتای سەدەی بیستا دژی دەسەڵاتی عوسمانیەکان بەسەر یۆناندا و بۆ سوودی وڵاتەکەیان شەڕیان دەکرد. ف

[٤٧] Athos

زۆربا هەر بەو سەرسامیەوە بەرانبەر بەپیاوێك، درەختێكی گوڵ كردوو، لیوانێك ئاوی سارد ئەو پرسیارانە لە خۆی دەكات، هەموو ڕۆژێك، هەرچیەك كە دەبینێت وادەزانێت یەكەمجاری بینینیەتی.

دوێنیٚ لەبەردەم كۆختەكەدا دانیشتبووین، دوای نۆشینی لیوانێك شەراب زۆربا بەسەرسامیەوە ڕووی تیٚ كردم و وتی:

–بەڕاست سەرۆك، بلێ بزانم، ئەم ئاوە سوورە چیە؟ قەدی پیرەدارێك لق و گەلا دەردەكات، هێشووی جوان و ترشی پێوە ئاوێزان دەبێت، ماوەیەك تیٚ دەپەڕێت، خۆر پێی دەگەیەنێت، وەك هەنگوینی شیرینی لیٚ دەكات و ئەوسا پێی دەلێن تریٚ، پاشان بەپیٚ هەلی دەشێلن، شیلەكەی دەگرن و دەیكەنە كووپەوە، ئەو شیلەیە خۆ بەخۆ پیٚ دەگات و دەگۆڕێت، لە جەژنی پیرۆزی (جۆنی سەرخۆش)[٤٨] دا سەری كووپەكان لا دەدەن، دەبینن شیلەكان بوونەتە شەراب، ئای كە سەیرە! چ موججیزەیەكە؟ تۆ لەو شیلە ڕەنگ سوورە دەخۆیتەوە و گیانت هێندە گەورە دەبێت كە لە قالبە كۆنەكەی لەشتا جێی نابێتەوە و خوا دەكێشیتە زۆرانبازی. ئەمە چ ڕازێكە! سەرۆك، پێم بلێ؟

من قسەم نەدەكرد، كە گوێم لە قسەكانی زۆربا دەگرت هەستم دەكرد دنیا پاكیزەیی خۆی نویٚ دەكاتەوە، هەموو شتە بیٚ نرخ و پواوەكان جارێكی دی باق و بریقی سەرەتایان بۆ دێتەوە، ئەوسەرەتایەی كە لەژێر دەستی خواوە هاتنە دەریٚ ئاو، ژن، ئەستێرە، نان بەرەو ئەسڵە پڕ لە ڕازەكەیان دەبوونەوەو، دیسان گەردەلوولە خواییەكە لە ئاسماندا هەلی دەكردەوە.

هەر لەبەر ئەوەبوو كە هەموو عەسرانێك لەسەر زیخی كەنارەكە ڕادەكشام، بەتاسەوە چاوەڕێی زۆربام دەكرد، ئەو هەموو لەشی لیتەو خەلۆزاوی بوو، بە هەنگاوی فراوان و بیٚ حالیەكی زۆرەوە، وەك مشكێكی گەورە لەژێر زەویەكەوە دەهاتە دەریٚ، كە لەدوورەوە دەمبینی، لەدارو باری لەشیەوە، لەسەری نەوی یان بەرزیەوە، لە جووڵاندنی باسكی درێژیەوە دەمزانی كاری ئەو ڕۆژە چۆن بوە.

[٤٨] St. John the drinker مێژووی ئەو ڕۆژە ڕێكەوتی (١٥)ی ئاب دەكات.

لەسەرەتاوە منیش لە گەڵیا دەڕۆیشتم‌و چاودێری کرێکارەکانم دەکرد، هەوڵم دەدا ڕێگایەکی تازە بۆ خۆم بدۆزمەوە، پەیوەندی لەگەڵ کاری دەستا پەیدا بکەم، ئەو بەرژەوەندیە مرۆڤایەتیەی لەژێر دەستما بوو بیزانم‌و حەزی لێ بکەم، ئەو تامە خۆشە بچێژم کەماوەیەکی زۆر بوو ئارەزوویم دەکرد— ئەوەی کە ئیتر نەك لەگەڵ ووشە بەڵکوو لەگەڵ مرۆڤە زیندووەکاندا سەروکارێکم هەبێت—پلانێکی خەیاڵیم دەکێشا کە ئەگەر کاری دەرهێنانی خەڵوزی بەرد باش بەرەو پێش بچێت کۆمەڵەیەکی تایبەتی دروست بکەم کە هەموو کاری تیابکەن، هەموو شتێکمان هەرەوەزی بێت، وەك براپێکەوە یەك خۆراك بخۆین‌و بەرگێك بپۆشین، لەمێشکما نەخشەیەکی تازەی ئاینیم دەکێشا، هەوێنی ژیانێکی تازەم دادەهێنا.

بەڵام هێشتا بڕیاری ئەوەم نەدابوو کە باسی پڕۆژەکەی خۆم بۆ زۆربا بکەم، ئەو کەمنی دەبینی لەناو کرێکارەکاندا دێم‌و دەچم، پرسیاریان لێ دەکەم، لە کارەکانیان دەکۆڵمەوەو هەمیشە لایەنیان دەگرم زۆری پێ ناخۆشبوو، تەماشای دەکردم، لێوی دەکرۆشت‌و دەیوت:

—سەرۆك، ناچیت سەیرێکی دەرەوە بکەیت؟ دەزانیت دەرەوە چ هەتاوێکە! بەڵام من ڕۆژانی یەکەم سوور بووم لەسەر مانەوەو نەدەڕۆیشتم، دەپرسی، زۆرم قسەدەکرد، دەمویست شتێك لە ژیانی کرێکارەکان بزانم. چەند منداڵێك هەیە، ئەو خوشکانەی دەبوو بەشوویان بدەن، لەکەس‌و کاری پیوە نەخۆشیان، لەکێشەیان، لە نەخۆشی‌و نارەحەتیان. زۆربا بەتاڵی‌و ترشیەکەوە پێی دەوتم:

—سەرۆك، تۆ ئەوەندە لە ژیانی ئەمانە مەکۆڵەرەوە کە دڵت پڕبیّ‌و زیادە لە پێویست‌و زیاد لەبەرژەوەندی کارەکەمان پێیانەوە پەیوەندیان لەگەڵدا پەیدابکەیت. چونکە ئەوسا لە هەڵەیان خۆش دەبیت، دەبێت ئەوەیش بزانیت کە ئەگەر وابکەیت ئەوانیش تووشی نەگبەتیەکی گەورە دەبن کە سەرۆك توندبێت کرێکار لێی دەترسێت، ڕێزی لێ دەگرن‌و کاردەکەن، بەڵام کە سەرۆك نەرم‌و لاواز بێت هەوساری لەسەر دەکەن‌و ڕای دەکێشن. تێ دەگەیت، سەرۆك؟

ڕۆژێکی تر، لەخۆراوابوندا، کە دەست لە کار هەلگیرا، زۆربا قازمەکەی لە بەر کۆختەکەدا فرێداو بەبێزاریەوە هاواری لێ هەستا:

-سەرۆک، تکات لێ دەکەم خۆت مەکێشە ناو کارەکانەوە، هەرچی من دروستی دەکەم تۆ دەیڕوخێنیت. ئەمڕۆ ئەو قسانە چی بوون بۆت کردن؟ سۆشیالتو ئەو جۆە وڕێنانە، تۆ یان سەرمایەداری؟ یەکێکیان هەڵبژێرە.

بەڵام ئەو هەڵبژاردنە چۆن دەبێت؟ پەرۆشیو حەزی سادەی من ئەوە بوو کە ئەو دوانە بکەم بەیەکو رێگا چارەیەك بۆ یەکخستنی دژەکان بدۆزمەوە، بۆ ئەوەی کە لەم رێگایەوە هەم ژیانی دنیا دەستەبەر بکەمو هەم بەختەوەری ئەو لایش بەدەست بهێنم. ئەم بیرە لە سالآنی پێشوەوە، یەعنی لە منالیەوە لە سەرمابوو، ئەوسا هێشتا قوتابی بووم، لەگەڵ هاوڕێ زۆر نزیکەکانمدا کۆمەڵەیەکمان بەناوی (ئەنجومەنی هاورێکان)[٤٩]ەوە دروست کردبوو، واتا ناوێك بوو خۆمان لێمان نابوو،هەمومان لەژوورێکی دەرك داخراوی مندا کۆبووینەوە، سوێندمان خوارد هەتا ماوین خەبات لەدژی نایەکسانی بکەین. لەکاتی سوێند خواردندا هەموو دەست لەسەر دڵ فرمێسکی درشت بەچاوماندا هاتە خوارێ، ئەمە ئایدیایەکی تەواو مندالآنە بوو، قوڕ بەسەر ئەو کەسەیش کە گوێی لێمان بوایەو پێبکەنیایە ئێستا کە دەبینم لە ئەندامانی ئەو ئەنجومەنە بوونەتە پزیشکی ساختەچیو پارێزەری سووكو، چەقالو بەقالو، سیاسەتمەداری درۆزنو رۆژنامەنووسی بچووك دڵم دەگوشرێت، لەوە دەچێت ئاوو هەوای ئەم دەڤەرە وشكو ناسازگاربێت، بۆیە بەنرخ ترین تۆوی تیا ناڕوێت یان لەنێو دڕكو داڵدا دەمرێت. من ئەمڕۆ چاك ئەوە دەبینم کە هێشتا عاقڵ نەبووم، سبحانەالله، وایش هەست دەکەم کە تەواو ئامادەم نمایشێکی دۆنکیشۆتانە بکەم.

ڕۆژانی یەك شەموان واخۆمان رێك دەخست کە دوولاوینو دەمانەوێت زەماوەند بکەین، ریشمان دەتاشی، کراسێکی تازەی سپیمان لەبەردەکردو نزیکی عەسر دەچووینە لای هورتانس خانم، ئەو رۆژانی یەکشەموان مریشکێکی بۆ سەر دەبڕین، سێ قۆڵی

---

[٤٩] Friendly society ئەم ناوە لە (ئەنجومەنی هاورێکان)ی سالی ١٨٢١ وەرگیرابوو کە ڕەنگی بۆ شۆڕشی یۆنان ڕشت بۆ ئازادی بەدەست هێنانیو رزگار بوون لەداگیرکەرانی عوسمانی. ف.

دادەنیشتین و دەستمان بەخواردن و خواردنەوە دەكرد، پاشان زۆربا دەستە درێژەكانی دەنایە سەر سنگە پڕ لە بەرەكەتەكەی ئەو ژنە دڵسۆزەو مەمكی دەگرت، كە شەویش دەگەیشت ئێمە دەگەڕاینەوە كۆختی كەنار دەریاكەمان، ژیان لەدیدی ئێمەدا سادەبوو، پڕ بوو لە نیازی پاك و كۆن، وەك خودی هورتانس خانمی پیر زۆر خۆش و دڵنەواز بوو.

لەیەكێك لەو یەك شەموانەدا، كە لەو میواندارییە سەخاوەتمەندانەیە دەگەڕاینەوە بڕیارمدا لەگەڵ زۆربادا قسە بكەم و نەخشەی كارەكانمی پێ بڵێم.

ئەو بەسەرسامییەوە دەمی داپچڕیبوو، پێی بەجەرگی خۆیدا نابوو تا گوێ لەهەموو قسەكانم بگرێت، هەندێك جار سەرە زلەكەی دەلەقاند، هەر لەسەرەتای قسەكانمەوە مەستیەكەی ڕەویەوەو هاتەوە سەر خۆی.

كەلێ بوومەوە بەتووڕەییەوە دووسێ تاڵ مووی لە سمێڵی دەركێشاو وتی:

—سەرۆك، داوای لێ بوردنت لێ دەكەم، من وادەزانم مێشكی تۆ هێشتا دەڵەمەیو خۆی نەگرتوەو، تەمەنت چەندە؟

—سی و پێنج ساڵ.

—ئا.. كەواتە تازە خۆی هەر ناگرێت.

ئەمەی وت و دایە قاقای پێكەنین، من زۆر دڵگران بووم و هاوارم لێ كرد:

—یەعنی تۆ بڕوات بەمرۆڤ نیە؟

—خۆت بێ حەوسەڵە مەكە، سەرۆك، نا، من بڕوام بەهیچ شتێك نیە، ئەگەر بڕوام بەمرۆڤ ببوایە بڕوام بەخواو بڕوام بە شەیتانیش دەبوو، ئەمەیش خۆی مەسەلەیەكە، سەرۆك، ئەگەر وابێت هەموو شتەكان تێكەڵ و پێكەڵ دەبن، ئەمەیش دەردەسەرییەكی زۆرم بۆ دروست دەكات.

بێدەنگ بوو، شەوكڵاوەكەی لەسەری داكەند، بەرك هەستاویەوە سەری خوراندو دیسان كەوتەوە راكێشانی موەكانی سمێڵی، وەك بڕیاری دابێت هەموو سمێڵی هەڵكەنێت، دەیویست شتێك بڵێت و دەی گێڕایەوە، بەلاچاو تەماشای كردم، دیسان سەیری كردمەوە، ئەمجارەیان وەك قیروسیای كردبێت تەواو بەرِكەوە دارەكەی دەستی بە بە بەردەكاندا كێشاو بەدەنگی بەرز وتی:

–مرۆڤ گیانلەبەرێکی دڕندەیە، دڕندەیەکی گەورە، وا دیارە تۆ ئەمە نازانیت، چونکە تۆ هەمووشتێکت ئاسان بەسەردا تێپەڕیوە، لێ ئەمە لەمن بپرسە، من پێت دەڵێم مرۆڤ دڕندەیە، ئەگەر خراپەی لەگەڵدا بکەیت ئەو ڕێزت لێ دەگرێو لێت دەترسێت، خۆ ئەگەر چاکەی لەگەڵدا بکەیت چاوت هەڵدەکۆڵێت.

((سەرۆك، خۆت لەخەڵکی تەریك بگرەو روویان زۆر مەدەرێ، پێ یان مەڵێ هەموو یەکسانن‌و مافیان وەك یەکە، ئەگینا پێ شێلی مافی خودی خۆت دەکەن، نانەکەی خۆتت لێ دەدزن‌و لەبرساندا دەتکوژن، خۆتیان لێ کەلاخە، سەرۆك، ئەوەیش بزانە کەمن چاکەی تۆم دەوێت))

دڵگران‌و نا ئومێد بەسەریمدا خوڕی:

–کەواتە تۆ بڕوات بەهیچ نیە؟

–نەو، من بڕوام بەهیچ نیە، ئەتەوێ چەند جار ئەمەت بۆ بڵێمەوە؟ من بڕوام بەهیچ شتێك‌و هیچ کەسێك نیە بێجگە لە زۆربا، نەك لەبەر ئەوەی زۆربا لەهەموویان چاکترە، نا، بەهیچ جۆرێك، قەت وانیە، ئەویش دڕندەیە، بەڵام بۆیە من بڕوام بەزۆربایە چونکە تاقە کەسێکە گوێ لەمستم بێت، تەنیا کەسێکە باش بیناسم، ئەوانی دی تارمایین، من بەچاوی زۆربا دەبینم‌و بەگوێی ئەو دەبیستم‌و ڕیخۆڵەی ئەو هەرس دەکەم، باقیەکەی تر، وەك پێم وتیت هەموو تارمایین، کە من مردم هەموویان دەمرن‌و دنیای زۆربایش بەیەکجاری وێران دەبێت.

بەپلارێکی گاڵتە ئامێزەوە پێم وت:

–تۆ کابرایەکی خۆپەرستیت، قسەکانت ئەوە دەردەخەن!

–خەتای من نیە، سەرۆك، ئەمە واقیعە، من پاقلەم خواردوەو ناچارم باسی پاقلە بکەم، زۆربام‌و زۆربابیانە قسە دەکەم.

من هیچم نەوت، هەستم کرد وتەکانی زۆربا وەك لێدانی قامچی پیامدا دەچزێن، ئافەرینی ئەو توانایەیم کرد، کە ئاوا بەڕاشکاوی مرۆڤی تا ئەوڕادەیە سووك کرد، کەچی لەهەمان کاتدا ئەمەندە پەرۆشی ژیان‌و کارکردن بوو لەگەڵیاندا، وەلێ من، یان دەبوو وەك

خوا پەرستەکان بچمە خەڵوەتەوە، یان بەپەڕی دەست کرد مرۆڤەکان بڕازێنمەوە تا بتوانم لەگەڵیاندا هەڵکەم.

زۆربا ئاوڕی دایەوەو تەماشای کردمەوە، لەبەر جریوەی ئەستێرەکاندا دەمیم بینی کە پێکەنین تا پەنا گوێی کشاندبووی، یەکسەر وەستاو وتی:

—سەرۆک، لێم زویر بوویت؟

گەیشتبووینە کۆختەکە، زۆربا بەخۆشەویستی و نیگەرانیەوە سەیری کردم، من وەڵامیم نەدایەوە، هەستم کرد منیش بیرم لەگەڵ زۆربادایەو کەچی دڵم ناهێڵێت، دەیەوێت خۆی بهاوێتە دەرەوە، لە دڕندە هەڵبێت و ڕێگایەکی تر بۆ خۆی بکاتەوە. وتم: زۆربا من ئەمشەو خەوم نایەت، تۆ بڕۆ بنوو.

ئەستێرەکان دەیان جریواند، دەریا هەناسەی هەڵدەکێشاو گوێچکە ماسیەکانی دەلستەوە، گوڵ ئەستێرەیەک چراچکۆڵە عاشقانەکەی ژێرسکی داگیرساندبوو، پرچی شەو شەونمی لێ دەتکا.

من لەسەر دەم کەوتبووم و بێ ئەوەی بیر لە هیچ بکەمەوە کڕبووم، لەگەڵ شەوو دەریادا بوومەیەک، هەستم کرد ڕۆحم بۆتە گوڵ ئەستێرەیەک و چرابچووکە سەوزو ئاڵتوونیەکەی داگیرساندوە، لەسەر زەویە شێدارو تاریکەکە دانیشتوەو چاوەڕوانە.

ئەستێرەکان لەسەفەردا بوون، ساتەکان تێ دەپەڕین، کە هەستام، بێ ئەوەی بزانم چۆن، ئەو دووکارەی کە دەبوو لەو کەنارەدا بەئەنجامی بگەیەنم بەتەواوی لە مێشکما نەخشی بەستبوو.

یەکەمیان هەڵاتن بوو لە بوودا، خۆڕزگارکردن لەخەمە میتافیزیکیەکان و، ڕزگارکردنی ڕۆح لە دوودڵی و بێ هوودەیی. دوەمیان، هەر لەئێستاوە، خۆ بەستنەوەیەکی قووڵ و ڕاست و ڕەوان بوو بەخەڵکەوە.

بەخۆم وت: ڕەنگە هێشتا کات بەبەریەوە مابێت.

— ٥ —

((ئاپۆ ئانا گنوستی، کوێخای دێ سڵاوتان لێ دەکات، داواتان لێ دەکات ئەگەر پێتان خۆش بێت بۆ نانی نیوەڕۆ بفەرموونەماڵیان، ئەمڕۆ بەیتاڵێك بۆ بەراز خەساندنی دێتە ناو گوند، کیرامارۆلیۆ[٥٠] ی ژنی کوێخا (گون)ی بەرازتان بۆ چاك دەکات، ئێوەیش بەبۆنەی جەژنی لەدایك بوونی (میناس)[٥١] ی نەوەیانەوە پیرۆز باییان لێ دەکەن))

چوون بۆ ماڵی گوندنشینێکی کریتی بەڕاستی تامو چێژێکی تایبەتی خۆی هەیە، لەوێ هەموو ئەو شتانەی لەدەوروبەرتان: زۆپا، چرای زەیتی، گۆزەو گلێنە ریزکراوەکانی خوار دیواو، مێزو چەند کورسیەكو ئەو گۆزە ئاوە ساردەی کەلای چەپتەوە لەناو دیوارەکە نراوە، هەموو ئەمانە نیشانەی باوك سالارین، بەدارە ڕاکانەوە گورزەی بەهێو هەنارو گیا بۆن خۆشەکانی وەك گوڵە مریەم، نەعنا، پونگە، گلاپەژم، جاترە هەڵواسرابوون.

لە ناوەوەیش، بەسێ چوار پلە پەیژە دەگەیتە ژوورێکی سەرەوە، تەختێکی بەرزی نووستنی لێ دانراوە، لەسەرویەوە پەیکەری قەدیسەکانو مۆمێك کە هەمیشە دەسووتێت، ماڵەکە لە چۆڵ دەچێت، کەچی هەموو پێویستیەکی تیایە، چونکە مرۆڤی ڕاست بەشتی کەمیش قایلە.

ئەو ڕۆژە خۆشو خۆری پاییزیش زۆر دلگیر بوو، ئێمە لەبەردەمی ماڵەکەدا، لە باخچەیەکی لادێیانەو لەژێر دارێکی بەرگرتووی زەیتوندا دانیشتین. لەنێوان گەڵا زیوینیەکانەوە، دەریاکە هێورو لەسەر خۆ لەدوورەوە دەبریسکایەوە، گەواڵە هەورەکانیش بەسەرماندا تێ دەپەڕین، جارێك بەری خۆریان دەگرتو تاوێك دەیان کردەوە، دەتوت زەوی جارێك هەناسەی شادی و تاوێك هەناسەی غەمگینی دەدات.

[٥٠] Kyra Maroulio

[٥١] Minas

لە پایینی باخچەكەدا، لەنێو چەپەرێكی بچووكدا، بەرازێكی تازە خەسێنراو لەتاو ئازار دەینالاندو گوێی كەڕدەكردین، بۆنی گونی برژاوی سەر پشكۆكان دەڕژایە نێو لووتمانەوە.

باس‌و خواسمان دەربارەی شتە هەمیشەییەكانی وەك دەغڵ‌و دان‌و ڕەزو باران بوو. ئێمە ناچار بووین هاوار بكەین، چونكە كوێخا گوێی گران بوو، وەك خۆی دەی وت: ((گوێیەكی زۆر لە خۆ بایی)) هەیە، ژیانی ئەم پیرە كریتیە وەك درەختی نێو دەربەندێك كە لە پەنایەكی با نەگردا ڕوابێت ڕاست‌و ڕەوان‌و هێور پێ گەیشتبوو، لەدایك بوون، گەورەبوون، ژن هێنان، منداڵ‌و نەوە خستنەوە، هەندێكیان مردبوون‌و ئەوانی دی مابوون، بەهەرحاڵ خاوەن وەچەو میراتیی خۆی بوو.

كریتیە پیرەكە كەوتە یاد كردنەوەی زەمانی كۆن‌و سەردەمی توركانی عوسمانی، قسەكانی باوكی دەوتەوەو ئەو موجیزانەی ئەوسا ڕوویان دابوو، چونكە مرۆڤی ئەوسا لەخوا دەترسان‌و ئیمان داربوون، دەی وت:

بڕوانن، هەر خۆم، ئاپۆ ئاناگنوستی كە ئێستا لەگەڵتاندا دەدوێم، من بە موجیزە لەدایك بووم، بەڵێ، بەموجیزەیەك، ئەگەر بۆتانی بگێڕمەوە چۆن بووە سەیرتان لێ دێت‌و دەڵێن سبحان اللهو دەچنە دێری مریەمی پاكیزەوەو مۆمێكی بۆ داگیرسێنن. ئەنجا نیشانەیەكی خاچی كێشاو لەسەر خۆو بەدەنگێكی خۆش دەستی بەگێڕانەوە كرد.

لەو سەردەمەدا ژنێكی توركی دەوڵەمەند لەگوندەكەماندا هەبوو، لەعنەتی لێ بێت. ڕۆژێك ئەو نەفرەت لێ كراوە ئاوس بوو، كاتی منداڵ بوونی گەیشت، لەسەر تەختێكی دارین خەوانیان‌و سێ شەوو سێ ڕۆژ وەك مانگا بۆڕاندی، بەڵام منداڵەكەی هەر لێ نەبووەوە، ژنێكی ناسیاوی- ئەویش هەر بەلەعنەت بێت- ئامۆژگاری كرد كە : ((زەفەرخانم، تۆ دەبێت هاوار لە دایكە مریەم بكەیت تافریات بكەوێت)) دایكە مریەم ناوێكە توركەكان بە مریەمی پاكیزەی دەڵێن. ئەم دێڵە سەگە توركە، زەفەرخانم، وەك مانگا بۆڕاندی كە :(من هاوار لەو بكەم؟ حاشا، مردنم لەو كارە پێ چاكترە)) بەڵام ژانی ژنەكە تا دەهات زیاتر دەبوو، هەر بەو جۆرە شەو ڕۆژێكی تر مایەوە ، هەر دەی ناڵاندو منداڵەكەی لێ نەدەبووەوە، چی بكات؟ ئیتر بەرگەی ئەو هەموو ئازارەی نەگرت‌و ناچار

هاواری کرد: ((دایکه مریەم، دایکه مریەم)) بەد بەختە تا تینی تیابوو هاواری دەکرد، بەڵام نە ژانی لەکۆڵ دەکەوت‌و نەمنداڵ دەردەکەوت. ئەوسا ژنە ناسیاوەکە پێی وت:

((ڕەنگە ئەو لە زمانی تۆ نەگات، چونکە لەوە دەچێت زمانی تورکی نەزانێت، هەر بەناوی مەسیحی خۆیەوە بانگیکە)) ئەنجا دێڵە سەگەکە بانگی کرد: (ئەی پاکیزەی رۆمیان، ئەی پاکیزەی رۆمیان)) وەلێ لەعنەت لە شەیتان ئەمجاریش ئازارەکەی زۆرتر بوو، ژنە ناسیاوەکەی پێی وت: ((زەفەرخانم، تۆ وەك ئەو دەیەوێت وای بانگ ناکەیت، بۆیە نایەت بەدەنگتەوە)) ئەنجا دێڵە سەگە کافرەکە کەخۆی لەمەترسیدا بینی لە دڵەوە هاواری لێ کرد: ((ئەی پاکیزەی پیرۆز)) هەر ئەوەندەو ئیتر منداڵەکە وەك مار ماسی لەدمێنیەوە داخزیە خوارێ.

((ئەمە لە رۆژێکی یەك شەمودا روویدا، لەیەك شەموی داهاتودا دایکیشم ژانی منداڵ بوون گرتی، ئەو داماوە زۆر ئازاری کێشاو ناڵاندی، ئەویش هاواری کرد: ((ئەی پاکیزەی پیرۆز، ئەی پاکیزەی پیرۆز)) بەڵام هیچ هەواڵێك لە منداڵ بوون نەبوو، باوکم لەناوەڕاستی حەوشەکەدا لەسەر زەویەکە دانیشتبوو، ئەمەندە خەمبار بوو نەی دەتوانی شتێك بخوات یابخواتەوە، دڵی لە پاکیزەی پیرۆز ئێشا بوو، دەی وت: ((دەبینن، جاری پێشو ئەودێڵە سەگە، زەفەر خانم، هاواری ئەو مەزنەی کردو یارمەتی لێ ویست، ئەو زوو بەدەنگیەوە هات‌و منداڵەکەی لێ کردەوە، کەچی ئێستا...)) رۆژی چوارەم ئیتر باوکم خۆی بۆ نەگیرا، بێ سێ‌و دوو شەنەکەی هەڵگرت‌و چوو بۆ دێری پاکیزەی شەهید–سێبەری لەسەرمان کەم نەبێت– کە گەیشتە ئەوێ هێند تووڕەبوو بێ ئەوەی نیشانەی خاچ بکێشێت چوە ناودیرەکەوە، دەرگاکەی لەسەر خۆی داخست، بەرانبەر بە پەیکەرەکەی پاکیزە وەستاو هاواری لێ کرد: ((دەی بیلێ، ئەی پاکیزەی پیرۆز بێگومان کرینیوی[٥٢] ژنم دەناسیت، کە هەموو شەوێکی یەك شەموان زەیتی بۆ دەهێنایت‌و چراکانی دادەگیرساندیت، ئەوژنەی من، کرینیو، وا سێ شەوو رۆژە ژان دەیگرێ‌و هاوار لە تۆ دەکات، یەعنی تۆ گوێت لە دەنگی نیە؟ دیارە کەڕیت واناى ژنەویت، خۆ ئەگەر لەباتی ئەو دێڵە سەگێکی وەك

زەفەرخانم یان یەكێكی تر بوایە لەو ژنە توركە پیسانە تۆ بۆ فریاكەوتنی ملی خۆت دەشكاند، بەڵام بۆ ژنەكەی من كە مەسیحیەكی ئیمانداره تۆ كەڕبوویتو گوێت لەدەنگی نیە، چاكە، خۆ ئەگەر پاكیزەی پیرۆز نەبوویتایە بەم شەنەی دەی بینیت دەرسێكی چاكم دادەدایت))

ئەمەی وتو بێ ئەوەی سەر دانەوێنێت ڕووی بەرەو دەرەوە وەرگێڕا، بەڵام لەوكاتەدا دەنگی چركە چركێك لەپەیكەرەكەی مریەمەوە هات، دەنگەكە ئەمەندە توند بوو دەت وت خەریكە پەیكەرەكە لێك بكاتەوە، پەیكەری قەدیسەكان كە بیانەوێت موجیزە یەك بنوێنن دەنگێكی وایان لێ هەڵدەستێت، من بۆیە ئەمە دەڵێم تا ئەگەر نایزانن فێری بن، باوكم زوو هەستی ڕاگرت، گەڕایەوە، كەوتە سەر ئەژنۆ، نیشانەی خاچی كێشاو هاواری كرد: ((ئەی پاكیزەی پیرۆز، من بەرانبەر بەتۆ گوناهم كرد، قسەی زۆر پڕو پوچم كرد كە نەدەبوو بیكەم، تۆ بەگەورەیی خۆت لێم قبوولكە))

هەر كە باوكم گەیشتەوە ناو گوند مزگێنیان دایە كە : ((پیرۆزبێت، گوستاندی، ژنەكەت كوڕی بوو) ئەو كوڕە من بووم، ئاناگنوستی پیر، بەڵام من هەر لە دایك بوونەوە گوێم گرانبوو، چونكە باوكم سووكایەتی بەپاكیزەی پیرۆزكردبوو، پێی وتبوو گوێی كەڕە. بێگومان پاكیزەی پیرۆز وتبووی (( ئا، بەڕاست، هەرئاوا؟ زۆرچاكە، كەمێك سەبركە، بۆ ئەوەی بزانیت كفر كردن یانی چی من كوڕەكەت كەڕدەكەم))

ئاپۆ ئاناگنوستی وێنەی خاچی كێشاو وتی:

–ئێستا ئەمە گرنگ نیە، سوپاس بۆ خوا، چونكە ئەو مەزنە دەیتوانی كوێر یان گەلۆر یان قەمبوورم بكات، یان– خوا نەخواستە–بیكردمایە بە كچ، ئەمە هیچ نیە، من بەرانبەر بە گەورەیی ئەو سەر دادەنەوێنم.

لێوانەكەی پڕ كرد، لەگەڵ بەرزكردنەوەی لێوانەكەی خۆیدا دیسان وتی:

–سێبەری خوامان لەسەر كەم نەبێت.

وتم: بەخۆشیت، ئاپۆ ئاناگنوستی، هیوادارم سەد ساڵ بژیو نەوەی نەوەكانت ببینیت.

پیرەمێرد لێوانەكەی خۆی یەكژەمی هەڵدا، سمێڵی پاك كردەوەو وتی:

-نا ، کوڕم، ئیتر بەسە، من نەوەی خۆمم دیوەو ئەوەندە بۆ من بەسە، من، هاوڕێیان، ئیدی پیر بووم، ئیتر کەمەرم شل بوە، ناتوانم هیچ کارێك بکەم، ئەگەرچی هێشتا لە هەوەس نەکەوتووم، بەڵام ناتوانم منالٚ بخەمەوە، بۆیە ژیان بە چ دەردێکم دەخوات؟

جارێکی تر پەرداخەکەی پڕ کرد، لە پشتێنەکەی پشتی گوێزو هەنجیری وشك کە بەگەڵای غار پێچرابوونەوە دەرهێناو بەسەرماندا بەشی کرد، دیسان وتی:

-من هەرچیەکم هەبوو داومەتە منداڵەکانم، ئێستا ئێمە هەژارو دەست کورتین، بەڵێ هەژاریی و نەدارایی، بەڵام من دەردە دڵ ناکەم، خوا گەورەیەو فریاد ڕەسەو خاوەنی هەموو شتێکە.

زۆربا بە گوێی پیرەمێردا قیژاندی:

-باشە، ئاپۆ ئاناگنوستی، ڕەنگە خوا هەموو پێویستیەکی لابێت، بەڵام بە ئێمە چی؟ ئەو پیرە پیسکەیە هیچ بەئێمە نادات.

کوێخا ناو چاوی گرژ کردو بە تووڕەییەوە وتی:

-ئەم قسەیە مەکە، هاوڕێ، قسە بەخوا مەڵێ، ئەو داماوەیش چاوی لە دەستی ئێمەیە.

لەو کاتەدا، دایکە ئاناگنوستی، هێورو بێدەنگ، لەدەفرێکی گلٚدا گونی بەرازەکەو گۆزەیەکی مسی گەورەی شەرابی بە ژووردا کرد، هەمووی لەسەر مێزەکە داناو لە شوێنی خۆیدا وەستا، وەك خاچ دەستی لەسەر سنگی داناو سەری نەوی کرد.

من لە لایەکەوە بێزم لەجۆرە خواردنە دەهاتەوەو ، لەلایەکی ترەوە شەرمم لە نەخواردنی دەهات. زۆربا بەلایەکی چاو تەماشای کردم، زەردەخەنەیەکی شەیتانانەی کردو وتی:

-ئەمە بەتامترین گۆشتە، سەرۆك، پێت ناخۆش نەبێت.

ئاناگنوستی پیر زەردەیەکی هاتێ و وتی:

-ڕاست دەکات، تۆ تاقی بکەرەوە، هەر لە مۆخ دەچێت، کە شازادە جۆرج -خوالێی خۆش بێت- بۆ دیدەنی دێرەکە هاتە سەرشاخ، قەشەکان خواردنێکی شاهانەی گۆشتیان

بۆ هەموومان ئامادە کرد، تەنیا قاپێك سوپی بۆ شازادە دانا، شازادە بە کەوچکەکەی دەستی کەوتە سەرو بن کردنی سوپەکە، بەسەر سامیەوە پرسی: ((ئەمانە لۆبیان، لۆبیای سپی؟)) سەرۆکە پیرەکەی دێر پێی وت: ((بخۆ، شازادە، بخۆ، پاشان بۆت باس دەکەم)) شازادە دووسێ کەوچکی لێ چێشت، چی لەقاپەکەدا بوو، خواردیو دەمو لێوی لستەوە، دیسان پرسیەوە: ((ئەم خۆراکە چاکە چی بوو، چ لۆبیایەکی بەتام بوو، هەردەت وت مۆخە(( سەرۆك دێر بە پێکەنینەوە پێی وت : ((نا، شازادە، ئەوە لۆبیا نەبوو، ئێمە هەموو کەلەشێرەکانی ئەم ناوەمان خەساندبوو))

پیرەمێرد پێکەنیو، بەچنگاڵەکەی دەستی پارچەیەکی لە (گون)ی بەرازەکە هەڵگرتو وتی:

—ئەمە خواردنی شاهانەیە ، ئادەی دەمت بکەرەوە.

من دەمم کردەوە ئەو تیکەکەی تێ ئاخنی.

دیسان لێوانەکانی پڕ کردەوە، ئێمە بەخۆشی لەدایك بونی نەوەکەیەوە خواردمانەوە، چاوی باپیرە گەشایەوە، لێم پرسی:

—مامە ئاناگنوستی، تۆ حەزدەکەیت نەوەکەت ببێت بەچی؟ بیڵێ تا بۆی بخوازین.

—من چیم بوێت، کورم؟ باشە دەمەوێت ڕێی ڕاست بگرێت، پیاوێکی چاکو باوکێکی باش بێت بۆ خێزانەکەی، ئەویش منداڵو نەوە بخاتەوەو یەکێك لە منداڵەکانی لە من بچێت، تا کاتێك کە پیرەمێردەکان لێی بڕوانن بڵێن:

((بڕوانە، چەند لە ئاپۆ ئاناگنوستی دەچێت، خوالێی خۆش بێت، چ پیاوێکی چاك بوو!((

بێ ئەوەیش کەتەماشای ژنەکەی بکات وتی:

—مارولیا، مارولیا، وەرە گۆزەکە پڕ بکەرەوە لە شەراب.

لەو کاتەدا دەرگای چەپەرەکە بەتوندی کرایەوە، بەرازەکە بەمرە مڕ خۆی خستە باخچەکەوە، زۆربا بەزەیی پیا هاتەوەو وتی:

—بەستەزمانە ئازاری هەیە...

پیرەی کریتی بەدەم پێکەنینەوە وتی:

-بێگومان ئازاری هەیە، ئەگەر وایان لە تۆ بکردایە ئازارت نەدەبوو؟

زۆربا بە کورسیەکەی ژێر خۆیدا کێشاو لەژێر لێوەوە بەترسەوە وتی:

-دەمت دابخە، پیرەی کەر.

بەرازەکە بە بەردەمماندا هاتو چۆی دەکردو بەرکەوە لێی دەڕوانین، ئاپۆ ئاناگنوستی بە خوماری ئەو تۆزە شەرابەوە کە خواردبویەوە وتی:

-لەوە دەچێت ئەم ئاژەڵە زانیبێتی کە ئێمە گونی ئەو دەخۆین.

بەڵام ئێمە لەسەر خۆو هێور دەمان خواردو شەرابی سورمان دەنۆشی. لەنێو چڵە زەیتوونە نوقرەییەکانەوە تەماشای دەریامان دەکرد کە هێشتا لەبەرتیشکی خۆرئاوادا بە تەواوی ڕەنگی گوڵی گرتبوو.

* * *

کەتاریکی داکەوت ئێمە لەماڵی کوێخای دێ بەدەر کەوتین، زۆربا کە ئەویش مەستو شادمان بوو ئارەزووی قسەی هاتبوو، وتی:

-سەرۆك، پیرێ ئێمە چیمان وت؟ وەك خۆت دەت وت دەتەوێت بیری خەڵکی ڕووناك بکەیتەوە، چاوو گوێیان بکەیتەوە، زۆرباشە، فەرموو چاوو گوێی مامە ئاناگنوستی بکەرەوە! بەچاوی خۆت بینیت ژنەکەی لەبەردەمیا چی دەکردو چۆن وەك سەگێك چاوەڕێی فەرمانی خاوەنەکەی بێت لەسەر پێ وەستابوو؟ دەبرۆ پێیان بڵێ ئەمە زوڵمە مرۆڤ خەریکی خواردنی پارچەیەك گۆشتی بەرازبێت کە هێشتا بەرازەکە زیندوەو بەبەردەمیا دێتو دەچێتو هاوار دەکات، یان ژنیش وەك پیاو مافی یەکسانی بوونی هەیە، یان گەمژەیی ئەو مرۆڤەی کە خۆی خەریکە لەبرسا ئەمرێتو کەچی سوپاسی خوایەك دەکات کە هەموو شتێکی هەیە! ئەم ئاپۆ ئاناگنوستییە بەدبەختە لەم قسەو ڕێ نماییە بێ مانایەی تۆ چ کەڵکێك وەردەگرێت؟ تۆ بێجگە لە دەردی سەری هیچ بۆ ئەو دروست ناکەیت، چی بەدایکە ئاناگنوستی دەبڕێت؟! بێجگە لە نانەوەی شەڕ لە نێوان خێزانەکەدا؟ مریشك دەیەوێت ببێتە کەڵەشێرو ئەوسا خێزانەکە تێك بەربن، سەرۆك، واز لەو خەڵکە بهێنە بەحاڵی خۆیانەوە چاوو گوێیان مەکەرەوە، ئەگەر تۆ چاوو گوێیان

بكەیتەوە ئەوان لەبەدبەختی خۆیان زیاتر چی دەبینن؟ وازیان لێ بێنە بەخەونەكانی خۆیانەوە.

كەمێك بێدەنگ بوو، سەری خوراند، بیری كردەوە، دیسان كەوتەوە قسە:

—مەگەر ئەو كاتەی ...

—مەگەر كام كات؟ بیڵێ.

—مەگەر ئەوكاتەی كە چاوت كردنەوە دنیایەكی چاكتر لەو دنیا تاریكە ببینن كە ئێستا تیا دەژین، تۆ دنیایەكی وات هەیە.؟

من نەم دەزانی، ئەوەم چاك دەزانی كە دەبێت چی بڕوخێنین، بەڵام نەم دەزانی لەسەر ئەو وێرانەیەوە دەبێت چی دروست بكەین، لەو باوەڕەیشدا بووم كە هیچ كەسێك نیە بەڕاستی ئەمە بزانێت. دنیای كۆن دنیای هەست پێكراوەو بەهێزە، تیایدا دەژین‌و بەردەوام كێشەمان لەگەڵیایەتی، بۆیە ئەمە دنیایەكە وجودی هەیە، دنیای ئایندە هێشتا نەهاتۆتە دی، هەستی پێ ناكەیت‌و ونە، لە نوورێك دروست بوە كەتان‌و پۆی خەونەكانی پێ چنراوە، هەورێكە ڕەشەباكانی وەك خۆشەویستی و نەفرەت‌و خەیاڵ‌و ڕێكەوت‌و خوا دەستەویەخەی بوون. گەورەترین پێغەمبەر ناتوانێت هیچ بەمرۆڤ بڵێت بێجگە لە دەستور پێ دانێك، چەندە ئەو دەستورە تەم‌و مژاوی‌و نادیار تربێت ئەو پێغەمبەرە گەورە تر دەبێت.

زۆربا زەردەخەنەیەكی تەوساوی كردو لێی ڕوانیم، من پێم ناخۆشبوو، پێم وت:

—من ئەو دنیا چاكترەم هەیە كە پیشانیان بدەم.

—هەتە؟ ئادەی!

—ناتوانم بەتۆی بڵێم، چونكە تێ ناگەیت.

زۆربا سەری لەقاندو وتی:

—ها! دیارە كە نیتە، تۆ وا تێ مەگە من مۆخی كەرم خواردبێت، سەرۆك، ئەگەر وایان پێ وتوویت درۆیان لەگەڵدا كردوویت، منیش وەك ئاپۆ ئاناگنوستی نەخوێندەوارم، بەڵام ئەوەندە گەلۆر نیم، نا، بەهیچ جۆرێك، باشە، كەمن تێ نەگەم ئەی ئەو پیاوە داماوەو ئەو ماكەرەی ژنی كە بەنیوەی ئەو دادەنرێت چۆنی تێ دەگەن؟ ئەی هەموو ئاناگنوستەكانی

تری دنیا چۆن تێی دەگەن؟ کەواتە تۆ دەیانخەیتە تاریکیەکی تازەترەوە؟ ئای باوکە! لێ گەڕێ لە تاریکیە کۆنەکەدا کە پێی ڕاهاتوون بمێننەوە، ئەوان تا ئێستا وایان ڕاکێشاوە، تۆ وانازانیت؟ ئەوان دەژینو چاکیش دەژین منداڵیان دەبێ و نەوە دەخەنەوە، خوا کەڕو کوێریان دەکاتو ئەوان هەر سوپاسی دەکەن. ئەوان بە بەدبەختیەکەیان دڵخۆشن، دە وازیان لێبێنەو لە خۆوە قسە مەکە.

من بێدەنگ بووم. لەوکاتەدا بە بەردەم باخچەی بێوەژنەکەدا تێ دەپەڕین، زۆربا کەمێك وەستاو هەناسەیەکی هەڵکێشاو هیچی نەوت. وەك ئەوەی لە شوێنێك باران باری بێت بۆنی خاکی تازە هەواکەی خۆش کردبو، ئەستێرە بەراییەکان بە ئاسمانەوە دەرکەوتن، مانگی نوێیش، بەڕەنگێکی زەردی سەوز کارەوە هەڵاتو ئاسمانیش لەجوانیو بێگەردیدا تەژی بوو.

بەخۆم وت: ((ئەم پیاوە نەچۆتە قوتابخانەو مێشکی تێك نەچوە، هەموو ڕەنگێکی دیوە، بیری کراوەتەوەو دڵی گەورە بوە، بێ ئەوەی جوامێریو ئازایەتیە خۆڕسکیەکەی لە دەست دابێت، ئەو هەموو مەسەلە ئاڵۆزانەی کە بۆ ئێمە چار ناکرێت، وەك ئەسکەندەری گەورەی هاووڵاتیەکەی خۆی، کە بەزەبری شمشێرێك گرێی گۆردیانی [٥٣] کردەوە ئەم چاری دەکات. هەڵەو کەوتنیشی لە مەزەبانیە، چونکە هەموو شوێنێکی، ئەم لەسەریەوە تاپێی بەزەویەوە بەستراوە، وەحشیەکانی ئەفریقا مار دەپەرستن چونکە هەموو لەشی بە زەویەوە نووساوەو گشت نهێنیەکانی دنیا دەزانێت. بەسکی، بەکلكو سەری پەی بە نهێنیەکان دەبات، ئەو هەست بەدایکی سروشت دەکات، لەگەڵیا تێکەڵ دەبێتو دەبن بەیەك، زۆربایش هەروایە، بەڵام ئێمەی خوێندەوار باڵندە بێ مێشکەکانی ئاسمانین))

---

[٥٣] Gordien بەگرێ کوێرەی گۆردیان ناوی دەرکردوە، گوایا دەنگێك لە شوێنێکی نا دیارەوە وتوویەتی هەر کەسێك ئەو گرێ کوێرەیە بکاتەوە دەبێتە فەرمانڕەوای ئاسیا، ئەسکەندەری کوڕی فلیپی مەکدۆنی لە پەرستگای زیوس لە شاری گۆردین بەزەبری شمشێرێك دەیکاتەوە، لە زمانی ئەوروپاییدا کردنەوەی گرێی گۆردیان ئیدیۆمێکە بۆ چارەسەرکردنی کێشەی سەختو ئاڵۆز بەکاردێت-ف-

تا دەهات ئەستێرەكان زیاتر دەبوون، بەنیسبەت مرۆڤەوە تووڕەو نەفرەت كارو دڵڕەق‌و هیچ جۆرە بەزەییەكیان تیانەبوو.

ئیتر ئێمە قسەمان نەدەكرد، بەترسەوە لە ئاسمانمان دەڕوانی‌و هەموو چركەیەك ئەستێرەی ترمان دەبینی كە لە خۆرهەڵاتەوە هەڵدەهاتن‌وبەری ئاسمانیان ڕوناك‌و درەوشاوەتر دەكرد.

گەیشتینە كۆختەكە، من هیچ ئارەزووی خواردنم نەبوو، لەسەر بەردێكی كەنار دەریا كە دانیشتم، زۆربا ئاگری كردەوە، خواردنی تەواو كردو ویستی بێتە لامەوە، بەڵام بیری گۆڕی، لەسەر پێخەفەكەی ڕاكشاو نووست.

دەریا زۆر هێور بوو، زەوییش لە ژێر ئەستێرە باراندا بێ جووڵەو خامۆش بوو، نەسەگ دەوەڕی‌و نەباڵندەیەكی شەو گەڕیش دەیخوێند، بێدەنگیەكی دنیاگیر، پڕ لەترس‌و نهێنی، لەگەڵ هەزاران هاوارو ناڵەی دوور كە لە ناخمانەوە هەڵدەستاو ئێمە نەمان دەبیست تێكەڵ بەیەكدی دەبوون، من تەنیا هەستم بە دەنگی لێدانی خوێنێك دەكرد كە لاجانگ‌و دەمارەكانی گەردنمی دەكوتا. بەترس‌و لەرزەوە بەخۆم وت: ئەمە دەنگی بەورە.

لەهیندستان كە شەو دادێت، بەدەنگێكی هێور گۆرانیەكی غەمگین‌و یەك شێوە دەڵێن، گۆرانیەكی سامناك‌و سست، وەك دەنگی باوێشكێكی دووری گیاندارێكی دڕندە، پێی دەڵێن گۆرانی بەور، كە مرۆڤ گوێی لێ دەبێت دەكەوێتە چاوەڕوانیەكی پڕ لەترس‌و لەرزەوە، منیش كە بیرم لەو دەنگە سامناكە دەكردەوە وردە وردە سنگی خاڵیم پڕ دەبوو، گوێم سووك‌و بێدەنگیەكەیش دەبوە هاوار، دەت وت گیانیش لەو گۆرانیە دروست بوەو دەیەوێت لەلەش دەرپەڕێ‌و گوێی لێ بگرێت.

دانەویمەوە، دەستم پڕ كرد لە ئاوی دەریاكەو لا جانگ‌و دەم‌و چاوم پێ تەڕ كرد، فێنك بوومەوە، لەقوڵایی وجودمدا هاوارەكان كەوتبوونە هەڕەشەیەكی نادیارو بێ سەبرەوە، بەورەكە لە وجودی مندا دەی نركاند، لەپڕا منیش بەئاشكرا گوێم لە دەنگە كەبوو.

لەكاتێكدا كە لەجێگاكەی خۆم بەرزە پێ ڕاپەڕیم هاوارم كرد:

بودا!... بودا!...

خێرا بەکەناری دەریاکەدا کەوتمە هەنگاونان، وەك بمەوێت ڕابکەم وابوو، ئێستا ماوەیەکە کەشەوانە تەنیام‌و بێدەنگی دەست بەسەر هەموو لایەکدا دەکێشێت گوێم لەدەنگێ دەبێت، سەرەتا دەنگێکی غەمگینەو لە شیوەن‌و لالانەوە دەچێت، بەلام هێدی هێدی تووڕە دەبێت، دەگوڕێنێت‌و فەرمان دەردەکات، وەك منالێك کە کاتی لەدایك بوونی گەیشتبێت بەسنگما دەکێشێت.

لەوە دەچو نیوەی شەو بێت، هەورە ڕەشەکان لە ئاسماندا یەکیان گرتبوو، دلۆپە درشتەکانی باران بە سەر دەستما دەڕژان، بەلام من چ بایەخێکم پێ نەدەدا، نوقمی نێو هەوای گەرم بووم‌و، لەڕاست‌و چەپما، بەسەر لاجانگمەوە هەستم بەدوو بلێسەی ئاگر دەکرد، هەر بەدەم لەرزینەوە بیرم لەوە کردەوە کە ئەم بەرداشی بودایە لەگەڵ خۆیدا ئێمەیش دەهاڕێت، کاتی ئەوە هاتوە کە خۆم لەو بارە گرانە ڕزگار بکەم.

بەپەلە گەڕامەوە کوختەکەو چراکەم داگیرساند، کە شەوقی چراکە لەدەم و چاوی زۆربای دا پێلۆی لێکدان، چاوی بەرز کردەوەو منی بینی کەبەسەر کاغەزدا کۆمابوومەوەو خەریکی نووسین بوم، لەژێرلێوەوە شتێکی وت من تێی نەگەیشتم، لەپڕا ڕووی لە دیوارەکە کردو دیسان خەوتەوە. من زۆر بەخێرایی دەمنووسی چونکە پەلەم بوو، ((بودا)) بەتەواوی هەموو گیانمی داگیر کردبوو، من دەمبینی وەك تۆمارێکی شینی پڕ لە نیشانە، لەزەینمدا دەکرایەوە، ئەوەندەیش خێرا دەکرایەوە پەلەم بوو لێی دوانەکەوم، من دەمنووسی‌و هەموو شتەکان زۆر سادەو ئاسان بەدەستمەوە دەهاتن، نەم دەنووسی، دەبێت بلێم کۆپیم دەکرد. دنیایەکم دەهاتە بەرچاو پڕ لە بەزەیی‌و خۆشەویستی، ڕەت کردنەوەو خۆ بەدەستەوە دان، کۆشکەکانی بودا، ژنانی حەرەم سەرا، کەژاوەی زێڕین، سێ ڕێکەوتە شوومەکە لەگەڵ پیرو نەخۆش‌و مردودا[٥٤]، هەڵهاتنی، خەڵوەت کێشانی،

---

[٥٤] ئاماژەیە بۆ چیرۆکی بودا کاتێ لەگەڵ نۆکەرەکەیدا لە کۆشکی میرایەتی خۆی دێتە دەرێ، لەڕێگا پیرە مێردێك دەبینێت‌و پاشان نەخۆشێك‌و دوایی مردوویەك. باسی هەرسێ حاڵەتەکە لە نۆکەرەکەی دەپرسێت‌و ئەویش بۆی باس دەکات کە ئەمانە چارەنووسی هەر کەسێکن‌و ژیان بەو جۆرە کۆتایی دێت، پیربوون‌و نەخۆش کەوتن‌و پاشان مردن. ئەمە بودا نیگەران دەکات‌و دوای ئەوەی وازی لە میرایەتی هێنا، بەرگی دەروێشی پۆشی‌و ڕووی لە دەشت‌و دەر

نەجات بوون‌و بانگەوازی رزگار بوونی... زەوی بەگوڵی زەرد داپۆشرابوو، سواڵکەرو پادشاکان کراسی زەردیان لەبەردا بوو، بەردو درەخت‌و جەستەکان سووکەڵە ببوون، رۆحەکان ببوونە هەڵم، هەڵمەکان ببوونە جەوهەرو جەوهەریش تواوبووە، پەنجەم ماندووی نووسین بوو، بەڵام من نەم دەویست‌و نەم دەتوانی دەست هەڵبگرم، ئەم خەونە تێ دەپەڕی‌و هەڵدەهات‌و دەبوو پێی بگەم.

بەیانی کە زۆربا لەخەو هەستا بوو منی دیبوو، سەرم خستبووە سەر نووسینەکەم‌و نوستبووم.

---

کرد، کەوتە بیر کردنەوەو خەڵوەت یشان، گەیشتە ئەو ڕاستیەی کە هەموو ناخۆشی‌و گیرو گرفتەکانی مرۆڤ سەرچاوەین ئارەزووەکانی نەفسە، کە توانیت ئەوە لەخۆتدا بکوژیت ئیتر ڕەنج‌و ئازار ناچێژیت، ئەمەیش کاتێک دێتەدی کە مرۆڤ بگاتە (نیرڤانا) واتا وازهێنان لە ژیانی خۆش‌و رووڵە نەبوونی کردن -و-

—٦—

که لەخەو هەستام خۆر دوورم بەئاسماندا سەرکەوتبوو، ئەمەندەم نووسیبوو دەستی ڕاستم سربببوو، نەم دەتوانی پەنجەکانم بنوقێنم، باهۆزی بوودایی بە سەرما تێ پەڕیبوو، خاڵیو ماندوو جێی هێشتبووم.

پەڕە کاغەزەکان بەسەر زەویەکەدا بڵاو ببوونەوە، نوشتامەوە تا هەڵیان بگرم، بەڵام نەتاقەتی ئەوەم هەبوو تەماشایان بکەمو نەتوانایشم تیا مابوو، دەت وت هەموو ئەو ئیلهامە بێ ئامانانە تەنیا خەون گەلێك بوون کە نەم دەویست لە زیندانی وشەدا بمێننەوە یان بە وشە لەنرخیان کەم بکەمەوە.

ئەو ڕۆژە باران بەکاو خۆ دەباری، زۆربا پێش ڕۆیشتنی خۆی وەجاخەکەی داگیرساندبوو، من هەموو ئەو ڕۆژە چوارمشقی دانیشتمو بێ ئەوەی هیچ بخۆم بێ جووڵە دەستم بەسەر ئاگرەکەوە گەرم دەکردەوە، گوێم لە دەنگی یەکەم بارانی ئەو وەرزە گرتبوو کە لە سەرخۆ دەباری.

بیرم لەهیچ نەدەکردەوە، سەرم وەك مشکە کوێرەیەك کە لەزەویەکی شێدارا گرمۆڵە بووبێت حەیابوەوە، من گوێم لە جوڵەو ورتەو ژاوە ژاوی زەویو دەنگی نمەی بارانو ئەو تۆوانە بوو کە دەترەکین، هەستم دەکرد کە زەویو ئاسمان، چۆن لەسەرەتای دروست بونیاندا کەوەك ژنو مێردێك تێکەڵ بەیەك بوونو منالیان خستەوە هەر ئاواجووت دەبنەوە، بەرانبەرم، بەدرێژایی کەناری دەریاکە، گوێم لە دەنگو نرکەی دەریا بوو، وەك جانەورێکی دڕندە کە زمانی بۆ ئاو خواردنەوە دەرکێشابێت ڕۆخەکەی دەلستەوە. من شادمان بووم، ئەوەیشم دەزانی ئێمە بەدەگمەن هەست بەو بەختیاریە دەکەین کە تیایدا دەژین، تەنیا ئەو کاتە نەبێت کە بەختەوەریەکەمان تێ دەپەڕێو ئێمە بەرەو دوا ئاوڕ دەدەینەوە، لەپڕا هەست بەوە دەکەین— هەندێك جار بەسەرسامیەوە—کە چەندە

بەختەوەر بووین، بەڵام من لەو کەناری کریتەدا بەختەوەر دەژیام و خۆیشم هەستم بەو بەختەوەریە دەکرد.

دەریایەکی گەلێك شین و پان وپۆڕ، کەتا کەنارەکانی ئەفریقا درێژ دەبوەوە، زۆرجار بای زۆر گەرمی باشور هەڵی دەکرد، گڕەیەك بوو لەناوچە لماویە گەرم و دوورەکانەوە دەهات، سەر لەبەیانیان دەریاکە بۆنی کاڵەکی لێ دەگرت، نیوەڕۆ لەسەر خۆ دەبوە هەڵم، تەنیا شەپۆلێکی سووکی هەبوو هەر بەئەندازەی مەمکێکی تازە گۆپکە کردو، شەو هەناسەی هەڵدەکێشاو ڕەنگی گوڵی سورو شەرابی و باینجانی و شینی تۆخی لەخۆ دەگرت.

دوا نیوەڕۆکانم بەوە بەسەر دەبرد کە دەستم پڕ دەکرد لە قومی زەرد باوی کەنار، کە قومە گەرم و نەرمەکە لەنێو پەنجەکانمەوە دەخزایە خوارێ هەستم بەخۆشیەك دەکرد، دەست وەك سەعاتێکی لمین وایە کە ژیانی ئێمە بەلایدا تێ دەپەڕێ و لەناو دەچێت، تەمەن تێ دەپەڕی و من تەماشای دەریام دەکرد، گوێم لە دەنگی زۆربا دەبوو، لەخۆشیاندا وام هەست دەکرد لاجانگەکانم پل دەدەن.

لەبیرمە ڕۆژێك لەگەڵ برازایەکی چکۆلەم دا –ئالکا[٥٥] کەکچۆڵەیەکی چوار ساڵان بوو، ڕۆژی پێش سەری ساڵی نوێ چووین بۆ تەماشای پیشانگایەکی کەرەسەی یاری فرۆشتن، لەکاتی وەستاندا ڕووی تێ کردم و ئەم ڕستە سەیرەی پێ وتم:

((مامە ئوگر[٥٦]، من هێند خۆشحاڵم لە خۆشیاندا شاخم لێ ڕواوە))

من سەرم سوڕما، ژیان چ موجیزەیەکە! چۆن هەموو ئەو گیانانەی ڕەگیان تەواو لە قوڵیدایە پێك دەگەن و تێکەڵ بەیەکتر دەبن! چونکە یەکسەر من بیرم لە سەرێکی بودا کردەوە کە لە داری ئابەنووس دروستیان کردبوو، من ئەوسەرەم لەمۆزەخانەیەکی دوردا دیبو، بودا خۆی ئازاد کردبوو، دوای حەوت ساڵ دابڕان تەواو شادو بەختەوەر ببوو، دەمارەکانی تەوێڵی لە چەپ و ڕاستەوە ئەوەندە هەڵئاوسابوون کە لە ژێر پێستەکەیەوە دەرکەوتبوون و ببوونە دوو شاخی پتەوی پێچاو پێچی سپرنگ ئاسا.

---

٥٥ Alko

٥٦ Ogre

لەعەسرا ئەمە بارانەکە خۆشی کردو دیسان ئاسمان بوەوە بەسایەقە، برسیم بوو دڵخۆش بووم بەبرسیەتیەکەم، چونکە ئیتر زۆربا دەگەیشت، ئاگری دەکردەوەو دەستی بە ئاهەنگی چێشت لێنانی ڕۆژانە دەکرد.

زۆربا کە مەنجەڵی دەنایە سەر ئاگر زۆرجار دەیوت:

-ئەمەش لەو شتانەیە کە هەرگیز کۆتایی نایەت، ژن، لەعنەتی خوای لێ بێت. تەنیا چیرۆکی بێ کۆتایی نیە، خواردنیش هەروایە. یەکەمجار بوو لە سەر ئەو کەنار دەریایەدا هەست بەلەزەتی خواردن بکەم. سەر لەئێوارە زۆربا لەبەینی دوو بەردا ئاگری دەکردەوەو خواردنی دروست دەکرد، ئەنجا دەستمان بە خواردن‌و خواردنەوە دەکرد. قسەیشمان لەیەکدی گیردەبوو، پاشان لەوە دەگەیشتم کە خواردنیش کارێکی ڕۆحیەو، گۆشت ونان‌و شەراب کەرەسە گەلێکی خاون کە ڕۆحیان لێ دروست دەبێت.

سەر لە ئێوارە، دوای کاری ڕۆژانەو پێش نان خواردن‌و خواردنەوە زۆربا حاڵی باش نەبوو، بێ حەوسەڵەو دەبوو بەزۆر قسەی پێ بکەیت، هەڵس‌و کەوتیشی ناجۆرو ماندوویەتی پێوە دیاربوو، بەڵام وەك خۆی دەیوت کە بەنزینی دەکردە ماشێنەکەیەوە ئیتر ماتۆرە سست‌و ماندوەکەی لەشی دەبزوت‌و دەکەوتەوە گەڕ، چاوی شەوقی دەدایەوەو یادی ڕابووردووی دەکردەوە، قاچی باڵی لێ دەڕواو دەکەوتە سەما، دەیوت:

-پێم بڵێ چی بەو خواردنە دەکەیت کە دەی خۆیت تاپێت بڵێم تۆ کێیت.

هەیە ئەوەی دەی‌خوات دەیکاتە چەوری‌و پیسی، هەیە دەیکاتە بەزم‌و کارو خۆشی، باقیەکەی تری وەك بیستوومە دەیکەن بە خوا، بەم پێ‌یە سێ جۆر مرۆڤ هەن، من نە لە چاکترینی ئەوان‌و نەلە خراپترینیانم، بەڵکو و لەناوەڕاستی هەردووکیاندام، یەعنی ئەوەی دەی خۆم دەیکەمە بەزم‌و کارو خۆشی، ئەمەیان زۆر خراپ نیە.

تەماشایەکی زۆڵانەی کردم‌و پێکەنی، دیسان وتی:

-بەڵام تۆ، سەرۆك، وابزانم دەتەوێت ئەوەی دەی خۆیت بیکەیت بە خوا، بەڵام ناتوانیت‌و لەبەر ئەوەیە ئازار دەچێژیت، تۆیش بەدەردی قەلەڕەش چوویت.

-قەلەڕەش چی بەسەرا هاتوە، زۆربا؟

–وەك دەیزانیت قەلەڕەش لە سەرەتاوە بە شێوەیەکی جوانو رێكو پێك، واتا وەك قەلەڕەش بەرێدا دەڕۆشت، رۆژێك بەسەریا هات وەك کەو بەرێدا بڕوات، ئیتر لەو ساوە تا ئێستا، قەلەڕەشی داماو جۆری رێگا رۆشتنەکەی خۆیشی لەبیرچووەوە، ئێستا نازانێت چ قوڕێك بەسەر خۆیدا بکات، دەڕواتو دەشەلێت.

* * *

سەرم بەرز کردەوەو گوێم لە دەنگی پێی زۆربا بوو کە لەکانزاکەوە سەردەکەوت، دوای کەمێك نزیك کەوتەوە، دەمو چاوی درێژو مۆن بوو، باسکی درێژی شل و شەکەت بوون، لە ژێرلێوەوە وتی:

–سام[٥٧] سەرۆك.

–سڵاو هاوڕێ، کاری ئەمرۆ چۆن بوو؟

زۆر با وەڵامی نەدامەوە ، تەنیا ئەوەندەی وت:

–ئێستا ئاگر دەکەمەوە و خواردن دروست دەکەم.

باوەشێك داری لەگۆشەیەك هەڵگرت، شارەزایانە لقەکانی لەنێوان دوو بەردا لەسەر یەك داناو ئاگری پێوەنا، کیتەڵەیەکی خستە سەر، ئاوو پیازو تەماتەو برنجی تێ کردو دەستی بەچێشت لێنان کرد.

منیش سفرەیەکم لەسەر مێزە خڕە نزمەکە راخست، نانی گەنم لەتی گەورە کردو، لەو گۆزە وێنە لەسەر کراوەی ئاپۆ ئاناگنوستی لەرۆژانی بەراییدا پێی بەخشیبووین شەرابم تێکرد، زۆربا لەبەردەم کیتەڵەکەدا لەسەر ئەژنۆ دانیشتبوو، چاوی کرابوونەوەو بێدەنگ لەئاگرەکە ورد دەبووەوە، کت و پڕ لێم پرسی:

–بەراست زۆربا تۆ منالٚت هەیە؟

رووی تێ کردم و وتی:

–بۆ دەپرسیت ؟ بەڵێ، کچێکم هەیە.

–مێردی کردووە؟

---

[٥٧] سام کورت کراوەی ((سلام علیکم)) ە.

-زۆر پێ‌کەنی.

-بۆ پێ دەکەنیت زۆربا؟

وتی: ئەمە پرسی ناوێت، بێگومان شووی کردووە، بێ عەقڵ نیە، من لەکانێکی مسدا لەپراڤیتسا[-٤-] کە دەکەوێتە چالسیدیکەوە[-٥-] کارم دەکرد، ڕۆژێك لەیانی[-٦-] برامەوە نامەیەکم پێ گەیشت، بەراست بیرم نەبوو پێت بڵێم من برایەکم هەیە، پیاوی ماڵو ژیانەو عاقڵەو دەچێتە کڵێسەو سووخۆرو ریابازە، ئەوانەی پێیان دەڵێن کۆڵەکەی کۆمەڵ، لەسالۆنێکدا دوکانی وردە فرۆشی هەیە، لەنامەیەکدا نووسیبووی: "برام ئالکسیس، فروست و[-٧-]ی کچت لەرێ دەرچووەو ناوی خێزانەکەمانی لەکەدار کردووە، دۆستێکی هەیەو منالیشی لێی بووە، حەیامانی بەتەواوی بردووە، من دەڕۆم بۆ گوندو سەری دەبرم"

-باشە ئەی تۆ چیت کرد زۆربا؟

زۆربا شانی هەڵتەکاند و وتی:

-هیچ، وتم تف لەم ژنانەو نامەکەم دڕاند.

برنجەکەی تێکدا، خوێنی تێ کردو پێکەنینێکی گاڵتەجاڕانەی کرد.

-ڕاوەستە تا ئەو دیوی ڕووداوەکە ببینیت کە چەندە پێکەنیناویە، دوو سێ مانگ دوای ئەوە نامەیەکی ترم لەبرا کەرەکەمەوە پێ گەیشت، کەرە نوسیبووی "برای ئازیزم ئالکسیس، دوای هیوای سەلامەتیو بەختەوەریت، مژدەت دەدەمێ کە ئابڕووە تکاوەکەمان گەڕایەوە جێگای خۆی، تۆ ئێستا دەتوانیت سەرت بەرز ڕابگرێت، چونکە ئەو پیاوەی بۆم باس کردبوویت فروسوی خواست"

---

-٤- pravitsa

-٥- Chalcidic

-٦- yanni

-٧- Phrosso

زۆربا سەری وەرگێڕاو تەماشای کردم، لەبەر شەوقی ئاگری جگەرەکەیدا چاویم بینی چۆن پریشکیان دەدا. دیسان شانی هەڵتەکاندو بەسووکایەتی پێ کردنێکەوە کەناتوانیت وەسفی بکەیت لەسەر قسەکەی ڕۆیشت:

–تفیش لەو جۆرە پیاوانە.

دوای کەمێك دیسان وتی:

((چی لەژن چاوەڕوان ئەکرێت، بێجگە لەوەی لەگەڵ یەکەم پیاودا کەپێك دەگەن بەسەر یەکتردا بتلێنەوەو منالیان بێت؟ ئەی چی لەپیاو چاوەڕوان دەکرێت، بێجگە لەوەی کە بکەوێتە ناو داوەکەوە؟ ئەمە لەیاد نەکەیت سەرۆك!))

کیتەڵەکەی لەسەر ئاگرەکە داگرت و دەستمان بەخواردن کرد.

دیسان زۆربا کەوتەوە ناو بیرکردنەوەوە، خەمێك ئازاری دەدا، تەماشای دەکردم، دەمی دەکردەوەو دەیبەست، لەبەردەم ڕووناکی چرا زەیتیەکەدا چاوی بەفرمێسك و دڵی خەمباریم بەچاکی دەبینی، ئیتر خۆم پێ نەگیراو وتم:

–زۆربا، تۆ قسەیەکت هەیەو دەتەوێت پێمی بڵێیت، چاکە، دەبیلێ ئەمە گرێیەکە لەسەردلتا، بیلێو خۆت رزگار بکە.

زۆربا بێدەنگ بوو، بەردێکی بچووکی هەلگرت و بەهەموهێزیەوە لەپەنجەرە کراوەکەوە فرێی دایە دەرەوە.

وتم: لەوردە بەرد گەڕێو قسەکە بکە.:

زۆربا ملە چرچ و لۆچەکەی درێژکردو چاوی لەناو چاوم بڕی، بەکەسەرێکی تایبەتەوە پرسی:

–سەرۆك، تۆ بڕوات بەمن هەیە؟

لەوەلامدا وتم:

بەلێ، زۆربا، دەزانم تۆ هەر کارێك بکەیت هەڵەی تیا ناکەیت، تەنانەت ئەگەر خۆیشت بتەوێت ناتوانیت بیکەیت، بۆ نموونە: تۆ لەشێر یان لەگورگ دەچیت، ئەمانە هەرگیز وەك مەڕو گوێدرێژ رەفتار ناکەن و هەرگیز لەسروشتی خۆیان لا نادەن، تۆیش تا سەر ئێسقان زۆربایت.

زۆربا سەری راوەشاندو وتی:

–بەڵام من نازانم بۆ کوێ دەچین؟

–من دەزانم، تۆ خەمی پێ مەخۆو کاری خۆت بکە.

زۆربا بەدەنگی بەرز وتی:

–جارێکی دی ئەمە بڵێرەوە، سەرۆك، بائازاتر بم.

–وتم بۆ پێشەوە، تۆکاری خۆت بکە.

چاوی زۆربا پرپیشکی‌داو وتی:

–ئێستا دەتوانم قسەت لەگەڵدا بکەم، رۆژانێکە نەخشەیەکی گەورەم لەسەرایە، بیرێکی شێتانە، ئایا دەتوانم دەست بەکاربم؟

–بۆ پێویست بەپرسیار کردن دەکات؟ ئێمە بۆ ئەوە هاتووینەتە ئێرە بیرمان بخەینە کار.

زۆربا ملی راکێشا، بەخۆشی‌و ترسەوە تەماشای کردم و هاواری کرد:

–راست بڵێ سەرۆك، مەگەر ئێمە بۆ دەرهێنانی خەڵوز نەهاتوینەتە ئێرە؟

–خەڵووز بیانوویەکە تا خەڵکی ئەم ناوە گومانمان لێ نەکەن، ئێمە بەبەڵێندەرێکی دەوڵەمەندو خانەدان بزانن و بەتەماتە پێشوازیمان لێ نەکەن، تێگەیشتی زۆربا؟

دەمی زۆربا لەسەر سامیا هەر کراوە بوو، ئەیویست تێ بگاو نەی ئەتوانی بەر لەهەموو خۆشحاڵیەکەی بگرێت، لەپڕا لەمەبەستەکە تێ گەیشت، هاتەلامەوە، شانی گرتم و بەشەوقەوە پرسی:

–تۆ سەما دەزانیت، سەرۆك؟ سەما دەکەیت؟

–نا.

–نا؟

بەحەپەساوییەوە دەستی شل بوو، دوای کەمێك رامان وتی:

–باشە، بەڵام من سەما دەکەم، سەرۆك تۆ کەمێك برۆرە ئەو لاوە تا پێت پیانەنێم، هوو هە،... هوو هە!

راپەڕی، بازی دایە ئەو دیو کۆختەکەوە، پێڵاوەکانی پێی پەرت کرد، چاکەت و مێلەکەکەی داکەندو فڕێی دان، پانتۆڵەکەی تا ئەژنۆ سەرخست و دەستی بەسەما کرد، هێشتا دەم و چاوی ڕەشایی خەڵووزی پێوەبوو، سپێنەی چاوی دەبریسکایەوە. کەوتە سەما کردن، دەستی بەیەکدا دەداو بەرز دەبووەوە، لەهەوادا دەسوڕا، دادەکەوتەوەو ئەژنۆکانی دەچەماندەوە، پاشان هەر بەو ئەژنۆ چەماوەیەوە بەرز دەبۆوە، دەت وت لەشی لەلاستیك دروستکراوە، لەپڕا جارێکی تر خۆی بۆ بەرزتر هەڵ دەدا، وەك بیەوێت گاڵتە بەیاساکانی سروشت بکات و بفڕێت. هەستت دەکرد لەو جەستە پیرەدا گیانێکی سەرکێش هەیە، گیانێك دەیەوێت لەشەکە لەگەڵ خۆیدا بەکێش بکات تا هەردووکیان پێکەوە وەك ئەستێرەیەکی کشاو بکەونە تاریکیەوە. ئەو گیانە لەشی بەرەو ئاسمان دەجووڵاند، بەڵام دیسان دەکەوتەوە، چونکە نەی دەتوانی لەوە زیاتر خۆی لەهەوادا بگرێت.

جارێکی تر بێ بەزەییانە گیان‌و لەشی ڕادەدا. ئەمجارە کەمێك زیاتر بەرز دەبووەوە، بەڵام جەستەی داماو دیسان بەهەناسە بڕکێ دەکەوتەوە سەر زەوی.

بڕۆکانی زۆربا گرێیان تێ کەوتبوو، ڕووی حاڵەتێکی جیدی‌و دوو دڵی لەخۆگرتبوو، ئیتر دەنگی بەرز نەدەکردەوە، شەویلاکی لەیەکدی گیر کردبوون و دەیویست ئەوەی ناکرێت بەدی بێنێت.

بانگم لێ کرد: زۆربا ، زۆربا، ئیتر بەسە.

ترس دایگرتم، ترسی ئەوەی کە ئەو لەشە پیرەڵۆکە بەرگەی ئەم هەموو هیلاکیە نەگرێت و ببێت بەهەزار پارچەوەو هەر پارچەیەکی بکەوێتە لایەکەوە. من دەمتوانی زۆری هاوار بەسەردا بکەم، بەڵام کەی زۆربا گوێی لەهاواری سەر زەویە؟ هەموو لەشی وەك لەشی باڵندەی لێ هاتبوو.

من بەکەمێك دوو دڵیەوە تەماشای سەمای وەحشیانەو نائومێدانەکەیم دەکرد، کە مناڵ بووم توانای خەیاڵم هەمیشە لەکارداو شتی ئەوەندە سەیرم بۆ هاوڕێکانم دەگێڕایەوە کە خۆیشم بڕوام پێی نەبوو.

ڕۆژێك هاوڕێ چکۆلەکانی قوتابخانەم لێیان پرسیم: "بەڕاست باپیرت چۆن مرد؟" من بێ سێو دوو ئەفسانەیەکم دروست کردو، وردە وردە کە دەم خستە سەرێو پێمەوە دەنا خۆیشم بڕوام پێ هێنا. وتم:

"باپیرم پێڵاوی لاستیکی لەپێ دەکرد، ئەو کاتەی کە ردێنی سپی ببوو، ڕۆژێك لەسەربانەوە خۆی فڕێدایە خوارێ، بەڵام هەر کە کەوتە سەر زەوی وەك تۆپ بەرەو سەرووی خانوەکەمان بەرز بووەوە، بەرزو بەرزتر ڕۆیشت تا لەناو هەورەکاندا ون بوو، بەڵێ، باپیرم ئاوا مرد."

لەو ڕۆژەوە کە خۆم ئەو ئەفسانەیەم دروست کرد، هەر جارێك کە دەڕۆیشتمە کڵێسا چکۆلەکەی سانت میناس و پەیکەری سەرکەوتنەکەی عیسام بۆ ئاسمان دەبینی بەپەنجەم ئاماژەم بۆدەکردو بەهاوڕێکانم دەوت:

"تەماشاکەن، ئەوە باپیرمە بەپێڵاوە لاستیکەکانیەوە"

عەسری ئەو ڕۆژەیش، ساڵانێك دوای ئەو ڕووداوە، کە زۆربام بەو جۆرە بینی بەرز دەبوەوە بە سەرسامیەوە بیری ئەو چیرۆکە منالانەیەم کەوتەوە، وەك لەوە بترسم نەکا زۆربایش لەناو هەورەکاندا بێ سەرو شوێن بێت، بۆیە هاوارم کرد:

—زۆربا ، زۆربا، ئیتر بەسە.

ئیتر زۆربا کەوتە هەناسەبڕکێو چوار مشقی لەسەر زەویەکە دانیشت، لەخۆشیا دەم و چاوی دەدرەوشایەوە، موە خۆڵەمێشیەکەی بەتەوێڵیەوە نووسابوو، ئارەقەیش کە تێکەڵ بەتۆزی خەڵوز ببوو بەسەر ڕوومەت و چەناگەیدا دەهاتە خوارێ، بەنیگەرانیەوە بەسەریاو نوشتامەوە، دوای کەمێك وتی:

—ئێستا کەمێك ئاسودە بووم، وەك خوێنم لێ گیرابێت، ئیتر ئەتوانم قسە بکەم.

گەڕایەوە ناو کۆختەکە، لەبەردەم مقەڵیەکە دانیشت و بەڕوویەکی خۆشەوە لێم ڕاما، پرسیم:

—چیت بوو وا هاتیتە سەما؟

—دەت ویست چی بکەم، سەرۆك؟ لەخۆشیاندا خەریك بوو خەفە دەبووم، ناچار بووم هەناسەیەك بدەم، چۆن ئەمە بکەم؟ بەقسە؟ های! های! های!

—خۆشیی چی؟

دەم و چاوی گۆڕا، لێوی لەرزیو وتی:

—چۆن خۆشیی چی؟ ئەی ئەم هەموو قسانەی كە تۆ ئێستا كردنت چی بوون؟ یان لەمانایان تێ نەگەیشتوویت؟ تۆ خۆت وتت ئێمە بۆ خەڵوز نەهاتووینەتە ئێرە، مەگەر وات نەوت؟ وتت هاتووین كات بەسەر بەرین، چاوبەستێكە لەخەڵكیش تا وا نەزانن شێتینو بماندەنە بەرتەماتە، بەڵام كە خۆمان تەنیا دەبینو كەسمان لێوە دیار نابێت قاقا پێدەكەنین، مەگەر ئەمانەت نەوت؟ بەشەرەفم منیش هەر ئەمەم دەخواست و بەڵام چاكی لێ تێ نەدەگەیشتم، من جارێك بیرم لەخەڵووز دەكردەوە، جارێك لەدایكە بوبولینا، جارێكیش لەتۆو... سەرم لێ شێوابوو، كە تونێڵێكم لە كانەكەدا لێ دەدا بەخۆم دەوت:" من بەدوای خەڵووزا دەگەڕێم" بۆیە سەرتاپای لەشم دەبوە خەڵووز، بەڵام كە كار تەواو دەبوو دەچوومە لای ئەو مالوسە پیرە، لەبەرچاوما هەموو خەڵووزی لینیت و هەموو سەرۆكەكان دەبوونە ئەو قردێلە باریكەی كە بەدەوری ملیا ئاڵاندبویو، خودی زۆربایشیان لەگەڵ بێت، ئیتر شێت دەبووم، پاشان كە بەتەنیا دەمامەوەو كارم نەدەبوو بیرم لەتۆ دەكردەوە، سەرۆك، دڵیشم پڕ دەبوو، ئەو بیركردنەوەیە وەك بارێكی قورس وابوو بەسەر شانمەوە، بەخۆم دەوت:" ئەمە خەجاڵەتیە، زۆربا، حەجاڵەتیە تۆ ئەو پیاوە ناسكە بخەڵەتێنیت و پارەكەی بخۆیت، ئەم ریسواییە تاكەی؟ بەس نیە" بەتۆم وت:" سەرۆك، من شێت دەبم، شەیتان لەلایەكەوە رامدەكێشێت و خوا لەلاكەی ترەوە، هەردووكیان لەناوەڕاستا دووكەرتیان دەكردم، خوا كارت راست بكات سەرۆك، قسەیەكی چاكت كردو منت گەشاندەوە، ئێستا لەوەگەیشتم كە هەردووكمان هاوڕێی یەكین، دەبێت ئاگر بەبارودەكەوە بنێین، ئێستا چەندت پارە پێیە؟ بیهێنە، هەمووی دەخۆین"

زۆربا ئارەقەی دەم و چاوی سڕیو تەماشای ئەم لاوئەولای خۆی كرد، پاشماوەی خواردنەكەمان هێشتا لەسەر مێزە بچووكەكە بوو، دەستە گەورەكانی درێژ كردو وتی:

—بەیارمەتیت، سەرۆك، من هێشتا برسیمە.

لەتێك نان، پیازێك و مشتێك زەیتوونی هەڵگرت. زۆر بە تاسوقەوە دەیخوارد و كاسەكان بێ ئەوەی بەر لێوی بكەون چیان تیابوو لەدەمیەوە بەرەو خوار دەبوونەوە،

لەگۆزەکەوە شەرابەکەی قلّپ قلّپ دەکردە جامەکەوەو، زۆر بەخۆشیەوە ملّچە ملّچی دەکردو دەی وت:

—ئێستا هەست دەکەم هاتوومەتەوە سەرخۆم.

چاوی لێ داگرتم و پرسی:

—تۆ بۆ پێناکەنیت، سەرۆك؟ بۆ وام تەماشا دەکەیت؟ ئیتر من وام، لەناوەوەی مندا شەیتانێك هەیەو هاوار دەکات، ئەو هەر چیەکەم پێ بلّێت دەیکەم، هەر جارێك لە ناخۆشیو دیق کردنابم بانگی سەماکردنم لێدەکات.

منیش سەما دەکەم، ئەمە ئاسوودەییم پێ دەبەخشێت، کاتێك کە دیمیتراکی [٨] کوڕم لەکالسیدیك مرد من هەر وەك ئێستا هەستام و سەمام کرد، هاوڕێو کەسەکانم کەمنیان لەبەردەم لاشەکەدا وا بینی هاتن نەهێلّن سەما بکەم، کەوتنە هاوار:" زۆربا شێت بووە،" بەلاّم ئەگەر من لەو شوێنەدا سەمام نەکردایە خەم و خەفەت شێتی دەکردم، چونکە ئەوە یەکەم کوڕم بوو،تەمەنی سێ سالّ بوو، من نەم دەتوانی خۆم لەبەردەم مەرگیدا رابگرم، ئەزانیت چی دەلّێم، سەرۆك، یان لەگەلّ دیواردا قسە دەکەم؟

—تێ دەگەم زۆربا، تێ دەگەم، تۆ لەگەلّ دیواردا قسە ناکەیت.

—جارێکی تر لەرووسیا، نزیك بە نوڤوروسیسك [٩] بووم.. بۆ ئەوێیش هەر بۆ کانزا چووبووم، بەکورتی بۆ کانی مس، پێنج شەش وشەی رووسی فێر بووبووم، هەر ئەوەندەی کارەکانمی پێ رایی بکەم. لەوانە:" نا، بەلّێ، نان، ئاو، خۆشم دەوێیت، وەرە، چەند؟" لەگەلّ پیاوێکی رووسیدا، لەو بەلشەفیانەی ئاگریان دەکردەوە بوومە هاوڕێ، هەموو شەوێك دەچووینە مەیخانەیەکی بەندەرو چەند نیو قاپێك ڤۆدکامان هەلّدەدا، ئەمە دەی هێنایەنەوە سەر خۆمان، هەر کە سەرمان گەرم دەبوو دەرگای دلّمان بۆ یەکتر دەکردەوە، ئەو دەیویست لەسەردەمی شۆڕشی روسیادا چی بەسەرهاتبوو بەدرێژی بۆم باس بکات، منیش دەمویست هەموو شتەکانی خۆمی پێ بلّێم...ئێمە لەگەلّ یەکدا مەست دەبووین و هاوڕێ بووین، هەر بەئامارەو جوولّە تا ئەندازەیەك یەکدیمان تێ دەگەیاند،

---

[٨] Dimitraki

[٩] novo Rossisk

یەکەمجار ئەو قسەی دەکرد، کە دەگەیشتنە ئەو شوێنەی من تێی نەدەگەیشتم بەسەریا دەم قیڕاند کە: بوەستە، ئەوسا ئەکەوتە سەماکردن. تێ دەگەیت، سەرۆک؟ یەعنی دەیویست بەسەماکەی باسەکەیم تێ بگەیەنێت، منیش هەروام لەگەڵ ئەودا دەکرد، واتا هەر شتێك نەمانتوانیایە بەزمان لەیەکتری بگەیەنین بەپێ، بەدەست، بەسك، یان بەهاواری ئاژەڵیانە دەمانووت: های! های! هولالا، هوهی.

" سەرەتا کابرای رووسی باسی ئەوەی کرد کە چۆن هاوڕێ یان تفەنگیان هەڵگرت، چۆن شەڕ دەستی پێ کرد، چۆن گەیشتنە نوڤوروسیسك، کە دەگەیشتە ئەوەی لەقسەکان نەگەم دەستم بڵند دەکردو هاوارم لێ‌هەڵدەستا: بوەستە. رووسیەکە زوو لەجێگاکەی رادەپەڕی، دەی، دەستی بەسەما دەکرد، وەك یەکێك دەستی لێ وەشێنرا بێت سەمای دەکرد، من تەماشای دەستی، پێی، سنگی‌و چاویم دەکردو لەهەموو شتێکی دەگەیشتم دەمزانی چۆن هاتۆتە نوڤوروسیسك، چۆن سەرۆکەکانی خۆیان کوشتووە.

چۆن دوکانەکانیان تالان کردووە، چۆن چوونەتە سەرماڵان و ژنیان فڕاندووە، لەسەرەتاوە ئەو سۆزانیانە گریاون، دەم و چاوی خۆیان رنیوەتەوەو چنگاوشی پیاوەکان بوون، بەڵام وردە وردە راهاتوون، چاویان داخستووەو لەخۆشیا کەوتوونەتە نازو نووك، ئیتر ئەمەیە ژن!

"ئینجا نۆرە ئەهاتە سەر من، هەر لەسەرەتای قسەکانمەوە کابرای رووسی، رەنگە لەبەر ئەوەی کەمێك گوێی گران و عەقڵیشی باش کاری نەدەکرد، هاواری لێ هەڵدەستا: بوەستە، منیش هەر ئەوەم لێ چاوەڕێ دەکرد، لەشوێنەکەم هەڵدەستام، کورسی‌و مێزم لادەداو دەکەوتمە سەماکردن.

ئای هاوڕێ نەگبەتەکەم! لەراستیا زۆر کەس روخاون! خوا بیان گرێت! لەشیان لەبێ کاریا لاڵ کردووە، ئێستا تەنیا دەتوانن بەدەمیان قسە بکەن، ئاخر دەم دەتوانێت چی بڵێت؟ خۆزگا دەت بینی ئەو رووسیە چۆن هەموو لەشی بۆ من دەکردە گوێ‌و چۆن لەهەموو شتەکان دەگەیشت؟ من هەر بەسەما کردن باسی نەگبەتی خۆم و سەفەرەکانم بۆ دەکرد، چەند ژنم هێناوەو چ کارێك دەزانم، بەرد تاشین، کرێکاری کان، چەرچیەتی،

گۆزەگەری، بەرگری میللی، سەنتور لێدان، هێلکە فرۆشی، ئاسنگەری، قاچاخچیەتی، چۆن خراومەتە زیندانەوە، چۆن هەڵاتووم و چۆن گەیشتوومەتە رووسیا...

"ئەو لەگەڵ ئەوەیشدا کە گوێی گرانبوو لەهەمووی دەگەیشت، هەمووی، دەست و پێم قسەیان دەکردو قژۆجلەکانیشم، تەنانەت ئەو چەقۆیەش کە کردبووم بەپشتێنەکەمدا هەر دەدوا، کە لێ دەبوومەوە ئەو کەرە گەورەیە لەباوەشی دەگرتم و ماچی دەکردم، دیسان لیوانەکان مانپڕ لەقۆدکا دەکردو لەباوەشی یەکترا دەگریاین‌و پێ دەکەنین، لەبەرە بەیاندا لەیەکتر جیا دەبووینەوەو لۆژ لۆژ بەرەو نووستن دەچووین، لەئێوارەدا جارێکی‌تر یەکدیمان دەدۆزیەوە...

"پێ دەکەنیت، سەرۆک؟ باوەڕ ناکەیت؟ بێگومان لەدڵی خۆتا دەڵێیت: ئەم قسە قۆڕانە چیە ئەم سەندبا دی بەحریە هەڵیان دەبەستێت؟ دەشێت بەسەما مرۆڤ بتوانێت لەگەڵ یەکتردا بدوێت؟ بەڵام، سوێندت بۆ دەخۆم کە خواو شەیتانەکانیش هەر بەم جۆرە قسە لەگەڵ یەکدیدا دەکەن..

"وا بزانم تۆ خەوت دێت، تۆ زۆر ناسك و نازداریت و بەرگە ناگریت، برۆ بنوو، سبەی لەم بارەیەوە قسە دەکەینەوە، من پلانێکم هەیە، پلانێکی زۆر باش، سبەی لەو بارەیەوە لەگەڵتا دەدوێم، جگەرەیەکی تر دەکێشم، رەنگە خۆم لەدەریایش بهاوم، جەستەم ئاگری گرتووەو دەبێت دامرکێمەوە، شەوباش"

ماوەیەکی زۆری پێ چوو تا خەوم لێ کەوت، بیرملەوە دەکردەوە کە تەمەنم بەفیڕۆ چووە، خۆزگا بمتوانیایە بەئیسفنجێك هەموو ئەو شتانەی خوێندوومنەتەوە، ئەوەی دیومەو بیستوومە بیان سڕمەوە، پاشان بێمە قوتابخانەکەی زۆرباوەو لەنووکەوە دەست بەئەلف‌و بێی گەورەو رەسەن بکەم، ئەوسا ئەو رێگایەی لەپێشم دەگرت چەندە جیاواز دەبوو! ئەوسا هەر پێنج هەستەکەم و تەواوی لەشم دەخستەکار تا چێژ وەربگرن و شت فێربن، فێری رۆیشتن و زۆران و مەلەو ئەسپ سواری‌و سەوڵ لێدان و ماشێن لێخوڕین و شەرە تفەنگ دەبووم. رۆحم پڕ دەکرد لەجەستەم و جەستەم پڕ دەکرد لەرۆح، دوایش ئەم دوو دوژمنە دێرینەیەم لەناخی خۆمدا ئاشت دەکردەوە.

هەر چۆن لەسەر دۆشەکەکەم دانیشتبووم وایش بیرم لەوە دەکردەوە کە چۆن تەواوی ژیانم بەخەسار چوو بوو. لەدەرگا کراوەکەوە زۆربام لەپەنایەکدا لەبەر تیشکی ئەستێرەکاندا دەبینی، لەسەر بەردێك وەك باڵندەی شەو چوار مشقی دانیشتبوو، ئیرەیم پێ دەبرد، دەمزانی ئەو گەیشتۆتە حەقیقەت و رێگای راستیش هەر ئەوەیە کە ئەو گرتوویەتی.

ئەگەر زۆربا لە سەردەمانێکی سەرەتاییو داهێناندا بژیایە بێگومان سەرۆکی خێڵ دەبوو، لەپێش هەموومانەوە دەڕۆیشت و بەتەور زینەکەی رێگاکەی خۆش دەکرد، یان دەبووە شاعیرێکی بەناو بانگی لەبابەتی شاعیرانیتروبادۆر و سەری دەکێشایە ناو کۆشکەکانەوەو، هەموو، لەپیاوە گەورەکانەوە بیگرە تا خانمی ماقووڵو نۆکەرو خزمەتکار چاویان لەلچو لێوە ئەستوورەکانی دەبڕی.. بەڵام لەم سەردەمی قەدر نەزانینەی ئێمەدا زۆربا وەك گورگی برسی بەدەوری حەسارەکاندا ملّ و مووشیەتی، یان وا هەرەس دێنێت دەبێتە گاڵتـە جاڕی کۆلکە نووسەرێك

لەپڕا زۆربام بینی لەجێگاکەی هەستاو خۆی رووت کردەوە، جلەکانی فڕێدایە سەر کوچکەکان و خۆی هاویشتە ناو دەریاکەوە، جارجارە لەبەر تیشکە لاوازەکەی مانگدا سەرە گەورەکەیم دەبینی لەناو ئاوەکەوە دەردەکەوت و دیسان ون دەبووەوە، هەندێك جار هاوارێکی دەکرد، دەوەڕی، دەی حیلاند، وەك کەڵەشێر دەیقوقاند. لەو شەوە چۆڵو هۆڵەدا رۆحی دەچووەوە ناو دنیای ئاژەڵانەوە.

لە سەرەخۆو بێ ئەوەی بەخۆم بزانم خەو بردمیەوە، بەیانی، لەسپێدەدا، زۆربام بینی بەشادیو پێکەنینەوە هات و قاچی راکێشام. وتی:

—هەستە ، سەرۆك، با پرۆژەکەی خۆمت پێ بڵێم، گوێ دەگریت؟

—گوێم لێتە.

وەك تورکەکان لەسەر زەویەکە دانیشت و کەوتە باس کردنی نەخشەکەی، دەیویست دەزگایەکی گوێزانەوە(تەلەفریك) لەسەر شاخەوە تا کەنارەکە رابکێشێت، بۆ ئەوەی ئەو دارانەی بۆ تونێڵەکەمان پێویستە پێی بگەیەنین و ئەوەیش زیادەیە وەك تەختە بۆ خانوودروست کردن بیفرۆشینەوە. ئێمە بڕیارێکی وامان هەبوو، دارستانێکی سنەوبەر کە

مى دێر بوو بەکرێ بگرین، بەڵام گوێزانەوەی دارەکانمان گران لەسەر دەکەوت و هێسترمان دەست نەدەکەوت. بۆیە زۆربا بیری لەوە کردبووەوە دەزگایەکی گوێزانەوە لەتەلی ئەستوور و کۆڵەکەو بەکرە دروست بکات. کە لە باسی نەخشەکەی بووەوە پرسی:

—رازیت، مۆری دەکەیت؟

—مۆری دەکەم، زۆربا رازیم.

وەجاخەکەی ئاگردا، کتریەکەی نایە سەر، قاوەیەکی بۆ من دروست کرد، بەتانیەکی بەسەر قاچمادا تا سەرمام نەبێت، بەخۆش حاڵیەوە چووە دەرێ، وتی:

—ئێمە ئەمڕۆ تونێڵێکی تر لەکانەکە دەکەینەوە، من دەمارێکی ترم دۆزیوەتەوە، دەماری ئەڵماسێکی رەشی راستەقینەیە.

دەست نووسەکەم کە لەبارەی بووداوە بوو کردەوەو منیش چوومە تونێڵە تایبەتیەکەی خۆمەوە، هەموو رۆژەکە کارم کرد، چەندە بەرەو پێش دەچووم زیاتر هەستم بەئازادی دەکرد، تووشی هەڵچوونێکی تێکەڵ بەدڵنیایی، بەخۆنازین و بێزاری، بەڵام من خۆم دابوە دەست کار، چونکە دەمزانی هەر بەتەواوکردنی ئەم دەست نووسە و داخستن و مۆر لێدان و پێچانەوەی ئیتر ئازاد دەبم.

برسیم بوو، هەندێك مێوژ وبادام و پارچەیەك نانم خوارد، پاوەڕێی زۆربا بووم بێت و هەموو ئەو خەڵاتانەی مرۆڤیان شاد دەکرد، لە پێکەنینی بێ خەوش و وتەی چاك و خواردنی بەتام لەگەڵ خۆیدا بێنێت.

سەر لەئێوارە پەیابوو، خواردنی ئامادە کرد، نانمان خوارد، بەڵام بیری لەشوێنێکی تر بوو،لەسەر ئەژنۆ دانیشت، دارە باریکەکانی لەزەویەکە چەقاند، پەتێکی لێ رایەڵ کردن، چەند دەنکە شقارتەیەکی بەبەکرەی بچووکەوە هەڵواسی، ئەی ویست لاری پەتەکە ئەوەندە بێت کە دەزگاکە نەڕوخێت.

پێی وتم:

—ئەگەر زۆر لێژ بێت،خراپ دەردەچێت، کەمیش بێت هەرباش نیە، دەبێت بەموو حسابی بۆ بکرێت، بۆ ئەم کارەیش سەرۆك تەنیا مەیو مێشك پێویستە.

پێکەنیم و وتم:

—چەندت مەی بوێت هەیە، بەڵام مێشك... چیت عەرز بکەم...

زۆربا دایە قاقای پێکەنین و نیگایەکی خۆشەویستانەی تێگرتم و وتی:

—تۆ پیاوێکی بێ مێشك نیت، سەرۆك.

بۆ حەسانەوە کەمێك دانیشت، جگەرەیەکی داگیرساند، دیسان کەوتەوە هەوای خۆیو زمانی کرایەوە، وتی:

—ئەگەر ئەم تەلەفریکە سەر بگرێت دەتوانین تەواوی دارستانەکە رابکێشینە خوارێ، کارگەیەك بکەینەوە، ستوون و دارو تەختە دورست بکەین و ئەوەندە لا بخەین مەگەر بەسەوڵ کۆی بکەینەوە، دواییش پاپۆڕێکی سێ ستوونی دروست بکەین، چی بارو بنەمان هەیە تێی بخەین و هەموو دنیا بگەڕێین.

چاوی زۆربا پڕشنگیان تێ گەڕاو پڕ بوون لەژنی وڵاتانی دوورو شاری چراخان وماڵێ گەورەو کەرەسەو کەشتیەکان، دیسان ووتی:

—سەرۆك، مووم سپی تێ کەوتووەو دانیشم لەق بووە، ئیتر وەختی ئەوەم نەماوە بەفیرۆی بدەم، تۆ هێشتا لاویت و بە بەرتەوەیە، بەڵام من ناتوانم، راستت پێ بڵێم من چەندە تەمەنم بەرەو پێشتر بچێت کێوی تر ئەبم، من لەو باوەڕەدا نیم کە پیری مرۆڤ ببڕێو لەتین و تاوی بخات، بڕوایشم بەوە نیە هەر ئەوەندەی ئیزرائیل ببینێت ئیتر ملی بۆدرێژبکات و پێی بڵێت:" فەرموو سەرم لێوەکە با بە بەهەشت شادبم" من چەندە پیرتر بم یاخی تر ئەبم، ئاڵاکەم نەوی ناکەم تا هەموو دنیا نەگرم.

زۆربا هەستا، سەنتورەکەی لە دیوارەکە کردەوەو وتی:

—ئای شەیتان! تۆزێك وەرە خوارێ، بۆ وا هێور و بێدەنگ ئەوقی دیواریت؟ وەرەو کەمێکمان بۆبڵێ.

من لە دیمەنەکەی زۆربا تێر نەدەبووم کە بە چ سام و پەرۆشیەکەوە سەنتورەکەی لە بەسەتەکە دەرهێنا، راست وەك ئەوەی تویێك لەهەنجیر بکاتەوە،یان ژنێك رووت بکاتەوە وابوو.

سەنتورەکەی نایە سەر ئەژنۆی، بەسەریا چەمیەوە، لەسەرخۆ کەوتە لاواندنی ژێکانی، وەك راوێژی ئەوەی لەگەڵدا بکات کە کامە ئاهەنگ بژەنن، داوای لەخەو هەستانی

لیّ‌دەکرد، دەیویست بەزمانی‌لووس بیکاتە هاوڕازی ئازاری گیانی شەکەت و تەنیای خۆی، دەستی بەئاهەنگێک کردو بۆی دەرنەهات، وازی لیّ هێناو چووە سەر ئاهەنگێکی تر، ژێیەکان کرەکرپیان لێوە دەهات، وەك نەخۆش بن وابوو، یان بیانەوێت دەنگیان لێوە نەیەت، زۆربا پاڵی بەدیوارەکەوە داو کەوتە سڕینی ئارەقەی ناوچاوی.

لەسەنتورەکە مۆڕ بووەوە و لەبەر خۆیەوە ووتی:

–دڵی پێوە نیە. نایەوچێت ئیتر..

دیسان لەسەرخۆ پێچایەوە، وەك دڕندەیەك بێت و زۆربا لەوە بترسێت گازی لیّ بگرێت وابوو، پاشان هەستاو لەسەرخۆ بەدیوارەکەوەی هەڵواسی.

دیسان لەبەر خۆیەوەووتی:

–دڵی پێوەنیە، ئیتر... نایەوێت...ناکرێت زۆری لیّ بکرێت.

لەسەرزەویەکە دانیشتەوە، چەند بەڕوویەکی نایە ژێر پشکۆی مقەڵیەکەو شەرابی لەلیوانەکان کرد، هەڵیداو دیسان هەڵیدایەوە، بەڕوویەکی پاك کردو دایمیّ، پرسی:

–تۆ هیچ سەری لیّ دەردەکەیت، سەرۆك؟ من هەرگیز سەری لیّ دەرناکەم، لەوە دەچێت هەموو شتێك گیانی تیا بێت، دار، بەرد، ئەو شەرابەی دەینۆشین، ئەو خاکەی بەسەریا تیّ‌دەپەڕین.. هەمووی، هەمووی.. سەرۆك:

پێکەکەی بەرز کردەوەو ووتی:

–بەخۆشیت.

پێکەکەی فڕ کردو دیسان پڕی کردەوە، لەبەر خۆیەوە وتی:

–ئەم زەمانە سۆزانیە، ئەم جندەیە وەك دایکە بوبولینا وایە.

پێکەنیم، وتی:

–پیّ مەکەنە، گویّ رادێرە سەرۆك، ئەم زەمانەیە وەك دایکە بوبولینا وایە. وەك ئەویش پیرە، وانیە؟ لەگەڵ ئەوەیشدا رات دەگرێت، فێڵی وای لایە عەقڵت لەسەردا ناهێڵێت، کە چاوت دەنوقێنیت وا دەزانیت کچێکی بیست ساڵەت لەباوەشدایە، بەڵیّ، هاوڕیّ، سوێند ئەخۆم کەدەست بەکار دەبێت و چراکە دەکوژێنیتەوە وا دەزانیت کچێکی بیست ساڵەیە.

" پێم نەڵێی ژنێکی لات و گەجەڕە! ژیانی هەر رابواردن و داوێن پیسی بووە لەگەڵ دەریا سالارو پاپۆڕەوان و سەربازو جوتیارو جامبازو کەشیش و ماسی گرو ژاندارم ومامۆستاو واعیزو دادوەردا. باشە، وا وایش بوو، چی تیایە؟ ئەم سۆزانیە زوو ئەمانە لەبیردەکات، ئێستا هیچ دۆستێکی خۆی لەیاد نەماوە، ئەو هەمیشە، بێ گاڵتە، دەبێتە کۆترێکی بێ گوناه، قوویەکی سپیو بەچکە مراویەك، سووردەبێتەوە، بەڵێ، بڕوام پێ بکە لەشەرما سوور دادەگەڕێت و لەرزێکی وا دەیگرێت دەڵێی یەکەمجاریەتی کاری وا بکات. ژن نهێنیەکە، سەرۆك دەتوانێت هەزار جار بکەوێت، هەزار جاریش وەك کچێك کە دەستی بۆ نەبرابێت هەستێتەوە، بێگومان دەپرسیت بۆ؟ باشە، چونکە رابوردووی ناهێنێتـەوە بیر خۆی".

بۆ ئەوەی سەر بنێمە سەری پێم ووت:

—بەڵام زۆربا، تووتیەکەی لەیادی ناکات، ئەو هەمیشە ناوێك دێنێت کەناوی تۆ نیە، تۆ تووڕە نابیت کە لەگەڵیا خەریکیت و لەوەدایت بگەیتە ئاسمانی حەوتەم. لەپڕا تووتیەکە هاوار دەکات" کاناڤارۆ کاناڤارۆ؟"

حەز ناکەیت لەو کاتەدا ملی بگریت و بیخنکێنیت؟ ئیتر وەختی ئەوە هاتووە فێری بکەیت بڵێ زۆربا، زۆربا!

بەدەستە گەورەکانی گوێی خۆی توند گرت و هاواری کرد.:

—ئەی باوکە! ئەم قسە قۆڕانە چیە؟ بۆ دەتەوێت ئەو گیاندارە بەستەزمانە بخنکێنم؟ من زۆرم پێ خۆشە ئەو ناوە دێنێت، ئەو سۆزانیە شەو قەفەزەکە بەسەر تەختی خەوەکەوە هەڵدەواسێت، چاوی تووتیەکەیش هێند تیژە تاریکیەکە دەبڕێت، کە دەمانبینێت پێکەوە خەریکین زۆڵە دەیکاتە قیژەو هاوار: کاناڤارو، کاناڤارو.

"سوێندت بۆ دەخۆم، سەرۆك، هەر چەندە تۆ بەم کتێبانە مێشکی خۆتت تێکداوە و نازانم چۆن تێ دەگەیت؟ بەڵێ، سوێند ئەخۆم کە لەو کاتەدا یەکسەر وا هەست دەکەم کە پێڵاوێکی بریقەدارم لەپێدایە، پەڕێکم بەسەرەوەیەو ریشێکی نەرمی ئاوریشمینم پێوەیە کە بۆنی عەنبەری لێ دێت.

Buon Giorno Sera Mangiate Macaroni?

(ڕۆژباش، شەوباش، ماکەڕۆنی دەخۆیت؟)

یەعنی بەراستی بەراستی من دەبمە خودی کاناڤارو، سواری کەشتیە هەزار کون تێ بوەکەم دەبم و یا اللە. تۆپەکان ئامادە دەکەم و دەست بەتۆپ تەقاندن دەکەم.

زۆربا قاقای لێدا، چاوی چەپی نوقاندو تەماشای کردم، دیسان وتی:

-لێم ببوورە سەرۆک، من وەك ئالکسسی باپیرم وام، خوالێی خۆش بێت،ئەو لەتەمەنی سەد سالێدا عەسران لەبەردەم خانوەکەیاندا دادەنیشت تا سەیری ئەو کچانە بکات کە بۆ سەرکانی دەچوون، چاوی کز بوو باشی نەدەبینی، ئەوسا بانگی کچەکانی دەکردو دەیپرسی:" پێم بڵێ تۆ کێیت؟ لینوی -١٠- کچی ماسترا -١١- دونیت؟ کەواتە تۆزێ وەرە پێشتر بادەستمت بەر بکەوێت. وەرە پێشتر، مەترسە" کچەکە بەری لەپێکەنینەکەی خۆی دەگرت و دەهاتە پێشەوە، ئەوسا باپیرم دەستی بڵند دەکرد تادەگەیشتە دەم و چاوی کچەکە، هێدی هێدیو بەخۆشیو تاسەوە دەستی بەڕوویا دەهێناو فرمێسک لەچاویەوە بازرەقەی دەبەست، من جارێکیان لێم پرسی:"باپیرە، بۆ دەگریت؟" وای وەلامدامەوە:" کوڕم چۆن نەگریم، من لەسەرە مەرگام و ئەم هەموو کچە جوانانە جێ دێڵم؟

زۆربا هەناسەی هەڵکێشاو دیسان وتی:

-ئاخ، کوێرەی باپیرم، ئەگەر دەزانیت ئێستا چەند باش لەقسەکانت تێ دەگەم! زۆرجار ڕێ دەکەوێت بەخۆم دەڵێم:" ئای لەمنی بەدبەخت! خۆزگا هیچ نەبوایە لەیەك کاتدا هەموو ژنە جوانەکانیش لەگەڵ مندا بمردنایە" بەڵام ئەم سۆزانیانە دەژین و رادەبوێرن و پیاوان لەئامێزیان دەگرن و لەگەڵیاندا دەخەون، زۆربایش دەبێتە خاك تا ئەوانەپێی پیا بنێن"

چەند دانە بەڕووی لەئاگرەکە دەرهێناو پاکی کرد، پەرداخمان لێکدا، هەردووکمان تا ماوەیەکی زۆر لەوێدا ماینەوە، خواردمانەوە، وەك دوو کەروێشکی گەورە لەسەرخۆ بەڕوومان دەخوارد، گوێمان لەدەریا گرتبوو لەدەرەوە چۆنی دەنرکاند.

-١٠- Lenio

-١١- Mastrandoni

-٧-

تا نیوه شەوێکی درەنگ لەپاڵ وەجاخەکەدا دانیشتین، دیسان هەستم کردەوە کە بەختەوەری چ شتێکی ئاسان و کەم سەرمایەیە، تەنیا بەلێوانێك شەراب، بەرِوویەکی برژاو، مقەلّیەکی بچووك، دەنگی دەریا بەدەست دێت، بۆ ئەوەی هەست بەوە بکەیت کە بەختەوەری ئەمەیە تەنیا ئەوە پێویستە دلێکی سادەو قانعت هەبێت.

پرسیم: زۆربا، تۆ چەند جار ژنت هێناوە؟

هەردووکمان کەمەکێك سەرخۆش بووین، نەك لەبەر ئەوەی زۆرمان شەراب خواردبووەوە، بەڵکو زیاتر لەبەر ئەو بەختەوەریە مەزنەی نازانیت چۆنی باس لێوە بکەیت و ئێمە لەخۆماندا هەستمان پێ دەکرد، ئێمە شتێك نەبووین بێجگە لەدوو مێرووی گچکەی بەر رەشەبای مەرگ کە بەم خاکەوە نووساوین، هەریەکەمان بەشێوەی تایبەتی خۆی هەستی بەم راستیە دەکرد، هەردووکمان لەگۆشەیەکی تەرِیکی نزیك دەریادا، لەپشت قامیشەلان و دارو تەنەکەی بەتاڵدا، جێگایەکمان بەپاڵ یەکەوە پەیدا کردبوو، لەبەردەمماندا شتی جوان و خۆراك و، لەناوەوەیشماندا ئاسوودەیی وخۆشەویستی‌و دڵنیایی هەبوو.

زۆربا گوێی لەپرسیارەکەم نەبوو، نەت دەزانی بیری لە کام ئۆقیانووس دا بوو کە دەنگی منی پێ نەدەگەیشت. دەستم درێژ کردو پەنجەم تێوە ژەند، جارێکی تر لێم پرسیەوە:

-زۆربا، چەند جارت ژن هێناوە؟

داچڵەکی، ئەمجارەیان گوێی لێ بوو، دەستە زلەکانی راوەشاندو ووتی:

ئاه، تۆ تازه لەچی دەپرسیت! سەرۆك، باشە، ئیتر خۆ منیش پیاوم، منیش تووشی ئەو كەریەتیە هاتووم، ئاخر من بەژن هێنان دەڵێم كەریەتی، "لەگەڵ ڕێزمدا بۆ هەموو ئەوانەی ژنیان هێناوە، بەهەرحاڵ منیش لەو كەریەتیەدا بەشداریم كردو ژنم هێنا.

–باشە، من لێم پرسیت چەند جار؟

زۆربا كەوتە سەرهەڵكڕاندنێكی توندو، دوای كەمێك بیركردنەوە ووتی:

–چەند جار؟ بەجۆرە شەرعیەكەی تاقە جارێك، جارێكی ڕاست گۆیانە، بەنیوە شەرعیەكەی دووجار، بە ناشەرعیەكەیشی هەزار جار، دوو هەزار جار، سێ هەزار جار، بۆ دەشێت ژماردبێتم؟

–كەمێك باسی ژن هێنانتم بۆ بكە زۆربا. سبەینێ یەك شەممەیە، ڕیشمان دەتاشین، جلی جوان لەبەر دەكەین و ئەڕۆینە خزمەت دایكە بوبولینا. هیچ كارمان نیەو ئەمشەو دەتوانین زۆر نەنووین، دەی بۆم باس بكە.

–چیت بۆ باس بكەم؟ ئەمانە شتی باس كردن نین، سەرۆك، جووت بوونی شەرعی زۆر بێ تامە،وەك نانی بێ خوێ وایە [-١-] چیت بۆ باس بكەم؟ ئەمە چ خۆشەویستیەكە پیاو لەگەڵ ژنەكەیدا ماچ و مووچ بكات و كەشیشە كانیش لەپشت پەیكەری پیرۆزەوە زەق زەق تەماشای بكەن و بەرەكەتی بۆبنێرن؟

لەگوندەكانی لای ئێمەدا پەندێك هەیە دەڵێت:"تەنیا گۆشتی دزی بەتامە" ژنی خۆت گۆشتی دزی نیە. بەڵام ژنە ناشەرعیەكان، نازانم مرۆ كەی دەتوانێت ئەو هەمووە بێنێتەوە بیری خۆی؟ بۆ كەڵەشێر دەفتەری ژماردنی هەیە؟ شتی وات بەخەیاڵا دێت! لەگەڵ ئەمەیشدا، لەلاویدا من ئەو نەخۆشیەم هەبوو لەگەڵ هەر ژنێكدا بنوستمایە چەند تاڵێكی قژیم لێدەكردەوەو لای خۆم هەڵم دەگرت، بۆیە هەمیشە مقەستم پێ بوو، تەنانەت كە ئەیش چوومە كڵێسا مقەستم لەگیرفاندا بوو، ئیتر پیاو پیاوە، نازانێت چی بەسەردێت! وانیە؟

" هەربەوجۆرە چەند چەپكێك قژم كۆكردەوە، لەمووی رەش و زەردباوو تەنانەت چەند تاڵێكی سپیش. ئەوەندەم كۆكردەوە سەرینێكم لێ دروست كرد، سەرینەكەم دەنایە ژێر سەرم و دەنوستم، بێگومان ئەوە هەر بۆ زستان، چونكە لەهاویندا زۆر گەرم دادەهات، تا ماوەیەك و ئیدی وازم لێ هێنا، چونكە قژەكان وردە وردە بۆنیان گرت ومنیش ناچار بووم سەرینەكە بسووتێنم".

زۆربا دەستی بەپێكەنین كردو وتی:

—بەڵێ سەرۆك، ئەمە ژمارەو ئاماری من بوو، ئەویش سووتا، ئیتر تاقەتم لێ نەما، لەپێشا وام دەزانی زۆر ناخایەنێت بەڵام دوایی بینیم كۆتایی نیە، هەر ئەمەیش وای لێ كردم كە لەوەو دوا مقەست هەڵنەگرم.

—ژن هێنانی نیوە شەرعی چۆنە، زۆربا؟

زۆربا بەلاقرتێوە پێكەنیو وتی:

—ئای! ئەمەیشیان سیحری خۆی هەیە، ئای ژنە رەندەكانی سلاڤ. خوایە

هەزار ساڵ تەمەنتان بێت. چ سەربەستیەك! ئیتر لەگەڵ ئەواندا ((بۆ كوێ چوبویت؟ بۆ درەنگ هاتیتەوە؟ لەكوێ خەوتیت؟)) لە ئارادا نیە، نە ئەوان شت لەتۆ دەپرسن‌و نەتۆ لەوان، ئازادیەكی رەها.

دەستی درێژ كردو پێكەكەی هەڵگرتو هەڵیدا، بەرووپەكی پاك كردو هەر بەدەم قسەكردنەوە خواردی، كەوتەوە قسەكردن.

—یەكێكیان ناوی سوفینكا[٥٨] ئەوی دی ناوی نوسا[٥٩] بوو، لەگەڵ سوفینكادا لە شارۆچكەیەكی نزیك بەنوروسیسك یەكمان ناسی، زستان بوو، بەفر ئەباری، من بۆ كاركردن لە كانێكدا رێگام لەو شارۆچكەیە كەوتبوو، ئەو رۆژە رۆژی بازاربوو، لە هەموو گوندەكانی دەوروبەرەوە ژن‌و پیاو بۆ كرین‌و فرۆشتن هاتبوونە ئەوێ، گرانی‌و سەرمایەكی

[٥٨] Sophinka
[٥٩] Noussa

ترسناك، خەڵكی هەرچی هەبوو، تەنانەت پەیكەری پیرۆزەكانیشیان دەفرۆشت تا نانی پێ بكڕن.

((من بەناو بازاڕەكەدا دەگەڕام، لەپڕا چاوم بەژنێكی لادێی جوان كەوت، لەعەرەبانەكەی دابەزی، ژنێكی شۆخ، باڵای دوومەتر بەرزو چاوەشینەكانی لەڕەنگی دەریا دەچوون، سمتو كەفەلیشی هەرباسی مەكە، هەردەت وت ماینە، لەتاوا زمانم لاڵ بوو، بەخۆم وت : ((هێی، زۆربای نەگبەت، دیسان تووشی بوویت))(كەوتمە دوایی‌و تەماشام كرد، تێرم لە ڕوانینی نەدەخوارد، نەدەبوو لەو سمتو كەفەڵە نەڕوانیت كە وەك زەنگی كڵێسە لە جەژنی پاكدا[٦٠] لەرە لەریان بوو. بەخۆم ووت:

((نەگبەت، بەدوای چ كانێكدا دەگەڕێیت؟ تۆ ڕێگات هەڵە كردوە، كانی ڕاستەقینە ئەمەیە، بڕۆرە ناوی‌و تونێلی تیالێبدە))

((كچەكە وەستا، بارێك داری كڕی، هەڵی گرت‌و خستیە ناو عەرەبانەكەی، ئەی خوا چ دەست‌و مەچەكێك ! هەندێك نان‌و پێنج شەش ماسی كڕی‌و نرخەكەی پرسی، فرۆشیارەكەی وتی ئەوەندە دەكات. كچەكە گوارە ئاڵتونەكەی لە گوێی كردەوە تا لەباتی پارەی شتەكان بیداتێ، چونكە پارەی پێ نەبوو.

من زۆر نارەحەت بووم، بهێڵم ژنێك گوارەكانی، خشڵەكەی، سابوونە بۆندارەكەی، شووشە عەترەكەی بفرۆشێت! ئەگەر هەموو ئەم شتانە لەدەست بدات دنیا كاول دەبێت. لەوە دەچێت هەموو پەڕەكانی تاوس لێ بكەیتەوە. تۆ دڵت دێنێت پەڕی تاوس لێ بكەیتەوە؟ هەرگیز، نا، نا.

لەدڵی خۆمدا وتم زۆربا زیندوەو نابێت شتی وا ڕووبدات، كیفی پووڵەكەم كردەوەو پارەكەم دایە كابرا، ماوەیەك بوو رۆبڵ كرابوە كاغەز، بەسەد دراخما هێسترێكت دەكڕی‌و بەدەیشی ژنێكت دەهێنا.

---

٦٠ جەژنی فصح یان پاك Easter جەژنی ساڵانەی مەسیحیەكانە، یادی ئەو رۆژەیە كە عیسا دوای لە خاچدانی هەستایەوە، ئەو رۆژە دەكەوێتە نێوان ٢٢ی مارت (نزیك بە جەژنی نەورۆز)و ٢٥ی نیسانەوە.

((پوڵەکەمدا، کچەکە سەری لار کردەوەو بەلایەکی چاو پیامدا هەڵیڕوانی، دەستی گرتم تاماچی بکات، بەڵام من دەستم کێشایەوە، چی؟ وای دەزانی پیرەمێردم؟ بەدەنگی بەرز وتی: سپا سیبا، سپا سیبا. واتا ((سوپاس سوپاس)) بەبازێك خۆی هەڵدایە نێو عەرەبانەکەیەوە، جڵەوی ئەسپەکەی لەدەست گرتو قامچیەکەی ڕاست کردەوە، بەخۆم وت:

(( ئای زۆربا! ئاگاداربە هاوڕێ، یارۆ دەیەوێت لە چنگت دەرچێت!))

منیش بە بازێك خۆم هەڵدایە ناو عەرەبانەکەوەو لەپاڵیا دانیشتم، ئەو هیچی نەوت، تەنانەت خۆی نەبان کردو سەیری نەکردم، قامچیەکی بە ئەسپکەدا کێشاو کەوتینەڕێ.

((لەڕیگا تێ گەیشت کە دەمەوێت بیهێنم. لەدوو سێ وشە زیاتر روسیم نەدەزانی، بەڵام، باشە، ئەم جۆرە کارانە قسەی زۆریان ناوێت، بەچاوو دەستو ئەژنۆ لەگەڵ یەکتردا دواین، بەکورتی گەیشتینە گوندو لەبەردەم ماڵەکەیاندا وەستاین، هاتینە خوارێ، کچە بەشانێك دەرگای کردەوەو چووینە ژورێ، لەنێو حەوشەکەدا دارەکەمان داگرت، ماسیو نانمان هەڵگرتو چووینە ژوری خانوەکەوە، پیرێژنێکی لاواز لەبەردەم زۆپاکەدا بێدەنگ دانیشتبوو دەلەرزی، خۆی لە گوێنیو پەڕۆو پیتاڵو پێستی مەڕەوە پێچابوو، کەچی هێشتا هەر دەلەرزی. ئەوەندە سارد بوو تفت هەڵدایە دەیبەست[٦١]، دانەویم باوەشێك دارم خستە زۆپاکەوەو دام گیرساند، پیرێژنەکە بەپێکەنینەوە کەوتە تەماشاکردم، کچەکەی شتێکی پێ وتبوو، بەڵام من نەدەزانی چیە، کە زۆپاکەم داخست پیرێژن خۆی گەرم کردەوەو کەمێك هاتەوە سەر خۆی.

((لەو بەینەدا کچە سفرەی داخست، هەندێك ڤۆدگایشی هێناو نۆشیمان، سەماوەری داگیرساندو چای دەمکرد، نانمان خواردو بەشی پیرێژنیشمان دا، پاشان کچەکە زوو جێگای ڕاخست، لێفەو مەلافەی پاکی دانا، چراوگێکی لەپێشی پەیکەری مریەمی پیرۆزدا داگیرساندو سێ جار نیشانەی خاچی کێشا، پاشان، بەدەست ئاماژەی بۆ کردم، بەجووتە لەبەردەم پیرێژنەکەدا هاتینە سەرچۆكو دەستیمان ماچ کرد، ئەو دەستەی کە ئێسکەکانی

---

[٦١] لە فارسیەکەدا دەڵێت: نینۆکی بەپەنجەوە نەدەهێشتی، عەرەبیەکەیشی هەروایە. -ك-

زەق‌و زۆپ دەرکەوتبوون بە سەرماندا هێمن‌و ورتە وترتێکی کرد، لەوە دەچوو پیرۆزبایمان لێ بکات، من بەدەنگی بەرز وتم (( سپا سیبا، سپا سیبا))و لەگەڵ کچەدا بەقەڵەمبازێك خزاینە ناوجێگاکەوە))

زۆربا بێدەنگ بوو، سەری بەرز کردەوەو لەنوختەیەکی دووری لای دەریا ڕاما، پاشان وتی:

—ناوی سوفینکا بوو. دیسان کڕبوەوە.

بەپەرۆشەوە لێم پرسی:

—باشە، دوایی؟

—ئیتر (دوایی)) نیە، ئەمە چ نەخۆشیەکە، سەرۆك، تۆ (دوایی)و (بۆ) ت لەدەم نابڕێت! پێویست ناکات لەسەر ئەم شتانە زۆر بڕۆیت، چونکە ژن کانیەکی ساردە، مرۆڤ دادەنەوێت، وێنەی خۆی تیا دەبینێت‌و لێی دەخواتەوە، دیسان دەخواتەوە تا خەریکە بتەقێت، پاشان یەکێکی تر دێت، ئەویش تینوەو دادەنەوێت‌و وێنەی خۆی تیا دەبینێت‌و دەخواتەوە، دوایی، یەکێکی تر... بڕوابکە، سەرۆك، ژن کانیەکە بۆ خۆی.

—دوایی، تۆ ڕۆیشتیت؟

—ئەی دەتەوێت چی بکەم؟ پێم نەوتی ژن کانیەو من ڕێبوارم، بێگومان ڕێگای خۆم لەبەرگرتەوە، سێ مانگ لەگەڵیا مامەوە، خوا ئاگادارە گلەیم لەچاوم بووبێت لەوم نەبوە، بەڵام دوای سێ مانگ بیرم کەوتەوە کە من کەوتوومەتە دوای کانزاو دەبێت بڕۆم، بەیانیەك پێم وت: ((سوفینکا، من کارم هەیەو دەبێت بڕۆم)) سوفینکا وتی((باشە، ئەگەر لەسەر ڕۆیشتنیت بڕۆ، من تامانگێك چاوەڕێت دەکەم، ئەگەر لە کۆتایی مانگدا نەهاتیتەوە من ئازادم‌و تۆیش خوات لەگەڵ))

پێم وت:

—دوای مانگەکە گەڕایتەوە؟

زۆربا هاواری لێ هەستا:

—تۆیش، سەرۆك، دوور لەڕووت زۆرکەری، ها! بگەڕێمەوە بۆ کوێ؟

ئەم سۆزانیانە ناهێڵن مرۆڤ ئاسوودە بێت، دە رۆژ دوای ئەوە، لەکوبان[٦٢] تووشم بوو بەتووشی نوساوە.

–دەی باسی ئەوم بۆ بکە.

–دیسانەوە، سەرۆک ! نابێت ژیانی ئەم دوو چەتیوە تێکەڵ بەیەکدی بکەین، بەخۆشی سوفینکا.

شەرابەکەی یەکژەمی بەسەرەوە نا، پاشان، پاڵی بەدیوارەکەوە داو وتی:

–قەیدی نیە، چیرۆکی نوسایشت بۆ دەگێڕمەوە، ئەمشەو جانتاکەم پڕە لە ڕوسیا، دەبێت خاڵی بکەم.

سمێڵی پاک کردەوەو ئاگرەکەی تێکدا.

–وەك پێم وتیت لە یەکێك لە گوندەکانی کوباندا یەکترمان ناسی، هاوین بوو، کاڵەکو شووتی هەڵدرابوونەوە، من جار جارە یەکێکم لێ دەکردنەوە، کەس قسەی نەدەکرد، لەناوەڕاستەوە قاشم دەکردو دەم ولووتم تێ دەنا،

((لە ڕووسیادا هەموو شتێك زۆرە، سەرۆك، هەرڕژاوە، چیت حەز لێ یە هەڵی بگرە، نەك تەنیا کاڵەکو شووتی، بەڵکوو ماسیو کەرەو تەنانەت ژنیش، بۆ نموونە لە ڕۆیشتنا چاوت بە کاڵەکێك دەکەوێت، هەڵی دەگریت، چاوت بەژنێك دەکەوێت، ئەویش هەڵدەگریت. وەك ئێرە، ئەم یۆنانەی ئێمە نیە هەر کە توێکڵە شوتی یەکێك هەڵ بگریتەوە بت کێشێتە دادگا، یان دەست بۆ ژنێك بەریت براکەی بتداتە بەر چەقۆو بیەوێت تیکە تیکەت بکات. تف لەم خەڵکە سواڵکەرە نەدیو بدیە، بابڕۆن ئەم پیسکانە خۆیان بکوژن، ئێوەش ماوەیەك بچنە روسیا تا بیان بینن چ گەورە پیاوگەلێکن!

((ئێ، من بەکوباندا تێ دەپەڕیم، لەباخچەیەکدا چاوم بەژنێك کەوتو حەزم لێ کرد، تۆ، سەرۆك، دەبێت ئەوە بزانیت کە ژنی سلاڤی وەك ژنە لاتو پیسەکانی یۆنان نین کە دڵۆپ دڵۆپ خۆشەویستیت پێ بفرۆشنو هیچ نرخێکت بۆ دانەنێن، ژنی سلاڤی زۆرت دەداتیو لەخەوو ئەوینو خواردندا گران دەتکێشێت، ئەو نزیکە لە گیاندارانی بیابانو

---

[٦٢] Kouban

خودی زەویەوە، واتا تا بتەوێت دەتداتێو، وەك ئەم ژنە بەد ڕەوشتو بەرچاو تەنگانەی یونان نین. لێم پرسی: (ناوت چیە؟)) ئاخر تۆ دەزانیت سەرۆك من بەهۆی ژنەوە کەمێك فێری ڕوسی ببووم، وتی: ناوم نوسایە، ئەی ناوی تۆ؟)) وتم: ((ئالکسیس، من زۆر خۆشم لەتۆدێت، نوسا)) بەوردی لێی ڕوانیم، ڕوانینی ئەوانەی دەیانەوێت ئەسپێك بکڕن، پێی وتم: لەوە ناچێت تۆیش کەم بیت، ددانەکانت توندو تۆڵو سمێڵت گەورەو شانو ملت پانو قۆڵو مەچەکێکی بەهێزت هەیە، منیش خۆشم لە تۆ دێت)) لەوە زیاتر قسەمان لەگەڵ یەکترا نەکردو پێویستیشی نەدەکرد بیکەین، لە چاو تروکانێکدا ڕێك کەوتین، بڕیار بوو ئەو شەوە بەرگی ڕۆژی یەك شەموان لەبەربکەمو بڕۆمە ماڵیان، نوسا لێی پرسیم: ((پاڵتاوی فەروت هەیە؟)) وتم: ((بەڵێ، بەڵام بەم گەرمایەو فەرو...)) وتی: ((قەیدی نیە، بیهێنە، سەرنج ڕاکێشە))

((شەو وەك تازە زاوا ئارایشتی خۆمدا، پاڵتۆ فەروەکەم دایە سەر دەستما، دارە سەر زیوینەکەمم بەدەستەوە گرتو کەوتمە ڕێ، ماڵەکەیان خانوویەکی گەورەی لادێییانە بوو، حەوشە لەناو حەوشەدا، مانگاو ئاوی ترێ گرەی تیا بوو لە دوو جێگاشدا ئاگریان کردبووەوەو مەنجەڵی گەورەیان لەسەردانابوو، پرسیم: ((لەمەدا چی دەکوڵێنن؟.. ئاوی کاڵەك -ئەی ئەمیان- ئاوی شووتی. بەخۆم وت ((چ مەملەکەتێکە! گوێت لێیە؟ ئاوی کاڵەكو ئاوی شووتی. بەخۆم وت ((ئەمە ئەو سەرزەمینەیە کەخوا بەڵێنی داوە، خۆزگەم بەخۆت زۆربا کەوتویتەتە شوێنێکی واوە، هەر تەواو وەك مشکێك کەوتبێتە ناو پێستەی پەنیرەوە))

بەپلیکانەکاندا سەر کەوتم، پلەکان گەورەو تەختە بوونو چرکە چرکیان دەهات، باوكو دایکی نوسا لەسەرەوە وەستابوون، لەو پانتۆڵە سەوزانەیان لە پێدابوو کە دانیشتوانی باشووری ئەوروپا لەبەری دەکەن، پشتێنی سووری گوڵێنکەداری بەستبوو، شەو کڵاوی گەورەیان لەسەردابوو، هەردووکیان باوەشیان بۆ کردمەوەو ئێستا ماچ نەکەیت کەی دەیکەیت!

سەرووچاومیان کردە لیکاو، زۆر بەخێرایی قسەیان لەگەڵدا دەکردم، من باشیان لێ تێ نەدەگەیشتم، بەڵام لە سیمایاندا ئەوەم دەخوێندەوە کە ناخۆشەویست نیم.

((چوومه ژورێ، بڵێم چیم دی؟ سفرەیەکی پان و پۆڕ لەسەر مێزێك داخرابوو، پڕ بوو لە جۆرەها خواردن و خواردنەوە، ڕێك وەك کەشتیەکی چارۆکەداری مەزن، خزم و کەس و کار، ژن و پیاو، هەموو بەپێوە وەستابوون، لەپێشی هەموویانەوە نووسا، ئارایشتی کردبوو، بەرگی شەوی لەبەرداو، سنگیشی وا هاتبووە پێشێ دەت وت سنگی کەشتیە، لە جوانی و قەشەنگیدا دەدرەوشایەوە، دەستە سرێکی سوری بەدەوری سەریەوە پێچابوو، بەسەر سنگیەوە وێنەی داس و چەکوشێك چنرابوو، لەدڵی خۆمدا وتم: ((باشە نۆربای بەد ڕەگەزو لەعنەتی! ئەم غەزو بەزە بۆ تۆیە؟ تۆ ئەمشەو ئەم لەش و لارە لە ئامێز دەگریت؟ ڕەحمەت لەو باوك و دایکەی کوڕی وەك تۆیان خستۆتەوە!))

ژن و پیاو پەلاماری خواردنەکەماندا، وەك بەراز دەمان خواردو وەك ماسی دەمان نۆشی، باوکی نوسا لە پاڵما دانیشتبوو، ئەوەندەی تێ کردبوو خەریك بوو بتەقێت، لێم پرسی: ((ئەی کوا ئەو قەشەیەی مارەمان لەیەکدی دەبڕێت؟))

ئەو کە لەگەڵ قسە کردندا پرپشکی تفی لەدەم دەردەپەڕی وەڵامی دامەوە: ((ئێمە قەشەمان نیە، پێویست بە قەشەناکات، چونکە دین تلیاکی گەلانە))

((ئەمەی وت و هەستا، سنگی لە پێشنا، پەرداخێکی پڕ لە مەی لە دەست گرت، لەچاوم وردبووەوەو پاشان دەستی بە قسان کردو چ قسانێك! وتارێك بوو بۆ خۆی، بەڵام چی دەوت خوا دەیزانێت. من ئیتر تاقەتی بە پێوە وەستانم نەماو وردە وردەیش خەریك بوو مەست دەبووم، دانیشتمەوەو ئەژنۆم بەئەژنۆیەوە چەسپاند کە لەلای ڕاستمەوە دانیشتبوو.

((پیرەمێردەکە هەر قسەی دەکردو ئارەقەی دەڕشت، تا هەموو بەسەریا ڕژان و لە باوەشیان گرت تابێدەنگ بێت. نوسا ئاماژەیەکی بۆ کردم کە -یاالله- هەستەو تۆیش قسەیەك بکە))

((منیش هەستامە سەرپێ و نیوە ڕوسی و نیوە یۆنانی قسەیەکم کرد.

بەڵام چی؟ لەعنەتم لێ بێت ئەگەر خۆیشم بزانم چیم وتوە، تەنیا ئەوەم لەبیرە کە لەدواییا کەوتبوومە سەر گۆرانی چەتەکان و زەڕە زەڕ شتی بێ وەزن و قافیەی بێ مانام دەوت:

چەتەکان لە چیا دا کەوتن

تا ئەسپەکان بدزن

وەلێ ئەسپی لێ نەبوو

نۆسایان فڕاند.

((وەك دەبینی، سەرۆك، من شیعرەکەم بەو بۆنەیەوە گۆڕی))

پاشان ڕۆیشتن‌و ڕۆیشتن

(ئای دایکە، دەیانەوێت بڕۆن)

ئاخ، نۆساکەم

ئاخ، نۆساکەم

وای

((بەوتنی وشەی ((وای)) پەلاماری نوسام داو ماچم کرد))

((ئەمە ئەو کارە بوو کە دەبوو بیکەم، وەك ئەوەی شتێکم کردبێت کە ئەوان چاوەڕێیان دەکرد، بێجگە لەوە چاوەڕێی شتی تر نەبوون، ئیتر چەند لاوێکی گورج‌و گۆلی ریش سوور بە پەلە چراکانیان کوژاندەوە.

((ژنانی بێ ئابڕو دەستیان بەناڵەو هاوار کرد گوایا دەترسن، دوای کەمێك، لە تاریکیا کەوتنە نازو نووك، پڕمە پڕمێکیان بوو مەپرسە! وەك یەکێك ختووکەیان بدات وابوو.

((ئەوەی دوای ئەوە ڕوویدا، سەرۆك، تەنیا خوا خۆی دەیزانێت‌و بەس، بەڵام من وادەزانم کە خودی خوایش نەیدەزانی مەسەلەکە چیە، ئەگەر بیزانیایە هەر بەهەورە بروسکە دەیسوتاندین، پیاووژن، بەسەریەکدا کەوتبوونە سەر زەوی‌و تەپاوتلیان بوو، من هەر دەستم دەکوتاو دەمویست نوسا بدۆزمەوە، بەڵام لەکوێ دەمتوانی نوسا پەیدا بکەم؟ لە جیاتی ئەو یەکێکی ترم بەر هەوێڵ کەوت‌و لەگەڵیا دەست بەکار بووم.

((نزیك بەسپێدەی بەیان هەستام تا لەگەڵ ژنەکەمدا بەڕێ بکەوم، هێشتا دنیا بوولێڵ بوو، من جوانم نەدەبینی، قاچی یەکێکم گرت‌و ڕام کێشا، بەڵام ئەوە قاچی نووسا نەبوو، پێی یەکێکی ترم گرت‌و ئەو نەبوو، پێی سێیەمم گرت‌و ئەویش دەرنەچوو، قاچی چوارەم‌و پێنجەمیش تا بە زەحمەتێکی زۆر قاچی نووسام دۆزیەوەو ڕام کێشا، لەژێر

دووسێ پیاوی زەبەلاحدا دەرم هێنا كە كچە بەسزمانەكەیان پان و پلیش كردبووەوە، هەڵم ساندو وتم: ((نوسا، هەستە بابڕۆین)) لەوەڵامدا وتی ((پاڵتاوە فەروەكەت لەبیر نەچێت، بابڕۆین)) بەجووتە بەڕێ كەوتین.

كە زۆربا بێدەنگ بوو لێم پرسیەوە:

—دەی،دوایی؟

زۆربا بەبێزاریەوە وتی:

—دیسان دەستت بە (دوایی ، دوایی)) كردەوە !

هەناسەیەكی هەڵكێشا

—شەش مانگ لەگەڵیا بووم، سوێند دەخۆم لەو ڕۆژە بەدواوە ئیتر ترسم لە هیچ نەما، بەڵێ، پێت دەڵێم ترس لە هیچ شتێك، مەگەر تەنیا شتێك، ئەویش ئەوەیە خوا نەكردە شەیتان یان خوا بیرەوەری ئەو شەش مانگەم لەبیربەرێتەوە، تێ دەگەیت، سەرۆك؟

زۆربا چاوی لێك نا، گۆڕانێكی زۆری پێوە دیاربوو، ئەمە یەكەمین جاربوو بیبینم یادوەریەكی ئەوەندە كۆن بەم سەختیە بیهەژێنێت، دوای كەمێك پرسیم:

—كەواتە تۆ نوسات زۆر خۆش ویستوە؟

زۆربا چاوی كردەوەو وتی:

—تۆ لاویت، سەرۆك، تۆ هێشتا لاویت و پەی بەم شتانە نابەیت، كەتۆیش وەك من مووت سپی بوو ئەوسا جارێكی تر قسەیەك لەم باسە نەمرە دەكەین.

—كام باسی نەمر؟

—ژن، ئیدی! مەگەر چەند جارم پێ وتیت ژن مەسەلەیەكی نەمرە! بەڵام تۆ ئێستا لەو كەڵەشێرە باڕانە كە دووجارو سێ جار بەسەر مریشكا دەتسن، پاشان، جیكڵدانیان پڕ لە هەوا دەكەن، دەچنە سەر زبڵدانێكی بڵندو دەكەونە خوێندن و خۆ گیڤ دەكەنەوە، ئەوانە گوێ نادەنە مریشكەكە، بەڵكوو لە پۆپنەكانیان دەڕوانن، كەواتە چی لەخۆشەویستی تێدەگەن، هیچ، هیچ.

بەرِكەوە تفێكی لەسەر زەوی كرد، دوایی، ڕووی وەرگێڕا، نەی دەویست تەماشای من بكات، لێم پرسیەوە:

-چاکە، زۆربا، نوسا چی بەسەر هات؟

زۆربا کە لەخاڵێکی دووری دەریادا ڕوانینەکەی کۆتایی دەهات لەوەڵامدا وتی:

-شەوێك دوای ئەوەی گەڕامەوە ماڵێ نوسام لەهیچ شوێنێك نەبینیەوە، ئەو لەگەڵ سەربازێکی لاودا کە چەند ڕۆژێك بوو هاتبوە گوندەکە هەڵاتبوو، ئیتر هەموو شتێك تەواو ببوو، دڵم لە ناوەڕاستا بوو بەدوو لەتەوە، بەڵام زۆڵە زوو خۆی گرتەوە، بێگومان تۆ ئەو چارۆکانەی پاپۆڕت دیوە کە بەکنری ئەستوور پارچەی سورو زەردو ڕەشیان پێوە دوراوەو هیچ زریانێك ناتوانێت لێ یان بکاتەوە، دڵی منیش وەك ئەو پارچانە وایە، لە هەزار لاوە کون بوەو هەزار پینەی پێوەیە، ئیدی لەچی بترسێت!

-ئەی بەرانبەر بە نوسا هیچ رقێکت لەدڵ نەگرتوە، زۆربا؟

-جا بۆ دەبێت ڕقی بۆ لەدڵ بگرم؟ تۆ چیت دەوێت دەتوانیت بیڵێیت، بەڵام ژن شتێکی ترە، سەرۆك، ژن مرۆڤ نیە، ئیتر بۆ رقی لێ هەڵ بگرم؟ ژن گیاندارێکە ناتوانیت تێی بگەیت، هەموو یاسا دینیو دەوڵەتیەکان لەبارەی ژنەوە بڕیاری هەڵەیان داوە. نەو، نەدەبوو ئەمانە لە گەڵ ژندا وەها رەفتارێك بکەن، نەو ئەم یاسایانە، سەرۆك، زۆر درشتو زاڵمانەن، ئەگەر من یاسا ناس بوومایە یاساکانی ژنو پیاوم وەك یەك دانەدەنا، بۆ پیاو دە، سەد، هەزار ئەرکم دادەنا، چونکە پیاو پیاوەو بەرگە دەگرێت، بەڵام بۆ ژن تەنانەت یەکێکم نەدەنووسی، چوونکە دەبێت چەند جارت پێ بڵێم، سەرۆك، کە ژن گیاندارێکی لاوازە. بەسەلامەتی نوسا، سەرۆك، هەروەها بەسەلامەتی ڕەگەزی ژن، خوایش عەقڵێك بەئێمەی پیاو بدات.

دەستی بەرز کردەوەو پێکەکەی هەڵدا، پاشان کتو پڕ وەك تەورێکی بەدەستەوە بێت دەستی هێنایە خوارێ، دیسان وتی:

-خوا یان دەبێت عەقڵێك بەئێمەی پیاو بدات یان کارێکی نەشتەرگەریمان تیا بەئەنجام بگەیەنێت، بێجگە لەمە باوەڕ بکە کەڵکمان پێوە نەماوە.

-٨-

ئەمڕۆ نم نم باران دەبارێت‌و سۆزو تاسەیەکی بێ ئەندازە زەوی‌و ئاسمانی کردۆتە یەک، من کەوتمەوە بیری ئەو پەیکەرە هیندۆکیەی کە ڕەنگی بەردەکەی ڕەش بوو: باسکی پیاوەکە کە لەکەمەری ژنەکە ئالأبوو، ئەمەندە بەمیهرو پاکیزەییەوە ببوونە یەك، لەگەڵ ئەوییشدا کە ڕەوتی زەمانە هەردوو لەشەکەی ساویوەو تا ڕادەیەك خواردوویەتی، کەچی بینەر واهەست دەکات کە دوو مێروون‌و تێکەڵ بەیەکدی بون، نمەی بارانێك بەسەریاندا دای کردووەو باڵی تەڕ کردوون‌و زەوییش ئارەزوویەتی لەسەر خۆ هەر بەو لەئامێزگرتنەوە هەڵیان لووشێت.

من لە کوختەکەدا دانیشتووم، تەماشای ئاسمان دەکەم کەتادێت تاڵتر دەبێت، تەماشای دەریایش دەکەم کە بە بروسکەیەکی ڕەنگ خۆڵەمێشی نیمچە سەوز دەدرەوشێتەوە، لەم سەرەوە تا ئەوسەری کەنارەکە نەمرۆڤێك هەیە، نە کەشتیەکی چارۆکە دارو نە باڵندەیەك، تەنیا بۆنی خاك لە پەنجەرە کراوەکەوە دێتە ژورێ.

لە شوێنەکەم هەستام‌و وەك درۆزەکەر دەستم بۆ بارانەکە درێژ کرد، لەپڕا حەزی گریانم هاتێ، هەستم بەخەمێك کرد کە نە بۆ خۆم و نەهی خۆم بوو، بەڵکوو لەوە قووڵترو تاریك تر بوو، لەخاکە تەڕەکەوە هەڵدەستا، وەك ترسی جانەوەرێك کە هێورو ئارام بلەوەڕێت، هەر بەنەست‌و بێ ئەوەی هیچی بەچاو دیبێت بۆنی ئەوە بکات کە کەوتۆتە داوەوەو ڕێی دەرچوونی نیە وابوو، خەریك بوو هاوار بکەم، چونکە دەمزانی ئەمە ئاسوودەیی‌یەکم پێ دەبەخشێت، بەڵام شەرمم پێ هات.

هەورەکان تا دەهاتن بەرەو خوارتر دەبوونەوە، من لەپەنجەرەکەوە تەماشای دەرەوەم دەکرد، دڵم لەسەر خۆ لێی دەدا.

دەزانیت ئەوکاتانەی کەباران نم نم دەبارێت چ ئازارو خەمێکی زۆرت لا کەڵەکە دەکەن! هەموو ئەو یادگارە تاڵانەی کە لە قوڵایی دڵی مرۆڤدا حەشار دراون، وەك دوری

یاران، زەردەخەنە کوژاوەکانی سەر لێوی ئافرەت، ئەو ئومێدانەی وەک پەروانەی بێ باڵ تەنیا کرمەکەیان ماوەتەوەو ئەویش بەسەر گەڵای دڵمەوەیەو دەی خوات، هەموو ئەمانەت دێنێتەوە یاد.

ورده ورده یادی هاورێیەکم کەبۆ قەوقاز دوور خرابوەوە، لەنێو باران و خاکە تەڕەکەوە تازە دەبوەوە، قەڵەمەکەم هەڵ گرت، بەسەر پەڕە کاغەزدا نووشتامەوە، بۆ ئەوەی تۆڕی بارانەکە بپسێنم و هەناسەیەک بدەم لەگەڵیا کەوتمە دەردە دڵ کردن.

((هاورێی گەلێک ئازیز، من ئێستا لە کەنارێکی تەریکی کریت دام، لەم شوێنەدا من و چارەنووس رێک کەوتووین تا چەند مانگێک بۆ تەمسیل کردن لێرە بمێنمەوە، نامەت بۆ دەنووسم، لێرە دەوری سەرمایە دارێک دەبینم، دەوری خاوەن کانێکی خەڵووزی لینیت، دەوری خاوەن کار، ئەگەر ئەم تەمسیلانەی من بیگرێت دەڵێم تەمسیل نەبووە، بەڵکوو بڕیارێکی گەورە بوو دابووم کە شێوەی ژیانم بگۆڕم.

((لەبیرتە لەکاتی ڕۆیشتنتا منت بە ((مشکی کاغەز خۆر)) ناوزەد کرد؟ ئەوسا ئەو قسەیەی تۆ زۆری کارلێ کردم و بڕیارمدا کە ئەم کاغەز کاغەزێنە تا ماوەیەک-یان بۆ هەمیشە- بخەمەلاوەو ڕوو لە ژیانێک بکەم کە کارو کردەوە بێت. تەپۆڵکەیەکم بەکرێ گرت کە کانی خەڵوزی تیایە، کرێکارم بۆ گرت، بێڵ و قازمەو چرای ئێستیلن وسەلەو کامیۆنم کڕی و تونێلم لێ داو بەدڵی زەویدا چوومە خوارێ، هەموو ئەمانەم بۆ تووڕە بوونی تۆ بوو، ئەوەندەم هەڵکەندو بەژێر زەویدا چوومە خوارێ، لەمشکی کاغەز خۆرەوە بووم بەمشکە کوێرە، هیوادارم ئەم گۆڕانەت بەدڵ بێت.

((من لێرە خۆشیەکەم زۆر گەورەیە، چونکە زۆر سادەن و لەچەند ڕەگەزێکی نەمری وەک: ئاوو هەوای بێگەرد، خۆر، دەریا، نانی گەنم پێک دێن.

شەوانە سەندبادێکی بەحری سەیر بەرەو ڕووم دادەنیشێت و قسە دەکات، قسەکانی دنیا گەورە دەکات، هەندێک جار کە ئیتر وشە دەرەقەت نایەت، لەشوێنی خۆی ڕادەپەڕێت و دەست بەسەما کردن دەکات، کە سەمایش دادی نادات سەنتورەکەی لەسەر ئەژنۆی دادەنێت و دەست دەکاتە ژەندن.

((هەندێك جار ئاهەنگێکی هێند وەحشیانە لێ دەدات کە مرۆڤ هەناسەی بەگیر دێت، چونکە لەخۆڕا هەست بەوە دەکات کە ژیان بێتام و نابوودەو شیاوی مرۆڤ نیە، جاری تریش ئاهەنگێکی ئەوەندە خەماوی دەژەنێت مرۆڤ هەست بەوە دەکات ژیان پێنج و دوو ڕۆژێکەو، وەك لمی نەرم لەنێو پەنجەکانتەوە دەخزێنە خواری و ئیتر بوارێك بۆ ڕزگار بوون نیە.

((دڵی من وەك مەکۆی جۆڵا لەم سەری سنگمەوە بۆ ئەوسەری ڕادەکات، تەمەنی ئەم چەند مانگەم دەڕێسێت کە لە کریت دا بەسەری دەبەم –پەنا بەخوا– هەست بەبەختەوەریش دەکەم.

کونفوشیوس[٦٣] دەڵێت ((زۆرن ئەوانەی بەختەوەری لەسەروی مرۆڤەوە دەبینن. هەندێکیش لەخواریەوە، بەڵام بەختەوەری ڕێك بەئەندازەی باڵای مرۆڤە)) ئەمە ڕاستە، کەواتە بەئەندازەی باڵای مرۆڤەکان خۆش بەختی هەیە، خۆش بەختی ئەمڕۆی منیش هەر ئەوەندەیە، ئەی شاگردو مامۆستای ئازیزم، منیش بەنیگەرانیەوە بەختەوەریەکە دەپێوم و دەیپێومەوە، تا بزانم ئێستا باڵام چەندە، چونکە تۆ خۆت باش دەزانیت کە باڵای مرۆڤ هەمیشە لە ئاستێکدا نیە))

((ئای، چۆن گیانی مرۆڤ بەپێی ئاوو هەواو بێدەنگی و تەریکی، یان ئەوکەسانەی هاوڕێتن و لەگەڵیاندا دەژی لە گۆڕان و وەرچەرخاندایە!))

من لێرەوە کە لەپەنجەرەی تەریکی خۆمەوە تەماشای مرۆڤەکان دەکەم، ئیتر ئەوان نەك وەك مێروولە، بەڵکوو بەپێچەوانەوە، لەشێوەی جانەوەرێکی زەبەلاحی سەردەمە کۆنەکان، واتا دیناسور[٦٤] و پترواکتیلەکان[٦٥] دەبینم کە لەدەوروبەرێکی پڕ لە

---

[٦٣] کونفوشیوس، یان بەزمانی چینی (کنك فوتسو) ناو دارترین فەیلەسوفی چینی و دامەزرێنەری قوتابخانەی ئاکار (ئەخلاق)ە هەمیشە هەوڵی بۆ پاکژ کردنەوەی دەروونی مرۆڤو یەکسانی داوە. ٥٥٢-٤٧٩ پ.ز (و-ف)

[٦٤] dINOSAR ئەو گیاندارە خشۆکە زەبەلاحەیە کە لەسەردەمی دوەمی زەوی ئاسیدا هەبوون و تەنیا ئاسەواریان ماوە درێژی هەندێك جۆریان وەك (برونتوزورس) لە چل مەتر تێ پەڕیوە. و.ف

((اوسیدکرنبیک)و پڕ لە ڕوەکە گەنیوە بێ کەڵکەکاندا کە لەسەرەتای دروست بوون لەوێوە دەستی پێ کردووە دەژین. ئەم دەوروبەرە جەنگەڵێك بوو پڕ لەنهێنیو نا دروستو سۆز بەخشیش، مانا گەلێکی وەك ((نیشتمان))و ((نەژاد)) کە تۆ حەزیان پێ دەکەیتو ماناگەلێکی تری وەك ((وڵاتی باڵا))و ((مرۆڤایەتی)) کەمن شەیدایم، لێرە، لەگەڵ هێزێکی توندی وێرانیا کاردا یەکسانو یەك نرخیان هەیە، ئێمە واهەست دەکەین کە لەقوڵاییەوە هاتوینەتە سەرەوە تا چەند برگەیەك، نا، نەك برگە، بەڵکوو چەند پیتێکی دەنگداری پێکەوە نەگونجاوی وەك (ئاه) یان (ئۆه) بخەینە سەر زمانمانو دوایی لەناو بچین، گەورەترین بیرو باوەڕیش ئەگەر جوان یەکالای بکەینەوە، دەبینین بوکەڵەیەکە هەناوی پڕە لە ئاردە دارو لەناو ئەویشدا سپرینگێکی تەنەکە شاراوەتەوە.

((تۆ من باش دەناسیت، ئەوەیش دەزانیت ئەم بیرە ڕەقو تەقانە نەك نام وەستێنن، بەڵکوو بەپێچەوانەوە ئەو دەنکە شقارتانەن کە بڵێسەم لە دەرون هەڵدەستێننو پێویستیشن، چونکە وەك ـ بودا ـ ی مامۆستام دەفەرموێت: ((من دیومە)) لەبەر ئەوەی کە دیومەو بەچاو داگرتنێك لەگەڵ دەرهێنەرە نادیارو مەستو خۆش خولقەکەمدا نێوانی خۆشم دامەزراندوە، بۆ لە مەودوا دەتوانم لەسەر ئەم تۆپی زەویەو تاکۆتایی، واتا بەشەوقو شادیەوە دەوری خۆم ببینم، لەبەر ئەوەیش کە دیومە کەواتە منیش لە داهێنانی بەرهەمێکدا کەلەسەر شانۆی خوا دەوری تیا دەبینم هاوکاریەکم کردوە.

((هەر بەم جۆرەکە من لێرەوە تەماشای شانۆی گەردون دەکەم، لەئەشکەوتە ئەفسانەییەکانی قەوقازدا تۆیش دەبینم کە سەرقاڵی بەئەنجام گەیاندنی دەوری خۆتیتو، هەوڵ دەدەیت کە چەندین هەزار کەس لە ڕەچەڵەكو نەژادی ئێمە کە لەبەردەم مەترسی مەرگدان رزگاریان بکەیت، تۆیش یەکێکیت وەك پرومیپە[٦٦] دەبێت لەشەڕ لەگەڵ هێزی

---

[٦٥] پترۆداکتیل :pterodacly خشۆکێکی کۆنە باڵداری سەردەمی دوەمی زەوی ناسینە، هەندێکیان بچووكو هەیشیان بوە کە بەباڵی کردۆتەوە حەوت مەتر بوە. و ـ ف

[٦٦] Promethea لە ئەفسانەکانی یۆناندا خوای ئاگرە، کوڕی تیتان پایتو برای ئەتلەسەو بەبناغەدانەری یەکەم شارستانیەتی مرۆڤ دادەنرێت، ئەودوای ئەوەی ئادەمی لەقوڕ دروست کرد بۆ گیان بەبەراکردنی ئاگری لە ئاسمان دزی، زیوس بەهۆی هەفائیستوسەوە لەسەر کێوی

ئەهریمەنەكاندا، واتا برسیەتیو سەرماو مەرگو نەخۆشی ئازاری راستەقینە بچێژێت. بەڵام تۆ پیاوێكی بەدەماریت، هەندێك جار چێژ لەوە وەردەگریت كە ئەوهێزی ئەهریمەنانە زیاتر بنو لەشكست نەیەن. چونكە لەم حاڵەتەدا ئامانجی تۆ كە تا ڕادەیەك بەردەوام لەگەڵ نائومێدیدایە ئازاو قارەمانتر دەبێتو گیانیشت دەرك بەمەزنیەكی غەم ئەنگێز تر دەكات.

((تۆ ئەم ژیانەی خۆت تەواو بە بەختیار دەزانیت، لەبەر ئەوەیش كە خۆت وات داوەتە قەڵەم هەر وایە، تۆیش بەختەوەریت بە قەدەر باڵای خۆت بڕیوە، سوپاس بۆ خوا كە ئێستا باڵای تۆ لە باڵای من بەرزترە. مامۆستای چاكیش خەڵاتی لەوە باشتری لەكوێ دەست دەكەوێت كە قوتابیەكەی لەخۆی چاكتر پەروەردە كردبێت.

((بەڵام من گەلێك جار فەرامۆش كارم، خۆ لە بیردەكەمو، ڕێگای هەڵە لەبەردەگرم، ئیمانم مافورێكی بێ باوەڕیە، هەندێك جار دێمە سەر ئەوەی ئاڵو گۆڕێك بەدی بێنم، واتا هەموو تەمەنم بكەمە قوربانی چەند چركە ساتێكی راستەقینە، بەڵام تۆ شێرنی كەشتیەكەت توند گرتوە، تەنانەت كە لەگەڵ مەرگیشدا دەستەو یەخە دەبیت ئەوەت لەبیر ناچێت بەرەو كوێوە دەئاژویت.

((ئەو ڕۆژەت لەبیرە كە هەردووكمان لەكاتی گەڕانەوەماندا بۆ یۆنان بەئیتاڵیادا تێ پەڕین؟ ئەی لەبیرتە كە بڕیارماندا بچینە ناوچەی پونتوس[٦٧] كە ئەوسا ناوچەیەكی زۆر پڕ مەترسی بوو؟ لەوێ، لە شارۆچكەیەكدا بەپەلە لە شەمەندەفەر دابەزینو، تا گەیشتنی شەمەندەفەرێكی دی تەنیا سەعاتێكمان بەدەستەوە بوو، چووینە ناو باخێكی چڕو گەورەی نزیك بە ئێسگەی شەمەندەفەرەكەو، درەختی ناو باخەكە گەڵا پانو، داری مۆزو قامیشی ڕەنگ خۆڵەمێشیەكی كانزایی تێری تیا ڕوێنرابوو. مێش هەنگەكانیش بەلقێكی گوڵكردوەوە پورەیان دابوو، لقەكە دەهاتو دەچوو، بەوە خۆشحاڵ بوو كە هەنگەكان گوڵەكان دەمژن.

---

قاف زیندانی كردو هەڵۆیەكی بۆ تەرخان كرد كە هەموو ڕۆژێك لە جگەری پرومیسە بخوات بەڵام هەموو ڕۆژێك جگەری وەك خۆی لێ دەهاتەوە، پرومیتە لەدواییدا بەدەستی هیرقەل یا هیراكلس ئازادكرا. و-ف

[٦٧] pontus

((ئێمە بێدەنگو دڵ خۆش وەك لەخەودا بین وابوو، هەر دەیش ڕۆیشتین، لەپڕا، لەپێچێکی پڕ لەگوڵی باخەکەدا دوو کچمان بینی بەدەم ڕۆیشتنەوە کتێبیان دەخوێندەوە، ئیتر من نازانم جوان بوون یان ناشیرین، تەنیا ئەوەم لەیادە کە قژی یەکێکیان زەردو هی ئەوی دی ڕەش بوو، هەردووکیان کراسی بەهاریان لەبەردا بوو. ئێمە بوێرانە، وەك یەکێك لەخەودا بێت لێ یان نزیك کەوتینەوە، تۆ بەپێکەنینەوە پێت وتن:((ئەو کتێبەی دەیخوێننەوە باس لەهەر شتێك بکات ئێمە ئامادەین گفتوگۆی لەسەر بکەین)) ئەوان کتێبێکی گۆرکیان[٦٨] دەخوێندەوە، لەبەر ئەوەی ئێمە پەلەمان بوو خێرا دەستمان کرد بەباسی ژیانی هەژاریو بەد بەختیو یاخی بوونو خۆشەویستی.

((من هەرگیز خۆشیو ناخۆشی ئەو ڕۆژەم لەبیرناچێت، ئیتر ئێمەو ئەو دوو کچە نەناسە بووینە دوو هاوڕێی دێرینو کۆنە عاشق، خۆمان بە بەرپرسیاری ڕۆحو لەشیان دەزانیو پەلەیشمان بوو، چونکە دوای چەند دەقیقەیەکی تر بەیەکجاری لێ یان دادەبڕاین. لەو هەوا کرژەدا بۆنی فڕاندنو مەرگ هەست پێ دەکرا.

((شەمەندەفەرەکە گەیشتو شوتی لێدا، ئێمە وەك لەخەو هەستابین ڕاپەڕین. دەستی یەکتریمان گوشی، من چۆن دەتوانم ئەو دەست گوشینە توندو نائومێدانەیەو ئەو دە پەنجەیەی نەیان دەویست لێك جیاببنەوە لەیاد بکەم؟ کچێکیان زۆر ڕەنگی پەڕیبوو، ئەوی تریان پێ‌دەکەنیو دەلەزی.

((لەبیرمە کە هەر ئەوسا پێم وتیت وشە گەلێکی وەك (یۆنان) (نیشتمان) (پێویستی سەر شان) وشەی بێمانان، ئەمەیان حەقیقەتە)) تۆ لەوەڵامدا پێت وتم (ڕاستە وشەی یۆنانو نیشتمانو پێویستی سەر شان هیچ مانایان نیە، بەڵام ئێمە بۆ ئەو هیچەیە کە بەتەواوی ئارەزووەوە خۆمانی بۆ بەکوشت دەدەین))

((بەڵام بەڕاستی من بۆ ئەمانە بۆ تۆ دەنووسم؟ بۆ ئەوەیە پێت بڵێم ئەو شتانەی ئەوسا پێکەوە کردومانن من لەیادم نەکردوون. بۆ ئەوەیشە ئەو مەبەستەی بەڕەو ڕوو

[٦٨] gorki

لەڕوومان نایەت بۆ یەکی باس بکەین چونکە وامان عادەت کردوە، ئیتر عادەتێکی باشە یان خراپ، من دەرفەتی ئەوە بۆ خۆم بڕەخسێنم کە لێرەدا باسیان بکەم.

((تۆ کە ئێستا لای من نیتو روم نابینیت، منیش ترسی ئەوەم نیە لاوازو قەشمەر دەرکەوم، پێت دەڵێم زۆرم خۆش دەوێیت)).

نامەکەم کۆتایی هات، لەگەڵ هاورێکەمدا دەردە دڵم کردبوو، هەستم کرد باری لەشم سووك بووە، زۆربام بانگ کرد، بۆ ئەوەی تەڕ نەبێت لەژێر تاشە بەردێکدا دانیشتبوو، لەسەرو بەندی تەلو دەزگای تەلەفریکەکەیدا بوو، بەسەریمدا نەڕاند:

—دەی زۆربا، هەستە با بڕۆین چەرخەڵەیەکی ناو دێ بکەین.

—دیارە زەوقت هەس، سەرۆك، ها! باران دەبارێت، نابێت بەتەنیا خۆت بفەرمویتو بڕۆیت؟

—بەڵی زەوقم هەیەو حەز ناکەم لەدەستی بدەم، ئەگەر پێکەوە بچین هیچم لەکیس ناچێت، وەرە با بڕۆین.

زۆربا پێکەنیو وتی:

—بەختەوەرم کە پێویستیت تێم کەوتوە، بابڕۆین.

پاڵتاوە کریتیە خوریەکەی خۆم کە بە کڵاوێکی نووك تیژ کۆتایی دەهاتو من بەدیاری دابومێ لەبەری کرد. بەجووتە بەناو قوڕاوی سەر رێگاکەدا بەرەو گوندەکە بەرێکەوتین.

باران دەباریو، لووتکەی چیاکان بەدەرەوە نەبوون، سووسەی کزە بایەك نەبوو، بەردەکان دەبریسکانەوە، گردی خەڵوزی لینید لەژێر گوشاری تەمو مژدا خپ بیوو. دەت وت خەمێکی ئینسانی دەمو چاوی ژنانەی گردەکەی لەخۆیەوە پێچاوەو گردەکە لەژێر باراندا لەهۆش خۆی چوە.

زۆربا وتی:

—کەباران دەبارێت دڵی مرۆڤ خەم دای دەگرێت، نابێت لەباران بێزار بیت، سەرۆك، ئەو بەستەزمانەیش گیانی تیایە.

لەداوێنی پەرژینێکدا چەمایەوەو یەکەمین گوڵە نێرگزی کێوی کە تازە پشکوتووبوون لێ کردەوە، ماوەیەکی زۆر، بێ ئەوەی تێری لێ بخوات هەر لێی دەڕوانی، وەك یەکەم

جاری بێت گوڵی نێرگزی ببینێت. پاشان لە حاڵێکدا کە چاوی لێك نابوون و بۆنی پێوە دەکردن پێی وتم:

–خۆزگا تێ دەگەیشتین، سەرۆك، کەبەردو گوڵ و باران چی دەڵێن، ڕەنگە هاوار بکەن، هاوار لەئێمە بکەن و ئێمە نەی بیستین، ئەی گوێی مرۆڤ کەی دەکرێتەوە؟ کەی چاومان بۆ بینین هەڵدێت؟ کەی باسکمان والا دەکەین تا هەموو .. بەردو گوڵ، باران و مرۆڤ لە ئامێز بگرین؟ تۆ دەڵێی چی؟ سەرۆك، ئەی کتێبەکانت چی دەڵێن؟

من پشتی قسەیەکم گرت و وتم:

–بۆ دۆزەخ! بۆ دۆزەخ! کتێبەکان بێجگە لەمانە هیچی تریان نیە بیلێن.

زۆربا قۆڵی گرتم و وتی:

–شتێکم بەبیردا هاتوە ئەمەوێت پێتی بڵێم، سەرۆك، بەڵام نابێ زویر بیت، دەبێت هەموو کتێبەکانت لەسەریەك کەڵەکە بکەیت و ئاگرێکیان پێوە بنێیت، پاشان ... نازانم بڵێم چی، تۆ پیاوێکی بێ عەقڵ نیت و مرۆیەکی چاکیت... پاش ئەوە دەشێت شتێکی چاکت لێ دروست بکرێت.

لەدڵی خۆمدا وتم: (هەقیەتی، هەقیەتی، بەڵام من ناتوانم کارێکی وابکەم)

زۆربا راماو کەوتە بیر کردنەوەو، دوای کەمێك وتی:

–من دەرك بەشتێك دەم...

–بڵێ بزانم، دەرك بەچی دەکەیت؟

–بەتەواویی نایزانم، بەڵام واهەست دەکەم شتێك بزانم، شتێك ئەگەر بمەوێت بەزمان بیلێم خراپی بکەم، خوا بیکات رۆژێك لەسەر خۆم بم بەسەما کردن بۆتی دەر دەبرم.

بارانەکە کردیە لێزمە، ئێمە گەیشتینە گوندەکە، کچۆڵەکان مەڕیان لە لەوەڕگاوە دەگێڕایەوە، جوتیارەکان نیریان لەملی گاکان داماڵی بوو، زەویە نیوە کێڵراوەکانیان جێ هێشتبوو، ژنان لە کۆڵانان‌دا بەدوای منالیاندا دەگەڕان. کە تەرزە دەستی بەبارین کرد ترسێکی زۆر گوندەکەی داگرت، ژنان کەوتنە هاوار هاوارو بەچاوییش پێ دەکەنین. لەڕیشی پڕو سمێڵی بادراوی پیاوانەوە دڵۆپی گەورە گەورەی باران دەهاتنە خوارێ، بۆنێکی تیژ لە خاك و بەردو گیاوە هەڵدەستا.

ئێمە كەباران وەك مشكی ناو ئاوی لێ كردبووین خزاینە چاخانە –قەسابخانەكەی– عیسمەت–ەوە، چاخانەیەكی تەواو ئاپوورە هەندێك، یاری –بلوت–ی بەكاغەز دەكرد، هەندێكی تر وایان دەنگ لێ هەڵبڕیبوو دەت وت لەم كێوەوە بۆ ئەو كێو بانگی یەكدی دەكەن، لەپشت مێزێكی بچووكەوەو لەناوەڕاستی چاخانەكەدا ریش سپییەكانی دێ لەسەر قەنەفەیەكی تەختە دانیشتبوون، ئاپوئاناگنوستی بەكراسە سپیەكەیەوە كە قۆڵەكانی پان‌و پۆڕ بوون ((مافراندوونی)) بێ دەنگو عەبووسن نێرگەلەی دەكێشاو چاوی بەزەویەكەوە دورابوو، مامۆستا میانە تەمەنەكە، بێدەنگ، بەویقار، خۆی دابوو بەسەر گۆچانە ئەستورەكەیدا، بەزەردەخەنەیەكی پڕ لەئارامەوە گوێی لەچەتەوڵێكی ئیشن گرتبوو كە تازە لە ((كاندی)) گەڕابۆوە، دەربارەی شتە سەیرەكانی ئەوارە گەورە قسەی بۆ دەركد، چایچیەكەیش كە لەپشت مێزەكەوە وەستابوو بەدەم گوێ گرتنەوە چاودێری جزوەی قاوەكانی دەكرد كەبەسەر ئاگرەكەوە بوون‌و، پێ دەكەنی.

ئاپوئاناگنوستی كە چاوی بەئێمە كەوت هەستاو وتی:

–ئای هاوشاریەكانم، فەرموون وەرنە لای ئێمەوە، ئەوەتا سفاكیانۆ نیكۆلی[٦٩] ئەو شتانەمان بۆ دەگێڕێتەوە كە لە–كاندی–دیونی یان بیستونی، مرۆڤێكی قسە خۆشە، لێرەوە وەرن، ئینجا ڕوی لەچایچیەكە كردو وتی:

–مانۆلاكی[٧٠] دووپێك ئارەق.

ئێمە دانیشتین، شوانەی كێوی كە چاوی بەم بێگانانە كەوت (گرژ)و بێدەنگ بوو، مامۆستاكە بۆ ئەوەی بیهێنێتەوە قسە لێی پرسی:

كەواتە قارەمان. نیكۆلی. بێگومان لەوێ شانۆیشت دیوە، وا نیيە؟ بەلاتەوە چۆن بوو؟

سفاكیانۆ نیكولی دەستە زبرو گەورەكانی بۆ لێوانە شەرابەكەی درێژ كردو هەڵی گرت،یەكژەمی بەسەریەوە نا، بوێریەكی تێ گەڕاو دەنگی لێ هەڵبڕی:

---

٦٩ Sfakianonikoli

٧٠ Manolaki

—منو نەچم بۆ شانۆ؟ بێگومان چووم، من هەمیشە ئەوەم دەبیست کە دەیان وت☹(کوتوپولی[٧١] ئەمەیەو کتمۆپۆلی ئەوەیە)) شەوێك نیشانەی خاچم کێشاو بەخۆم وت: ((زۆرباشە، بۆ من خۆم نەچمو ببینم؟ بزانم ئەم هەموو ناوو ناوبانگەی کوتوپۆلی چیە؟

ئاپۆئاناگنوستی پرسی:

—باشە ، لاوو، چویت چیت بینی؟ چۆن بوو؟ توخوا بۆ ئێمەیشی بگێڕەوە.

—هیچ، بەسەری خۆم هیچی وام نەبینی. خەڵکی کەگوێی لەناوی شانۆ دەبێت بیر لە شتی سەیرو پێکەنیناوی دەکاتەوە، بەڵام وانیە، من داخ بۆ پارەکەم دەخۆم کە بەفیڕۆ چوو، شوێنێك بوو وەك چایخانەیەکی گەورە، یان وەك ئاغەڵێك مەڕو ماڵات مۆڵی تیا خواردبێت. پڕبوو لەخەڵكو کورسیو مۆمدان، هەر نەم دەزانی لەکوێم، بەری چاوم تاریكو هیچم نەدەبینی، بەخۆم وت:((خوا گیان، دیارە منیان هێناوەتە ئێرە تا سیحرم لێ بکەن، دەبێت دەربچم)) لەو کاتەدا، کچێك کە وەك کلك هەڵتەکێنە دەجووڵا لێم نزیك کەوتەوەو دەستی گرتم، قیژاندم بەسەریا کە : ((ها! دەتەوێت بۆ کوێم بەریت؟ بەڵام ئەو گوێی بەقسەکانم نەداو بردمی، هەر بردمیو پاشان ڕووی تێکردمو وتی:

((لێرە دابنیشە)) دانیشتم، تەماشای هەر کوێیەکم دەکرد خەڵك بوو، لەپێشەوە، لەدواوە، لەڕاستەوە، لەچەپەوە، تەنانەت لەژێر سەقفەکە، بەخۆم وت : ((بێگومان دەخنکێم، ئێرە هەوای تیا نیە، لەوەی تەنیشتم پرسی: ((هاوڕێ، ئەم هونەر فیشانە[٧٢] لەکام دەرگاوە دێن؟ ئەو پەردەیەکی پیشاندام وتی: ((لەو ژوورەوە !)) ڕاستی کرد، لەپێشەوە زەنگێك لێ دەدرێت، ئینجا پەردەکە لادەدرێتو بەوتەی خۆیان ((کوتوپۆلی)) دەردەکەوێت، بەڵام کورتوپولی وەك ئەوان دەیڵێن مریشك نیە، ژنە، ژنێکی ڕاستەقینە،

---

[٧١] Cotopouli ژنە هونەرمەندێکی گەورەی یۆنانیە کە وشەکە مانا زمانیەکەی بەواتای – مریشك–'

[٧٢] مەبەست هونەر پیشەیە، لەدەقەکەدا Permaclonnas گۆڕاوە بە Primadonna کەمانای گەورەترین ژنی هونەر پیشە یان گۆرانی بێژی شانۆو ئۆرکسیترا دەگەیەنێت، ڕێنوسو فۆنەتیکەکانیان لەیەکتریەوە نزیکە. و–ف

ئینجا کورتوپولی کەوتە هاتوچۆ، بەم لاو ئەولادا خۆبادانو هەڵبەزو دابەز کە هەموو لەتەماشاکردنی تێر بوون کەوتنە چەپڵە لێدان، ژنەیش بۆی دەرچوو))

دێهاتیەکان لە پێکەنیندا لوول بوون، سفاکیانۆ نیکۆلی بێزار بوو، دەموو چاوی پێکدادا، ڕووی لەدەرگاکە کردو بۆ ئەوەی باسەکە بگۆڕێت وتی: ((هەر دەبارێت، هەموو بۆلای ئەویان ڕوانی، هەر لەو کاتەدا، ژنێك داوێنی کراسە ڕەشەکەی تا ئەژنۆی هەڵکردبوو، پرچی بەسەر شانیا هاتبوە خوارێو بەپەلە بەوێدا تێدەپەڕی،دەمو چاوی خڕپنو جلو بەرگە تەسکەکەی بەلەشیەوە قرسابوو، لەشێکی تۆکمەو ئارەزوو بزوێنی هەبوو.

من سڵەمیمەوە، بەخۆم وت:((ئەم بەڵایە لەکوێوە هات؟ وام هاتە بەرچاو کەژنێکی چوستو چالاکو ترسناکەو لەوانەیە کەپیاو هەڵدەلوشێت.

ژنەکە سەرێکی خێرای کێشاو نیگایەکی بروسکە ئامێزی لەناو چایخانەکە گرت، لاوێکی منالْ کار کە تازە خەتی دابوو لە نزیك پەنجەرەکەوە دانیشتبوو، وتی: یا حەزرەتی مریەم!

–مانولاکاسی [٧٣] پاسەوانی دارستان خوڕی:

–نەفرەتت لێ بێت.. تۆ ئاگر لەپیاو بەردەدەیتو بەدیار سوتانەکەیشیەوە دەوەستیت.

لاوە منالْ کارەکە کە نزیك بەپەنجەرەکە دانیشتبوو، سەرەتا لەسەر خۆ ورتە ورتێکی کرد، پاشان وردە وردە دەنگی لێ هەڵبڕی:

سەرینی بێوەژن بۆنی بەهێی لێ دێت

منیش بۆنیم کردوەو ئیتر ناتوانم بنووم

–مافراندونی– لوولەی نێرگەلەکەی ڕاوەشاندو هاواری کرد:

–دەمت داخە.

کوڕەکە بێ دەنگ بوو، پیرەمێردێك بەسەر مانولاکاسی پاسەواندا نوشتایەوەو لەسەرخۆ بەگوێیدا چرپاند:

[٧٣] Manolakas

—ئەوەمامت تووڕە بوە، ئەگەر ئەم ژنە بێچارەیەی بەردەست بکەوێت تیکە تیکەی دەکات. خوا ئاگای لێی بێت.

مانولاکاس وتی:

—ها، باوکە ئەندرولی[٧٤]، من بزانم تۆیش چاوت هەر بەدوای بێوەژنەکەوەیە، تەریق نابیتەوە، بەناخێری گیانت خزمەتی کلێسادەکەیت؟

—نا، دیسان دەیلێمەوە خوا ئاگای لێی بێت! تۆ نازانیت ماوەیەکە لەدێکەماندا چ جۆرە منداڵێك لەدایك دەبن، پەنا بەخوا وەك فریشتە جوانن، ئەزانیت بۆ؟ هەمووی لە چاوی ئەم بێوەژنەوە بناسن، چونکە وەك دەڵێن ئەم ژنە هاوڕێی هەموو دانیشتوانی ئەم گوندەیە، چۆن؟ بۆ نموونە، تۆ شەو چرا دەکوژێنیتەوەو بەخەیاڵ ئەو ژنەی کە لە باوەشتایە ژنی خۆت نیەو ئەو بێوەژنەیە، هەر لەبەر ئەمەیە هەر منداڵێك لەم گوندەدا لە دایك دەبێت زۆر جوان دەردەچێت.

باوە ئەندرولی کەمێك بێدەنگ بوو، پاشان لەبەرخۆیەوە وتی:

—خۆزگەم بەو ڕانانەی تێوەی دەئاڵێن، ئاخ، هاوڕێ، خۆزگا منیش ئێستا وەك — پاڤل[٧٥]—ی کوڕی ماڤراندونی تەمەنم بیست ساڵ دەبوو.

یەکێك بەپێکەنینەوە وتی:

—ئێستا کە بۆ ماڵێ دەگەڕێتەوە دەی بیبینەوە.

هەموو ڕوویان بۆ لای دەرگاکە وەرگێڕا، باران بەلێزمە بوو، ئاو بەسەر وردە بەردەکاندا دەکشا، جار جارە هەورە بروسکەیەك دنیای ڕووناك دەکردەوە.

زۆربا کە لە ڕۆیشتنی بێوەژنەکەوە پلەی گەرمای بەرز ببوەوە ئیتر خۆی پێ نەگیرا، ئاماژەی بەمن کردو وتی:

—بارانەکە خۆشی کردۆتەوە، هەستە با بڕۆین، سەرۆك.

لەبەر دەرگاکەدا، مێرد منالێکی پێ پەتی، قژ ئالۆزکاو، بەدوو چاوی گەورەو سامناکەوە دەرکەوت، نیگارکێشەکان وێنەی قەدیسین و یوحەنای مەعمەدانیان[٧٦] هەر بەو

---

[٧٤] Pere Androuli

[٧٥] Pavli

شێوەیە، بەو چاوانەوە كە لە ئەنجامی برسیەتی‌و نوێژكردندا تەواو كرابوونەوە وێنە دەكێشن.

هەندێك بە پێكەنینەوە بانگیان هەڵدا:

—سڵاو میمیتو[٧٧]

هەر گوندێك بۆ خۆی باڵوێكی هەیە، ئەگەر نەی بێت خەڵكی گوند بۆ كات بەسەر بردن یەكێك دەكەنە باڵول، میمیتو باڵولی ئەم گوندەیە.

میمتو بەدەنگێكی ژنانەی گیرەوە هاواری كرد:

—هاوڕێیان، هاوڕێیان، سورمیلینا[٧٨]ی بێوەژن مەڕی ون كردوە، هەركەس بیدۆزێتەوە پێنج لیتر ئارەقی خەڵات دەكرێت.

ماڤراندونی پیر هاواری لێ هەستا:

—بڕۆ دەرەوە، هەتیو، بڕۆدەرەوە.

میمیتو لەترساندا لە سوچێكی نزیك دەرگاكەوە كزۆڵەی كرد، ئاپو ئاناگنوستی دڵی پێ سوتاو وتی:

—وەرەدانیشە، میمیتو وەرە لێوانێك ئارەق بخۆرەوە با گەرم دابێیت، ئەگەر گوندەكەمان باڵوێكی وەك تۆی تیانەبێت بەكەڵكی چی دێت؟

لەوماوەیەدا لاوێك كە لەنەخۆش دەچوو، بەدوو چاوی شینی فرمێسكاوی‌و، قژی پێشە سەریەوە كە بەتەوێڵیەوە نووسابوو، ئاو لە هەمووگیانی دەچۆڕا، بەهەناسەبڕكێ لەبەر دەرگاكەوە دەركەوت. مانولاكاس هاواری لێ كرد:

—سڵاو كوڕی ئاپۆ پاولی، وەرە ژوری.

---

٧٦ Saint Jean Baptiste لە پێنج پێغەمبەرانی بەنی ئیسرائیلەكە شەش مانگ پێش عیسا لە دایك بوو، خەڵكی بە مەسیحیان دەزانی. بەڵام خۆی ئەوەی ڕەت كردەوەو مزگێنی هاتنی حەزرەتی عیسای پێدان.

٧٧ Mimitho

٧٨ Sourmelina

ماڤراندونی سەری وەرگێڕا، سەیری کوڕەکەی خۆی کردو نێو چاوی پێکدادا، لەبەرخۆیەوە وتی:

—یەعنی ئەم سەرو سەکوتە کوڕی منە؟ خوا بیبڕێت، لەکێ دەچێت؟ شەیتان ئەڵێ ملی بگرمو وەك جاڵجاڵۆکەی دەریا[79] بیکێشم بەزەویدا.

زۆربا لە پشیلەیەکی دەکرد لەسەر بەردێکی داخ دانیشتبێت، بێوەژنەکە سەری هێنابوە جۆشو ئیتر نەی دەتوانی لەنێو ئەو چوار دیوارەدا ئۆقرە بگرێت، هەر زوو زوو بەگوێمدا دەیچرپاند:

—برۆین، سەرۆك، بابرۆین، مرۆڤ لێرەدا دەخنکێت.

ئەو لای وابوو هەورەکان پەڕاگەندە بوونو خۆر دەرکەوتوە، ڕووی لە چایچیەکە کردو خۆی وا پیشاندا کە چ مەبەستێکی لەدواوە نەبێت، لێی پرسی:

—بەڕاست ئەو بێوەژنە کێیە؟

کۆندۆمانۆلیۆ[80] وەڵامی دایەوە ((ماینێکی ڕەسەن)ە.

پەنجەی لەسەر لێوی ناو بەچاو ئاماژەی بۆ ماڤراندونی کرد کە هێشتا چاوی لە زەویەکە بڕیبوو.

دیسان دووبارەی کردەوە:

—وتم ماینێکی ڕەسەن، بۆ ئەوەی گوناهی هەڵنەگرین چاکترە باسی نەکەین.

ماڤراندۆنی هەستا، مار پێچی نێرگەلەکەی لەملی نێرگەلەکەوە پێچاو وتی:

—ببورن، من دەڕۆمەوە ماڵێ، تۆیش، پاڤلی دوامەکەوە.

کوڕەکەی لەگەڵ خۆیدا بردو هەردووکیان لە بارانەکەدا ون بوون.

مانۆلاکاسیش هەستاو کەوتە دوایان.

کۆندۆمانۆلدو لەسەر کورسیەکەی ماڤراندونی دانیشت و بۆ ئەوەی دەنگی بە مێزەکانی دەوروبەری نەگات لەسەر خۆ وتی:

---

[79] Octopus جۆرە ماسیەکە هەشت باڵی لەدەوری دەمیدا هەیە.

[80] Kondomanolio

–بێچارە ماڤراندونی خەریکە لە داخا بتەقێت، بەد بەختیەکی گەورە ڕووی لەماڵەکەی کردوە، دوێنێ بەگوێی خۆم گوێم لێ بوو کە پاڤلی پێی وت: ((ئەگەر ئەو بێوەژنە نەبێتە ژنم خۆم دەکوژم)) بەلام ئەو سۆزانیە شووی پێناکات، پێی دەلێت: منالی کۆلان.

زۆربا بەگوێ گرتنی لەو قسانەی دەربارەی بێوەژنەکە دەکرا ئەوەندەی تر گڕی گرتبوو، پەیتا پەیتا دەیوت: دەبا بڕۆین.

کەلەشێر کەوتە خوێندنو بارانیش کەمێك خۆشی کردەوە.

من هەستام وتم: فەرموو با بڕۆین.

میمیتو کە لەسوچێکدا کزۆلەی کردبوو ڕاپەڕیو کەوتە دوامان.

وردە بەردەکان دەبریسکانەوە، دەرگاکان کە باران تەڕی کردبوون ڕەش دەچونەوە، پیرێژنە کۆماوەکان بە زەمیلەی دەستیانەوە بۆ کۆکردنەوەی هێلکە شەیتانۆکە لە مال هاتبوونە دەرێ.

میمیتو لێم نزیك کەوتەوە، دەستی لە دەستم داو وتی:

–سەرۆك، جگەرەیەکم بدەرێ، بەلکو بەختی خۆشەویستیت یاربێت.

جگەرەیەکم دایە، دەستە لاوازەکانی کە خۆر سوتاندبوونی بۆ درێژ کردمو وتی:

–بەیارمەتی ئاگرەکەیشم بدەرێ.

جگەرەکەی داگیرساندو مژێکی قوولی لێدا، هەموو دووکەلەکەی بەرەو سیەکانی هەلمژیو پاشان لەهەردوو کونە لوتیەوە ڕایدان. چاوی نانە سەر یەکو بەنیوە کراوەیی هێشتنیەوە، لەبەر خۆیەوە وتی:

–ئێستا خۆم بە پاشا دەزانم.

–بۆ کوێ دەچیت؟

–ئەڕۆم بۆ باخی بێوە ژنەکە، بەلێنی داومەتێ ئەگەر بۆ دۆزینەوەی مەڕەکەی جاڕێکی بۆ بدەم ژەمێك خواردنم بداتێ

ئێمە خێرا دەڕۆیشتین، پەلە هەورەکان وردە وردە لەیەك دەترازانو خۆر بەدەر دەکەوت، گوندەکە لەخۆشی شۆردنو تازە بوونەوەکەی پێدەکەنی.

دەمی زۆربا پڕببوو لەئاو، لە میمیتوی پرسی:

—تۆ بێوەژنەکەت خۆش دەوێت؟

میمیتو تریقایەوەو وتی:

—بۆ خۆشم نەوێت؟ بۆ منیش وەك ئەوانی دی کوڕی گۆماوێك نیم؟

بەسەرسامیەوە پرسیم:

—گۆماو؟ مەبەستت چیە، میمیتو؟

—مەبەستم سکی ژنە، ئیدی!

مات بووم‌و بەخۆم وت تەنیا شکسپیر دەیتوانی لە چرکە ساتی داهێنانیدا ئاوازوو بێتە دەست‌و وێنەیەکی واقیعیانەو بێ پەردە بۆ ڕازی نهێنی‌و ناخۆشی لە دایك بوون بکێشێت.

تەماشای میمیتوم کرد چاوی گەورەو ناجۆرو کەمێك تیل بوون.

—تۆ ڕۆژگارت چۆن بەسەر دەبەیت، میمیتو؟

—دەتەوێت چۆنی بەسەر بەرم؟ وەك پاشایەك، بەیانیان لەخەو هەڵدەستم، تیکەیەك نان دەخۆم‌و دەکەومە کار کردن بۆ خەڵك، لەهەر شوێنێك‌و بۆ هەر کەسێك بێت، نامە دەگەیەنم‌و دەبەم، پەین دەکێشم، شیاکە کۆدەکەمەوە، بەقولاپەکەم ماسی دەگرم، من لەگەڵ پورمدا، دایە لینو دەژیم، ئەو لە شین‌و شەپۆڕو دانیشتنی پرسەدا دەلاوێنێتەوە، ڕەنگە بیناسن، چونکە هەموو کەسێکی ئێرە دەیناسێت، تەنانەت وێنەیشیان لێ گرتوە، هەر لە ئێوارەوە دەڕۆمەماڵێ، قاپێك شۆربا دەخۆم‌و ئەگەر هەبێت کەمێك شەراب دەخۆمەوە، ئەگەر نەیشبێت، ئەوەندە لە ئاوی پاکی خوا دەخۆمەوە تا سکم وەك تەپڵی لێ دێت، دوای ئەوە، شەو باش.

—ئەی بەتەما نیت ژن بێنیت، میمیتو؟

—من؟ خۆ شێت نەبووم، تۆ ئەڵێی چی هاوڕێ؟ یەعنی دەتەوێت ژانەسەر بۆ خۆم دروست بکەم؟ ژن پێڵاوی دەوێت؟ من پێڵاو لەکوێ بێنم؟ من خۆم پێم پەتیە.

—ئەی پێڵاوت نیە؟

—چۆن نیمە؟ بێگومان هەمە، پار کابرایەك مردوو پوورە لینو پێڵاوەکانی لەپێ داکەندو دای بەمن، بەڵام من تەنیا لە ڕۆژی جەژنی پاکدا کە دەچم بۆ کڵێساو تەماشای

کەشیشەکان دەکەم ئەو پێڵاوە لەپێ دەکەم. پاشان دایان دەکەنم. بەملما هەڵیان دەواسمو بۆ ماڵ دەگەڕێمەوە.

—لەم دنیایەدا چیت لەهەموو شتێکی تر پێ خۆشترە میمیتو؟

—یەکەم نان، ئای کە حەزم لە نانی گەرمو برژاوە بەتایبەتی نانی گەنم، پاشان شەرابو دوای ئەویش خەو.

—ئەی ژن؟

—پف، وتم تەنیا بخۆو بخۆرەوەو بخەوە، شتەکانی تر هەموو دەردی سەرین.

—ئەی بێوە ژن؟

—وێڵیکە کە، بۆ دۆزەخ، چاکترین شت ئەوەیە بیدەیتە دەست شەیتان.

سێجار تفی ڕۆ کردە سەر زەویەکەو نیشانەی خاچی کێشا.

—خوێندەواریت هەیە؟

—هیچ، کەمناڵ بووم بەزۆر بردمیانە بەر خوێندن، بەڵام زوو تووشی نەخۆشی گرانەتا بومو تێک چووم، ئیتر بۆخۆم لە دەست قوتابخانە ڕزگارم بوو.

زۆربا لە پرسیارەکانی من بێزاربوو، تەنیا بیری لای بێوەژنەکە بوو، دوایی قۆڵی گرتمو وتی:

—سەرۆک...

ئینجا ڕوی لە میمیتو کردو پێی ووت:

—تۆ لە پێشەوە بڕۆ، ئێمە قسەی تایبەتیمان هەیە.

دەنگی نزم کردو لەوە دەچوو ناجۆربێت، وتی:

—سەرۆک، ئێستا نۆرەتە، بەغیرەت بەو حەیای پیاو مەبە، شەیتان یان خوا ئەم تیکە چەورەی بۆ ناردویتو تۆش ددانی خواردنت باشە، ئەم خەڵاتە مەدەرە دواوە، دەست درێژ بکەو بیگرە، ئاخر خوا بۆ دەستی بە ئێمە داوە؟ بۆ گرتن، کەواتە! من لەتەمەنی خۆمدا ژنی زۆرم دیوە، بەڵام ئەم بێوەژنە نەحلەتیە لەوانەیە کە منارەش دێنێتە لەرزە.

بەناخۆشیەوە وەڵامیم دایەوە:

—من نامەوێت سەر ئێشە بۆ خۆم دروست بکەم.

ناخۆشیەکەی من لەبەر ئەوە بوو کە منیش لەناخی دڵمەوە حەزم دەکرد، ئەو لەش و لارە توندو تۆڵە لەباوەش بگرم کە وەك گیانلەبەرێکی بەتەڵەب هاتوو بەبەردەمدا تێپەڕی.

زۆربا بەسەر سوڕماویەوە وتی:

وتت سەر ئێشە بۆ خۆت دروست ناکەیت؟ ئەی تۆ چیت دەوێت؟

—من وەڵامم نەدایەوە، زۆربا لەسەری ڕۆشت:

—خودی ژیان دەردە سەریە، بەڵام نەك مردن، باشە تۆ هەر دەزانیت ژیان یانی چی؟ یانی پشتێنەکەت بکەرەوەو بەدوای دەردی سەریدا بگەڕێ.

من بێدەنگ بوومەوە، دەمزانی زۆربا ڕاست دەکات، بەڵێ، دەمزانی وایە، بەڵام ئەوەندە ئازا نەبووم پێ لەو ڕاستیە بنێم، تەمەنی من بەڕێگایەکی ناجۆردا تێپەڕیبوو، ئیتر تێکەڵ بوونم لەگەڵ خەڵکیدا بێجگە لە مەنەلۆژێك لەگەڵ ناوەوەی خۆمدا هیچی تر نەبوو، بەئەندازەیەك تەپی بووم ئەگەر خۆمیان سەرپشك بکردایە لەنێوان خۆشەویستی ژنێك و خوێندنەوەی کتێبێکدا کەباس لە خۆشەویستی بکات کتێبەکەم پەسەند دەکرد.

زۆربا وتیەوە: واز لەحساب و کیتاب بێنە، سەرۆك، ژمارەو ممارە بخەرەوە لاوە، ئەم تەرازووە نەحلەتیە بشکێنەو گوێ لەمن بگرەو دوکانەکەت دابخە، ئەمە ئەو ساتەیە کە تۆ دەتوانیت گیانی خۆت ڕزگار بکەیت یان لەدەستی بدەیت. گوێ بگرە، سەرۆك، ئێستا دووسێ لیرە، لیرەی ئاڵتون نەك کاغەز، بخەرە دەستە سرپێکەوە، چونکە لیرەی کاغەز سەرنج ڕاناکێشێت، بەدەستی میمیتودا بینێرە بۆ بێوەژنەکە، پێی بڵێ ئەم پەیامەیشتی پێ بگەیەنێت:

((خاوەنی کانەکە سڵاوی هەیە، ئەم دەستە سرەی بۆ ناردویت و ئەمە شتێکی وا نیە، بەڵام نیشانەی خۆشەویستیەکی مەزنە، هەروەها وتویشیە خەم بۆ مەڕەکە نەخوات، ئەگەر گومیش بوو بێت قەیدی نیە، تا ئەو لێرەیە تۆ خەم مەخۆ، لەوساوە کەتۆی لەبەر چایخانەکەدا دیوە نەخۆش کەوتووەو چاك بوونەوەی تەنیا لە دەستی تۆدایە))

((ئینجا شەو دەچیت و لە دەرگای دەدەیت —کە ئاسن گەرم بو ئینجا دەبێت بیکوتیت— پێی دەڵێیت ڕێگات وون کردوەو شەو غافڵ گیری کردویت و پێویستیت بە

چرایەکی دەستیە، یان پێی بڵێ کتو پڕ تەندروستیت خراپ بوە پەرداخێك ئاوت گەرەکە، یان لە هەموو ئەمانە باشتر، مەڕێك بکڕەو بۆی بەرە، پێی بڵێ:

((وەرە گوڵەکەم، ئەمە ئەو مەڕەیە کە ونت کردبوو، من دۆزیومەتەوە.))

ئینجا بڕوا بکە سەرۆك، بێوەژنەکە پاداشتت دەداتەوەو دەتباتە ژورێ، ئاه، خۆزگا منیش لە پاشکۆی ئەسپەکەتەوە سوار دەبووم، بەڵێ سەرۆك، تۆ بەسواری دەڕۆیتە بەهەشتەوە، هاوڕێ، ئەوەیش بزانە، من تەواو دڵنیات دەکەم کە لەو بەهەشتە زیاترمان نیە، گوێ لە قسەی قەشەکان مەگرەو ئەو حەقیقەتە بزانە کە بەهەشتی تر وجودی نیە.))

پێ دەچوو لەباخی بێوەژن نزیك کەوتبێتەوە، چونکە میمیتو هەناسەی هەڵکێشاو، بەزمانە پتەکەیەوە کەوتە گۆرانی وتن.

شەراب بەڕووی دەوێتو هەنگوین گوێز

کوڕ کچی دەوێتو کچیش کوڕ.

زۆربا هەنگاوی گورجتر کردو کونە لووتی زیاتر کرانەوە، وەستا هەناسەیەکی قوڵیداو تەماشای کردم، بەپەرۆشەوە پرسی:

-ئێستا چی دەڵێیت؟

بەساردیەکەوە وەڵامیم دایەوەو: بابڕۆین

خێراتر کەوتینە ڕێ، زۆربا سەری ڕاوەشاند، لەبەرخۆیەوە ورتە ورتێکی کرد من تێی نەگەیشتم.

کە گەیشتینە کوختەکە لەسەر ئەژنۆ دانیشت، سەنتورەکەی نایە سەر ئەژنۆی، سەری دانەواندو کەوتە بیر کردنەوە، وەك ئەوەی گوێی بۆ ئاوازێکی زۆر ڕادێرابێتو بیەوێت لەنێوانیاندا یەکێك کە لەهەموویان جوانتر یان خەماوی ترە هەڵبژێرێت. تا دۆزیەوەو ئاوازێکی بەسۆزی دەست پێ کرد، جار جارە بەلاچاوێك تەماشای دەکردم، وام هەست دەکرد ئەوەی نەیدەتوانی یان نەی دەوێرا بەزمان دەری ببڕێت بەسەنتورەکەی پێی دەوتم، دەی وت تۆ تەمەنی خۆت بە فیڕۆ داوە، تۆو بێوەژن دوو مێرووی نابوودن کەبۆ ماوەیەکی زۆر کەم لەبەر تیشکی خۆردا دەژینو، پاشان بۆ یەکجاری دەفەوتێن، ئیتر هەرگیز زیندو نابنەوە، هەرگیز.....

زۆربا تەکانێکی داو لە جێگاکەی هەستا، کتو پڕ تێگەیشت کە بە بەلاش خۆی ماندو دەکات. پاڵی بە دیوارەکەوە داو جگەرەیەکی پێ کرد، دوای تاوێك ڕامان وتی:

–سەرۆك، دەمەوێت لە نهێنیەکت ئاگادار بکەم کە ڕۆژێك لە سالونیك[٨١] پیرێژنێکی عاقڵ پێی وتم. دەبێت منیش ئەم نهێنیە ئەگەر هیچ کەڵکیشی نەبێت هەر پێتی بڵێم.

((ئەوکاتە من لەمەکدۆنیا چەرچی بووم، یەعنی بەگوندەکاندا دەگەڕام و بەکرەو دەرزیو کتێبی سەرگورشتەی قەدیسیو بنێشتو دەرمانم دەفرۆشت، دەنگێکم پێوە بوو وەك دەنگی هوزار،، دیارە خۆت دەزانیت کەژن چەندە حەزی بەدەنگی خۆشە ((جا ئەو سۆزانیانە حەز بەچی ناکەن؟)) خوا خۆی دەزانێت چەندیان پێیە! ڕەنگە تۆ بەقەدەر مەیمونێك ناشیرین بیت. شەلو کۆم بیت، بەڵام کە دەنگت خۆشو گۆرانی زان بیت عاشقت دەبن.

((من لە سالونیك چەرچی بوومو تەنانەت ڕێم دەکەوتە گەڕەکی تورك نشینەکانیش، لەوە دەچوو ژنە دەوڵەمەندێکی موسوڵمان کە کچە پاشایەك بوو گوێی لەدەنگم بووبێتو شەیدای بووبێت، بەڕادەیەك کە خەوو خۆراکی لێ حەرام کردبێت، ناچار پەنای بردبوە بەر ئەو پیرێژنەو، چنگی پڕ کردبوو لەمەجیدیو پێی وتبوو: ((دەخیلو دەست بەدامێنت، بڕۆ بەو چەرچیە کافرە بڵێ بێتە ئێرە، ئامان! دەبێت هەر چۆنێك بوە ببینم، چونکە ئارامم لێ براوە))

پیرێژن هاتو دۆزیمیەوەو پێی وتم:((کوڕی ڕۆمیان، وەرە لەگەڵما، وتم نایەم. دەتەوێت بۆ کوێم بەریت؟ وتی کچە پاشایەك هەر لە ئاوی سازگاری کانی دەچێت لەژوورەکەیدا چاوەڕێتە. وەرە لەگەڵما)) بەڵام من ئەوەم دەزانی شەوانە لە گەڕەکی تورکاندا مەسیحی دەکوژن. وتم نایەم، وتی کافر بۆ تۆ لە خوا ناترسیت؟ وتم جا بۆ دەبێت لێی بترسم؟ وتی کوڕی ڕۆمی، هەرکەس بۆی هەڵکەوێت لەگەڵ ژنێکدا بنوێتو نەیکات ئەوە گوناهێکی گەورەی لەئەستۆیە، کوڕم، کەژنێك داوای لێکردیت لەگەڵیا بخەویتو نەچوویت ڕۆحت دەمرێت، ئەو ژنە لەبەردادگای خوادا دوعات لێ دەکات، ئاهو نزولەی ئەو ژنە، ئیتر

[٨١] Salongue

هەرکەس بیتو چەندە کاری چاکیشت کردبێت لێت گیرا دەبێتو فڕێت دەداتە دۆزەخەوە))

زۆربا هەناسەی هەڵکێشاو وتی:

—ئەگەر دۆزەخ هەبێت بۆ منەو هۆیەکەیشی ئەمەبوو کە بۆم باس کردیت. لەبەر ئەوە نیە دزیم کردبێت، یان یەکێکم کوشت بێ، یان لەگەڵ ژنی خەڵکیدا نووستبم، نا، نا، هەموو ئەمانە هیچ نینو خوای گەورە لەم گوناهانە خۆش دەبێت، بەڵام من دەچمە دۆزەخەوە، چونکە ئەو شەوە لە سالۆنیك ژنێك لەناو جێگاکەیدا چاوەڕێی کردمو من نەچووم ......

هەستا، ئاگری کردەوەو دەستی بەچێشت لێنان کرد، بەلاچاو تەماشای کردم، بەتەوسەوە لەبەرخۆیەوە وتی:

—هیچ کەرپەك لەوە خراپتر نیە کە مرۆڤ هەر بەدەستی ئانقەست نەیەوێت گوێت لێ بگرێت!

ئینجا دانەویو زۆر بەتووڕەییەوە کەوتە فوو کردن لەدارە تەڕەکە.

— ٩ —

رۆژ دابویه کورتی، خۆر زوو ئاوا دەبوو، دوانیوەڕوان دڵی مرۆڤ زیاتر بەتەنگ دەهات، ئەوترسەی کۆن باوو باپیرانمانی دادەگرت لە ئێمەیش نیشت، کاتێك کە لە مانگەکانی وەرزی زستاندا هەموو عەسرانێك خۆریان دەبینی زوو ئاوا دەبێت. نا ئومێدانە بیریان بۆ ئەوە دەچوو کە ((بەیانی بەتەواوی دەکوژێتەوە)) بۆیە هەموو شەویان بەترس‌و لەرزەوە لەسەر بەرزاییەکان بەسەر دەبرد.

زۆربا بە قووڵی‌و لە من سەرەتایی تر هەستی بەو نیگەرانیە دەکرد، بۆ ئەوەی لێی رزگار بێت،تا ئەستێرەکان ئاسمانیان ڕووناك نەکردایەتەوە لە تونێلی کانزاکە نەدەهاتە دەرێ.

تازە دەمارێکی چاکی خەڵوزی دۆزیبووەوە کە خۆڵەمێش‌و شێی زۆر نەبوو ، هێزی سوتانیشی گەلێك تیابوو، لەبەر ئەوە زۆربا کەیف خۆش بوو، چونکە ئەو لە زەینی خۆیدا وایدانابوو چەندە قازانج بکات ئەوەندە گۆڕان بەسەر ژیانیا دێت، وەك سەفەرو ژن‌و سەرچڵی نوێ، هەمیشە چاوەڕێی ئەو رۆژە بوو کە قازانجی زۆر بکات‌و باڵی گەورەی لێ بروێت— مەبەست لە باڵ پارەبوو— تا بتوانێت بفڕێت‌و بڕوات، هەر ئەمە وای لێ کردبوو شەوو رۆژ بیر لەو دەزگا بچووکەی تەلەفریك بکاتەوە، دەیویست لێژیەکەی هێند تەرازوو بێت کە قەدی دارەکان—وەك خۆی دەیوت—ئەوەندە سوك‌و ئاسان بهێنێتە خوارێ وەك فریشتە هەڵی گرتبن وا.

رۆژێك زۆربا پارچەکاغەزێکی سپی‌و چەند قەڵەمێکی ڕەنگاو ڕەنگی هەڵگرت، وێنەی چیاو دارستان، دەزگاکەو قەدی ئەو درەختانەی بەسیمەکەوە هەڵواسرابوون‌و لە چیاکەوە بەرەو خوار دەکرانەوو، هەریەکەیان دووباڵی گەورەی شینی تۆخیان پێوەبوو دروست کرد، لە کەنداوە بچووکە کەوانەییەکەدا وێنەی کەشتی بارهەڵگری ڕەش لەگەڵ کەشتیەوانە سەوز پۆشەکاندا کە لە تووتی بچووك دەچوون کێشا، هەروەها ئەو بەلەمانەی قەدی دارە زەرد باوەکانیان بارکردبوو، چوار قەشە لە چوار سووچەوە وەستابوون‌و

لەدەمیانەوە شریتی گوڵ ڕەنگ هاتبوە دەرێ کە بەخەتێکی گەورەو ڕەش لێمان نوسرا بوو ((خوا، تۆ چەندە مەزنیت و کارەکانیشت چەندە مایەی شانازین!))

چەند رۆژێك بوو زۆربا بەپەلە ئاگری دەکردەوەو خواردنی دروست دەکرد، هەر کە لە خواردن دەبووینەوە ئەو بەرەو رێگای گوندەکە تێی دەتەقاندو دوای ماوەیەك بەبێ حاڵی دەگەڕایەوە. لێم دەپرسی:

—دیسان بۆ کوێ چوویت زۆربا؟

ئەو هەر ئەوەندەی دەوت: کارت پێوە نەبێت، سەرۆك.

هەر زوویش باسەکەی دەگۆڕی.

شەوێك کە گەڕایەوە بەسەر سامیەوە لێی پرسیم:

—بەڕاست، سەرۆك، خوا هەیە یان نا؟ تۆ لەم بارەیەوە بڕوات چۆنە؟ ئەگەر هەیە— چونکە بەهەرحاڵ هەمووشت دەشێت— تۆ بۆ خۆت چۆنی لێ تێ دەگەیت؟

من وەڵامیم نەدایەوەو شانێکم بۆ هەڵتەکاند، ئەو وتی:

—بەڵام من، سەرۆك، پێکەنینت نەیەت، ها! من وادەزانم کە خوا لە من بچێت، تەنیا جیاوازی ئەوەیە کە ئەو گەورەو بەهێز ترو لەمن شێت ترە، لەمانەیش زیاتر نەمر ترە، ئەو بە ئاسودەیی لەسەر کەوڵی گەرمو نەرمی مەڕ دانیشتوەو کوختەکەیشی ئاسمانە، کوختەکەی وەك ماڵی ئێمە لە تەنەکەی کۆنی سوتەمەنی دروست نەکراوە، بەڵکوو لە هەور دروست کراوە، بەدەستی ڕاستیەوە قەمە یان تەرازوو نیە—چونکە ئەمانە ئامێری کاری قەسابیو بەقاڵن— بەڵکو ئیسفنجێکی گەورەی بەدەستەوەیە کەوەك هەوری باران تەڕیە بە ئاو، لەلای ڕاستیەوە بەهەشتەو لەلای چەپیەوە دۆزەخ، کە رۆحێك دەڕواتە بەردادگاکەی، کە بێگومان رۆحێکی روتو قووتە— چونکە لاشەکەی مردوە— و دەلەرزێت، خوا لێی دەڕوانێت و لە ژێرەوە پێ دەکەنێت، هەر لەوکاتەدا خۆی توورە دەکات، دەنگ هەڵدەبڕێت و پێی دەڵێت: ((وەرە پێشەوە لەعنەتی، وەرە بتبینم))

((ئینجا دەست بەپرسیارو وەڵام دەکات. رۆحە رووتەکە خۆی بەسەر پێی خوادا دەکێشێ و هاواری لێ دەکات: ((ئامان بم بەخشە من تاوانبارم)) ئەوسا دەست بەژماردنی

گوناهەکانی دەکات، گوناهەکانی ئەوەندە زۆرن لە ژمارە نایەن– خوا وەڕزدەبێت، دەکەوێتە باوێشك دانو بەسەریا دەخورێت:

((بەسە ئیتر، بەس، مێشکی سەرت بردم)) ئیتر، شلّپ، شلّپ، بە ئیسفنجێك هەموو گوناهەکانی دەسڕێتەوەو دەڵێت: ((زوو پی هەڵکەو ونبە، بڕۆ بۆ بەهەشت)) بە–پوتروس–[82] یش دەڵێت: ((پوتروس ئەم بێچارەیەش بخەرە بەهەشتەوە))

((چونکە دەبێت تۆ بزانیت، سەرۆك، کەخوا سەرۆکێکی گەورەیەو گەورەییش دەبێت وابێت، یەعنی لێ بوور دەبێت))

چاکم لەبیرە ئەو شەوەی کە زۆربا خەریکی ئەم بێنەو بەردەیە بوو من پێ دەکەنیم، بەڵام ئەم ((گەورەییە))ی خوا لەزەینی مندا شێوەی خۆی دەگرتو بەزەیی و بەخشندەیی و توانای زۆری لێ بەرجەستە دەبوو.

شەوێکی تر کەباران دەباریو ئێمە خزابووینە کوختەکەی خۆمانەوەو شا بەڕوومان لەمقەڵیدا دەبرژاند، زۆربا تەماشای کردم، وەك مەتەڵێکی زلی هەڵهێنابێت ماوەیەکی زۆر لێی ڕوانیم، دوایی خۆی نەگرتو وتی:

سەرۆك، ئەمەوێت بزانم من چ سودێکم بۆ تۆ هەیەو بۆ پەلم ناگریو دەرم بکەیت؟ من پێشتر پێم وتویت کە بە من دەڵێن ((ئافات)) چونکە ڕوو لەهەر کوێیەك بکەم داری بەسەر بەردیەوە ناهێڵم، تۆ لەگەڵ مندا بیت دەکەویتە ساجی عەلی، بۆیە پێت دەڵێم دەرم بکە.

لە وەڵامیا وتم: من تۆم خۆش دەوێت، ئەوی تری وازلێ بێنە:

–یەعنی تۆ لەوە ناگەیت کە مێشکی من سەنگێکی تەواوی نیە؟ ڕەنگە مێشکم زیاد لە ئاسایی یان کەمتربێت، وەلێ بەهەرحاڵ سەنگی تەواوی نیە، بڕوانە، باوای بڵێم کەتێی بگەیت، ئەمە چەند شەوو ڕۆژێکە ئەو بێوەژنە ئارامو قەراری لێ هەڵگرتووم، وانەزانیت ئەمەم بۆ خۆمە، نا، سوێندت بۆ دەخۆم کە بۆ خۆم نیە، چونکە من بەتەواوی ئەوە دەزانم کە هەرگیز دەستی منی ناگاتێ، ئەو سۆزانیە خوا گرتوە تیکەیەکە بەمن قوت ناچێت. بەڵام نامەوێت دەستی کەسی تریشی نەگاتێ، بەکورتی بەڕەوای نازانم ئەو ژنە بەتەنیا

---

[82] لەوە دەچێت پوتروس یان (سانت بیەر)، کلیل دار یان پاسەوانی بەهەشت بێت. و–ف

بنوێت، چونكە حەیفە سەرۆك، بەڕاستی من بە شتێكی وا قایل نیم، هەر لەبەر ئەمەیە كە شەوانە بەدەوری باخەكەیاندا دەگەڕێم، دەزانیت بۆ؟ بۆ ئەوەی بزانم كەسێك هەیە بڕوات و لەگەڵیا بنوێت، ئەوسا ئاسوودە دەبم.

من دامە پێكەنین.

—پێ مەكەنە سەرۆك، ئەگەر ژنێك بەتەنیا بخەوێت خەتای ئێمەی پیاوە. ڕۆژی قیامەت خوا حساب لەگەڵ هەمووماندا دەكات. خوا ، وەك دەڵێن، لە هەموو گوناهەكان خۆش دەبێت، ئیسفنجێكی بەدەستەوەیە، بەڵام لەم گوناهە خۆش نابێت. قوڕبەسەر ئەو پیاوەی بۆی هەڵكەوتوە لەگەڵ ژنێكا بنوێت و نەنوستوە، بەد بەحاڵی ژنێكیش كەتوانیویتی لەگەڵ پیاوێكدا بخەوێت و نەخەوتوە. بیر لەقسەی پیرێژنەكە بكەرەوە.

كەمێك بێ دەنگ بوو، لەپڕا پرسی :

—بەڕاست كەپیاو مرد دەتوانێت لەشێوەیەكی تردا بێتەوە ناو دنیا؟

—بڕوا ناكەم، زۆربا.

—منیش بڕواناكەم، بەڵام ئەگەر بشێ شتێكی وا ڕووبدات، ئەو جۆرە پیاوانەی كە بۆم باس كردیت، یەعنی ئەوانەی خۆشەویستیان نەكردوە، دەزانیت سەرۆك، لە چ شێوەیەكدا جارێكی تر دەگەڕێنەوە دنیا؟ لەشێوەی هێسترا.

دیسان بێدەنگ بووەو كەوتەوە بیر كردنەوە، لەپڕا پرشنگێك كەوتە نێو چاوی، وەك شتێكی دۆزیبێتەوە بەهەڵچوونەوە وتی:

—كێ چوزانێت، ڕەنگە هەموو ئەم هێسترانەی كە ئەمڕۆ ئێمە لە دنیادا دەیان بینین ئەو جۆرە مرۆڤە بن، هەموو ئەو بێ ئەقڵانەی كە لەكاتی ژیانی دنیایاندا پیاوو ژن بوویێتن و لەحەقیقەتدا وانەبووبن، بۆیە بوون بەهێستر. هەر لەبەر ئەمەیشە كە هەمیشە جووتە وەشێنن، تۆ لەم بارەیەدا چی دەڵێیت؟ سەرۆك؟

لەوەڵامدا بەپێكەنینەوە وتم:

—من واهەست دەكەم سەنگی مێشكی تۆ بێگومان لەوە كەمترە كە پێویستە، دەهەستەو سەنتورەكەت بێنە، پیاو.

–ئەمشەو سەرۆك، سەنتورو مەنتور نیە، پێت ناخۆش نەبێت، ئەمشەو من حەزم بەقسەیە، چەنەبازی دەكەم، دەزانیت بۆ؟ چونكە دنیایەك خەمو خەفەتم لەدڵدایەو تووشی دەردە سەر هاتووم، ئەم توونێلە تازەیە –خوا لەناوی بەرێت– خەریكە كێشەم بۆ دروست دەكات، تۆش خەریكی سەنتور بازی خۆتیت؟

ئەوەی وتو بەڕوە گەورەكانی لەناو خۆڵەمێشەكە دەرهێنا، هەندێكی دامێو لێوانەكانمان پڕ لەئارەق كرد.

كەپێكمان لێكدا وتم:

–بەتەمای خواین.

زۆربا دووبارەی كردەوە:

–خوا لەدەمی تۆی بژنەوێتو فریامان بكەوێت، بەڵام تا ئێستا هیچی دیار نیە. ئارەقە خەستو گەرمەكەی یەك ژەم هەڵداو لەسەر تەختەكەی ڕاكشاو وتی:

–سبەی پێویستیم بەهەموو هێزو توانامە، چونكە دەبێت لەگەڵ هەزار شەیتاندا چنگاوش بم.. شەوباش.

ڕۆژی دوایی، بەیانی زوو، زۆربا چووە نێو كانزاكەوە، كرێكارەكان لەلێدانی تونێلێك بەرەو خەڵووزە باشەكە پێشڕەوییان كردبوو، ئاو لەبن میچی تونێلەكەوە دەهاتە خوارێو، كرێكارەكان لەناو لیتەو ڕەشاوەكەدا كاریان دەكرد.

زۆربا لە دوورۆژ لەوەو بەرەوە ئەستوونی ئامادە كردبوو، تابیداتە ژێر توونێلەكە، كەچی هەر دڵنیا نەبوو، ئەستوونەكان هێند ئەستوور نەبوون، زۆربا هەر بە غەریزەی ڕووتی خۆی، وای هەست دەكرد ئەوەی لەو تونێلە تونناو توونەی ژێر زەویدا ڕوودەدات هەمان ئەو شتەیە كەلەناو گیانی خۆیدا هەستی پێ دەكات، ئەیزانی داربەستنەكە زۆر دڵنیاكەر نیە، ئەو دەنگە هەرە نزمانەی كە خەڵكی تر نەیدەبیستن ئەو دەیژنەوتن. دەت وت دارەكان لەژێر قورسایی بن میچەكەدا دەناڵێنن.

ئەو ڕۆژە شتێكی تریش زۆربای دوودڵ كردبوو :

–ئەمشەو سەرۆك، سەنتورو مەنتور نیە، پێت ناخۆش نەبێت، ئەمشەو من حەزم بەقسەیە، چەنەبازی دەکەم، دەزانیت بۆ؟ چونکە دنیایەك خەمو خەفەتم لەدڵدایەو تووشی دەردە سەر هاتووم، ئەم توونێلە تازەیە –خوا لەناوی بەرێت– خەریکە کێشەم بۆ دروست دەکات، تۆش خەریکی سەنتور بازی خۆتیت؟

ئەوەی وتو بەڕوە گەورەکانی لەناو خۆڵەمێشەکە دەرهێنا، هەندێکی دامیٚو لێوانەکانمان پڕ لەئارەق کرد.

کەپێکمان لێکدا وتم:

–بەتەمای خواین.

زۆربا دووبارەی کردەوە:

–خوا لەدەمی تۆی بژنەوێتو فریامان بکەوێت، بەڵام تا ئێستا هیچی دیار نیە. ئارەقە خەستو گەرمەکەی یەك ژەم هەڵداو لەسەر تەختەکەی ڕاکشاو وتی:

–سبەی پێویستیم بەهەموو هێزو توانامە، چونکە دەبێت لەگەڵ هەزار شەیتاندا چنگاوش بم.. شەوباش.

ڕۆژی دوایی، بەیانی زوو، زۆربا چووە نێو کانزاکەوە، کرێکارەکان لەلێدانی تونێلێك بەرەو خەڵووزە باشەکە پێشڕەوییان کردبوو، ئاو لەبن میچی تونێلەکەوە دەهاتە خوارێو، کرێکارەکان لەناو لیتەو ڕەشاوەکەدا کاریان دەکرد.

زۆربا لە دووڕۆژ لەوەو بەرەوە ئەستوونی ئامادە کردبوو، تابیداتە ژێر توونێلەکە، کەچی هەر دڵنیا نەبوو، ئەستوونەکان هێند ئەستوور نەبوون، زۆربا هەر بە غەریزەی ڕووتی خۆی، وای هەست دەکرد ئەوەی لەو تونێلە توناو توونەی ژێر زەویدا ڕوودەدات هەمان ئەو شتەیە کەلەناو گیانی خۆیدا هەستی پیٚ دەکات، ئەیزانی داربەستنەکە زۆر دڵنیاکەر نیە، ئەو دەنگە هەرە نزمانەی کە خەڵکی تر نەیدەبیستن ئەو دەیژنەوتن. دەت وت دارەکان لەژێر قورسایی بن میچەکەدا دەناڵێنن.

ئەو ڕۆژە شتێکی تریش زۆربای دوودڵ کردبوو:

ئەوکاتەی دەیویست بڕواتە بن تونێلەکەوە، کاهینی گوندەکە قەشە ستفانۆس[٨٣] بەسواری هێسترێکەوە بەوێدا تێ پەڕی‌و، بەپەلە بەرەو دێرێکی نزیک دەچوو تا فریای دوا درووەدی ڕاهیبەیەك بکەوێت کە لەگیانەڵادابوو، خۆش بەختانە پێشئەوەی قەشە سەری باس‌و خواسی لەگدا دامەزرێنێت زۆربا فرسەتی هێناو سێ‌جار تفی ڕۆکردە سەر زەویەکە، لەوەڵامی سڵاوی قەشەدا لەبەرخۆیەوە وتی: سڵاو، جەنابی قەشە !

بەدەنگێکی نزمتریش وتی:

–لەعنەتی تۆ لەمن بێت.

زۆربا لەگەڵ ئەوەیشدا کە هێشتا هەستی بەوە دەکرد بەتەواوی لەدیداری نەگریسی قەشەو پێ‌و قەدەمە شوومەکەی ڕزگاری نەبوە، بەتووڕەییەوە خۆی بەتونێڵە تازە هەڵکەنراوەکەدا کرد.

بۆنی خەڵوزو گازی ئەستیلن[٨٤] مرۆی کاس دەکرد، کرێکارەکان کۆڵەکەو داربەستنەکەیان چاکتر دەکرد، زۆربا بەتووڕەیی‌و ڕوویەکی مۆنەوە سڵاوی لێ کردن. قۆڵی هەڵکردو کەوتە کارکردن.

دە دوانزە کرێکار بەقازمە کەوتبوونە وێزەی دەمارەکەو خەڵوزیان لەبەردەمیاندا کۆدەکردەوە، کرێکاری تر بەبێڵ خەڵوزەکەیان هەڵدەگرت‌و بەعەرەبانەی بچووکی دەستی بۆ دەرەوەیان باردەکرد.

کت‌و پڕ زۆربا وازی لەکار هێنا، بەکرێکارەکانیشی ڕاگەیاند دەست لەکار هەڵبگرن‌و خۆیشی گوێ قوڵاغ بوو، چۆن سوار لەگەڵ ئەسپەکەیدا دەبێتە یەك‌و لەشێك پێك دێن‌و هەروەها کەشتیەوانیش لەگەڵ کەشتیەکەیدا، زۆربایش هەر بەوجۆرە لەگەڵ کانەکەدا ببوە یەك، دەماری تونێلەکەی وەك دەمارەکانی لەشی خۆی دەناسی‌و، ئەوەی لێژنە خەڵوزە ڕەشەکان هەستیان پێ نەدەکرد ئەو بەڕوونی‌و هوشیارانە هەستی پێ دەکرد.

هەر لەو کاتەدا کەگوێچکە گەورەو پڕ لەموەکانی هەڵخستبوو من گەیشتمە ئەوێ، وەك هەستێکی پێشینە ڕای گرتبێتم یان دەستێك پاڵی پێوە نابم لە خەو ڕابووم، بەپەلە

---

[٨٣] Stephanos

[٨٤] Acetylen گازێکی بێ ڕەنگەو قابیلی تەقینەوەیە لە هەوادا. –و–

جلەکانم لەبەرکردو هاتمە دەرێ، بێ ئەوەی بزانم بۆچی‌و بۆ کوێ دەچم هەنگاوی خێرلمنا، بەڵام لەشم بێ دوودڵی ڕێگای کانەکەی لەبەر گرتبوو، منیش ڕاست ئەو کاتە گەیشتم کە زۆربا بەنیگەرانی‌و ترسەوە گوێی تیژ کردبوو.

دواى تاوێك وتی:

–چاکە، دەی کوڕینەوە، وام زانی کە..... هیچ ........دەی دەست بەکار بن.

سەری وەرگێڕاو، منی بینی‌و لێوی خۆی گەست، پرسی :

–بەم بەیانی زووە لێرە چی دەکەیت؟ سەرۆك؟

لێم نزیك کەوتەوەو بەگوێیدا چرپاندم :

–ناچیتە سەرەوە هەوایەك وەربگریت، سەرۆك؟ ڕۆژێکی تر بۆ پیاسە وەرەوە بۆ ئێرە.

–بۆچی ڕویداوە داوە زۆربا ؟

–هیچ، خراپ تێگەیشتبووم، ئاخر ئەم بەیانیە زوو تووشی قەشەیەك هاتم.

باشە ، دەی برۆ.

–ئەگەر مەترسیەك لەئارادایە عەیب نیە بەتەنیا برۆم.

زۆربا وەڵامی دامەوە : بۆ؟

ئەگەر تۆ بویتایە دەڕۆیشتیت؟

–نەو

–ئەی چی؟

تووڕەبوو وتی:

–ئەوەی ئەرکی زۆربایە جیاوازە لەئەرکی کەسانی تر، ئەگەر واهەست دەکەیت ڕۆیشتنت عەیبە مەڕۆ، بمێنەرەوەو لەسەر خۆت!

چەکوشەکەی هەڵ گرت، لەسەر نووکی پێی وەستاو، ئەو دارانەی لەبنی سەقفەکە بەسترابوون، بزماری گەورەی پیا داکوتان. من یەکێك لە چرا ئەستیلەکانە نەکانم لەدارێك کردەوەو، بەناو لیتاوە ڕەشەکەدا کەوتمە هات‌و چۆ، تەماشای دەمارە ڕەش‌و بریسکە دارەکە خەڵوزەکەم دەکرد، بێگومان زەوی دارستانی زۆر گەورەی لەهەناویدا گۆڕ کردوەو

بەدرێژایی ملیۆنان ساڵ منداڵەكانی جاویوە، هەرسی كردون‌و گۆڕیونی، درەختی كردۆتە لینیت‌و لینیت بە خەڵوزو ئینجا زۆربا گەیشت.

دیسان چراكەم هەڵواسیەوەو كەوتمە تەماشاكردنی كاری زۆربا، هۆش‌و گۆشی دابوە كارەكەی، بیری لەهیچ شتێك نەدەكردەوەو لەگەڵ زەوی‌و قازمەو خەڵوزدا ببووە یەك، لەگەڵ چەكوش‌و بزماردا بەگژ دارو تەختەدا دەچوو، ئازاری سەقفەكەی دەچێشت كە ورگی داكەوتبوو، لەگەڵ هەموو چیاكەدا بەشەڕ دەهات تا بەتەگبیرو زۆر خەڵوزی لێ دەست بكەوێت.

زۆربا بە غەریزەیەكی قووڵی پڕ لەدڵنیاییەوە هەستی بەگەوهەری مادە دەكرد، بێ هەڵە كردن بزماری بەوشوێنەدا دادەكوتا كە هێشتا خۆی نەگرتبوو، یان گومانی لێ دەكرد، بەو شێوەیەی ئەوسا دێم، كە سەرتاپای خەڵوزاوی‌و پیس بوو-كەتەنیا سپیایی چاوی دەبریسكایەوە- وام هەست كرد خۆی كردۆتە خەڵوز یان هەر بوە بەخەڵوز، بۆ ئەوەی زۆر بەئاسانی لە دوژمن نزیك بێتەوەو بچێتە سەنگەرەكەیەوە.

من كەسۆزێكی ساكارانە بەسەرما زاڵ ببوو هاوارم لێكرد:

-ئافەرین، زۆربا، بۆ پێشەوە.

كەچی تەنانەت سەریشی وەرنەگێڕا، ئاخر چۆن دەتوانێت لەوكاتەدا، لەگەڵ مكێكی كاغەز خۆردا قسەبكات، كە لەباتی قازمە قەڵەمۆكەیەكی پێ بێت؟ ئەو سەرگەرمی كاری خۆی‌و بواری قسەی نەبوو، لەبیرمە شەوێك پێی وتم: ((لەوەختی كاردا قسەم لەگەڵدا مەكە، چونكە لەوانەیە بتەقم-بۆ بتەقیت زۆربا؟- دیسان وەك منداڵ كەوتیتەوە بۆ ، بۆ! ئاخر نازانم چۆنت تێبگەیەنم چونكە؟ من لەوكاتانەدا هەموو هەستم لەكاردایەو لە نووكی پێمەوە تا تەوقی سەرم بەبەرد یان خەڵوز یان سەنتورەوە نووساوم، جا ئەگەر تۆ لەوكاتەدا كت‌و پڕ دەستت تێوەدام یان قسەت لەگەڵدا كردم من دەسڵەمێمەوە ڕەنگە بتەقم، ئێستا تێگەیشتیت؟))

تەماشای سەعاتەكەم كرد، سەعات دەی بەیانی بوو. ووتم :

-برایان كاتی نان خواردنی بەیانیە، ئێوەیش زۆر ماونەتەوە.

کرێکارەکان زوو ئامێرەکانیان لەسووچێکدا دانا، دەمو چاوی ئارەقاوییان سڕی‌و ئامادەی هاتنە دەرەوە بوون لەتوونێلەکە. زۆربا کە نوقمی نێو کارەکەی بوو گوێی لەقسەکانم نەبوو، ئەگەر گوێیشی لێ بوایە لەجێگای خۆی نەدەجوولا، جارێکی تر کەوتبووەوە دڵە ڕاوکێ‌و گوێی ڕادێرابوو.

بەکرێکارەکانم وت: با جگەرەیەك بکێشین، چاوەڕێ بن.

بەگیرفانەکانمدا کەوتمە گەڕان، کرێکارەکان بەدەورمدا چاوەڕێ بوون، لەپڕا زۆربا ڕاپەڕی‌و گوێی بەدیواری تونێلەکەوە چەسپاند، من لەبەر چرا ئەستیلنەکەدا بینیم دەمی کرابووەوەو گرژ ببوو. بانگم لێ کرد: چیتە زۆربا؟

لەو کاتەدا دەت ووت هەموو دیواری تونێلەکە بەسەرمانەوە دەلەرزێت.

زۆربا بەدەنگێکی کرخەوە وتی:

—ڕاکەن، ڕاکەن.

هەموو بەرەو دەرگای دەرەوە هێرشمان برد، بەڵام هێشتا نەگەیشتبووینە یەکەمین بەشی دارە بەستراوەکان کە دەنگی چرکە چرکێکی بەهێزترمان گوێ لێ بوو، زۆربا کۆڵەکەیەکی ئەستوری هەڵگرت تابیداتە بەر ئەودارە بەسراوانەی لەوەدا بوو بڕوخێن، چەند زووتر ئەوەی بکردایە ڕووخانی دیوارەکەی بۆ ماوەیەك دوادەخست‌و ئێمەش ڕزگارمان دەبوو.

جارێکی تر زۆربا هاواری لێ هەستا! ڕاکەن.

ئەمجارەیان دەنگی زۆربا ئەوەندە نزم هاتە گوێ دەت وت لەژێر زەویەوە دێت. هەموومان ترسنۆکانە —کەزۆر جار لەهەڵوێستی وادا دەردەکەوێت— بێ ئەوەی گوێ بدەینە زۆربا بەرەو دەرەوە ڕامان کرد. من دوای چەند چرکەیەك هاتمەوە سەر خۆم‌و بەرەو لای زۆربا ڕۆیشتم، بانگم لێ کرد: زۆربا، زۆربا! وام زانی هاوارم لێ کردوە کەچی پاشان زانیم هاوار لەدەمم نەهاتۆتە دەرێ‌و ترس نووزەی لێ بڕیوم.

شەرم دای گرتم، هەنگاوێك گەڕامەوە دواوەو دەستم بۆ پێشەوە درێژکرد، هەرچۆنێك بوو زۆربا توانیبووی کۆڵەکە ئەستوورەکە بداتە بەر دارە بەستراوەکان. پاشان بەناو قوڕو لیتاوەکەدا کەوتمە خۆ بەکێش کردن‌و بۆ دەرەوە ملی نا. لەو دنیا نیوە تاریك و

هەڵچوونەیدا زۆربا بەسەر مندا کەوت، بێ ویستی خۆمان کەوتینە باوەشی یەکدیەوە.

بەورتە ورتێکی نیوە خنکا وەوە وتی:

—با دەرچین، بادەرچین.

بەرەو روناکایی هەڵاتین، کرێکارەکان ڕەنگیان پەڕیبوو، لەبەردەرگاکەدا کۆ ببوونەوەو بێ ئەوەی ورتەیەکیان لێوە بێت سەرسام وەستابوون.

دەنگی سێیەم چرکە توندترو لەدەنگی درەختێك دەچوو لافاو شکاندبێتی، لەپڕا دەنگی تەقینەوەیەکی ترسناکی وەك هەورە تریشقە هات، کێوەکەی لەرزاندو سەقفی تونێلەکە داڕووخا.

کرێکارەکان بەدەم ورتە ورتەوە نیشانەی خاچیان کێشاو وتیان:

خوارەحمی کرد:

زۆربا بەتووڕەییەوە پێی ووتن:

—قازمەکانتان لە ژوورەوە جێ هێشت؟

کرێکارەکان بێدەنگ بوون، ئەو زۆر تووڕە بووبو، هاواری بەسەرا کردن:

—بۆ لەگەڵ خۆتاندا نەتان هێنا؟ هەی ترسنۆکینە نە: بێگومان خۆیشتان پیس کردوە. حەیف بۆ ئەو هەموو ئامێروو کەرەسانە.

من کەوتمە نێوانیان‌و وتم:

—دەی زۆربا. کەی وەختی ئەوەیە خەفەت بۆ بێڵ‌و قازمە بخۆین! سوپاس بۆ خوا کە هەموو سەلامەت دەرچووین، ئێمە سوپاست دەکەین‌و بەرۆح قەرزارتین.

زۆربا وتی: —من برسیمە، ئەم ڕووداوە هیچی لەگەدەمدا نەهێشت. توێشە بەرەکەی کە بەسەر بەردێکەوە دای نابوو هەڵ گرت، کردیەوەو نان‌و زەیتوون‌و پیازو پەتاتەیەکی کوڵاوو مەتارەیەکی بچووکی شەرابی تیا دەرهێنا. بەدەمی پڕەوە پێی وتین:

—دەی کوڕینە، شتێك بخۆن.

زۆربا زۆر بەتاسوق‌و بەپەلە تیکەی دەگلاند، وەك لەپڕا هێزو توانایەکی زۆری خۆی لەدەست دابێت‌و بیەوێت قەیرانی بکاتەوە، لەسەر خۆ کەمێك نوشتابوەوەو نانی دەخوارد، مەتارەکەی هەڵگرت، سەری خۆی بەپشتا خست‌و خوڕ خوڕ شەرابەکەی

بەگەروە وشکەکەیدا سەرەو خوار کردەوە. کرێکارەکانیش ترسیان ڕەویەوەو، تویشە بەرەکانیان کردەوەو دەستیان بەخواردن کرد، هەموو چوارمشقی بەدەوری زۆربادا دانیشتبوونو لەگەڵ نان خواردندا لێیان دەڕوانی، هەموو دەیان ویست خۆبەسەرپێیدا بخەنو دەستی ماچ بکەن. بەلام دەیان زانی زۆربا تووڕەو تڕۆیە، بۆیە کەسیان نەیان وێرا دەست پێشخەری بکەن.

لەدواییدا میکلیس[٨٥] کە لەهەموو بەتەمەن ترو سمێڵی پڕو ماشوبرنج بوو غیرەتی بەخۆی داو کەوتە قسە، وتی:

—بەڕاستی ئالکسیس، ئەگەر تۆ نەبویتایە ئێستا هەموو منالمان هەتیو کەوتبوون.

زۆربا بەدەمی پڕەوە تەنیا ئەوەندەی وت:

—دەمت دابخە.

ئیتر کەسێکی دی نەی وێرا دەم بکاتەوە.

[٨٥] Michelis

—١٠—

((ئاخر ئەم چاڵە بە پێچو پەناو نادیارە، ئەم پەرستگای درۆیە، ئەم هەمانەی گوناهە، ئەم کێڵگەیەی هەزار تۆوی فێڵو تەڵەکەی تیا وەشێنراوە، ئەم دەرگای دۆزەخە، ئەم زەمیلەیەی لێوان لێوە لە مەکرو، ئەم ژەهرەی لەهەنگوین دەچێت، ئەم زنجیرەی پێی مرۆڤی بەدنیای دونەوە بەستۆتەوەو پێی دەڵێن ژن، کێ دروستی کردوە؟))

من لەسەر زەویەکەو لەپاڵ مقەڵی ئاگرەکەدا، بێ دەنگو سەنگ دانیشتبووم‌و ئەم سروودەی بودام دەنووسیەوە.

دوعا لەسەر دوعا ئەوەم دەکرد کە ئەوشەیتانی لەش‌و لارە بەباران تەڕبوە، کە بەدرێژایی شەوانی زستان‌و لەهەوای شێداردا بە بەرچاومەوە لەنجەو لاری بوو لەبیرم بچێتەوە. خۆیشم نازانم چۆن دوای ڕوخانی تونیلەکە کە هێندەی نەمابوو کۆتایی بەژیانم بهێنێت، بەردەوام ئەو بێوەژنە کەوتبوە نێو خوێنمەوە، وەك دڕندەیەکی بێ ئامان‌و تەژی بەسەر کۆنەکردن بەرەو لای خۆی ڕای دەکێشام‌و هاواری لێ دەکردم:

—وەرە، وەرە، ژیان تەنیا چاو تروکانێکەو بەس، وەرە، زوو وەرە، تا درەنگ نەبوە، وەرە.

من چاکم دەزانی کە ئەم ((مارا))[٨٦] یە گیانی شەیتانەو چۆتە لەشی ژنێکی خڕوخەپانەوە، بۆیە لەگەڵیا دەجەنگیم، دەستم کردبوە پاکنووس کردنی (بودا)، وەك وەحشیەکانی دەوری بەرد کە لە ئەشکەوتەکانیاندا وێنەی ئەو جانەوەرو دڕندانەیان دەکێشا کە لەتاو برسیەتی دەوروخولیان دەدان، بە بەردێکی نووك تیژ هەڵیان دەکەندن، یان بەڕەنگی سورو سپی نیگاریان دەکێشان، ئەو خەڵکە وەحشیە هەوڵی ئەوەیانبو کە

---

٨٦ Mara لەئاینی بودادا گیانی ئەهریمەن یان شەیتانە کە فەرمان بەشەیتانە بچوکەکانی تر دەکات. و-ف

بەهەڵکەندن یان وێنە کێشانی ئەو دڕندانە لەسەربەرد بەرجەستە بکەن، ئەگەر ئەوەیان نەکردایە ئەو جانەوەرانە پەلاماریان دەدانێ.

لەو ڕۆژەوەی خەریك بوو بکەومە ژێر دارو پەردوەکەوە لەناو بچم، هەمیشە بێوەژن لەدنیای ئاگرینی تەنیایی مندا گەردو خولی بوو، بەسمتو کەفەڵە هەوەس بزوێنەکەیەوە ئاماژەی بۆ دەکردم، من بەرۆژ بەهێز بووم، زەینم بەئاگاو دەمتوانی لەبیری خۆمی بەرمەوە. دەمنووسی کە شەیتانی بەدخوو چۆن لەبەردەم–بودا– دادەردەکەوت چۆن بەرگی ژنی پۆشی‌و چۆن مەمکە توندو تۆڵەکانی بەئەژنۆی ئەو خواپەرستەوەنا، چۆن بودا هەستی بە مەترسی کردوو، تەواوی توانای بەکارهێناو شەیتانی ڕاونا منیش هەرئاوا توانیم سەربکەوم‌و شەیتان لەخۆم دور بخەمەوە.

هەر رستەیەکم دەنووسی هەستم بەئاسوودەیی دەکرد، دڵم بەهێزتردەبوو، هەستم دەکرد شەیتان لەژێر کاریگەری ئەو وشانەدا کەدژی بوون لەپاشەکشێدا بوو بەرۆژ بەوپەڕی هێزمەوە لەگەڵیا بەشەڕدا دەهاتم، بەڵام شەو عەقڵم چەکەکەی لەسەر زەوی دادەنا، دەرگای بوونم دەکرایەوەو بێوژن دەهاتە ژورێ.

بەیانی، بەشکت خوراوی‌و ماندوێتی‌یەوە لە خەو ڕادەبووم‌و جارێکی تر دەستم بەشەڕ دەکردەوە، هەندێك جار کە سەرم لەسەر نووسین هەڵدەبڕی ئێوارە داکەوتبوو، ڕوناکی هەڵدەهات‌و لەپڕا تاریکیم بەسەردا دەکشا رۆژ کورت‌و جەژنی لەدایك بوون نزیك تردەبووەوە من لەشەڕدا ئازاتر دەبووم‌و بەخۆم دەوت: ((من بەتەنیا نیم، ڕوونکای کەهێزێکی گەورەیشە، جارێك سەر دەکەوێت‌و جارێك شکست دەخوات. بەڵام روناکی نائومێد نابێت، منیش پێ بەپێی ئەو دەجەنگم‌و ئومێد پەیدا دەکەم))

ئەم شەڕەی من لەگەڵ بێوەژندا، بەلای خۆمەوە، پەیڕەوی کردن بوو لەڕژێم‌و هێزێکی گەردوونی‌و هەر ئەمەش توانای پی دەبەخشیم. لەگەڵ خۆمدا بیرم لەوە دەکردەوە کە ڕەگەزێکی ساختەو فێڵباز ئەم لەشەی ئێمەی دەست نیشان کردوە، تا ئەوتروسکە ئازادەی لەمندا هەڵگیرساوە لەسەر خۆ بیکوژێنێتەوە، لەگەڵ خۆمدا دەموت:

((ئەو هێزەی لەناو ناچێت هێزێکی خواییەو مادەیش دەگۆڕێت بۆ رۆح، هەمو کەسێك لەناوخۆیدا کەمێك لەو گەردەلوولە خواییەی تیایەو، لەبەر ئەمەیشە دەتوانێت نان‌و ئاوو

گۆشت بگۆڕێت بۆ بیروکار. زۆربا راست دەکات کە دەڵێت: ((پێم بڵێ بۆچی دەخۆیت پێت دەڵێم تۆ کێیت!))

بۆیە هەوڵو ڕەنجی بێ وچانم دەدا کەئارەزوەکانی لەشم بگۆڕم بە –بودا–

زۆربا بۆنی ئەوشەیتانەی کردبوو کە من لەگەڵیا بەشەڕهاتووم، شەوی جەژن لێی پرسیم:

–بیر لەچی دەکەیتەوە. سەرۆك؟ پێ دەچێت لەسەر خۆت نەبیت!

من خۆم لە پرسیارەکەی گێل کرد، بەڵام زۆربا لەوانە نەبوو وازبێنێت، دیسان وتی:

–تۆ گەنجیت، سەرۆك...

لەپڕا دەنگی زرنگانەوەیەکی تاڵو توورەیی تێ کەوت.

–...گەنجێکی سالارو سەنگین چاك دەخۆیتو دەخۆیتەوە لە هەوای دەریا ئیشتیها بەخشەکە هەناسە وەردەگریتو توانات تێ دەگەڕێت، باشە تۆ چی لەم هێزو توانایەت دەکەیت؟ تۆ بەتەنیا دەخەویت ئەمەجێی داخە، لەسەر خوا هەر ئەمشەو برۆرە ئەوێ و کات بەفیڕۆ مەدە، لەم دنیایەدا هەموو شت ئاسانە، سەرۆك، ئاخر دەبێت چەند جار ئەمەت بۆ دووبارە بکەمەوە؟ ئەمەندە شت لەخۆت گەورە مەکە!

لەبەردەستمدا دەست نووسەکەی بودام کردبوەوەو پەڕەپەڕە هەڵم دەدایەوە، گوێم لەقسەکانی زۆربایش گرتبوو، دەمزانی ئەوقسانە رێگام بۆ ئاسانتر دەکات. کەچی هێشتا گیانی (مارا)ی دەلالو مەکرباز هەربانگی لێ دەکردم، من بێ ئەوەی وورتەیەکم لێوەبێت گوێم گرتبوو، لەگەڵ هەڵدانەوەی لاپەڕەکانی کتێبی بودادا بڕیاری بەرەنگاری کردنم دەدا، بۆ ئەوەی هەڵچوونە درۆییەنەکەم بشارمەوە کەوتبوومە فیکە لێدان. بەڵام کە زۆربا بەبێدەنگی بینیمی ئاگری گرتو وتی:

–ئەمشەو جەژنی سەری ساڵە، هاوڕێ، زووکە تانەچوەتە کلێسا برۆ بیبینە. ئەمشەویش حەزرەتی عیسا هاتۆتە دنیاوە، تۆیش، سەرۆك، تۆیش، موجیزەیەك بنوێنە.

بەتوورەییەوە لەجێگاکەم هەڵسامو وتم:

—بەسە، زۆربا، هەرکەسەو بەدینی خۆی، ئەوە بزانە کە مرۆڤ لە درەخت دەچێت، بۆ تۆ تائێستا شەڕت لەگەڵ دارهەنجیرەدا کردوە کە بۆ گێلاس ناگرێت؟ کەواتە ئیتر بەسە، وانزیك بەنیوە شەوە، وەرە پێکەوە بڕۆینە کلێساو بزانین مەسیح چۆن لەدایك دەبێت!

زۆربا شەوکلاوە زستانیە فراوانەکەی لەسەرناو بە نابەدڵی وتی:

—باشە، بابڕۆین، بەڵام دەبێت ئەوەت پێ بڵێم کە ئەگەر ئەمشەو وەك جوبرائیلی فریشتە بچوویتایەتە لای بێوەژنەکە خوا زیاتر لێت ڕازی دەبوو. ئەگەر خوا بەو ڕێگایەدا بڕۆیشتایە کە تۆی پیا دەڕۆیت هەرکەس نەدەکەوتە سەرو سۆراخی مریەمی پاکیزەوەو هەرگیزیش مەسیح لەدایك نەدەبوو. تۆ ئەگەر لەمنت بپرسیایە کە خوا بەچ ڕێگایەکدا ڕۆیشتووە دەم وت: بەو ڕێگایەدا کە بەمریەم کۆتایی دێتو، مریەمیش خودی ئەو بێوەژنەیە.

ماوەیەك بێدەنگ بوو تا وەڵامی بدەمەوە، بەڵام بێ سوود بوو. ئینجا بەزۆری دەرگاکەی کردەوەو چووینە دەرێ. لەداخا بەدارەکەی دەستی بەوردە بەردەکانیدا دەکێشاو جەختی لە قسەکانی دەکرد:

—بەڵێ سەرۆك! مریەم ئەو بێوەژنەیە.

وتم دەی، بڕۆو دەنگە دەنگ مەکە.

لەو شەوە زستانیەدا هەنگاوی خێرامان دەنا، ئاسمان زۆر پاكو بێگەرد بوو. ئەستێرەکان گەورەو نزیك، وەك پۆلوکە بەحەواوە هەڵواسرابێت دەدرەوشانەوە، چەندە بەدرێژایی کەنارەکەدا بۆ پێشەوە دەچووین شەو وەك دەعبایەکی زەبەلاحو ڕەش کە لەکەنار دەریادا راکشابێت دەی نرکاند.

لەگەڵ خۆمدا دەم وت: ((لەم شەوەوە کە ڕوناکی دەستی زستانی بەسەردا زاڵ دەبێت هێدی هێدی بەرەو سەرکەوتن دەچێت، دەڵێیت ئەویش ئەمشەو لەگەڵ کوڕی خوادا لەدایك دەبێت))

هەموو دانیشتوانی گوند لە کوورە گەرمو بۆن خۆشەکەی کلێسادا کۆبووبوونەوە. لەپێشەوە پیاوو لەدوایانەوە ژن دەستیان کردبوە خاچو تێکیان ئاڵاندبوو، قەشە ستیفانۆس کە لەهەموویان باڵابەرزترو ڕۆژوی چل ڕۆژەیش تێکی دابوو، بەبەرگە زێڕینیە

قورسەکەیەوە، بەم لاو ئەولادا شەقاوی درێژی دەناو بخوردانەکەی دەجووڵاندو بەدەنگی زۆر بەرز درووودی دەخوێند، زۆر بەتاسەوە چاوەڕێی بینینی لەدایک بوونی مەسیحی دەکرد، تا زووتر بگەڕێتەوە ماڵێو بکەوێت بەسەر شۆربای چەورو باستورمەو گۆشتی برژاودا.

پێشینان کە وتوویانە: ((ئەمڕۆ روناکی لەدایک دەبێت))[٨٧]

ئەم ڕستەیە دڵی مرۆڤ نالەرزێنێت، فکریش نابێتە ئەفسانە کە دەست بەسەر دنیادا بگرێت، ڕستەیەکی لەم بابەتە، باس کردنە لەدیاردەیەکی فیزیکی ئاسایی کە بەهیچ شێوەیەك خەیاڵی ئێمە، یان با بڵێین رۆحی ئێمەی نەهەژاندوە، بەڵام روناکیەك کەلەدڵی زستاندا دێتە دنیاوە بوە بەمنداڵێكو ئەو منداڵەیش بووە بەخواو وا بیست سەدەیە رۆحی ئێمە ئەوی بەسنگی خۆیەوە ناوەو شیری دەداتێ...

دوای نیوە شەوێکی درەنگ سرووتە ئاینیەکە تەواو بوو، مەسیح لەدایك ببوو، گوند نشینەکان برسیو دڵ خۆش بەپەلە بەرەو ماڵ دەچوونەوە، تا ئاهەنگێکی خواردن بسازێننو، لە ڕوانگەی ورگیانەوە هەست بەوە بکەن کە چۆن رۆحی خوا لەجەستەی مەسیحدا بەرجەستە دەبێت. ورگ بنەمایەکی بەهێزە بۆ نانو شەرابو بە تایبەتی گۆشت، بۆیە بێ نانو شەرابو گۆشت ناتوانیت خوا دروست بکەیت.

ئەستێرەکان گەورەو گەشاوە، وەك فریشتە، بەسەرگومەزی سپی کڵێساوە دەدرەوشانەوە. ڕێگای کاکێشان وەك روبارێك لەم سەری ئاسمانەوە بۆ ئەو سەری دەبڕی، ئەستێریەکی سەوزی چون زمروت بەسەرمانەوە دەدرەوشایەوە، من هەناسەی نیگەرانیم هەڵکێشا.

زۆربا سەری بۆلا وەرچەرخاندمو پرسی:

—تۆ باوەڕدەکەیت. سەرۆك، کەخوا بووبێتە مرۆڤو لەگەوڕدا لە دایك بوبێت؟

تۆ بڕوا بەمە دەکەیت یان گاڵتەت بەهەموە دێت؟

---

[٨٧] لەزۆر شوێنی ئینجیلدا عیسا بەروناکی ناوی دێت.

وتم: وەڵامدانەوەی پرسیارێکی وا زۆر گرانە، زۆربا، من ناتوانم بە تۆ بڵێم بڕوام هەیە یان نا، تۆ خۆت چۆن؟

—بەڕاستی منیش سەری لێ دەرناکەم، کەمناڵ بووم نەنکم چیرۆکی پەریانی بۆ دەگێڕامەوەو من هیچ بڕوام بەو چیرۆکانە نەدەکرد، لەگەڵ ئەوەیشدا، وەك ئەوەی بڕوایان پێ بکەم لەتاوا دەلەرزیمو پێدەکەنیمو دەگریام.

که ڕیشم لێ ڕوا هەموو ئەم چیرۆکانەم دایە لاوەو تەنانەت پێکەنینم پێیان دەهات، بەڵام ئێستا کە پیربووم لەوەدەچێت دیسان نەرم بووبێتم، سەرۆك، ئەشێ بەشێوەیەك بڕوام پەیدا کردبێتەوە، مرۆڤ گیانداریکی پڕ لە گرێو گۆڵە.!

ئێمە بەرەو میوانخانەکەی هورتانس خانم دەچووین، وەك ئەسپی برسی کەبۆنی ئاخوڕی کردبێت خێرا ڕێگاکەمان دەبڕی.

زۆربا وتی:

—ئەم باوکە رۆحانیانەی کڵێسا مرۆگەلێکی زۆر ناقۆڵان، ئەمانە لە چاوی ورگەوە لەمرۆڤ دەڕوانن، کەواتە چۆن دەتوانیت خۆتیان لێقوتار بکەیت؟ بەخەڵکی دەڵێن چل ڕۆژی تەواو نەگۆشت بخۆنو نەشەراب بنۆشن، یەعنی ڕۆژو بگرن! بۆ؟ بۆ ئەوەی حەز لەگۆشتو شەراب بکەیت، ئای لەم بەرازە پۆخڵو بەفرو فێڵانە!

هەنگاوی گورجتر کردو وتیەوە:

—پەلەبکە، سەرۆك، بێگومان ئێستا قەلەموونەکە باش کوڵاوە

کەگەیشتینە ژووری خانمە میهرەبانەکەمان وتەختە گەورەو هەوەس بزوێنەکەی نووستنی، سفرەیەکی سپیمان بینی بەسەرمێزەکەدا داخرابوو، هەردوو قاچی قەلەموونەکە رووڵەحەوا کرابوونەوەو هەڵمی لێ بەرز دەبووەوە، گەرمایی ئاگری نێو مەقەڵیەکەیش ئەو ناوەی خۆش کردبوو.

هورتانس خانم قژی کردبوە پرچ، رۆبێکی درێژی گوڵداری ڕەنگ بوردو کە قۆڵەکانی دەڵبو دامێنی تۆڕی ریشاڵ ریشاڵ بوون لەبەرکردبوو. ئەوشەوە شریتێکی زۆر زەرد، بەپانی دووپەنجەی لەملە چرکەیەکدا توند بەستبوو، عەترێکی زۆری گوڵە پرتەقاڵی لەبن باخەڵی دابوو.

من لای خۆمەوە بیرم لەوەکردەوە: ((هەموو شتەکانی ئەم دنیایە چەند ڕاستو لەگەڵ یەکدا گونجاون! چەند دنیا بەدڵی مرۆڤە! وەك ئەم گۆرانی بێژە پیرە کە تەمەنی بەداوێن پیسی بردۆتە سەرو، ئێستا کە کەوتۆتە ئەم کەنارە تەریکەوە هەموو دڵسۆزیو پیرۆزیە گەرمەکانی ژنی هێناوەتە ناو ئەم ژوورە نابوودەوە))

خواردنی زۆرو بەتام، وەجاخی گەرم، لەشی ڕازاوەو ئارایشت کراو، عەتری گوڵە پرتەقاڵ، چەندە بەئاسانیو زوو هەموو ئەم لەزەتە بچووکانەی لەش، لەهەمان کاتدا ئینسانی دەبنە شادیەکی مەزنی ڕۆح!

لەناکاودا چاوم پڕبوو لەفرمێسك، هەستم کرد لەم شەوە شکۆمەندەدا، لێرە، لە کەناری ئەم دەریا تەریکەدا بەتەنیا نیم، ژنێك لێوان لێو لەخۆبەخت کردنو سۆزو مەینەت باری بۆ لام دێت: ئەو دایك بوو، خوشك بوو، ژن بوو، منیش کەوام دەزانی پێویستم بە هیچ شتێكو کەسێك نیە لەپڕا هەستم کرد پێویستیم بە هەموو شتێکە، بێگومان زۆربایش تووشی هەمان ئەو هەڵچونو سۆزە خۆشە ببوو، چونکە هەر ئەوەندەی چووینە ژوورەوە بازرەقەی بەستو ئەو گۆرانی بێژە ڕازاوەیەی لەئامێزگرتو بانگی هەڵدا:

—مەسیح لەدایك بووە، ژن سڵاوت لێ بێت.

بەڕووی خۆشەوە تەماشای کردمو دیسان وتی:

—سەرۆك، بڕوانە ژن چ گیانەوەرێکی فێڵبازە، ئەم گیانەوەرە دەتوانێت تەنانەت خوایش لەسەر پەنجە تووتەی بسوڕێنێت.

چووینە سەرمێزەکە، پەلاماری خواردنەکەمان داو شەرابمان نۆشی، لەشمان حەسایەوەو ڕۆحمان لەخۆشیدا هەژا، دیسان زۆربا گڕی گرتەوە، وەك هەر جارێکی دی کە بەسەرمدا دەی قیژاند:

—بخۆو بخۆرەوە، سەرۆك، بخۆو بخۆرەوە باگەرم دابێیت، تۆیش گۆرانی بڵێ، کوڕی باش، تۆیش وەك شوان گۆرانی بڵێ:

((شانازی بۆ خوا کە لەهەموو گەورە ترە)) ئاخر مەسیح لەدایك بوە، گاڵتە نیە، چەندت توانا تێدایە بەدەنگی بەرز گۆرانی بڵێ، بۆ ئەوەی خوا گوێی لەدەنگت بێتو چێژی لێ وەربگرێت.

دیسان زۆربا کەوتبوەوە هەوای خۆی‌و بەردەوام بوو:

—مەسیح لەدایك بوە، ئەی سلێمانی حەکیم، ئەی میرزای قەڵەم، ئەمەندە سەری خۆت مەیەشێنە. لەدایك بوە یان نا؟ بێگومان بوە، هاوڕێ، ئەوەندە خۆت گێل مەکە، تۆ ئەگەر بەزەڕەبینێك سەیری ئەو ئاوە بکەیت کەدەی خۆینەوە (ئەمەیان رۆژێك ئەندازیارێك پێی وتم) دەبینیت کە ئاو پڕیەتی لە کرمی ورد کە بەچاوی ڕووت نابینرێن، ئەوسا کرمەکان دەبینیت‌و ئاوەکە ناخۆیتەوە، کە ئاویشت نەخواردەوە لەتینواندا دەمریت، ئەو زەڕەبینە بشکێنە، سەرۆك، تا کرمەکان یەکسەر ون بن‌و تۆ بتوانیت ئاو بخۆیتەوە دەرونت فێنك بکەیتەوە.

ئینجا ڕووی لە دۆستە ڕازاوەکەی کردو، پێکە پڕ لە شەرابەکەی بەرزکردەوەو وتی:

—من، ئەی بوبولینای زۆر ئازیزم، ئەی هاوڕێ دێرینەکەی جەنگم، ئەم پێکە لەچاوی تۆ دەنۆشم، من لە تەمەنی خۆمدا چەندان پەیکەرم دیوە کە بەپێشی کەشتیەوە داکوتراون، مەمکیان لەنێو دەستیانداو سووراویان بەڕومەت‌و لێوەوە بوە، ئەوان هەموو دەریاکانی دنیایان لەڕوناکیا دیوەو سەریان کێشاوەتە هەموو بەندەرەکانەوە، کە کەشتیەکانیش تێك شکاون هاتوونەتە وشکانی‌و تا دوا رۆژی تەمەنیان پاڵیان بەدیواری مەیخانەیەکەوە داوە کە پەناگای ماسیگرو کەشتیەوانەکان بوە.

((بوبولیناکەم، ئەمشەو کەتۆ لەم کەناری دەریایەدا دەبینم‌و، مرێ خواردن‌و خواردنەوەم‌و چاوم کراوەیە، تۆ لەدیدی مندا یەکێکی لەوپەیکەرانەی کە بەپێشی کەشتیەکی گەورەوە دروست کرابێت‌و، منیش، هۆ مراویە قوتەکەم، دوا بەندەرتم، هەمان مەیخانەم کە کەشتیەوانەکان روی تێ دەکەن‌و تیا دەخۆنەوە، وەرە، پاڵم پێوەدەو چارۆگەکانت هەڵدە، من، هۆ فریشتەکەی دەریام، ئەم لێوانە شەرابە کریتیە لە چاوی تۆ دەنۆشم.

هورتانس خانم کە قسەکان زۆریان کارلێ کردبوو، دەستی کردە گریان‌و خۆیدا بەسەرشانی زۆربادا، زۆربا سەری بەگوێمەوە ناو لەسەر خۆ پێی وتم:

-دەبینیت، سەرۆك، بەم قسە خۆشانەم سەرئێشەم بۆ خۆم دروست کرد، ئەمشەو کەوتمە کەوێڵی ئەم ژنۆکەیەوەو تازە لێ ناگەڕێت برۆم، ئەی چیبکەم؟ من دڵم بەحاڵی ئەم داماوانە دەسوتێت، بەڵێ، دڵم بە حاڵی هەموویان دەسوتێت.

ئەمجارە بەدەنگی بەرز رووی لە فریشتەکەی دەریاکردو وتی:

-مەسیح لەدایك بوە، خۆشی لەخۆمان.

باسکی ئالآندە باسکی ئەو ژنە میهرەبانەوە، دەست لەناو دەستو بەدزە نیگای یەکدیەوە، پێکەکانیان تا دوا قوم هەڵدا.

زۆری نەمابوو سپێدەی بەیان بدات کە ئەو رۆژە گەرمو تەختەخەوە گەورەیەم جێ هێشتو بەتەنیا رێیماڵەوەم لەبەرگرت.

خەڵکی گوندەکە لەو شەوی جەژنەدا لە خواردنو خواردنەوە مڕببوونو، تێکڕا نووستبوون، لەژێر ئەستێرە گەورەو درەوشاوەکانی زستانیدا هەموو دەرگاو پەنجەرەکانیان داخستبوو.

دنیا ساردبوو، دەریا دەی نرکاندو ئەستێرەی بەیان لەخۆرهەڵاتەوە کەوتبوە سەمای درەوشانەوە، من بە کەنارە دورو درێژەکەدا دەڕۆیشتم، یاریم لەگەڵ شەپۆلەکانیدا دەکرد، شەپۆلەکان هەڵدەبەزینەوە بۆ ئەوەی تەڕم بکەنو من هەڵدەهاتم. دڵخۆش بوومو لەگەڵ خۆمدا دەم وت:

((بەختەوەری ڕاستەقینە ئەوەیە کە مرۆڤ هیچ خولیایەکی نەبێت، وەك کۆیلەیەك کاربکات کە بەڕواڵەت خولیاکانی زۆرن، دور لە مرۆڤ بژی، هیچ پەیوەندی پێیانەوە نەبێتو خۆشی بوێن، لە جەژنی سەری ساڵدا هاوبەشی بکاتو، دوای ئەوەی تێری خواردو تێری خواردەوە تاقو تەنیا لە هەموو داوەکان رزگاربێت، بەسەر سەریەوە ئەستێرەو، لە لای چەپیەوە وشکانیو لەلای ڕاستیەوە دەریابێتو، لەناکاودا هەست بەوە بکات کە ژیان لەدڵیا دوا موجیزەی خۆی نواندوە، واتا بوە بە چیرۆکێك لەچیرۆکی فریشتەکان)).

ڕۆژ بەدوای ڕۆژدا تێ دەپەڕین، من بۆ خۆم ئازایەتیم بەخەرج دەدا، بەڵام لە قوڵایی دڵما هەستم بەخەمو ئازار دەکرد، لەماوەی هەموو ئەو هەفتەیەی جەژندا یادوەریەکان

بەسەریان دەکردمەوەو، سنگمیان پڕ دەکرد لە ئاوازە دێرینەکانیو ئازیزە لەبیر کراوەکان، جارێکی دی ڕاستی ئەم وتە کۆنەم بۆ دەرکەوتەوە کە دەڵێت:

((دڵی مرۆڤ چاڵێکی پڕ لە خوێنە، لەم بەرو ئەوبەری چاڵەکەدا ئازیزە لەدەست چوەکان لەسەرسك کەوتوون تا لە خوێنی خۆیان بخۆنەوەو زیندوببنەوە، چەندە ئەوانە لای ئێوە ئازیزتربن زیاتر خوێن دەخۆنەوە).

شەوی کۆتایی ساڵ کۆمەڵێك منداڵە وردکەی گوند بەلەمێکی گەورەی کاغەزیان هێنا، هاتنە کوختەکەمانو بەزریکەو شادیەوە دەستیان بەخوێندنەوەی (کالاندا)[88] کرد

((قەشەبازیلی مەزن لەوشارەوە کەتیا لەدایك بوە، لەشاری قەیسەریەوە، گەیشت، لێرەداو لەبەردەم ئەم کەنارەشینەی کریتدا وەستا. خۆی بەسەر گۆچانەکەیدا داو لەپڕا گۆچانەکەی پڕبوو لەگەڵاو گوڵو سروودی جەژن دەستی پێکرد:

((ماڵی تۆ، ئەی سەرۆك، پڕ لە گەنمو ڕۆنو زەیتونو شەراب بێت، ژنەکەیشت وەك کۆڵەکەیەکی مەڕمەڕ سەقفی ماڵەکەت ڕابگرێت.

کچەکەت شووبکاتو لۆکورو کچێکی ببێت

کوڕەکانت قوستەنتەنیە، شاری پاشاکانمان ئازاد بکەن.

ساڵی نوێتان پیرۆزبێت، مەسیحیەکان))

زۆربا بەخۆشیەوە گوێی گرتبوو، تەپڵی منداڵەکانی گرتبوە دەستو بەجۆشو خرۆشەوە دەیکوتا.

من تەماشام دەکردو بێ ئەوەی هیچ بڵێم گوێم ڕادێرابوو، وام هەست دەکرد گەڵایەکی دی لە دڵی من، واتا ساڵێکی تر دەکرێتەوەو هەنگاوێکی تر بەرەو ئەو چاڵە ڕەشە هەڵدەنێم.

زۆربا کە بەدەنگێکی زۆر بەرز لەگەڵ منداڵەکاندا گۆرانی دەوتو تەپڵی لێدەدا پرسی:

---

[88] Kalandaگۆرانی میللی یونانیەو بەتایبەتی لەساڵی نوێدا دەوترێت. ف

–چیتە، سەرۆک؟ چیتە، هاوڕێ؟ ڕەنگت پەڕیوەو پیربوویت، من لە ڕۆژانی وادا دەبمەوە بەمنداڵو وەک عیسای مەسیح جارێکی تر لەدایک دەبمەوە، بۆ خودی عیسایش هەموو ساڵێک لەدایک نابێتەوە؟ منیش وەک ئەو.

من بەسەر تەختە خەوەکەوە پاڵ کەوتمو چاوم لێک نا، ئەو شەوە دڵم نامۆیی دەکردو ناقەتی قسەکردنم نەبوو.

خەوم لێ نەدەکەوت، وەک پێویست بێت ئەو شەوە باجی هەموو کارەکانم بدەمەوە. هەموو تەمەنم وەک خەونێک، خێراو بەنادیاریو نەگونجاوی هێنایەوە بەرچاوم، بەناهۆمێدیەوە لێم ڕوانی، ژیانی خۆم وەک گەواڵە هەورێک هاتە بەرچاو کە بای کوێستان بەهەموو لایەکدا ڕای ڕفێنێتو شێوەی جیاواز وەربگرێت. شی بێتەوەو دیسان یەک بگرێتەوە، شێوەی قوو، سەگ، شەیتان، دووپشکو مەیمون لەخۆ بگرێت، بەردەوام ڕیشاڵ ڕیشاڵ بێت، بایەکە هەر بیگێڕێو پاشان وەک کۆلکە زێڕینەی لێ بکات.

بەیانیدا، من چاوم نەکردەوە، دەمویست هەموو هێزو توانام لە ئارەزووە ئاگرینەکەمدا کۆ وەکەم، پەردەی مۆخ بدڕێنمو بچمە ناو ئەو کەناڵە تاریکو سامناکەوە کە لەوێوە هەموو دڵۆپێکی وجودی مرۆڤ دەڕژێتە ئۆقیانووسێکی مەزنەوە، حەزم دەکرد ئەو پەردەیە زوو بدڕێت، تابزانم ئەم ساڵی تازەیەم چۆن دەبێت...

–بەیانیت باش، سەرۆک، ساڵی نوێت پیرۆز.

دەنگی زۆربا بو کە جارێکی تر بەتووڕەییەوە هێنامیەوە سەرزەوی، چاوم کردەوەو هەر لەوکاتەدا زۆربام بینی هەنارێکی گەورەی فرێدایە بەردەرگای کوختەکە. دەنکە تەڕو یاقوتیەکانی هەنارەکە تابەردەمی تەختە خەوەکەی من پەڕین، من چەند دانەیەکم لێ کۆکردنەوەو خواردمنو گەروم تەڕایی تێ کەوت.

زۆربا بەخۆشیو شادیەوە هاواری دەکرد:

–هیوادارم قازانجمان زۆربێتو کیژە جوانەکان بۆ خۆیانمان بەرن. لە جێگاکەی هەستا، ریشی تاشی جوانترین بەرگ! پانتۆڵی ماهوتی سەوز، چاکەتێکی خوری زبرو ڕەنگ قاوەیی، قەمسەڵەیەکیش کە تانیوەی پێستی بزن بوو لەبەرکرد، کڵاوە هەشتەرخانیە روسیەکەی خۆی لەسەر نا، سمێڵی باداو وتی:

—سەرۆك، من دەچمە كلێسا، وەك نوێنەری كۆمپانیەكە خۆمیان نیشان دەدەم، لەبەرژەوەندی كانەكە نیە پێمان بڵێن ((فراماسون)).

من بەم كارە زەرەرناكەم. كەمێكیش كات بەسەر دەبەم.

سەری دانەواند، چاوی هەڵتەكاندو لەبەر خۆیەوە وتی:

—بەڵكوو بێوەژنەكەیش ببینم.

خواو بەرژەوەندی كۆمپانیاو بێوەژن تێكەڵەیەكی گونجاویان لەزەینی زۆربادا دروست كردبوو. من گوێم لە دەنگیپێی بوو كە لەسەرخۆ دووردەكەوتەوە. ڕاپەڕیمو لە جێگاكەم هەستام، خەونەكەم نەهاتەدیو گیانم جارێكی دی خۆی لەزیندانی جەستەمدا بینیەوە.

جلەكانم لەبەركردو بەدرێژایی كەناری دەریادا ڕێگام لەبەرگرتەوە، توند دەڕۆیشتمو دڵخۆش بووم، دەت وت لە مەترسی یان گوناهێك ڕزگار بووم.

لەپڕا ئارەزوویەكی كرێسی (فزولی) ئەو سەرلەبانیە، بۆ پەی بردن بە ئایندەیەك كە هێشتا لەدایك نەبوە، وەك تاوانێك هاتە بەرچاوم.

بیرم لە بەیانیی ڕۆژێك كردەوە كە قۆزاخەیەكم بەقەدی درەختێكەوە بینی، ئەوكاتە بوو كە كرمی ئاوریشمەكە قۆزاخەكەی دڕیبوو، ئامادەی هاتنە دەرەوە بوو، زۆرم چاوەڕێ كرد، بەڵام ئەو درەنگ كەوتوو من بەپەلە بووم، بە تووڕەییەوە دانەویمو بەهەناسەی خۆم كەوتمە گەرم كردنەوەی، بەخێرایی قۆزاخەكەم گەرم كردو لەبەر چاومدا موجیزەیەك ڕوویدا لەوە زووتركە لە سروشتا ڕووبدات، قۆزاخەكە كرایەوە، كرمەكە بەكێشمەكێش خۆی دەرهاویشت، من لەو كاتەدا هەستم بە ترسێكی گەورە كرد كە هەتا ماوم لە یادی ناكەم، باڵی كرمەكە هێشتا نەكرابوەوە، بەهەموو هێزی لەشە لاوازو لەرزۆكەكەیەوە هەوڵی دەدا باڵی لێك بكاتەوە، من كە بەسەریا دانەوی بووم بەهەناسە كۆمەكیم دەكرد، وەڵێ بێهودە بوو، دەبوو زیاتر سەبری لەسەر بكرێت، هەروەها كرانەوەی باڵەكانی پێویستی بەهەتاو بوو. بەڵام تازە هیچ، هەناسەكەم وای لە كرمەكە كردبوو لاوازو بێتینو لەناوەختا بێتەدەرێ. نائومێدانە تەكانێكی دایە خۆی، دوای چەند چركەیەك بەسەر لەپی دەستمەوە گیانی دەرچوو.

بەبڕوای خۆم ئەم تەرمە بچووکە بارێکی زۆر گرانە بەسەر ویژدانمەوە، چونکە ئێستا زۆر چاك لەوە گەیشتووم کە دەست درێژی کردنە سەر یاسا مەزنەکانی سروشت تاوانێکی گەورەیە، نابێت ئێمە پەلە بکەین، نابێت ئارام لەبەرخۆمان هەڵبگرین‌و، دەبێت بە تەواوی دڵنیایەوە پشت بە رژێمی نەمری سروشت ببەستین.

لەسەر تاوێرە بەردێك دانیشتم تا بەهێوری، لە خۆمدا لەم بیرۆکەی ساڵی نوێیە بکۆڵمەوەو تاووتوێی بکەم..ئاه! خۆزگا ئەو مێروە بچووکە بیتوانیایە بەردەوام بەپێش چاومدا بفڕیایەو ڕێنمایی بکردمایە.

-١١-

ئەمەندە بەخۆشیەوە لەخەو هەستام دەت وت جەژنانەم دراوەتێ، هەوا ساردو ئاسمان سایەقەو دەریاش لەبریسكو هوڕدا بوو.

ڕێگای گوندم لەبەرگرت، پێ دەچوو قوداسەكە كۆتایی هاتبێت هەر بەدەم ڕێگاوەو بە گومانێكی گەلۆرانەوە لە خۆم دەپرسی كەلەم سەرەتای ساڵی نوێیەدا یەكەم كەس كە تووشی دێم بینینی بەخێر دەگەڕێت یان بەشەڕ؟ بەخۆم دەوت: خوا بكات منداڵێك بێت باوەشی پڕبێت لە یاریەكانی جەژن، یان پیرەمێردێكی خۆگر بەبەرگێكی سپیو قۆڵی كراسێكی هەراوی گوڵ لەسەر چنراوەوە، دڵخۆشو هەوادار بەوەی كە ئازایانە لە ژیاندا كاری خۆی ڕاپەڕاندوە، هەرچەند دەچوومە پێشێو لەگوند نزیك دەبوومەوە ئەم دڵە ڕاوكێ گەوجانەیەم زیادی دەكرد.

لەپڕا ئەژنۆم شل بوو: لەسەر ڕێگای گوندەكە، لەژێر دار زەیتونەكاندا بێوەژنەكە دەركەوت. سەرتاپا سوری پۆشیبوو، سەرپۆشی ڕەشی بەسەردا دابوو، ئاغر ئاغر هەنگاوی لەسەر خۆی دەنا.

لەنجەو لارەكەی لە ڕۆیشتنی دەڵە پڵنگێكی ڕەش دەچوو، وام هەست پێكرد كە بۆنێكی زۆر خۆشی میسك ئەو ناوەی پڕ كرد، ویستم ڕا بكەم، زانیم ئەم دڕندەیە كە تووڕە بێت بێ بەزەییو بێ ئامانە، بۆیە تاقە ڕێگای ڕزگاربوونم ئەوەیە كە هەڵبێم، بەڵام چۆن؟ بێوەژن تادەهات نزیك تردەبوەوە، وام هەست كرد وردە بەردی سەر ڕێگاكە لەژێر پێیدا وەك لەشكرێكی بەسەردا بڕوات لەهاوارو ناڵەدا بوو، منی بینی سەری لەقاند، سەرپۆشەكەی داخزایە خوارێ، قژە قەترانیە ڕەشو بریسكەدارەكەی دەركەوت، بەنیگایەكی مەستانەوە زەردەخەنەیەكی بۆ كردم، جوانیەكی سەیر لەچاویا هەبوو، بەپەلە سەرپۆشەكەی هەڵگرتەوە، وەك شەرمی ئەوە گرتبێتی كە شاراوەترین نهێنی ژن، واتا زوڵفی دەركەوتوە.

من ویستم بدوێم‌و پیرۆزبایی ساڵی نوێی لێ بكەم، بەڵام وەك ئەو رۆژەی كە تونێلی كانەكە ڕووخاو گیانم كەوتە مەترسیەوە گەروم وشك بوو، ئەو قامیشانەی ببوونە پەرژینی دەوری باخەكەی بەدەم باوە دەلەرینەوە، خۆری زستانە كەوتبوە سەر لیمۆی ئاڵتوونی ڕەنگ‌و نارنجە گەڵا تۆخەكان، هەموو باخەكە وەك بەهەشت دەدرەوشایەوە.

بێوەژن وەستا، دەستی بردو توند پاڵی بەدەرگای باخەكەوە ناو كردیەوە، ئەوساتە بوو كەمن بەبەردەمیدا تێپەڕیم، ئەو سەری وەرگێڕا، تەماشای كردم‌و برۆی هەڵتەكاند. دەرگاكەی بەكراوەیی هێشتەوەو هەر بەهەمان لارو لەنجەوە ڕۆیشت‌و لەپشت دارنارنجەكانەوە ون بوو.

چوونە ژوورەوە لە دەرگاوە، دەرگا داخستن، كەوتنە دوای بێوەژن، ناوقەدی بگری‌و بێ ئەوەی وشەیەكی لەگەڵدا بڵێی بەرەو تەختە خەوە گەورەكەی بەریت كارێكی پیاوانەیە! كارێكە بێگومانم باپیرم كردوویەتی‌و هیوادارم نەوەی منیش بیكات. بەڵام من هەر لەوشوێنەدا وەك بزمار داكوترابووم، دوودڵ بووم‌و بیرم دەكردەوە. لەبەر خۆمەوەو بەپێكەنینێكی تاڵەوە وتم: ((خوا یاربێت لەژیانەكەی تردا، ژیانەكەی ترن لەم كارە چاكتر دەكەم))

كەوتمە سەر ڕێگایەكی پڕ لەدارو درەخت، هەستم كرد گرێ یەكم لەسەردڵە ، وەك ئەوەی گوناهێكی گەورەم كردبێت، وێڵ وێڵ بەهەموو لایەكدا دەگەڕام، هەوای سارد لەرزی لێ هێنابووم، بێ هوودە لە هەوڵی ئەوەدا بووم دیمەنی لەنجەولارو زەردەخەنەو چاوە سنگی بێوەژن لەبیر خۆم بەرمەوە، بەڵام ئەو دیمەنانە بەردەوام دەهاتنەوە بەرچاوم‌و لەوەدا بوو هەناسەم لێ ببڕن.

درەختەكان هێشتا بێ گەڵا بوون، وەلێ چرۆیان كردبوو، چرۆكان هەڵئاوسابوون‌و پڕ بوون لە شیلەو ترەكی بوون، لەهەر چرۆیەكدا هەست بەچڵی تازەو گوڵ‌و میوەی ئایندە دەكرا كە لەوێدا كۆبوونەتەوەو بۆسەیان داناوە، تا لەدەرفەتێكدا بەرەو ڕووناكی دەرپەڕن.

گەورەترین موجیزەی بەهار لەو پێگەیشتنەدایە كەلەبن ئەو توێكڵ‌و پۆستە وشكانەی درەختدا، شەوو رۆژ، بەبێدەنگی‌و بەنهێنی لەناو دڵی زستاندا دەیكات.

لەناكاواو هاوارێكی شادیم لێ هەستا، بەرانبەرم، لەپەنایەكی باگردا، درەختێكی چوالەم بینی كە پێش وەختو لەناوەڕاستی زستاندا گوڵی كردبوو، ڕێگای بۆ هەموو درەختەكانی دی خۆش كردبوو، موژدەی بەهاری بۆ هێنابوون.

هەستم بە ئاسودەییەكی مەزن كرد، بەقووڵی بۆنی تازەو خۆشم هەڵمژی، كەوتمە لاڕێو لەژێر لقە گەڵ گرتوەكانی درەختەكەدا چوارمشقی دانیشتم.

ماوەیەكی زۆر بێئەوەی بیر لەهیچ بكەمەوە وبێ ئەوەی خەمێكم هەبێت هەر بەدڵخۆشیەوە مامەوە، لەئەبەدیەتدا بووم و لەبن یەكێك لەدارەكانی بەهەشتدا دانیشتبووم.

لەپڕا دەنگێكی قەبەی جانەوەر ئاسا هێنامیەوە سەرخۆم.

–تۆ لەم كونەدا چی دەكەیت، سەرۆكت ماوەیەكە بەدواتدا دەگەڕێم، ئەوەندەی نەماوە بۆ نیوەڕۆ، دەی بابڕۆین.

–بۆ كوێ؟

–بۆ كوێ؟ تازە دەپرسیت بۆ كوێ؟ بۆ لای ئەو بەچكە بەرازە شیرە خۆرەیە، ئەی برسیت نیە؟ ئێستا ئەو كودەڵە بەرازە لە تەنوور هاتۆتە دەرێ، بەڕاست دەبێت چ بۆنو بەرامەیەكی هەبێت؟ دەم پڕ دەكات لە ئاو، دەی بابڕۆین.

لە جێگا كەم هەستام، دەستم بە قەدی زبری دار چوالە پڕ لەڕازەكەدا هێنا كە توانیبووی ئەم موجیزەی گوڵ كردنە دروست بكات، زۆربا چوستو چالاكو بەشەوقەوە لەپێشەوە دەڕۆیشت. پێویستیە سەرەكیەكانی مرۆڤ–یەعنی خواردنو خواردنەوەو ژنو سەما– هەمیشە وەك كانیەكی تەقیو لەلەشی بەتواناو ژەم بردەی زۆربادا جۆشو خرۆشی هەبوو.

زۆربا شتێكی بەدەستەوەبوو، پێچرابوو بە كاغەزێكی پەمەییەوەو بەدەزوویەكی ڕەنگ ئاڵتوونی، بەسرابوو. بەپێكەنینەوە لێم پرسی:

–ئەمە جەژنانەیە؟

زۆربا كە دەیوست هەڵچوونە دەرونیەكەی خۆی بشارێتەوە دایە پێكەنینو، بی ئەوەی لابكاتەوە وتی:

—دەمەوێت کەمێك دڵی ئەو منداڵە خۆش بکەم، ئەم دیاریە ڕۆژە خۆشەکانی ڕابووردوی بیردێنێتەوە..ئاخر هەروەك پێشان وتم: ئەو ژنە، ژنیش بوونەوەرێکە هەمیشە گلەیی لەبەختی خۆی هەیە.

—وێنەیە؟

—دەی بینیت.. پەلەمەکە.. دەی بینیت، من خۆم دروستم کردوە، با زووتر بگەین.

خۆری ئەو نیوە ڕۆیە ئێسکی گەرم دادەهێنا، دەریاش خۆش و خەندان خۆی بەهەتاوەکە گەرم دەکردەوە، دوورگەیەکی دورو تەنیا،لەتەمێکی تەنکەوە ئاڵابوو، لەدووره وەوات دەبینی کەلە دەریاکە هاتوتە دەرێو بەسەر ئاوەکەوە مەلە دەکات.

لە گوندەکە نزیك دەبووینەوە، زۆربا هاتە بن دەستمەوەو لەسەر خۆ وتی:

—دەزانیت، سەرۆك، یارۆ لەکلێسابوو، من لەپێشەوەو نزیك بەدرووی خوێنەکان بووم کە لەپڕا هەموو پەیکەرە پیرۆزەکان گەشانەوەو، مەسیح و مریەم و دوانزە حواری[89] کەدەرشانەوە. من نیشانەی خاچم کێشاو بەخۆم وت!((دەبێت چی ڕویدابێت؟ خۆرهەڵاتبێت؟))

کە ئاورم دایەوە: بێوەژنەکە لەوێ بوو.

من هەنگاوم هەڵگرت و وتم:

—لەبارەی ئەو ژنەوە زۆرمان قسەکردوە، ئیتر بەسە زۆربا.

بەڵام زۆربا کەوتە پەلە بەدوامداو وتی:

—من ئەوم لەنزیکەوە دی، سەرۆك، خاڵێکی لەسەر گۆنایە مرۆڤ شێت دەکات، بەڕاست خاڵی سەر گۆنای ژن ڕازێکە بۆ خۆی، وانیە!

بەسەرسامیەوە چاوی کردەوە:

---

[89] Apostles دوانزە هاوکاریکەی حەزرەتی عیسان کەدوای خۆی پەیامی مەسیحیەتیان بەڕاستی بەخەڵکی گەیاندو ئەمانە: پوتروس، ئەندریاس، یاقوبی گەورە، یوحەنا،توما، یاقوبی بچووك، یەهودا، فیلپس، برتولماس، مەتی، شەمعون، متیاس، هەندێك جارلە باتی دواناو ناوی یەهودای ئەسخەریوتی دێت کە بوە هۆی لەخاچدانی مەسیح و کوشتنی.

–تۆ سەرنجت داوە سەرۆك؟ لەسەر پێستێكی ناسكو تەنكەوە لەپڕا دەكەویت بەسەر خاڵێكی ڕەشدا. باشە، ئەمە بەسە بۆ شێت بوونی مرۆڤ، تۆ هیچ لەم مەسەلەیە دەزانیت، سەرۆك؟ لەم ڕووەوە كتێبەكانت دەڵێن چی؟

خوا كتێبەكانم ببڕێت.

زۆربا لەخۆشیا دایە قاقای پێكەنینو وتی:

–ئافەرین، وردە وردە خەریكی تێ دەگەیت.

بەجووتەو بێ وەستان بەبەردەم چایخانەكەدا تێ پەڕین، خانمە میهرەبانەكەمان كوودەڵە بەرازێكی لەناو تەنوورەكەدا بۆ لێ نابووین.

لەبەردەرگا وەستابوو چاوەڕێی دەكردین.

هەر ئەو قردێلە زەردە ڕەنگ كەناریەی پێشوی لە ملیەوە ئاڵاندبوو، سپیاوێكی زۆری دابوو لەڕوویو سوراوێكی خەستی لێویشی كردبوو، سیمایەكی سەیری هەبوو! كە ئێمەی بینی لەخۆشیا هەموو لەشی كەوتە جووڵە. چاوە بچووكەكانی شەیتانانە گێڕاو بە سمێڵە بادراوەكەی زۆرباوە گیربوون.

هەر ئەوەندەی دەرگای دەرەوە داخرایەوە زۆربا دەستی لەناو قەدی ئاڵاندو وتی:

جەژنت پیرۆز، بوبولیناكەم، سەیری چیم بۆ هێناویت!

ئینجامله چرچو لۆچەكەی ماچ كرد.

پیرە فریشتەی دەریا وەك ختووكەی درابێت ڕاچڵەكی، بەڵام لەخۆی نەگرت، چاوی لەدیاریەكەی زۆربا بڕی، وەری گرت، گرێی دەزوە ئاڵتونیەكەی كردەوە، تەماشای كردو قیژاندی.

من خۆم دانەواند تا تەماشای بكەم، زۆربای بێژو لەسەر پارچە مقەبایەكی ئەستوور بەچوار ڕەنگی سوور، زەرد، خۆڵەمێشیو ڕەش، وێنەی چوار كەشتی گەورەی شەڕكەری كێشابوون هەریەكێكیان ئاڵای خۆی بەسەرەوەو لەناو دەریایەكی شیندا بوون. لەپێشی هەر كەشتیەكدا فریشتەیەكی جوانی دەریا كە هورتانس خانم بوو، ڕوتو سپی، بەقژی پەخشانو مەمكی قوتیەوە، بەكلكێكی ماسی مارپێچو قردێلەی زەردو ناسكی گەردنیەوە بەسەر شەپۆلەكانەوە مەلەی دەكرد، چوار دەزوی بەدەستەوە بوو، هەر چوار كەشتیە

شەڕکەرەکان، کەئالاّی ئینگلیزو روس‌وفەرەنساو ئیتالّیایان پێوە بوو بەدەزووەکە ڕای دەکێشان، لەهەر گۆشەیەکی تابلۆکەدا، ریشێك، کە ڕەنگیان سورو زەردو خۆلەمێشیو ڕەش بوو هەلّواسرابوون.

گۆرانی بێژی پیر کە زوو لەمەبەستەکە گەیشت، لەکاتێکدا بە هەواو فیزێکەوە ئاماژەی بۆ لای فریشتەکەی دەریا کرد وتی:

—ئەمە منم.

هەناسەیەکیشی هەلّکێشاو دیسان وتیەوە :

—ئای، ئای! منیش ئەوسا یەکێك بووم لە دەولّەتە گەورەکان. ئاوێنە خڕو بچووکەکەی سەروی تەختە خەوەکە کەنزیك بەقەفەزی تووتیەکە بوو داگرتو تابلۆکەی زۆربای لەشوێنەکەی هەلّواسی. لەژێر ئارایشتە خەستەکەدا دیار بوو ڕەنگی گۆنای تێك چووبوو.

هەرلەوکاتەدا زۆربا چوبوە ناو موبەقەکەوە، چونکە برسی بوو، کودەلّە بەرازەکەی لەدەفرێکی گەورەداهێنا، بوتلّێك شەرابی نایە بەردەستی خۆییو هەر سێ لێوانەکەی پڕ کرد، دەستی پێکداداو هاواری کرد:

—دەی فەرموونە سەر سفرە، لە بەشی سەرەکیەوە کە گەدەمانە دەست پیٚ دەکەین، پاشان، خانمەکەم دەچینە سەر خوار گەدەیش، بەلاّم هەناسەی ساردی پیرە فریشتەی دەریا دۆخەکەی شێواندبوو، ئەویش لەهەر سەری سالّێکدا قیامەتێکی خۆیی هەبوو دەبوو بەژیانی رابوردویدا بچێتەوەو هەست بکات بەفیرۆ چوە، لەسەری ئەوژنەدا، شار گەلێکی گەورە، پیاوانی جیاواز، بەرگی ئاوریشمینی، بوتلّیٚ شامپانیو ریشە عەتراویەکان دەبوو وەك رۆژە شکۆمەندەکانی ئەوسا یان لەگۆڕی یادوەریەکانیەوە زیندوببنەوەو هاوار بکەن.

ژنە بەنازەوە وتی :

—من هیچ برسیم نیە، دلّم هیچ نابات، هیچ...

لەبەردەم مەقەلّیەکەدا بەچۆکداهاتو پشکۆ خەلّوزەکانی سەروبن کرد، شەوقی ئاگرەکە لەڕوومەتە تێك قوپاوەکانیەوە دەردەکەوت، تالّێکی زولّفی لەناوچاویەوە داکەوتە نێو ئاگرەکە، بۆ کرووزی ناخۆشی قژە سووتاوەکە ژوورەکەی پڕ کرد، کە بینی ئێمە هەر لێی ناپرسین جارێکی ترهەر لەبەرخۆیەوە وتی:

—نامەوێت بخۆم...

زۆربا تووڕە بوو، دەستی کردە مستەکوڵەو ماوەیەک بەدوودڵی مایەوە، ئیتر یان دەبوو ئێمە پێکەوە خەریکی خواردنی کودەڵە بەرازی تەنووری بین‌و ژنەش لەبەرخۆیەوە داخ‌و خەفەت هەڵبڕژێت، یان دەبوو زۆربا لەبەردەمیا بکەوێتەسەر ئەژنۆ، لەباوەشی بگرێت‌و بەقسەی خۆش دڵی بداتەوە، من لەدەم‌و چاوە خڕ ئەنگازەکەی زۆربادا بەچاکی هەستم بەم دڵە ڕاوکێیە دەکرد.

لەپڕا دەم‌و چاوی زۆربا هاتەوە سەر خۆی، لەوە دەچوو بڕیارێکی دابێت، بەچۆکدا هات، هەردوو ئەژنۆی فریشتەی دەریای گرت‌و بەدەنگێکی پڕ لەسۆزەوە وتی:

—مراویەکەم، ئەگەر نەخۆیت دنیا کاول دەبێت، تۆزێك بەزەیی، ئازیزەکەم ئەم پارچە گۆشتە بەرازە مەیل بفەرموو.

پارویەك لەگۆشت بەرازەکە، کە ڕۆنی لێ دەتکا کردی بەدەمیەوە، پاشان باوەشی پیاکرد، هەڵی گرت‌و لەسەرخۆ لەسەر کورسیەکەی خۆی کە لەنێوان هەردووکماندا بوو داینا، دیسان وتی:

—بخۆ، ماڵەکەم بخۆ، با بازێلی پیرۆز بێتەدیکەمانەوە، خۆت دەزانیت ئەگەر نەخۆیت ئەو حەزرەتە نایەتە ناو دێ‌و دەگەڕێتەوە بۆ قەیسەریەی وڵاتی خۆی، ئەوسا کاغەز‌و قەڵەم‌و کێکی جەژن‌و جەژنانەو بەلەیستۆکەکانی منداڵان‌و تەنانەت ئەم بەرازە شیرە خۆرەیە دەباتەوەو دەڕوات، کەواتە مراویەکەم دەست بکەرەوەو بخۆ.

بەدوو پەنجە ختووکەی ژێر باڵیدا، پیرە فریشتەی دەریا لەتاوا دایە پێکەنین، چاوە بچووکە سوور داگەڕاوەکانی سڕی‌و کەوتەخواردن‌و جاوینی پارچە گۆشتە بەتامەکە.

لەوکاتەدا دوو پشیلەی عاشق، لەسەربان، کەوتبوونە دەنگە دەنگ، هەردووکیان بەرکێکی زۆرەوە لەیەکتریان دەمڕاند، دەنگیان پڕی هەڕەشەو گوڕەشە بوو، لەپڕا گوێمان لێ بوو بەربوونە داپڵۆسینی یەکتری، زۆربا بەچاوداگرتن لەپیرە فریشتەی دەریاو لاسایی کردنەوەی پشیلەکان کەوتە میاو میاو کردن.

ژنە پێکەنی‌و لەژێر مێزەکەوە دەستی زۆربای گوشی، دەمی کرابوەوەو بەخۆشیەوە کەوتەخواردن.

خۆر داکەوت، لەپەنجەرە بچووکەکەوە هاتەژووریێو کەوتە سەر پێی خاتوونە میهرەبانەکەمان، بوتڵەکە تەوا ببوو زۆربا کەسمێڵی وەك سمێڵی پشیلەی کێوی قیت کردبوو لەهۆرتانس خانم نزیك کەوتەوە، ئەوکزۆڵەی کردبوو سەری بردوە بوە نێو شانیو دەلەرزیو هەستی بەگەرمی هەناسەی سەرخۆشانەی زۆربا دەکرد.

زۆربا سەری وەرگێراو پرسی:

–بەڕاستی سەرۆك، ئەم نهێنیە چیە لەمندا کە هەموو شتێکم بەپێچەوانەوەیە. کە منالْ بووم لەپیرەمێردێك دەچووم، یەعنی وشكو مۆن ,بووم، زۆرم قسە نەدەکردو، دەنگێکی قەبەی وەك دەنگی پیرەمێردم هەبوو، پێیان دەوتم لەباوە گەورەم دەچم. بەلاّم چەند گەورەتر بوومایە سەرکێش تر دەبووم، لەبیست سالْیدا شتی قۆڕم دەکرد، بەلاّم زۆر نا، لەوشتە قۆڕانەی هەموو کەسێك لەوتەمەنەدا دەیانکات.

لە چل سالْیدا وردە وردە هەستم بەوەکرد کە لاوم، ئەوسا کەوتمە دوای کەر بازاڕیەکی گەورەوە. ئێستایش کەتەمەنم شەست سالْە –بەینی خۆمان بێت سەرۆك، شەستو پێنج سالْم– بەلْێ، ئێستا کە کەوتومەتە تەمەنی شەست سالْیەوە بەڕاستی دنیام لا زۆر بچووك بۆتەوە تۆئەمە چۆن لێك دەدەیتەوە، سەرۆك؟ پێکەکەی هەلْ گرت، بەویقارێکەوە ڕووی لەخانمەکەی کردو بەدەنگێکی خۆ نواندنەوە وتی:

بەخۆشیت بوبولیناکەم هیوادارم ئەمسالْ ددان دەربکەیتو برۆی قەیتانیو جوانت بۆ دەربێتو، پێستی تازەو ناسکی وەك پێستی هەلْوژەت بۆ دروست بێت. ئەوسا ئەم قردێلە باریكو پۆخلاّنە تووڕبدەیت، پێم خۆشە شۆڕشێکی تر لەکریتدا هەلْبگیرسێتو چوار دەولْەتی گەورە بەدەزگا جەنگیەکانیانەوە بگەڕێنەوە، هەر کەشتیەکی جەنگی کاپتنێکی خۆی لەگەلْدابێتو هەر کاپتنێکیش ریشێکی لوولو عەتراوی خۆی هەبێت، تۆیش، ئەی پەری دەریایی من، جارێکی دی لەنێوان شەپۆلەکانەوە سەردەربهێنیتو بەدەنگی خۆشی دلْبەرانەوە گۆرانیەکان بلْێیتەوە، هیواداریشم ئەو کەشتیانە کەخۆیان بەم دووبەردە سەختەدا دەکێشن بشکێنو پارچەپارچە بن.

زۆربا ئەمەی وتو پەنجە گەورەکانی نایە سەر هەردوو مەمکە شلو شاوەکەی خاتوونی میهرەبان.

جارێکی تر زۆربا داگیرسایەوە، دەنگی هەوەس بازانەی گربوو، من پێکەنیم، جارێکیان لەسینەمادا پاشایەکی تورکم دیبو لەمەیخانەیەکی پاریسدا بەدمەستی دەکرد، یەکێك لەژنە کار گەرە قژ زەردەکانی نابوە سەر ڕانی، کەگەرم دەبوو گوڵینگەی تەڕبووشەکەی سەری لەسەر خۆ بەرز دەبووەوە، ماوەیەك بەشێوەیەکی ئاسۆیی دەمایەوەو لەپردا دیسان بەرەو ئاسمان ڕاست دەبوەوە.

زۆربا پرسی :

بۆ پێدەکەنیت، سەرۆك؟

بەڵام خاتوونی میهرەبان هێشتا هەستی لای قسەکانی زۆربا بوو.

هەناسەیەکی هەڵکێشاو وتی:

–ئاه ... زۆرباکەم، بۆ شتی وادەبێت؟ کەلاویەتی ڕۆیشت ئیدی ناگەڕێتەوە.

زۆربا زیاتر لێی نزیك کەوتەوە، تا کورسیەکانیان پێکەوە چەسپی، کاتێك ویستی سێیەم دوگمەی یەعنی دوگمەی سەرەکی کراسەکەی هورتانس خانم بکاتەوە وتی:

–گوێ بگرە، مراویەکەم، گوێ بگرە بزانە چ دیاریەکی گەورەت دەدەمێ، ئێستا پزیشکێك هەیە موجیزە دروست دەکات، ئەم پزیشکە دەرمانێکت دەداتێ، ئیتر شروبە یان تۆزە نایزانم. تەمەنی مرۆڤ دەکاتەوە بە بیست یان بیستو پێنج ساڵی، خەم مەخۆ ئازیزم، من دەنێرم لە ئەورووپاوە بۆت بێنن.

فریشتەی دەریاکەمان ڕاچەنیو پێستە سوورەکەی سەری لەنێوان قژە تەنکەکەیەوە بریسکایەوە، باسکە گۆشتنەکەی لەئەستۆی زۆربا ئالاندو وەك پشیلەیەکی مێچکە خۆی تێ هەڵسو، بەنازو نوکەوە بەزۆربای وت:

–ئەگەر ئەودەرمانە شروبە، ئازیزەکەم، ئەگەر شروبە با قەڕابەیەکم بۆ بێنن، ئەگەر تۆزیشە ...

زۆربا کەسێ یەم دوگمەیشی کردبووە وتی:

–جەواڵێکی گەورە.

پشیلەکان کە ماوەیەك بێدەنگ بوون کەوتنەوە قوڕو پف.

دەنگی یەکێکیان پاڕانەوەو لالانەوەو دەنگی ئەوی دی تووڕەییو هەڕەشە بوو.

خانمەکەی ئێمە باوێشکێکی داو چاوی خومار بوو، لەوکاتەدا کە بەنازەوە لەسەر رانی زۆربا دانیشتبوو وتی:

–گوێت لەدەنگی ئەوحەیوانە پیسانەیە؟ تەریق نابنەوە ..

سەری بەلاملی زۆرباوە ناو هەناسەی هەڵکێشا. زیاد لەئەندازەی خۆی خواردبوویەوەو چاوانی لێڵ ببوون.

زۆربا مەمکی لەچنگ گرتو لێی پرسی:

–بیرلەچی دەکەیتەوە، پشیلە جوانەکەم؟

پیرە فریشتەی دنیا دیدە بەدەنگی گریاناویەوە لەسەر خۆ وتی:

–لە ئەسکەندەریە .. بێروت.. کوستەنتەنیە..لەتورکەکان.. عەرەبەکان.. لەشەرابەکان.. کورسیەزڕ کفتەکانو گوڵینگە سوورەکان.

دیسان هەناسەی هەڵکێشایەوە.

–لەو کاتانەیش کە شەوانە عەلی بەگم لادەمایەوە، ئای چ سمێڵێکی پێوە بوو، چ برۆیەک، چ باسکێک! تەپڵ لێدەرو زوڕناژەنی بانگ دەکردو لە پەنجەرەوە پارەی بۆ هەڵدەدان، ئەوانیش لە حەوشەکەی مندا تا بەیانی دەیان کوتا.

ژنە دراوسێکان لە حەسودیا دیقیان دەکردو دەیان وت: ((عەلی بەگ ئەمشەویش لای خانمە))

((پاشان، لە کوستەنتەنیە سلێمان پاشا نەی دەهێشت رۆژانی هەینی برۆمە دەرێو بگەرێم، چونکە لەوە دەترسا کاتێک کە سوڵتان دەچێت بۆ نوێژی وجومعە بمبینێتو عاشقی جوانیەکەم ببێتو بمفڕێنێت، بەیانی کە لە ماڵەکەم دەچوە دەرێ سێ لاوی قولەڕەشی لەبەردەم ماڵەکە دەکردە پاسەوان تا هیچ پیاوێك لەوناوە نزیك نەبێتەوە، ئاخ سلێمانۆکەکەم!))

لەژێر کراسەکەیەوە دەستەسڕێکی گەورەی چوار گۆشە لەسەرکراوی دەرهێناو وەك کیسەی ئاویی کەوتە فیشکە فیشكو گاز لێ گرتنی دەستە سڕەکە.

زۆربا بەبێزاریەوە خستیە سەر کورسیەکەی تەنیشتیو بەتووڕەییەوە لە سەر جێگاکەی هەستا، دووسێ جار بەناو ژوورەکەدا گەڕاو ئەویش کەوتە فیشکە فیشك، لەناکاو وای هەست کرد ژوورەکەی لێ هاتۆتەوە یەك، داردەستەکەی هەلگرتو چوە ناو حەوشەکە، پەیژەکەی بەدیوارەکەوە نا، چاوم لێی بوو کەهەر بەرکەوە دووپلەی بە هەنگاوێك دەبڕی، هاوارم لێ کرد:

–هێی زۆربا، دەتەوێت لە کێ بدەیت؟ سلێمان پاشا؟

لەوەڵامدا وتی:

–ئەم پشیلە پیسو بەدانە ناهێڵن ئاسوودە بین،و، بازێکی داوچوە سەربان.

هورتانس خانم بەتەواوی سەرخۆش بوو، زوڵفی ئاڵۆزو چاوی پف کردویشی نابوونە سەر یەك، لەدەمە بێ ددانەکەیەوە قوڕو پفی بوو، خەو بەرەو شارە گەورەکانی خۆرهەلات، باخە پەرژین کراوەکان، ژورە تاریکەکانی کۆشکی پاشا عاشقەکانی کردبوەوە. لەدەریاکانی دەپەڕاندەوەو خۆی دەبینی کە ڕاوە ماسی دەکات، چوار قولاپی هەلداوەو چوار کەشتی جەنگی پێوە بوون. پیرە فریشتەی دەریا خۆی بە ئاوی دەریاکە پاكو فێنك کردبوەوەو، لەخەوە خۆشەکەیدا زەردەخەنەی دەهاتە سەرلێو.

زۆربا بەدارەکەی دەستیەوە کە هێشتا هەر ڕای دەوەشاند گەڕایەوە ژوورێ، کە بەو حاڵەوە چاوی بەژنەکە کەوت وتی:

–خەوی لێ کەوتوە؟ سۆزانیە نووستوە؟

وتم: بەڵێ: دکتورو ڤۆرۆنوف[٩٠] کەپیر جوان دەکاتەوەو، شا زۆرباو خەو هەڵیان گرتوەو بردویانە، ئێستا ئەو تەمەنی بیست ساڵەو لە ئەسکەندەریەو بیرۆتدا دەسوڕێتەوە.

زۆربا دەستی کردە بۆڵەبۆل، تفی لەسەر زەویەکە کردو وتی:

–بابروا، پیرەسەگی پۆخڵە، سەیری چۆنیش پێدەکەنێ، کێ چوزانێ بەکێ پێ دەکەنێ! سەرۆك هەستە بابڕۆین.

شەو کڵاوەکەی تەپاندەسەریو دەرگاکەی کردەوە.

وتم : ئەمە ڕاست نیە، وەك بەراز خۆراكەكەی بخۆین‌و، پاشان بەتەنیا جێی بهێڵین‌و بڕۆین.

زۆربا بەدەنگی بەرز وتی:

–بەتەنیا نیە، لەگەڵ سلێمان پاشادایە، بۆنای بینیت؟ ئێستا بە ئاسمانی حەوتەما دەگەڕێت، ئەم ژنە پیسە، بابڕۆین، سەرۆك، بەوسەرمایە هاتینە دەرێ، مانگ بەئاسمانەوە لە سەرخۆ دەجووڵا.

زۆربا بەبێزاریەوە وتی:

–تف لەم جۆرە ژنانە، بەڵام گوناه لەوانەوە نیە، لە ئێمەوەیە، لە ئێمەی بێ عەقڵ‌و شێتەوە، لە سلێمان پاشاكان‌و زۆرباكانەوەیە.

دوای كەمێك بەڕكەوە وتی:

–گوناه لە ئێمەیشەوە نیە، ها؟ تەنیا كەسێك گوناهبارە، ئەویش بێ عەقڵ‌و شێتێكی گەورەیە، سلێمان پاشای گەورە، بێگومان دەزانیت مەبەستم كێیە؟

لە وەڵامیدا وتم: ئەگەر هەبێت، ئەی ئەگەر نەبێت چۆن؟

–ئەگەر نەبێت ئەوا ئێمەیش هیچ قسەیەكمان نیە.

ماوەیەكی زۆر بێ دەنگ هەنگاوی فراوانمان نا، بێگومان زۆربا بیری سەیرو سەمەرەی بەمێشكا دەهات، چونكە بەردەوام دارەكەی دەستی بەسەر وردە بەردی ڕێگاكەدا دەكێشاو تفی لەزەوی دەكرد، كوت‌و پڕ ڕووی تێ كردم‌و وتی:

–باپیرم خوا لێی خۆش بێت، باش ژنی دەناسی، ئەو بێچارەیە زۆری ژن خۆش دەویست، بەڵام ئەوان لە ژیانیدا زۆریان بەڵا بەسەر هێنا بوو، بەمنی دەوت: ((ئالكسیس، كوڕەژیكەلەكەم، ئەگەڵ ئەوەدا كە هیوای خۆشیت بۆ دەخوازم ئامۆژگاریەكیشت دەكەم، هەرگیز بڕوابەژن مەكە، خوای گەورە كەویستی ژن لەپەراسووی ئادەم دروست بكات شەیتان خۆی خستە شێوەی مارەوەو هەرتەواو لەكاتی خۆیدا پەلاماری‌داو پەراسوەكەی دزی‌و هەڵات، خوا دوای كەوت‌و گرتی، بەڵام شەیتان لەنێو پەنجەكانی خواوە تێی فرتاندو بۆی دەرچوو، تەنیا شاخەكانی بەدەستی خواوە مانەوە، خوا فەرمووی: (( كەیبانووی

باش تەشیشی نەبێت دەتوانێت بەکەوچك بڕێسێت. زۆرباشە، منیش ژن لە شاخی شەیتان دروست دەکەم))

ئیتر بۆ بەدبەختی ئێمە، ئالکسیسی بچکۆلەم، خوا ئەم کارەی کرد، بۆیە ئێستا ئیش و کاری ئێمە لەگەڵ شەیتاندایە، دەست بۆ هەر شوێنێکی ژن بەریت، بێ جیاوازی، ئەوە دەست بۆ شاخی شەیتان دەبەیت، خۆت لەژن دوور بخەرەوە، کوڕەکەم، هەر ژنیش بوو سێوی بەهەشتی دزی و لەناو سنگیا شاردیەوە، ئێستا ئەو نەفرەت لێ کراوە بەو شێوانەوە خۆی بادەدا، تۆیش، خواگرتوو ئەگەر لەوسێوانە بخۆیت عەمرت کورتە، ئەگەر لێیشی نەخۆیت هەر عەمرت کورتە، ئیدی چ ئامۆژگاریەکت بکەم، کوڕەکەم؟ ئێستا چیت پێ خۆشە بیکە))

ئەمە ئەو ئامۆژگاریانە بوو کە خوا لێخۆشبووی باپیرم کردمی، بەڵام من عاقڵ نەبووم و بەقسەم نەکردو هەمان ئەو ڕێگایەم گرتە بەر کە ئەو پیایدا تێ پەڕیبوو، بۆیە کەوتمە ئەم ڕۆژەی کەتیایدا دەمبینیت.

خێرا لە گوندەکە دەرچووین، مانگە شەوێکی بەتەم بوو، بیر لەوە بکەرەوە سەرخۆش بیت، بڕۆیتە دەرێ بۆ ئەوەی هەوایەك هەڵمژیت و لەپڕا ببینیت دنیا گۆڕاوە! ڕێگاکان ببوونە ڕووباری شیر، چاڵ و چۆڵیەکان بەقسڵ پڕ کرابوونەوەو چیاکانیش بەفر داپۆشیبوون، دەست و دەم و چاوو گەردنی تۆیش وەك سکی گوڵ ئەستێرە بدرەوشێتەوەو مانگیش وەك میدالێکی خڕو سەیر بەسنگتەوە هەڵواسرابێت.

ئێمە بێدەنگ بووین و بەپەلە دەڕۆیشتین، مەستی مانگە شەوو شەراب بووین و هەستمان بەوە نەدەکرد کەپێمان بەسەر زەویەوەیە، لەدوامانەوە، لەگوندە نوستوەکەدا، سەگەکان کەوتبوونە سەربان، تەماشای مانگیان دەکردو نائومێدانە دەیان لوراند، ئێمەیش، بێ هیچ، لەخۆمانەوە حەزمان دەکرد مل درێژ بکەین و بکەوینە لورەلور.

بە بەردەم باخی بێوەژنەکەدا تێ پەڕین، زۆربا وەستا، شەراب و خواردنی چاك و مانگە شەو سەریان گەرم کردبوو، ملی درێژ کردو بەدەنگە ناقۆلاکەی کە لەزەڕینی چوارپێ دەچوو دەستی بەخوێندنەوەی شیعرێکی بێ ئەدەبانە کرد، کە هەر خۆی لەوێداو بەو حاڵی مەستیەوە دابنابوو،

ئەو لەش و لارە جوانەتم

لەسەرەوە تاپێت خۆش دەوێت

مار ماسی زیندو قوت دەداتو، بەزەبرێك لەپەل و پۆی دەخات

دیسان وتی: ئەمیش یەکێکە لەشاخەکانی شەیتان، دەی بابڕۆین سەرۆك.

کە گەیشتینە کوختەکە بوولێلّی بەیان بوو، من شەکەتو ماندو خۆم خستە سەر تەختە خەوەکە، زۆربا سەرو چاوی شتو ئاگری لە وەجاخەکەدا کردەوەو قاوەی لێنا، لەبەردەرگاکە بەچیچکانەوە دانیشت، جگەرەیەکی پێ کردو کەوتە دووکەڵ کردن، کڕو هێور چاوی لەدەریاکە بڕیو، دەمو چاوی گیرو لەبیر کردنەوەدا بوو، هەر لەتابلۆیەکی ژاپۆنی دەچوو کە من حەزم لێدەکرد. لەو تابلۆیەدا زاهیدێك چوار مشقی دانیشتوەو جبەیەکی ڕەنگ نارنجی لەبەردایە، دەمو چاوی وەك دارێك بەجوانی لەسەری هەڵکەنرابێتو باراناو ڕەشی کردبێت دەبریسکێتەوە، ملی ڕێك ڕاگرتووە، زەردەخەنەیەك بەسەر لێویەوەیەو بێترس لە شەوێکی تاریکدا لەبەردەمی خۆی ڕاماوە.

لەژێر تریفەی مانگەکەدا لەزۆربام دەڕوانی، دەست خۆشی ئەوەم لێ دەکرد کەچەند بێ پەرواو بەسادەییە تایبەتیەکەی خۆیەوە لەگەڵ دنیادا گونجابوو، چۆن لەش و گیانی ببوونە سەمفونیایەك و لەگەڵ یەکتردا ڕێك کەوتبوون، هەموو شتەکان، ژن و نان و ئاوو گۆشت و خەو، زۆر بەشادیەوە لەگەڵ لەشیدا تێکەڵ دەبوون و دەبوون بەزۆربا، من لە هەموو تەمەنما کونجانێکی واخۆشەویستانەم لەنێوان مرۆڤێك و دنیادا نەدیبوو.

ئێستا مانگ و خشت و، بەڕەنگێکی سەوزی کاڵەوە بەرەو ئابوون دەچوو، جوانی و بێگەردیەکەیشی وابەسەر دەریادا کشابوو کە باس ناکرێت.

زۆربا جگەرەکەی فڕێدا، دەستی درێژ کردو بەناو سەبەتەیەکدا کەوتە گەڕان، دەزوو بەکرەو پارچە تەختەی وردی دەرهێنا، چرا زەیتیەکەی داگیرساندو جارێکی دی بۆ دروستکردنی دەزگای تەلەفریکەکە دەستی کردەوە بەتاقیکردنەوەی، خۆی بەسەر ئەویاریە سەرەتاییەدا چەماند بوەوەو لەحسابێکی بەگرێ و گۆڵدابوو،، چونکە زوو زوو دەکەوتە سەر خوراندن و جوێن دان، لەپڕا تاقەتی نەما، شەقێکی لەتەل و دەزگاکە هەڵداو بەسەر یەکدا ڕوخاندنی.

-١٢-

خەوبردبوومیەوە، کەهەستام زۆربا ڕۆیشتبوو، هەواکەی ساردو من هیچ ئارەزووی هەستانم نەدەکرد، دەستم بۆ سەر ڕەفەکەی ژوور سەرم درێژکردو ئەو کتێبەی خۆشم دەویستو لەگەڵ خۆمدا هێنابووم دام گرت! شیعرەکانی مالارمیە[٩١] بوو، هەروا بەڕێکەوت شوێنێکم کردەوەو لەسەر خۆ دەستم بە خوێندنەوەی کرد، کتێبەکەم داخست، دیسان کردمەوەو دوایی لام برد، ئەو ڕۆژە، یەکەمجار بوو لە هەموو تەمەنما ئەو شیعرانەم وا وشكو بێ تامو بۆنو دوور لەجەوهەری ئینسانی بێتە بەرچاو، وشەگەلێکی بێ ڕەنگو بۆو بێ ناوەرۆك بوون، وەك ئاوێکی پاكو ڕووتی بێ میکرۆب، بەڵام بی ئەوەی مادەی خۆراکی تیا بێت، واتا بێگیان. وەك هەر وەك ئەو ئاینانەی کە هیچ کاریگەریەکی داهێنانیان تیانەماوەو، خواکان لە ئەنجامدا بونەتە شتێك بێجگە لە ئەنگێزەی شاعیرانە یان ئەو نەخشو نیگارانەی کە خەڵوەتگای مرۆڤو دیواری پێ دەڕازێننەوە هیچی ترنین، ئەم شیعرانەیش وایان لێ هاتبوو، ئەو خەونو خولیایانەی پڕن لە خاكو تۆو ببوونە یاریەکی فیکری کە چ خەوشێکی نیە، بەڵام بەهەندەسەیەکی هەوایی مامۆستایانەو ئاڵۆز داخراوبوون.

دیسان کتێبەکەم کردەوەو دەستم بەخوێندنەوە کرد، بۆ ئەم شیعرانە بەدرێژایی ئەم هەموو ساڵە منیان ئەفسوناوی کردبوو؟ ئەمانە شیعری پەتین، ژیان لەم شیعرانەدا بوەتە یاریەکی ڕوونو شەفاف کەتەنانەت بەئەندازەی دڵۆپێك خوێن نرخو سەنگی نیە، ڕەگەزی مرۆڤ لێوان لێوە لە ئارەزووی ساختەو ناپاکی، لەخۆشەویستی گۆشتو هاوار، دەشێت ئەم تێکەڵەیە پوخت بکرێتو ببێتە بیرێکی ڕووت، لە وەجاخی بەرزی رۆحدا بە شێوەیەکی کیمیاوی لە حاڵەتی مادە دەربچێتو بتوێتەوە.

---

[٩١] ئیستیڤان مالارمیە Malarme شاعیری ناوداری فەرەنسا ١٨٤٢-١٨٩٨ شیعری مالارمیە نموونەی کورتیو پوختیو ڕۆشنگەری ئەدەبیاتی سەدەی بیستە. ز-ف

ئەو شتانەی سەردەمانێك بەتەواوی منیان ئەفسوناوی کردبوو، چۆن ئەو سەر لەبەیانیە، لەبەرچاوما بوونە سیحرێکی چاوخەڵەتێنو تەناف بازی! هەمیشە وابوە، کە شارستانیەتێك هەرەس دێنێت ئەنجامەکەی وادەشکێتەوە، خەمو خولیاکانی مرۆڤ دەبن بەسیحربازیەکی وەستایانەو، بەشیعری ڕووتو، بەمۆسیقای ڕووتو بیری ڕووت، دوا مرۆڤ کە خۆی لەکۆتی هەموو جۆرە بیرو هەموو جۆرە خەونێك ڕزگار کردوەو، ئیتر نەهیوای بەشتێکەو نەلەهیچ دەترسێت، بەچاوی خۆی ئەو قوڕە دەبینێت کەلێی دروست کراوە، کە چۆن بوە بەرۆحو بۆ ئەو رۆحەیش ئیتر گڵێك نەماوە کە ڕەگی تیادابکوتێتو خۆراکی لێ وەربگرێت.

دوا مرۆڤ ئیدی خاڵی بۆتەوە، نەتۆوێکی هەیە، نەئەنگێزەیەكو نە خوێنێك، هەموو شتێك بوە بە وشەو وشەیش گۆڕاوە بۆ ئەفسونێکی بەئاوازو دوا مرۆڤ لەوەزیاتر دەڕواتو لە قوڵایی تەنیایی خۆیدا دادەنیشێتو مۆسیقا بەسەر موعادەلاتی ماتماتیکدا دابەش دەکات.

من ڕاپەڕیمو هاوارم لێ هەستا کە: ((بودا هەمان ئەو دوا مرۆڤەیەو مانای نهێنیو سەیری ئەو لەمەدایە، بودا ئەو– گیانە ڕووتە یە کە خۆی لە هەموو شت خاڵی کردۆتەوە، خاڵی بوون لە وجودی ئەودایەو ئەو هەر خودی خاڵیە کە هاوار دەکات: ناوەوەی خۆتان خاڵی بکەن، ڕۆحی خۆتان خاڵی بکەن، دڵی خۆتان خاڵی بکەن، هەرجێگایەك کەئەو پێی پیابنێت ئیتر لەوێدا ئاوێك ناڕواتو گیایەك سەوز نابێتو منالێك لەدایك نابێت)).

لەگەڵ خۆمدا بیرم کردەوە: ((دەبێت بەتەرخان کردنی ووشەی ئەفسوناوی، ئەو هێزانەی لە سەروی مرۆڤەوەن گەمارۆیان بدەم، دەبێت داوای هاوکاری لە ئاهەنگی ئەفسوناوی ڕژێمی سروشت بکەمو سیحرێکی بۆ بخوێنمو ئەو لە قوڵایی دڵی خۆم دەربکێشم، دەبێت تۆڕێکی وێنە بەڕویدا بدەمو ئەو بگرمو خۆم ڕزگار بکەم))

نووسینی (بودا) ئیدی یاریەکی ئەدەبی نەبوو، شەڕی مەرگو ژیان بوو لەگەڵ هێزێکی تێکدەری گەورە کە لە وجودی مندا بۆسەی دانابوو، شەڕی دووبەدوو، شەڕ لەگەڵ (نای

گەورە)[٩٢] دا کە دڵی دەخواردمو رزگار بوونی رۆحم بەسترابوو بە ئەنجامی ئەو شەڕە دوو بەدوەوە.

بەشادیو لەسەر سوربونەوە بەرگە دەست نووسەکەی بودام هەڵگرت، گەیشتبوومە ئامانجو ئیتر دەمزانی تیر بۆ کوێ دەهاوم، دوا مرۆڤی کامڵ بودایە، ئێمە هێشتا لەسەرەتای رێگادابن، نەتەواو خواردوومانەو نەخواردومانەتەوەو نەخۆشەویستیمان کردووە، ئێمە هێشتا نەژیاوین، ئەم پیرەمێردە لاوازو تەنگە نەفەسە زۆر زوو هاتۆتە سەردانمان، پێی بڵێ هەرچی زوترە بڕوات بەلای کاری خۆیەوە.

هەر ئاوا لەگەڵ خۆمدا دەدوامو دەستم بەنووسین کرد، بەلام نا، نەم دەنووسی، ئیدی ئەمە نووسین نەبوو: شەڕێکی ڕاستەقینە بوو، ڕاوێکی بێ بەزەییانەبوو، گەمارۆو تەڵەیەك بوو بۆ دەرکردنی ئەو گیاندارە لەلانەکەی، (لەڕاستیا هونەر جۆرە سیحرێکی رۆحە بۆ چوونە ناو لەشەوە، هێزە شەڕئەنگێزو خوێن ڕێژەکانی ناوەوەی ئێمە هۆیەکی شوومن بۆ کوشتنو وێران کردنو ڕقو شەرەف شکاندن، لەوکاتەدایە کە هونەر بە ئاوازە خۆشەکەیەوە دێتو لەدەست ئەو ئەهریمەنانە ڕزگارمان دەکات.

من بەدرێژایی ئەو رۆژە نووسیمو لێکم دایەوەو خەباتم کرد. کەشەو داهات شەکەتو ماندوبووم، بەلام هەستم دەکرد پێشرەویم کردوەو گەلێك لەسەنگەرەکانی پێشەوەی دوژمنم داگیرکردوە، ئێستا پەرۆشی هاتنی زۆربام، تا بخۆمو بنومو توانایەکی تازەم تێ بگەڕێت، بۆ ئەوەی جارێکی تر لەبەرەبەیانەوە دەست بەشەڕەکە بکەمەوە.

کە زۆربا گەیشت دنیا تەواو تاریك ببوو، ڕووی کرابوەوە، لەدڵی خۆمدا وتم: ((ئەویش دەستی کەوتوە، بەڵێ، ئەویش دەستی کەوتوە))و چاوەڕێم کرد.

پێش چەند رۆژێك لە کاتی ناجۆریو بێ حەوسەڵیی خۆمدا پێم وتبوو:

-زۆربا، پارەمان لەتەواو بووندایە، هەرچیەکت دەوێت زوو بیکە، ئەم تەلەفریکە بخە ڕێ، بۆ ئەوەی ئەگەر کاری خەڵوزەکەمان سەری نەگرت هیچ نەبێت پەنا بەرینە بەردارو تەختەکە، ئەگەر وانەکەین حسابمان فت دەبێت.

---

[٩٢] مەبەست لە(ناوی گەورە) ڕەت کردنەوەی موتڵەقە.

زۆربا بەدەم سەر خوراندنەوە پرسی بوی:

—پارەمان لەتەواو بووندایە سەرۆك؟ ئەمە شتێکی خراپە.

—بەڵێ، زۆربا، تەواو بوو، چیمان هەبوو خەرجمان کرد، شتێك بکە، ئەم تاقی کردنەوەی تەلەفریکە گەیشتە کوێ؟ هێشتا هەر هیچ؟.

زۆربا بێ وەڵامدانەوە سەری داخستبوو، ئەو شەوە هەستی بەتەریقی کردبوو لەبەرخۆیەوە هەر ورتە ورتی بوو: ( (ئەی تەلەفریکی نەعلەتی، ئاخری هەر بەدەستت دێنم)) وا ئەمشەویش بەدەمو چاوی گەشەوە گەڕایەوە، لە دوورەوە هاواری کرد:

—پەیام کرد، سەرۆك، ئاخری ئەو تەرازووکردنەم پەیدا کرد، نەعلەتیە دەخزاو خۆی بەدەستمەوە نەدەدا، بەڵام من بوارم نەداو گرتم.

—کەواتە دەی، زوو بەڕێی بخە، زۆربا، پێویستت بەچیە؟

—سبەینێ زوو دەبێت بڕۆم بۆ شارو پێویستیەکان بکڕم، وەك تەلی ئەستووری ئاسنو بەکرەو بۆڵبرینو بزمارو قولابو شتی دی. ئەوەندەیش زوو بگەڕێمەوە تۆ بەڕۆیشتنەکەی مت نەزانیبێت.

زوو ئاگری کردەوەو خواردنی دروست کرد، بەخۆشیەوە خواردمانونۆشیمان، بەجووتە ئەو رۆژە کاری باشمان ئەنجامدا بوو.

بەیانی رۆژیی دوایی، من تا گوندەکە لەتەکیا چووم، لەڕێگا وەك کەسانێکی عاقڵو کارامە لەبارەی دەرهێنانی خەڵوزی بەردەوە قسەمان دەکرد. لەلێژیەکەدا زۆربا لەبەردێك هەڵکەوت، بەردەکە بەرەو خوار غل بوەوە، زۆربا وەك لە تەمەنیا یەکەم جاری بێت دیمەنێکی وا سەیر بێتە بەرچاوی سەرسام وەستا، ڕووی‌تێ کردمو لێی ڕوانیم، لەتەماشاکردنەکەیدا هەستم بەکەمە ترسێك کرد، پاشان وتی:

—بینیت، سەرۆك؟ بەردەکان لەنشێویدا گیانیان وەبەردێت.

هیچم نەوت، بەڵام هەستم بەشادمانیەکی زۆر کرد، کەوتمە بیرکردنەوەوە.

هەر بەم شێوەیە کە خەیاڵ پەروازی گەورە بانگەشەی وەحی دەکاتو شاعیرانی مەزنیش دەڵێی هەموو شتێك بۆیەکەمین جار دەبینن، هەموو بەیانیەك دنیایەکی تازە لە بەرانبەریاندا دەبینن کە خۆیان دروستیان کردوە))

دنیا بۆ زۆربا، وەك مرۆڤە سەرەتاییەکان، خەونێکی گران و چڕبوو، ئەستێرە بەسەریا دەکشێت، دەریا بەلاچاویا دەکوتێت، ئەویش بی ئەوەی عەقڵ لێی بشێوێنێت، خاك و ئاوو گیاندارو خوای دەبینی.

هەواڵەکە بە هورتانس خانم گەیشتبوو، بەسوراوو سپیاوێکی خەست و بەنیگەرانیەوە لەبەردەم میوانانەکەیدا چاوەڕێی دەکردین، بەجۆرێك خۆی لە تەل دابوو دەت وت شەوی شەممەیەو بەرەو زەماوەندێکی میللی دەچێت، هێستریش لەبەردەگا ئامادەبوو، زۆربا خۆی هەڵدایە سەرپشتی و هەوسارەکەی لەدەست گرت.

پیرە فریشتەی دەریا بەشەرمەوە لێمان نزیك کەوتەوە، دەستە بچووك و گۆشتنەکەی خستە سەر سنگی ئەو ئاژەڵە، وەك بیەوێت خۆشەویستەکەی لەو سەفەرە پەشیمان بکاتەوە، لەسەر پەنجەی پێی خۆی بەرزکردەوە، بەکریشمەو نازەوە وەك کۆتر گماندی و وتی:

—زۆربا ، زۆربا

زۆربا ڕوی لێ وەرگێڕا، چونکە حەزی بەوە نەبوو لەو ناوەڕاستی ڕێگایەدا گوێ بۆ قسەی هەلەق مەلەقی عاشقانە هەڵخات. ژنەی داماو لەتەماشاکردنەکەی زۆربا ترسی لێ نیشت، بەڵام دەستی پڕ لەپاڕانەوەو دروودی هێشتا بەسەر سنگی هێسترەکەوە بوو.

زۆربا خەم ساردانە لێی پرسی: چیت گەرەکە؟

لەژێر لێوەوە وەك لێی بپاڕێتەوە وتی:

ئاگات لێم بێت، زۆربا، ئاگات لێم بێت و لەیادم مەکە.

زۆربا بێ ئەوەی وەڵامی بداتەوە هەوسارەکەی ڕاوەشاندو هێسترەکە ڕۆشت، من هاوارم کرد:

—سەفەری خێرت بێت، زۆربا، تەنیا سێ ڕۆژ، گوێت لێیە؟ تەنیا سێ ڕۆژو بەس.

ئاوڕی دایەوەو دەستە گەورەکانی ڕاوەشاند. پیرە فریشتەی دەریا دەگریاو فرمێسکەکانی بەناو سپیاوەکەی دەم و چاویا هێڵیان دروست دەکرد، زۆربا بانگی کرد: بەڵێنت دەدەمێ، سەرۆك، خوات لەگەڵ.

پاشان لەنێو دار زەیتونەکاندا لەچاو ون بوو.

هورتانس خانم دەگریاو تەماشای ئەو پارچە قوماشە سوور باوەی دەكرد كە ئەم داماوە خۆی خستبوویە سەرپشتی هێسترەكە تا ئازیزو خۆشەویستەكەی بەڕەحەتی لەسەری دابنیشێت، دوور بەدوور، لەنێو گەڵای زیوینی زەیتونەكانەوە بریسكەی دەهاتو دەكوژایەوە، دوای چركە ساتێك ئەویش ون بوو، هورتانس خانم تەماشای ئەملاولای خۆی كرد، دنیا چۆڵ بوو.

* * *

ئیتر من نەگەڕامەوە كەنار دەریا، بەڵكوو بەرەو كێوەكە چووم، كە گەیشتمە سەر لارێیەكی هەوراز گوێم لەدەنگی شەیپۆڕێك بوو، پۆستەچی ناوچەكە هاتنی خۆی بۆ گوندەكە دەگەیاند، هەربەدەم دەست ڕاوەشاندنەوە هاواری لێ كردم: سەرۆك.

نزیك كەوتەوەو بەستەیەك ڕۆژنامەو گۆڤاری ئەدەبیو دوونامەی دامێ، زوو یەكێك لەنامەكانم خزاندە گیرفانمەوە تا لە خۆر ئاوابووندا بەبیرێكی ئاسودەوە بیخوێنمەوە، دەم زانی كێ ئەو نامەیەی بۆ ناردووم، بۆ ئەوەی خۆشیەكەم زیاتر دەوام بكات حەزم كرد درەنگتر نامەكەی بچێژم. نامەكەی دیم بەخەتە درشتو ناخۆشەكەیو پەپوولە بێگانەكەیدا ناسیەوە، نامەیەك بوو لە ئەفریقاوە، لە چیاكانی نزیك بەتانگانیكا[٩٣] وە، لەیەكێك لەهاوڕێ دێرینەكانی قوتابخانەمەوە كەناوی كارایانیس[٩٤] بوو، كارایانیش لاوێكی سەیر بوو، توورەو تڕۆ، ددانی زۆر سپی بوون، یەكێك لە كەڵبەكانی وەك ددانی بەراز هاتبوە دەرێ، هەرگیز لەسەرخۆ قسەی نەدەكردو هەر هاواری بوو، گفتو گۆی نەبوو، شەڕی دەكرد، هەر بەلاوی كریتی نیشتمانی جێ هێشتبوو، لەوێ قەشە بوو دەرسی لاهوتی دەوتەوە ، لەگەڵ كچێكی قوتابی خۆیدا سەرو سەودایەك پەیدا دەكات، ڕۆژێك لە دەشتێكدا، لەكاتی یەكتر ماچ كردندا گرتبوویانو كردبوویانە هەرا، ئیدی هەر ئەوڕۆژە مامۆستای لاو بەرگی قەشەییەكەی فڕێدەداو سواری كەشتی دەبێت، بۆ لای مامێكی دەڕواتە ئەفریقا، لەوێ سەرومڕ دەست بەكار دەكات، كارخانەیەكی گوش دروست دەكاتو پارەیەكی باشی دەست دەكەوێت. جار جارە نامەی بۆ دەنوسیمو داوای لێ دەكردم بڕۆم

---

[٩٣] Tanganika دەریاچەیەكە لە خۆرهەڵاتی ئەفریقادا، لەنێوان زامبیاو تانزانیاو كۆنگۆدا

[٩٤] Karayanis

بۆ لای و شەش مانگێك لای بمێنمەوە، من هەرجارێك پاکەتی نامەکەیم دەکردەوە، تەنانەت پێش خوێندنەوەیش، هەستم دەکرد لە چەند لاپەڕەیەکی نامەکەدا کە بەدەزوو پێکەوە دوورابوون ڕەشە بایەك هەڵدەکات و مووی سەرم ڕاست ئەوەستێنێت، من هەمیشە بڕیاری ئەوەم دەدا بۆ بینینی بچمە ئەفریقا، کەچی نەدەچووم.

لەلارێکە دوورکەوتمەوە، لەسەر بەردێك دانیشتم، نامەکەم کردەوەو کەوتمە خوێندنەوەی:

((تۆ.. ئەی ئەوکەسەی وەك گوێچکە ماسی بەتاوێرە بەردەکانی یۆنانەوە نووساویت، کەی بڕیاری هاتنە لای من دەدەیت؟ تۆیش وەك گشت یونانیەکانی دی نوقمی مەیخانەو باڕەکانیش، هەروەك چۆن لە کتێبەکانتا، ڕەوشت و دابونەریت و بیروباوەڕە بەناوبانگەکەتدا هەر ئاوا نوقمیت.

ئەمڕۆ یەك شەممەیەو من چ کارێکم نیە، لەماڵ و موڵکی خۆمدام و بیر لە تۆ دەکەمەوە، خۆر وەك کوورە دەستوتێ و ماوەیەکە دڵۆپێك باران نەباریوە، لێرە کە لە مانگەکانی ئاپریل و مەی و ژوندا باران دەبارێت لافاو هەڵدەستێت.

((تاق و تەنیام و ئەمەیشم پێ خۆشە، یۆنانی لێرە کەم نین، (بۆ جێگایەك ماوە ئەو کرمانە خۆیانیان تێ نەخزاندبێت؟) بەلام من حەز بەبینینیان ناکەم، من بێزیان لێ دەکەمەوە، چونکە ئێوەی — هاو وڵاتیانی بەرێز! خوابتان برێت—تەنانەت لێرەیش گەڕو گولیەکەی خۆتان، یەعنی هەوەسە سیاسەتەکەتان بەدیاری بۆناردوین، سیاسەت یۆنانی داوەشاندوە، بێگومان قوماربازیو نەخوێندەواری و گوناهەکانی سێکسیش هەر هەیە.

((من رقم لەئەوروپاییەکانە، بۆیە لێرە، لەچیاکانی ئوزومبارا (ڤاسامبا)[٩٥] دا سەرگەردانم، لەئەوروپاییەکان بێزارم، بەلام لەپێش هەموویانەوە لەیونانیەکان و لەهەر کەسێك کە یۆنانیە بێزدەکەمەوە، ئیدی هیچ کاتێك پێ نانێمە یونانەکەتانەوە، من لێرە دەمرم، هەر لە ئێستاوە گۆڕێکم لەبەردەم کوختەکەمدا بەسەر چیایەکی تەریکەوە دروست

---

[٩٥] Usumbara (Vassamba) ناوی کۆنی پایتەختی کۆماری بوروندیە کە دەکەوێتە ئەفریقای ناوەندەوە، ناوچەیەکی بەرزی کشت و کاڵیە، ئوزومبارا ئەمڕۆ بە Burmbara بەناو بانگە. و - ف.

کردوە، تەنانەت کێلی گۆڕەکەیشم ئامادەکردوەو خۆم بەپیتی گەورە لەسەریم هەڵکەندوە:

گۆڕی یۆنانیەك

کە یۆنانیەکانی خۆش ناوێت

((کە بیر لەیۆنان دەکەمەوە خەریکە لەپێکەنیندا شەق دەبەم، تف ئەکەم، جوێن دەدەمو دەگریم، من بۆیە بەیەکجاری نیشتمانم بەجێ هێشت، کە ئیدی نەهیچ کەسێکی یۆنانی ببینمو نەهەرشتێك کەڕەنگو بۆی یۆنانی پێوەبێت. من هاتمە ئێرەو چارەنووسی خۆیشم لەگەڵ خۆمدا هێناوە–نەك چارەنووس منی هێنابێتە ئێرە، چونکە مرۆڤ هەرچی بیەوێت دەیکات–بەڵێ، من چارەنووسی خۆمم هێنایە ئێرە، کارم کردو ئێستا وەك کۆیلەیەك کاردەکەم، ئارەقەم ڕشتوەو هێشتا چین چین ئارەقەم لێ دەڕژێت، لەگەڵ خاكو باو بارانو لەگەڵ کرێکاری ڕەشو سووردا لەجەنگدام.

((هیچ جۆرە دڵخۆشیەکم نیە، تاقە شتێك نەبێت، ئەویش ئەوەیە کە بەلەشو گیانم کاردەکەم بەتایبەتی بەلەشم، حەزم لە ماندو بوونە، ئارەقە برێژمو گوێم لەقرچە قرچی ئێسکەکانم بێت، نیوەی ئەو پارەیەی بەدەستی دێنم چۆن دڵم بیەوێت تەخشانو پەخشانی دەکەم، من بەندەی پارەنیم، بەڵکوو پارە بەندەی منە، من بەندەی کارمو شانازی پێوەدەکەم ، دار ئەبڕمو بۆ ئەم کارە قەرار دادێکم لەگەڵ ئینگلیزەکاندا بەستوە، کارگەیەکی گوش دروست کردنم هەیە، ئێستا لۆکەیش دەچێنم، دوێنێ ئێوارە، دووتیرە لەو کرێکارانەی لای من، تیرەی ڤایایی[٩٦] و ڤانگۆنی[٩٧] لەسەر ژنە سۆزانیەك بوو بەشەڕیان، ئیتر دەمارو غیرەتی بێ عەقڵیان جوولابوو، دەبینیت، تەواو وەك یۆنانەکەی ئێوە! بە جوێنو هاوارو دارو گۆپاڵ بەرببوونە یەکدیو خوێن فوارەی بەستبوو، نیوەی شەو ژنان هاتنو بەشینو شەپۆر لەخەویان هەستاندم، بۆ ئەوەی بچم داوەریان بکەم، من ڕقم هەستاو هەموویانم لەدەرنا، بۆ دۆزەخ، پاشان ڕەوانەی لای پۆلیسی ئینگلیزیم کردن،

---

٩٦ Vayai

٩٧ Vanguni

بەڵام ئەوان بەدرێژایی ئەو شەوە لەبەرماڵەکەمدا مانەوەو دەنووزانەوە، لەبەرەبەیاندا لەماڵ هاتمە دەرێ‌و پێکم هێنانەوە.

((سبەینێ کە دووشەممەیە، بەیانی زوو لە چیاکانی ئوزومبارا بەنێو دارستانی چڕو کانیاوی ساردو سەوزەزاری هەمیشەییدا سەردەکەوم، چاکە، ئەی یۆنانیی بەد، ئەی تۆ کەی لەو بابلە نوێیە، لەو ((سۆزانیەی کەبەسەر گەورە ئاوەکانەوە هەڵنیشتوەو هەموو پاشاکانی گۆی زەوی زینای لەگەڵدا دەکەن))- مەبەستم ئەوروپایە- دڵت هەڵدەکەنرێت؟کەی دێیت تا پێکەوە بەو چیاو چۆڵ‌و هۆڵ‌و دڵفرێننانەدا سەربکەوین؟

من لەژنێکی ڕەش پێست منالێکم هەیە، کچە، دایکیم دەرکردوە، چونکە بەئاشکراو بەڕۆژی نیوەڕۆ، لەژێر هەر دارێکی سەر سەوزا خیانەتی لێ دەکردم، منیش بەتەنگ هاتم‌و دەرم کرد، بەڵام کچۆڵەکەمم هێشتۆتەوەو ئێستا دووساڵەیە، پێی گرتوەو کەوتۆتە قسەکردن، من یۆنانی‌ی فێردەکەم، یەکەمین ڕستە کەفێرم کردوە ئەمەیە: ((تف لە سەرو چاوت ئەی یۆنانی پیس)).

((بێژوە لە خۆم دەچێت، تەنیا لووتە پان‌و پۆڕەکەی دەچێتەوە سەر دایکی، من خۆشم دەوێت، وەك چۆن مرۆڤ سەگ‌و پشیلەکەی خۆی خۆش دەوێت. تۆیش ئاخێزێك بکەو وەرە ئێرە، ژنێکی ئوزومبارایی بێنەو با کوڕێکت ببێت، ئەوسا، ڕۆژێك لەڕۆژان لێکیان مارە دەکەین، بۆ ئەوەی هەم ئێمە شادمان بین‌و هەم ئەوان..

((خوات لەگەڵ، تۆ دەستی شەیتانت لەگەڵداو من دەستی با، ئەی هاوڕێی ئازیزم))

کارا یانیس

نۆکەری شەیتان سیفەتی دەرگای خوا

هەر بەکراوەیی نامەکەم لەسەر ئەژنۆم دانا، دیسان ئارەزوویەکی بەکوڵ جۆشی دام کە بڕۆم، نەك لەبەر ئەوەی پێویستم بەڕۆیشتن هەبێت، من لەو کەناری کریتەدا شادبووم‌و هەستم بەخۆشی‌و ئازادی دەکرد، لەهیچم کەم نەبوو، بەڵام ئارەزوویەکی زۆر هەمیشە لەناوەوەی دەخواردم، ئارەزووی ئەوەی تا نەمردووم چەند بتوانم زیاتر زەوی‌و دەریا ببینم‌و هەستیان پێ بکەم.

لەجێگاکەم هەستامو ڕاکەمم گۆڕی، یەعنی لەبری ئەوەی بەچیاکەدا هەڵزنێم بەپەلە بەرەو کەنار بوومەوە. لەگیرفانی سەرەوەی چاکەتەکەمدا هەستم بەنامەیەکی تر دەکردو ئیدی نەم دەتوانی دان بەخۆمدا بگرم، لەگەڵ خۆمدا دەموت: ((ئەم خۆشیە شیرین‌و پڕلەدڵە ڕاوکێیە تەواو دەمی پڕکردووین لە ئاو)) کە گەیشتمە کۆختەکەم ئاگرم کردەوە، چام لێناو نان‌و کەرەو پرتەقاڵ‌و هەنگوینم خوارد، پاشان جلەکانم دەرهێنا، لەسەرتەختە خەوەکە ڕاکشام، زەرفەکەم هەڵپچڕی‌و دەستم بەخوێندنەوەی نامەکە کرد:

((مامۆستاو شاگردی تازەم سڵاو:

((من لێرە، سوپاس بۆ (یەزدان) کارێکی گەورەو قورسم لەسەرە، —من کە وشەی سامناکی ((یەزدان))م لەنێو دووکەوانەی بچووکدا داناوە (وەك چۆن جانەوەرێکی دڕندە لەپشت شیشە ئاسنینەکانی قەفەزەوە دادەنێن) بۆ ئەوەیە کە تۆ لەگەڵ کردنەوەی نامەکەدا تووڕە نەبیت، بەڵێ، من سوپاسی (یەزدان) دەکەم، کارێکی گەورەم کردوە، لێرە، لە ڕوسیای باشورو لەقەوقازدا نیو ملیۆن یۆنانی لەمەترسیدان، گەلێکیان بێجگە لەزمانی تورکی یان روسی زمانی تر نازانن، بەڵام دڵیان شێل گیرانە بەیۆنانی دەدوێت، ئەمانە هاوخوێنمانن، ئەوەندە بەسە کە لەبروسکەی چاوی تیژو سووسەکەریان، لەزەردەخەنەی شەیتانانەوەو لێوی شەهوانیان، سووسەکەریان، لەوەی کەتوانیویانە لێرە، لەم وڵاتەپان‌و بەرینەی روسیادا ببنە گەورەو ئاغاو موژیك[٩٨] نۆکەریان بکات. ئەمانە ببینیت‌و هەست بکەیت کە بەڕاستی هەموو ئەمانە نەوەی. ڕاستەقینەی ئولس[٩٩] ی خۆشەویستی تۆن، ئەوسا مرۆڤ خۆشی دەوێن‌و ناهێڵێت لەناو بچن.

---

[٩٨] Moajik جوتیاری روسی کەبەکرێ لەکێڵگەدا کاردەکەن.

[٩٩] Uiysse یان ئودی سەیوس قارەمانی یۆنان‌و پاشای ئەفسانەیی (ئیتاك) کەمێردی (پنلوپ)و باوکی (تلماك)بوو، یەکێك بوو لەوانەی دەستی لە گەمارۆدانی ((ترواده))دا هەبوو، هەر ئەویش بەتواناو بیرو فێڵی دروست کردنی ئەسپە دارینەکان بۆ گرتنی تر وادە دەست نیشان کرا، دوای دەساڵ ئاوارەیی گەرایەوە نیشتمان، چیرۆکی ئاوارەیی‌و چۆنیەتی بەدەست هێنانەوەی پاشایەتی لە ((ئودیسە))ی هۆمیرۆسدا نووسراوە. و-ف

((لەبەر ئەوەی مەترسی لەناوچونیان هەیە، کلۆڵانە هەرچیەکیان هەبوە لە دەستیان داوە، ئێستا برسیو ڕووتن، لەلایەکەوە بەلشەفیەکان راویان دەنێنو لەلاکەی ترەوە کوردەکان، لەهەموولایەکەوە، وەك پەنابەر هاتوونو لەچەند شارێکی گورجستانو ئەرمەنستاندا کۆ بوونەتەوە، نەخۆراکیان هەیە نەپۆشاكو نەدەرمان، هەموو لەبەندەرەکاندا کۆدەبنەوە، دوو دڵو سەرگەردان چاو لە ئاسۆ دەربرن، بۆ ئەوەی کەشتیەکی یۆنانی بێتو بیانگەیەنێتەوە باوەشی یۆنانی دایکیان، بەشێکی نەژادمان، یەعنی بەشێکی رۆحمان تووشی مەترسیەکی گەورە هاتوون.

((ئەگەر ئێمە ئەمانە بدەینە دەست خوا بێگومان لەناو دەچن، خۆشەویستیو دڵپاکیو پەرۆشیو گیانی کارکردن (ئەم دووسیفەتەی دەوایی ئەوانەن تۆ پێت خۆشە لەهەموو کەسێکدا هەبن) پێویستە تابتوانین ئەمانە رزگار بکەینو بیانگێرینەوە بۆوڵاتی ئازادیخۆمان، لەوی کەڵکیان بۆ هاوڵاتیەکانی خۆمان زۆرترە، لەوێو بەرەو ژوورتر،واتا لەسنوورەکانی مەکدۆنیاو، لەوێ دوورتر لەسنوورەکانی تراس [100] تەنیا بەم شێوەیەیە کە سەدان هەزار یۆنانی رزگاردەبنو ئێمەیش لەگەڵیاندا رزگار دەبین. چونکە لەوساتەوەی کە گەیشتوومەتە ئێرە بەپێی ڕێنمایییەکانی تۆ بازنەیەکم کێشاوەو ئەمەم بە ((ئەرکی خۆم)) داناوە، بەخۆم وتوە:

((ئەگەر هەموو ئەوانەی لەم بازنەیەدان رزگار بکەم واخۆیشم رزگار کردوە، ئەگەر نەیکەم واخۆیشم لەناو چووم)) بەڵێ، ئەو پێنج سەدهەزار یۆنانیە لەناوئەو بازنەیەدان.

((شارو گوندەکان دەدەم بەپێوە، یۆنانیەکان کۆدەکەمەوە، راپۆرت دەنووسمو تەلگراف دەکەم، هەوڵ ئەدەم دەسەڵاتدارانی خۆمان لەئەسینا بڕیاری ناردنی کەشتیو خۆراكو جلوبەرگو دەرمان بدەنو ئەم داماوانە بگێرنەوە بۆ یۆنان، ئەگەر خەباتی بەجۆشو سەرسەختانە بەختەوەری بێت وامن بەختەوەرم، ئێستا نازانم ئاخۆ وەك تۆ

---

[100] Thrace تراس یان تراکیە ناوچەیەکی باشوری خۆرهەڵاتی ئەوروپایە، ساڵانی ١٩١٩-١٩٢٣ لەنێوان سێ وڵاتدا دابەش کران، یۆنان (تراسی خۆراوا) تورکیا (تراسی خۆرهەڵات)و بولگارستان (تراسی باکوور) ئەم ناوچەیە لە ساڵانی ٥١٢تا ٤٧٩پ.ز بەشێك بوون لە وڵاتی ئێران. -ف-

دەڵێیت من خۆش بەختیم بەقەدەر باڵای خۆم (برِیوە) یان نا! چونكە ئەگەر وابێت سوپاس بۆ خوا من باڵام بەرزە، بەهەرحاڵ من پێم خۆشە كە باڵام تا دوورترین خاڵی سەرسنووری یۆنان كەسنوری خۆش بەختی خودی منیشن درێژ بكەمەوە، وەلێ ئیدی كاتی خەیاڵ پڵاوی نیە، تۆ لەسوچێكی كەناری كریتدا ئاسودە ڕاكشاویتو گوێت لەدەنگی دەریاو سەنتور گرتوەو كانیشت هەیە، بەڵام من نا، كاركردن دەمخواتو بەوە خۆشحاڵم. بێجگە لەكار، ئەی مامۆستای بێكارەم، ڕێگایەكی تر بۆ ڕزگار بوون وجودی نیە.

((ئێستا بابەتی بیركردنەوەم زۆر سادەو یەك ریتمەو من بەخۆم دەڵێم: ئەم خەڵكی پونتوس[١٠١] و قەوقازە، ئەم گوندنشینانانەی قارس، ئەم بازرگانی وردە فرۆشانەی تفلیسو باتومو نوفوروسیسكو رستوفـو ئودیساو قرم لەئێمەنو لەخوێنمانن، بۆ ئەوانیش وەك خۆمان، پایتەختی یۆنان قوستەنتەنیەیە، ئێمە هەموو سەرۆكێكمان هەیە كەتۆ پێی دەڵێیت ئولیسو خەڵكی تر كوستەنتین پالیولوگ[١٠٢]ی پێ دەڵێن، هەڵبەتە ئەمە ئەو كوستەنتینە نیە كەلەپاڵ دیوارەكانی بێزەنتەدا كوژرا. بەڵكوو ئەوكوستەنتینە ئەفسانەییەیە كە بوو بە مەرمەڕو هێشتا لەچاوەڕوانی فریشتەی ئازادیدا ڕاست وەستاوە، من داوای لێ بوردنت لێ دەكەم كە ناوی ئەو سەرۆك نژادەمان بنێم ئاكریتاس[١٠٣]. من ئەمناوەم پێ خۆشترە، چونكە سەر سەختو جەنگاوەرترە، هەر ئەوەندەی گوێم لەم ناوەبێت ئیدی هیلینی نەمر، سەراپا زرێ پۆش، لەوجودی مندا باڵا دەكاتو، بێ سێو دوو لەهەموو سنوورەكاندا لە جەنگدایە، بەڵێ، لەهەموو سنوورەكاندا، لەمیللیەوە بیگرە تا فیكریو رۆحی. ئەگەر ناوی دیجنیس-یشی بخەینە سەر ئیتر رەچەڵەكی خۆمانمان كە پێكهاتەیەكی سەر سووڕهێنەرە لە خۆر هەڵاتو خۆراوا چاكتر بەرجەستە كردوە.

---

١٠١ Pontas ناوێكی كۆنی بەشێكی ئاسیای بچووكە لەكەناری دەریای ڕەشدا.

١٠٢ Constantin Paleologus كوستەنتەینی یانزە یان دوانزەیە ((دراگاسس))یشی پێ دەڵێن (١٤٤٩-١٤٥٣) لەبەرگری كردنیا لە كوستەنتەنیە بەرانبەر محەمەدی دوەمی سوڵتانی عوسمانی شكاو كوژرا. بەمە ئیمبراتۆریەتی ڕۆمی خۆرهەڵات كۆتایی هات. -ف-

١٠٣ Akbitas دیجنیس ئاكریتاس پاڵەوانی ئەفسانەیی داستانێكی یۆنانیە كەباوكی موسڵمانو دایكی مەسیحیە بوە، سنوور پارێزی ئیمپراتۆریەتی بێزەنتە بوە. -ف-

((من ئێستا لەقارسمو ئامادەم هەموو گوند نشینە یۆنانیەکانی ئەم ناوە کۆبکەمەوە، هەر ئەو ڕۆژەی گەیشتمە ئێرە، کوردەکان لەدەوروبەری قارسدا قەشەیەکو مامۆستایەکیان گرتو وەك هێستر ناڵیان کردن، پیاو ماقوڵان بەترسو لەرزەوە پەنایان بۆ ئەو ماڵە هێنا کەمنی تیام، ئێمە بەردەوام گوێمان لەتۆپخانەی کوردەکانە کەتادێن نزیکتر دەبنەوە،هەموو یۆنانیەکان چاویان لە من بڕیوە، وەك من تەنیا کەسێك بم بتوانم رزگاریان بکەم.

((دەمویست سبەینێ بچم بۆ تفلیس، بەڵام ئێستا لەبەردەم مەترسیەکی وادا ڕۆیشتن خەجاڵەتیە، بۆیە هەرلێرە دەمێنمەوە، من ناڵێم ناترسم، بێگومان دەترسم، بەڵام شەرم دەکەم، خۆ ئەگەر (جەنگاوەر)ەکەی –رامبرانت[١٠٤]–یش (جەنگاوەر)ەکەی من بوایە هەرئەم کارەی نەدەکرد؟ بێگومان دەمایەوە، بۆیە منیش دەمێنمەوە، ئەگەر کوردەکان بێنە ناوشارەوە ئاسایی‌و عادیلانەیشە کەیەکەم کەس من ناڵ بکەن، تۆیش، مامۆستاکەم، بێگومان چاوەڕێی ئەوە لە شاگردەکەت ناکەیت کەچارەنووسی هێستری هەبێت. ((دوای قسەو باسێکی زۆرو بێ کۆتایی، وەك یۆنانیەکان، بڕیارماندا ئەمشەو هەمووومان لەگەڵ هێسترو ئەسپ‌و مانگاو مەڕو ژن‌و منداڵدا لەجێگایەك کۆبینەوەو، بەیانی زوو بەرەو باکوور بەڕێ بکەوین، منیش وەك بەران پێش ڕانەکە دەکەوم.

((ئەمەیە کۆچی هۆزی میللەتێك بەناو زنجیرە چیاو دەشتێکدا کەناوی ئەفسانەییان هەیە! منیش دەبمە موسا–یان وەك موسا– کەمیللەتە هەڵبژاردەکەی خوا بەرەو سەر زەمینی بەڵێن پێدراو، کە ئەم سادە بیرانە بەیۆنانی دەزانن دەبەم، بۆ ئەوەیش کە شایستەی ئەو پەیامە موساییەبم‌و شەرمەزاری لای تۆ نەبم هەق وایە ئەم پێڵاوە چەرمە دەوڵەمەندانەیە کە تۆ گاڵتەی پێ دەکەیت فڕێدەم‌و کاڵەو وپێتاو لەپێ بکەم، ریشێکی درێژو قات قاتو چەورو پیس بهێڵمەوە، لەهەمووی گرنگتر ئەوەیە دوو شاخیشم هەبێت، بەڵام داوای پۆزشتان لێ دەکەم کە ناتوانم لەم بارەیەوە تۆ خۆشحاڵ بکەم، چونکە بۆ من

---

[١٠٤] Rembrandt ١٦٠٦–١٦٦٩ گەورەترین نیگارکێشی هۆڵەندایی. –ف–

گۆڕینی ڕۆح ئاسانترە لەگۆڕینی جلو بەرگ، بۆیە ئەو پێتاوە چەرمە لە پێ دەکەمو ریشم وەك کەلەرم ساف دەتاشمو ژنیشم نەهێناوە.

((مامۆستای ئازیزم، هیوادارم ئەم نامەیە–کە ڕەنگە دوا نامەم بێت بەدەستت بگات، چونکە کەس نازانێت چی ڕوودەدات، من بڕوام بەوهێزە نهێنیە نیە کە دەڵێن مرۆڤ دەپارێزێت، بەپێچەوانەوە، بڕوام بەوهێزە کوێرانەیە هەیە کەبێ مەبەستی شەڕو چ ئامانجێك لەچەپو ڕاست دەسرەوێنێتو چی بەردەست بکەوێت دەیکوژێت، من ئەگەر ئەم دنیایە بەجێ بهێڵم (وشەی (جێهێشتن) بەکاردێنم تا وشە ڕاستەقینەکە کە ئەم مانایە دەدات نەتۆ بترسێنێتو نەمن) بەڵێ ئەگەر من ئەم دنیایەم جێهێشت، تۆ، مامۆستای ئازیزم، تۆ تەندروستو بەختیار بژی. من شەرم دەکەم پێت بڵێم، بەڵام بمبوورە کە دەبێت بیڵێم: منیش تۆم زۆر خۆش ویستوە)).

لەدامێنی نامەکەدا، بەپەلە ئەمەی نوسیبوو:

پەراوێز : ئەو بەڵێنەی کەلەڕۆژی هاتنما لەسەرکەشتیەکە پێکەوە دامان لەیادی ناکەم، ئەگەر هاتە سەر ئەوەی من ئەم دنیایە ((بەجێ بهێڵم)) بێگومانبە تۆ لە هەرجێگایەك بیت ئاگادارت دەکەم، دڵ لەدڵ نەدەیت))

-١٣-

سێ ڕۆژو چوارو پێنج تێپەڕیو زۆربا نەگەڕایەوە، ڕۆژی شەشەم نامەیەکی چەند لاپەڕەییم لە(کاند)ەوە پێ گەیشت، نامەکە ڕاپۆرتێکی واقیعیانە بوو، لەسەر لاپەڕەی پەمەیی بۆن خۆش نووسرابوو، لە گۆشەیەکیدا وێنەی دڵێکی بەتیر پێکراوی پێوە بوو، من نامەکەم بەهێند وەرگرتو واجارێکی دی بۆ ئێوەی دەنوسمەوە، ڕستەو دەربڕینەکان هەر بەشلو شاوی خۆیانەوە هێشتمنەوە، تەنیا هەڵە ڕێنوسیە سەرنج ڕاکێشەکانیم دەستکاری کرد، زۆربا قەڵەمەکەیشی وەك قازمە لەدەست گرتوەو توند پیایدا کێشاوە، بۆیە لە چەند شوێنێکدا پەڕەکان یان کون ببوون یان مەرەکەبیان پیارژابوو.

((سەرۆکی ئازیزم، سەرمایەداری بەڕێز:

من بۆیە قەڵەم بەدەستەوە دەگرم تا یەکەم لێت بپرسم باری تەندروستیت باشە یان نا، دوەم پێت بڵێم سوپاس بۆ خوا ئێمەیش باشین.

((بەڵام من ماوەیەکە ئەوەم زانیوە کە وەك ئەسپ یان گا نەهاتومەتە دنیاوە، تەنیا ئاژەڵ بۆ خواردن دەژی، بۆئەوەی من لەو تۆمەتەی سەرەوە ڕزگاربم، شەوو ڕۆژ کار بۆخۆم دروست دەکەمو بۆبیرۆکەیەك نانی خۆم دەخەمە مەترسیەوە، پەندەکان هەڵدەگێڕمەوەو دەڵێم:

((مراویەکی لاوازبیت لەحەوزێکدا چاکترە لەوەی چۆلەکەیەکی قەڵەوبیت لەقەفەزێکدا))

((زۆرکەس نیشتمان پەروەرن بی ئەوەی هیچی تێبچێت بۆیان، بەڵام من ئەگەر چی زۆریشم لەسەر بکەوێت نیشتمان پەروەرنیمونابم، زۆرن ئەوکەسانەی بڕوایان بە بەهەشت هەیەو لەوەیش دڵنیان کەگوێ درێژەکەیان دەبەنەناو ئەوباخو لەوەرگا سەوزەوە، من جارێ گوێ درێژم نیەو ئازادم، لە دۆزەخیش ناترسم کە ڕەنگە تێ بکەوێت، ئومێدی

بەهەشتیشم نیە كەرەكەم هێندەی شەوەر[105]تیا بخوات بتەقێت، خوێندەوارنیمو ناتوانم مەبەستەكانم بپێكم، بەڵام تۆ، سەرۆك، تۆ تێم دەگەیت.

((ئەو كەسانە زۆرن لەوە دەترسن شتەكان پووچو بێ هوودە بن، بەڵام من نیازم نیە بیر لەوە بكەمەوە، من بەچاكەی دڵخۆش نابمو بەشەڕ خەفەت ناخۆم، گرتنی قوستەنتەنیە لە لایەن یۆنانیەكانەوە چ جیاوازیەكی نیە لەگەڵ گرتنی ئەسینادا لەلایەن توركەوە، بۆ من هەردووكیان وەك یەك وان.

((ئەگەر لەم قسانەمدا هەست بەوە دەكەیت تێك چووبم بۆم بنووسە، كە بۆ كڕینی تەلەفریك دەچمە مەخزەنەكانی كاندیەوە پێ دەكەنم، یارۆ لێم دەپرسێت بەچی پێ دەكەنیت، هاوڕێ؟ باشە من چیان بۆ باس بكەم؟ من بۆیە پێدەكەنم كاتێك دەست بۆ تەلێكی ئاسنی تازە دەبەم تابزانم باشە یان نا، لەپڕا دەكەومە بیری ئەوەوە كە بەڕاست مرۆڤ چیە؟ بۆ هاتۆتە دنیاوەو كەڵكی چیە بەبڕوای من هیچ نیە، بەلای منەوە هەموو شتەكان وەك یەك وان: بۆ نموونە من ژنم هەبێت یان نەم بێت، چاك بم یان خراپ، پاشابم یان حەماڵ. تەنیا شتێك كە بۆ من فەرق ئەكات ئەوەیە كەزیندووبم یان مردو، هەر كاتێك شەیتان یان خوا داوام بكەن- چی دەڵێی سەرۆك، ئەودوانە لای من هەر یەكێكن - من دەمرم، دەبمە لاشەیەكی بۆگەن، خەڵكی تر ژەهراوی دەكەم. بۆیە ناچاردەبن بەقوڵایی چوار پێ بمخەنە ژێر خاكەوە تا بۆ نەكەم نەیان خنكێنێت.

((بەم بۆنەیەوە، سەرۆك، دەمەوێت شتێكت لەگەڵدا باس بكەم، تەنیا شتێك كە دڵگیرم دەكاتو رۆژو شەو ئارامی لێ هەڵگرتووم، تەنیا شتێك كە دەمترسێنێت پیریە، سەرۆك، خوا بەدوورمانخات، مردن خۆی هیچ نیە، تەنیا فوویەكەو مۆمێك دەكوژێنێتەوە، بەڵام پیری سوكو ڕسواییە.

((من ئەوە بەعەیبێكی گەورە دەزانم دان بەوەدا بنێم كەپیر بووم، هەموو توانام بۆ ئەوەیە كەس نەزانێت پیر بووم، باز دەدەم، سەما دەكەم، پشتم دێشێت كەچی هەر سەما دەكەم، مەشروب دەخۆمەوە، سەرم گێژ دەخواتو دنیا بەدەوری سەرما دەسوڕێت، بەڵام

---

[105] شەوەر: گیایەكە لەبابەتی سێپەڕە- گوڵی سپی یان سور دەگرێت، قەدی ڕاستو بەرزە، لەدەمی ئاژەڵ دا ئەوەندەخۆشە كەپێی تێر نابێت زۆری لێ دەخوات تا دەدڕێت. -و-

من گوێی نادەمێ و واخۆم نیشان دەدەم کە هیچ رووی نەداوە، شەلاڵی ئارەقەم و کەچی خۆم فرێ دەدەمە دەریاوەو سەرمام دەبێت، ئینجا دەکەومە کۆکین، ئۆهـ.. ئۆهـ بۆ ئەوەی سوکنایم بێت، بەڵام شەرم دەم گرێت، سەرۆك، بەزۆر کۆکەکەم قوت دەدەمەوە، تۆ تائێستا گوێت لێبوە من بکۆکم؟ هەرگیز، نەك لەبەردەمی خەڵکیدا، بەڵکوو کە بەتەنیایشم هەرناکۆکم، من شەرم لەزۆربا دەکەم. سەرۆك، شەرمی لێ دەکەم.

رۆژێك لە چیای ئاتوس١٠٦ –ئاخر من بۆ ئەوێیش رۆیشتووم و خۆزگا پێم بشکایەو نەچوومایە– لەگەڵ راهیبێکدا بەناوی باوکە لاڤرنتیو١٠٧ خەڵکی چیو١٠٨بووینە هاورێ، ئەو پیاوە داماوە بڕوای وابوو کە شەیتان چووتە ناو لەشیەوە، تەنانەت ناویشی بۆ ئەوشەیتانە دۆزیبوەوەو پێی دەوت خوجا١٠٩ لاڤرنتیوی بەد بەخت سەری خۆی بەدەرو کڵێسەدا دەکێشاو هاواری دەکرد: ((خوجا دەیەوێت لە رۆژی هەینی پیرۆزدا١١٠ گۆشت بخوات، خوجا دەیەوێت لەگەڵ ژنا بنوێت، خوجا دەیەوێت سەرۆکی دێر بکوژێت. ئەوە خوجایە کە دەیەوێت ئەو کارانە بکات، بەڵێ، خوجایە، من نیم)) دیسان سەری خۆی بەبەردا دەکێشایەوە.

((منیش، سەرۆك، وەك ئەو راهیبە شەیتانێکم لەناودایە، ناوم ناوە زۆربا، زۆربای ناوەوەم نایەوێت پیربێت، نا، ئەوپیرنەبوەو هەرگیزیش پیر نابێت، ئەو غوولێکە، مووی وەك پەڕی قەلەڕەش. سیو دوو ددانی هەیەو هەمیشە گوڵە مێخەکێکی سووری لەپشت گوێیە، بەڵام زۆربای دەرەوە نەگبەتە پیر بوە، ورگی پەیدا کردوەو مووی سەری سپی تێ کەوتوە، دەم و چاوی چرچ و لۆچ و باڵای چەمیوەتەوە، ددانی لە کەوتندان، مووی سپی گوێچکە زلەکانیشی بەئەندازەی یاڵی گوێ درێژێك درێژ بوون،

---

١٠٦ Athos

١٠٧ Lavrentio

١٠٨ Chio

١٠٩ Hodja لەوە دەچێت لەبابەتی مەلا یان حاجی تورك بێت. و–ف

١١٠ Good Friday هەینی پێش جەژنی پاك سالرۆژی لە خاچدانی حەزرەتی مەسیح.

((چی بکەین، سەرۆك؟ تاکەی ئەم دوو زۆربایە لە شەڕی یەکتردا دەبن و پاشان کامیان سەردەکەوێت؟ ئەگەر من زوو بمرم ئیدی کێشەیەکم نیەو دلگران نابم، بەلام ئەگەر هەروا ماوەیەکی دوورو درێژ بمێنم کارم خراپە، بەلێ، سەرۆك، کارم خراپە، رۆژێك دێت و زەلیل دەکەوم و ئازادیم لەدەست دەدەم، چونکە بووك و کچەکەم ئەمرم بەسەردا دەکەن، دەیانەوێت چاودێری منالەکانیان بکەم، ئەوجانەوەرە پیسانە، ئەوشتە پیسانەی خستویانەتەوە. چاودێریان بکەم نەوەك خۆیان بسوتێنن، یان بکەون، یان خۆیان پیس بکەن، ئەگەر خۆیشیان پیس کرد ئەوا ناچارم پاکیان بکەمەوە.. ئاخ!

((تۆیش، سەرۆك، تووشی ئەم بەلایە دەبیت، ئەگەرچی لاویت، ئاگاداری خۆتبە، ئەوەی پێت دەلێم گوێی لێ بگرەو بەهەمان رێگادا برۆ کە من پیایدا رۆیشتووم، ئەگەر وا نەکەیت رێگای تری رزگاریت نیە، وەرە بابچینە ناو چیاکانەوە، خەلوزو مس و ئاسن و بەردی توتیای لێدەربێنین، پارەیەك کۆ بکەینەوە تاکەس و کارمان رێزمان لێ بگرن، هاورێ و دۆستەکانمان پێلاومان بلێسنەوە، پیاو ماقوولانی شار کلاوی رێزمان بۆداگرن، ئەگەر ئێمە سەرنەکەوین واچاکترە بمرین، سەرۆك، گورگ و ورچ و هەر جانەوەرێکی درندەی تر کە بێتە سەر رێگامان بمانخوات، هەر لەبەر ئەمەیشە خوا درندەی ناردۆتە سەر زەوی، بۆ ئەوەی مرۆڤ گەلێکی وەك ئێمە بخۆن پێش ئەوەی سووك و رسوابین))

لێرەدا زۆربا بەقەلەمی رەنگاو رەنگ وێنەی پیاوێکی درێژو لاوازی کێشابوو کە بەژێر درەختە سەوزەکاندا رای دەکردو حەوت گورگی سووری بەدواوە بوون. بەپیتی گەورە لەژێر وێنەکەدا نوسیبووی:

((زۆرباو حەوت گوناهی سەرەکی)).

لەسەر نامەکەیشی هەربەم جۆرە بەردەوام بوو :

((دەبێت تۆ لەم نامەیەوە تێ بگەیت من چ بەدبەختێکم و، تەنیا کەلەگەل تۆدا قسەدەکەم ئومێدێکم تێ دەگەرێ و ئاسوودە دەبم، چونکە بەهەر حال تۆیش وەك من وایت و بەخۆت نازانێت، تۆیش شەیتانێکت تیایەو هێشتا نازانیت ناوی چیە، لەبەر ئەو

نەزانینەیە کە ناتوانیت بەختەوەربیت، ناوێکی لێ بنێ، سەرۆك، بۆ ئەوەی هەست بەچاك بوونت بکەیت.

((بۆیە دەمویست بڵێم من چەندە بەدبەختم‌و، بەڕوونی ئەوەیش دەبینم کە هۆش‌و زیرەکیم بێجگە لە کەریەتی هیچی تر نیە، بەمەیشەوە ڕێ دەکەوێت ڕۆژانێك وەك پیاوی مەزن بیرم کردبێتەوە، خۆ ئەگەر لەوکاتانەدا بمتوانیایە هەموو ئەوشتانەی کە زۆربای ناوەوە فەرمانی پێ دەدام بمکردایە ئەو سەری دنیا دەماسی.

((لەبەر ئەوەیش کە لە نێوان من‌و ژیاندا پەیمانێکی دیاری کراو نیە، هەرکە گەیشتمە سامناکترین سەرەو لێژی جڵەو شل دەکەم، ژیانی مرۆڤ ڕێگایەکە پڕ لە هەورازو نشێوەو هەموو مرۆڤە عاقڵەکان لەو هەورازو نشێویەدا ستۆپ دەکەن، بەڵام من ماوەیەکی زۆرە وازم لە ستۆپ هێناوە، -لێرەدایە، سەرۆك، کە نرخی من دەردەکەوێت- چونکە من لە وەرگەڕان ناترسم، ئێمەی میکانیکی کە شەمەندەفەرێك لەخەت دەردەچێت پێی دەڵێین وەرگەڕان، خوا بمگرێت ئەگەر بە ئەندازەی گەردیلەیەك گوێم بەوەرگەڕانی خۆم دابێت، من شەوو ڕۆژ لێ دەخورم‌و هەرچی دڵم بیەوێت دەیکەم، ئەگەر مردیشم بۆ دۆزەخ، چیم لەکیس دەچێت؟ هیچ، بەهەرحاڵ ئەگەر هێواش‌و لەسەرخۆیش بڕۆم هەر دەمرم، ئەمە حەقیقەتە، بۆیە بکەو بڕۆ.

((بێگومانم تۆم هێناوەتە پێکەنین، سەرۆك، بەڵام من بێ عەقڵیەکانی خۆم، یان ئەگەر تۆ شتێکی ترت لاباشە بیڵێم، بیرو باوەڕو لاوازیەکانی خۆمت بۆ دەنووسم- جا چ جیاوازیەك لەنێوان ئەم سیانەدا هەیە؟ بەڕاستی من جیاوازی نابینم- بۆ تۆ دەنووسم‌و تۆیش ئەگەر حەزت لێ بوو پێ بکەنە، ئەگەر بزانم تۆ بەچی پێدەکەنیت منیش پێ دەکەنم، بەم جۆرە پێکەنین هەرگیز لەدنیا نابڕێت، هەموو کەسێك شێتیەکی تایبەتی خۆی هەیە، بەڵام بەبڕوای من گەورەترین شێتێیەتی ئەوەیە کە مرۆڤ شێت نەبێت.

((ئێستا وەك دەبینیت من لێرە، لە کاندی، خەریکی شێتیەتی خۆم‌و هەموو شتێکیش، وردو درشتیت بۆ دەنووسم، چونکە دەمەوێت راوێژت پێ بکەم، ڕاستە تۆ هێشتا لاویت، سەرۆك، بەڵام ئەمەندە حیکمەتی کۆنت خوێندۆتەوە -دوور لەگیانت کەمێك بوویتە کۆنە پەرست- بۆیە پێویستم بە ئامۆژگاریەکانتە.

((کەواتە، من لەوباوەڕەدام هەر مرۆڤێك بۆنی تایبەتی خۆی هەیە، هەڵبەت ئێمە لێکیان جیاناکەینەوە، چونکە بۆنەکان تێکەڵ بەیەکتری دەبن‌و، بەڕاستی ئێمە نازانین کامەیان بۆنی تۆیەو کامەیان بۆنی منە، تەنیا ئەوە دەزانین کە بۆگەنێك دێت‌و ئەو بۆگەنەیش ناوی ((مرۆڤایەتی))یە، هەڵبەتە مەبەستم بۆگەنی مرۆڤایەتیە، هەندێك کەس ئەوەندە بەشەوقەوە بۆنەکە هەڵدەمژن وادەزانن بۆنی هەلاڵەیە، بەلام من بەو بۆنانە دەڕشێمەوە. باواز لەوە بێنین، ئەمە باسێکی ترە.. ((دەم ویس بڵێم-وا جارێکی دی جڵەو بەردەدەم- کە ئەم ژنانە، ئەم سۆزانیانە، لووتیان وەك لووتی دێڵە سەگ تیژو بۆن گرە، هەربەبۆن دەزانن چ پیاوێك ئارەزوویان دەکات‌و کامەیان نایکات، هەر لەبەر ئەمەیە، هەر شارێك رێم تێی کەوتبێت، تەنانەت ئێستایش کەپیر بووم‌و لەمەیموون دەچم‌و گوێ بەجڵو بەرگ نادەم، کەچی هێشتا دووسێ ژن دوام کەوتوون، ئەم نەفرەت لێ کراوانە هەر بەبۆن شوێن پێم هەڵدەگرن، خوا لەگوناهیان خۆش بێت.

((بەهەرحاڵ، یەکەم رۆژ کە بەسەلامەتی گەیشتمە کاندی، دەورو بەری عەسرو دنیا بەرەو خۆر ئاوابوون دەچو، هەریەك ژەمی رووم لەدوکانەکان کرد، کەچی هەموو داخرابوون، چوومە میوانخانەیەك، ئالیکم دایە هێسترەکەم‌و خۆیشم نانم خوارد، دەم‌و چاوم شت، جگەرەیەکم داگیرساندو چوومەدەرێ تاپیاسەیەك بکەم، نەکەسم لە شاردا دەناسی‌و نەکەسیش دەیناسیم، تەواو ئازاد بووم‌و دەمتوانی لە کۆڵانەکاندا فیکە لێ بدەم‌و پێ بکەنم‌و لەگەڵ خۆیشمدا قسە بکەم، هەندێك ناوکە کوولەکەم کڕی، کەوتمە تروکاندن‌و توێکڵەکەیم فڕێ دەدایە سەرزەویەکەو دەڕۆیشتم، ئەو کاتە بوو کە چرایان دادەگیرساند، پیاوان عەسرانەیان دەخوارد، ژنان دەگەڕانەوە ماڵ‌و، هەوا بۆنی پۆدرەو سابونی بۆن خۆش‌و کەباب‌و عەرەقی ڕازیانەی لێ دەهات، بەخۆم وت:

((تۆ پیرە زۆربام، وادەزانیت تاکەی لەژیاندا دەمێنیت‌و هەوا هەڵدەمژیت، ئیدی بۆ تۆی پیرو بێ چارە ئەوەندە کات بەبەریەوە نەماوە هەوایەك هەڵمژیت، کەواتە تا دەتوانیت هەناسەی قووڵ هەڵمژە))

((بەڵێ، من بە پانی‌و درێژی مەیدانە گەورەکەی شاردا کە تۆ دەیزانیت دەگەڕام‌و ئەم قسانەم لەگەڵ خۆمدا دەکرد، لەناکاو- پەنا بەخوا- گوێم لەدەنگی هەراو زەناو سەماو

تەپڵو گۆرانی بوو، گوێم ڕاگرتو بەپەلە بەرەو لای دەنگەکە چووم، کاباریەکی سازو گۆرانی بوو، کوێرە چیت دەوێت دوو چاوی ساغ، چوومە ژوری، هەروا لەپشت مێزێکی بچووکەوە دانیشتم، بۆ دەبێت شەرم بکەم؟ چونکە وەك پێم وتیت کەس منی نەدەناسییەوە من بەتەواوی ئازاد بووم.

((ژنێکی قەڵەوی بەد هەیکەل لەسەر سەکۆکە سەمای دەکردو داوێنی کراسەکەی بەرزدەکردەوەو دای دەنایەوە، بەڵام من گوێم پێی نەبوو، داوای شووشەیەك بیرەم کردو لەوساتەدا ژنێکی جوانو وردیلە هاتو لەپاڵما دانیشت، ئەسمەرێکی تۆخو ئارایشتێکی خەستی کردبوو، بەپێکەنینەوە ڕووی تێ کردمو وتی: ڕێگا هەیە، باوەگەورە؟

((کە گوێم لەم قسەیە بوو خوێن بەری چاوی گرتمو، ئارەزوویەکی شێتانە لەسەری دام کەملی ئەم هیچو پووچە بگرمو هەڵی بکێشم، بەڵام خۆم گرت، دڵم پێ سوتاو بۆیەکەم بانگ کردو پێم وت:

دووبوتڵ شەمپانیا بێنە.

((دەبووریت، سەرۆك، لەپارەکەی تۆم خەرج کرد، بەڵام چی بکەم؟ سوکایەتیەکی گەورەم پێ کرابوو و دەبوو شەرەفمان بکڕمەوە، یەعنی شەرەفی تۆو خۆم، دەبوو ئەو ژنۆکەیە بهێنمە سەرچۆك، بەڵێ، دەبوو ئەو کارەبکەم، چونکە باش دەزانم کە تۆ خۆیشت لە هەڵوێستی وا بێدەنگ نابیتو بەرگریم لێ دەکەیت، کەواتە ! کاکی بۆی، شەمپانی بێنە))

((شەمپانیایان هاوردو داوای شیرینیم کرد، پاشان، دیسان داوای شەمپانیام کردەوە، لەوکاتەدا پیاوێك بە سەبەتەیەك گوڵی یاسەمینەوە تێ پەڕی، من سەبەتەکەم کڕیو هەموو گوڵەکانم ڕژانە باوەشی ئەو ژنە پووچەوە کە وێرای سوکایەتیم پێ بکات، ((دەی، خواردمانەوەو خواردمانەوە، بەڵام سەرۆك سوێندت بۆ دەخۆم دەستم بۆ نەبرد، من کاری خۆم باش دەزانم، کە گەنج بووم یەکەم کارم ئەوەبوو دەکەوتمە یاری کردن لەگەڵیانداو مالیم دەکردن، بەڵام ئێستا پیربووم، یەکەم ئیشم ئەوەیە پارە خەرج بکەمو بیلاوێنمو پارە بڕێژمە بەرپێی، ژنان شەیدای ئەم ڕەفتارەن، بەڵێ، هیچو پووچانە مردووی ئەوەن، ئەگەر قەموور بیت، ئەگەر پیرەمێردێکی کەنەفتو تەنانەت لە ئەسپێیش بچیت، ئەوان ئەم

خەوشانە نابینن، تەماشای هیچ ناكەن تەنیا تەماشای دەستت دەكەن كەوەك سەبەتەی كۆن پارەی لێ بڕژێت. بەڵی وەك وتم، خەرجم كردو خەرج كرد– سەرۆك، خوا تەمەنت درێژ بكاتو سەد ئەوەندەت بداتێ –ئیدی ژنە وازی لێ نەهێنام، وردە وردە لێم هاتە پێشیو ئەژنۆ ناسكەكانی بەڕانە لاوازو درێژەكانمەوە قرساند، بەڵام من لە پارچە سەهۆڵێك زیاتر هیچی دی نەبووم، ئەگەرچی لەناوەوەدا گڕم گرتبوو، تۆیش كە دەرفەتی وات بۆ هەڵكەوت دەبێت ئەوە باش بزانیت كە ئەمە عەقڵ لەسەری ژندا ناهێڵێت: یەعنی كاتێك هەست بكەن تۆ خەریكی لە ئاگری هەوەسدا دەسوتێیتو كەچی دەستیان بۆ نابەیت.

((بەكورتی شەو گەیشتە نیوەو تێ پەڕیش، چراكان كوژانەوەو كابارێكەیش لە هەڵگرتنابوو، سەفتەیەك كاغەزی هەزار دراخمایم لەگیرفانم دەرهێنا، هەموو پارەكەم داو برێكی چاكیشم بەخشیە بۆیەكە، ژنە پیامدا نووساو بەدەنگێكی تەریقیەوە وتی: ناوت چیە؟..

(منیش بە ئاوازی دڵ ڕەنجاوێكەوە وەڵامیم دایەوە: باوە گەورە))

((بێ شەرمە نوقرچێكی توندی لێ گرتمو لەسەر خۆ وتی: وەرە لەگەڵما وەرە..

((من دەستە بچووكەكەیم گرتو بۆ دڵنیایی كردنی دەستیم گوشیو پێم وت:

((بابڕۆین، چكۆڵەكەم، دەنگیشم گڕ ببوو.

((دەبێت تۆ خۆت باقی ڕووداوەكە بزانیت، سەرۆك، كارمان بەجێ هێناو پاشان خەو بردینیەوە، كە لەخەو هەستام نیوەڕۆ بوو، تەماشای ئەملاولای خۆم كرد، چی ببینم؟ ژوورێكی بچووكو پاكژ، قەنەفەو دەست شۆرو سابونی جۆراو جۆر، شووشەی گەورەو بچووكی عەترو ئاوێنەی گەورەو بچووك، كراسی ژنانەی ڕەنگاو ڕەنگ بەدیوارەوە هەڵواسراوو، كۆمەڵێك وێنەی جیاواز لە دەریاوانو ئەفسەرو كەشتیەوانو پۆلیسو ژنانی سەما كەرو ژنی رووتو قووت كە تەنیا جووتێك بان پاییان لەپێدابوو، لە پاڵیشما ئەو ژنە گەرمو نەرمە بۆن خۆشو قژ ژاكاوەم بینیەوە، لەسەرخۆ چاوم نانەوە سەریەكو بەخۆم وت: (( ئای زۆربا، تۆ ئەوكەسەیت هەر بەزیندویی ڕێگات كەوتۆتە بەهەشتەوە، جێگایەكی چاكە، هەڵمەستە)).

((پێش ئێستایش، سەرۆك، پێم وتبوویت هەر کەسەو بەهەشتی تایبەتی خۆی هەیە، بۆ تۆ بەهەشت پڕە لەکتێبو مەرەکەب، بۆ یەکێکی دی پڕە لەبەرمیلە شەرابو عەرەقو کۆنیاك، بۆ یەکێکی تر پڕە لە لیرەی ئیستەرلینگ، بەڵام بۆ من بەهەشت ئەمەیانە: یەعنی ژوورێکی بچووكو بۆن خۆشو بەرگی ڕەنگاو ڕەنگو سابونی حەمامو تەختە خەوێکی گەورەی سپرینگو، لە پاڵیشما ژنێك.

((ئەو گوناهەی خۆت دانی پێدا بنێیت لەنیوەیت دەبەخشن، من هەموو ئەو ڕۆژە دووپێم نەچوە دەرێ، ئاخر بۆ کوێ بچم؟ بۆ بچم؟ هیچیشم نەبوو، چونکە دڵخۆش بووم، داوای خواردنم لەچاکترین رستورانی شار کرد. سینیەك خۆراکی توانا بەخشی وەك خاویاری ڕەشو کەبابو ماسیو ئاوی لیمۆو (کادایيف)[111] یان هێنا جارێکی دی لەگەڵ ژنەدا کردمانەوەو خەوتینەوە، سەر لەئێوارە هەستاین، دەستمان لە دەستی یەکناو دیسان بەرەو ئەو کاباریەی سازو ئاوازە چووینەوە کە ئەوکاری تیا دەکرد.

((بۆ ئەوەی چیرۆکەکەت بۆ کورت بکەمەوەو، بەقسەی زیاد تووشی سەرگێژە نەبیت، دەبێت عەرزی جەنابتی بکەم کە ئەو بەرنامەیە تا ئێستا بەردەوامە، بەڵام بێ تاقەت مەبە، من هەر دەستم بەکارەکانەوەیە جارجارە سەر لەدوکانەکان دەدەم، دڵنیابە تەلو پێویستیەکانی هەر دەکڕم، ڕەنگە ڕۆژێك زوتر یان ڕۆژێك کەمتر یان دوای هەفتەیەك، یان ڕەنگە مانگێکی تر، چ قەیدی هەیە؟ پەندێك هەیە دەڵێت: پشیلەیەك بەپەلە بزێت بێچووی سەیرو سەمەرەی دەبێت. زۆر پەلەمەکە، بۆ بەرژەوەندی تۆ حەزئەکەم گوێم بکرێتەوەو زەینم ڕووناك بێتەوە، بۆ ئەوەی کڵاو نەکەنە سەرم، ئەو سیمەی دەیکڕم دەبێت لەجۆرە هەرە چاکەکانی بێت، ئەگینا تیا دەچین، بۆیە سەرۆك، کەمێك ئۆقرە بگرەو لەمن دڵنیابە.

((بەتایبەتی، خەمی منت نەبێت، ئەم ڕووداوانە بۆ من بەکەڵکن، لەماوەی ئەم چەند ڕۆژەدا بوومەتەوە بەلاوێکی بیست ساڵانە، دڵنیابە، ئەوەندەم هێز تێگەڕاوە دووبارە

---

[111] کادایيف Cadaif جۆرە شیرینیەکی تورکیە لە گوێز یان بادام و شەکر دروست دەکرێت، ئەشێ شتێك بێت وەك پاقلاوەی لای خۆمان. -ف-

ددانی تازە دەردەکەم، پێش ئەوەی بێمە ئێرە کەمێك پشتم دێشا، وەلێ ئێستا زۆر تەندروستو تەواوم، هەموو بەیانیەك لە ئاوێنەدا تەماشای خۆم دەکەمو بەلامەوە سەیرە کە هێشتا مووم وەك بۆیاخی ڕەشی لێ نەهاتوە:

((بێگومان تۆیش لەخۆت دەپرسیت کە من بۆ ئەم شتانەت بۆ دەنووسم، چونکە تۆ بۆ من وەك قەشەیەکیت بێ شەرم ئەتوانم لەبەردەمتا پێ بەگوناهەکانمدا بنێم، دەزانیت بۆ؟ چونکە بەبڕوای خۆم من چاك بکەم یان خراپ تۆ گوێی پێ نادەیت، تۆیش وەك خوای میهرەبان ئیسفنجێکی تەڕت بەدەستەوەیەو، بە جوولەیەك هەموو شتێکی چاك یان خراپ دەسڕیتەوە هەر ئەمەیشە وای لێ کردووم لەخۆم ڕابینم هەموو شتێکت پێ بڵێم"کەواتە گوێ بگرە:

((من بەتەواوی سەرو بن بوومو خەریکە عەقڵم لەدەست دەدەم، تکایە بەگەیشتنی ئەم نامەیە قەڵەم بگرە دەستو وەڵامم بدەوە، تا وەڵامی تۆم نەگاتێ لەسەر ئاگر دەژیم، من وای بۆ دەچم کە لە چەند ساڵێك لەمەو بەرەوە ئیدی ناوم لەدەفتەری خوادا نەماوە، لەدەفتەری شەیتانیشدا نیم، ناوی من تەنیا لە دەفتەری تۆدا تۆمارکراوە، بۆیە بێجگە لەو بەڕێزە کەسم نیە پەنای بۆ بەرم، بۆیە ئەوەی دەمەوێت بیلێم گوێی بۆ ڕادێرەو بزانە ڕووداوەکە بەم شێوەیەی لای خوارەوەیە.

((دوێنێ لەگوندێکی نزیك کاندی ئاهەنگێك ساز کراو نەعلەتی شەیتانم لێ بێت ئەگەر زانیبێتم ئاهەنگی کام لە قەدیسەکانە. لولا[۱۱۲]بەڕاست لەبیرم نەبوو پێت بڵێم کچەکەی هاورێم ناوی لولایە– لولا پێی وتم:

((باوە گەورە (ئەو هێشتا هەر باوە گەورەم پێ دەڵێت، بەڵام ئێستا بەعیشوەو نازەوە دەیلێت) دەمەوێت بچمە ئەو ئاهەنگە،

وتم: بڕۆ نەنکە گیان، بڕۆ.

((–بەڵام دەمەوێت لەگەڵ تۆدا بچم.

((–من نایەم، کارم هەیە، خۆت بەتەنیا بڕۆ.

((–باشە، کەواتە منیش ناچم.

---

[۱۱۲] Lola

ڕووم لێ گرژکردو پێم وت: بۆ ناچیت؟

((-ئەگەر لەگەڵما بێیت دەڕۆم ئەگەر نەیەیت ناچم.

((-ئاخر بۆ؟ تۆ بۆخۆت کەسێکی ئازادنیت؟

((-نا، ئازادنیم.

((-ناتەوێت ئازادبیت؟

((-نەخێر.

هەستم کرد خەریکە شێت دەبم، هاوارم کرد:

((-تۆ ناتەوێت ئازادبیت؟

((نا، نامەوێت، نامەوێت، نامەوێت.

((-سەرۆك، من ئەم شتانە لە ژوورەکەی ((لولا))و لەسەر کاغەزی (لولا) بۆ تۆ دەنووسم. بۆ خاتری خوا داوات لێ دەکەم چاك ئاگاداربیت، من لەو باوەڕەدام تەنیا ئەوکەسە مرۆڤە کە دەیەوێت ئازاد بێت، ژن نایەوێت ئازادبێت، بەم پێیە ئایا ژن مرۆڤە؟

((بۆ خاتری خوا زوو وەڵامم بدەرەوە، سەرۆکە دڵسۆزەکەم، من لەناخی دڵمەوە ماچت دەکەم.

((دڵسۆزت - ئەلکسیس زۆربا))

که لەخوێندنەوەی نامەکەی زۆربا بوومەوە ماوەیەك دۆش دامام، نەم دەزانی تووڕەبم، پێبکەنم، یان دەست خۆشی لەم پیاوە کێویە بکەم کە توێکڵی ژیان، واتا مەنتیقو ڕەوشتو ڕاستی شەق دەکاتو دەڕواتە نێو جەوهەری ژیانەوە، ئەو، هەموو خەسڵەتە بچووکەکان، چەندبەکەڵکیش بن، لەدەستی داون، تەنیا یەك خەسڵەتی سەختو گرانو ترسناکی بۆ ماوەتەوە، ئەویش بێ ئەوەی بەرەنگاری بکات بەرەو سنوورەکانی کۆتایی، واتا بەرەو هەڵدێری دەبەن.

ئەم کرێکارە نەخوێندەوارە، کە دەنوسێت، لەکاتی هەڵچوونو خرۆشانیدا قەڵەمەکەی دەشکێنێت، هەر وەك مرۆڤە سەرەتاییەکان کە پێستی مەیمونیەکەی خۆیان فرێدا، یان وەك فەیلەسوفە گەورەکان، کێشە سەرەکیەکان گەمارۆیان داوەو، ئەویش وەك

مەسەلەیەک تەماشایان دەکات کە پێویستە بەپەلەو هەر ئەوکاتە جێ بەجێ بکرێن. ئەو وەك منداڵ هەموو شتەکان بۆ یەکەمین جار دەبینێت، هەمیشە سەر سوورماوەو پرسیار دەکات، هەموو شتێك لەبەرچاویا موجیزە ئاسایەو، هەموو بەیانیەك کەچاودەکاتەوەو درەختو دەریاو بەردو باڵندە دەبینێت ماتو سەراسیمە دەبێتو هاوار دەکات:

ئەم موجیزەیە چیە؟ ئەم موجیزەی درەختو دەریاو بەردو باڵندانە چین؟

لەبیرمە رۆژێك کەپێکەوە بۆ گوندەکە دەچووین، تووشی پیرەمێردێکی لاواز بووین، سواری هێسترێك ببوو، هەر کە زۆربا هێسترەکەی دی چاوی کردەوەو لێی ڕاما، وا چاوی لەو ئاژەڵە بڕیبوو کە لادێیەکە ترساو هاواری کرد:

–بۆ خاتری خوا چاو بە هێسترەکەمدا هەڵ مەهێنە!

پیرەمێردەکە نیشانەی خاچی کێشا.

من ڕووم لە زۆربا کردو پێم وت:

–تۆ چیت لەگەڵ ئەوپیرەدا کردوە وا هاواری لێ هەستا؟

–من؟ هیچم لەگەڵدا نەکردوە، تەنیا تەماشای هێسترەکەیم کرد، تۆیش سەیرت لێ نایەت سەرۆك؟

–چی؟

–کەلەدنیادا شتێك هەیە پێی دەڵێن هێستر؟

رۆژێکی دی، کە لەسەرکەناری دەریاکە ڕاکشابووم و دەم خوێندەوە، زۆربا هاتو بەرانبەرم دانیشت، سەنتورەکەی نایە سەر ئەژنۆیو کەوتە ژەندنی، سەرم بەرزکردەوەو لێم ڕوانی، وردە وردە دەمو چاوی گۆڕا، خۆشیەکی سەیری لێ ڕوودا، ملە درێژو چرچەکەی لێ هەڵبڕیو دەستی بەگۆرانی وتن کرد، ئاهەنگەکانی مەکدۆنیا، گۆرانیە ناوچەییو میللیەکانو هاوارێکی وەحشیانە. گەروە مرۆڤیە کە گەڕابوەوە بۆ سەردەمانی پێش مێژوو، بۆ ئەو سەردەمانەی کە هاوار تێکەڵەیەکی بەرزبوو لە هەموو ئەو شتانەی کە ئەمڕۆ ئێمە مۆسیقاو شیعرو فیکری پێ دەڵێین. هاواری ئاخ ئاخی زۆربا، کەلەناخی رۆحیەوە هەڵدەقوڵا هەموو ئەو توێکڵە تەنکەی کە ئێستا ئێمە ناوی شارستانیەتی لێ

دەنێین دەی دڕیو، ڕێگای بۆ ئەو جانەوەرە دڕندە نەمرە، ئەو خوا تووکنە، ئەو گۆریلا ترسناکە خۆش دەکرد کە دەرپەڕێتە دەرەوە.

خەڵووزی لینیت، قازانجو زیان، هورتانس خانمو بەرنامەکانی ئایندە هەموو کۆتاییان پێ‌دەهات، ئەو هاوارە گشتی لەگەڵ خۆیدا دەبردو ئێمە پێویستمان بەهیچ شتێك نەدەما، هەردووکمان بێ جووڵە، لەسەر ئەوکەنارەی کریتدا، تەواوی تاڵیو شیرینیەکانی ژیانمان لەسنگناندا هەڵدەگرت، ئیدی تاڵیو شیرینی وجودی نەبوو، خۆر جێگای دەگۆڕیو شەو دادەهات، ورچی گەورە (الدب الكبير) بەدەوری چەقی بێ جووڵەی ئاسماندا سەمای دەکرد، مانگ هەڵاتو بەسەرسامیەوە لەو دوو ئاژەڵە بچووکەی ڕوانی کەلەسەر زیخەکە گۆرانیان دەوتو ترسیان لە هیچ کەسێك نەبوو،

زۆربا کە گۆرانیەکان زۆریان زەوق دابوویە کتو پڕ کەوتە قسەو وتی:

-هێی، هاوڕێ، مرۆڤ گیانەوەرێکی دڕندەیە، کتێبەکانت بخەلاوە، شەرم ناکەیت؟ مرۆڤ گیانەوەرێکی دڕندەیەو دڕندەیش کتێب ناخوێنێتەوە.

کەمێك بێ دەنگ ماو کەوتەوە پێکەنین، وتی:

-تۆ دەزانیت خوا چۆن مرۆڤی دروست کرد؟ ئەزانیت وشە سەرەتاییەکانی ئەم گیانەوەرە لەگەڵ خوادا چی بوو؟

-نا، لەکوێوە بیزانم؟ خۆ لەوێ نەبووم!

زۆربا چاوی داگیرساو هاواری کرد: بەڵام من لەوێ بووم.

-کەواتە خۆت بیڵێ.

زۆربا لە ژێر کاریگەری نیوە زەوقو نیوە گەپێکدا دەستی بەگێڕانەوەی چیرۆکە ئەفسانە ئامێزەکەی دروست کردنی مرۆڤ کرد.

-باشە، سەرۆك، گوێ بگرە، سەر لە بەیانیەك خوا زویرو دڵتەنگ لەخەو هەستا، بە خۆی وت: ((ئاخر من چ خوایەکم؟ کەسێك نیە پیامدا هەڵبداتو سوێند بەناوم بخوات، یان بێ تاقەتیم لێ بڕەوێنێت، ئیدی وەك کوندە بەبووی پیر لەژیان وەڕس بووم))

خوا تفی لەناو لەپی کردو قوڵی کراسی سەرخست، چاویلکەکەی لەچاونا، چنگێك خۆڵی هەڵگرتو بەتف گرتیەوە تا بوو بەقوڕ، قوڕەکەی تەواو شێلا، مرۆڤێکی لێ دروست کرد، لەبەر خۆرا داینا تا وشك بوەوە.

((دوای حەوت رۆژ، لەبەر خۆرەکەی هەڵگرت، خۆی گرتبوو، خوا تەماشای کرد، پێکەنیو بەخۆی وت:

((نەعلەت لە شەیتان، ئەمە بەرازێکەو لەسەر دووپێ وەستاوە، ئەمە ئەوە نیە کە من دەمویست، بەڕاستی ئابڕو چوونە.

((پشت ملی گرتو شەقێکی تێ هەڵداو وتی:

((-دەی بدە بەقنگتا، چ کارت نیە ئەوە نەبێت بڕۆیتو بەچکە بەرازی وەك خۆت بخەیتەوە، سەر زەوی بۆ تۆ، بڕۆ خواریو ونبە، یەك دوو، یەك ،دوو بۆ پێشەوە بڕۆ.

((بەڵام گیانەکەم ئەو گیاندارە بەراز نەبوو، کڵاوێکی ئاوریشمینی نەرمی لەسەرنا، لاو نیو چاکەتێکی دا بەشانیدا، لەسەر خەت پانتۆڵێکی لەپێ کردو جووتێ سۆلی گوڵێنکە سوور بەسەرپێیەکەوە، بێ لەمانە خەنجەرێکی تیژیشی کردبوو بەقەدیا،

-بێگومان شەیتان خەنجەرەکەی دابوویە- لەسەری نووسرا بوو:

((-لەدەستم قوتار نابیت))

((ئەوە مرۆڤە دروست کراوەکە بوو، ئادەم بوو، خوا دەستی دایە کەماچی بکات، بەڵام ئادەم سمێڵی باداو وتی:

((بڕۆ بەولاوە پیرەمێرد، خۆت لادە بابڕۆم))

کە زۆربا منی بینی واخەریکە لەپێکەنینا ریخۆڵەم ببڕێت وەستا، برۆی پێکداداو وتی:

-پێ مەکەنە، سەرۆك، ئەمەی وتم حەقیقەتە.

-بەڵام ئاخر تۆ لەکوێوە ئەمە دەزانن؟

-من وای هەست پێدەکەمو، خۆ ئەگەر منیش لەباتی ئادەم بوومایە هەروام دەکرد، من گرەو لەسەر سەری خۆم دەکەم کە ئادەم ئەوەی کردوە، تۆ بڕوا بەقسەی کتێبەکان مەکەو بڕوات بەمن بێت.

بێ ئەوەی چاوەڕێی وەڵامی من بێت دەستە زلەکانی درێژکردو دیسان کەوتەوە ژەندنی سەنتورەکەی.

* * *

من هێشتا نامە عەتراویەکەی زۆربام بەدەستەوە بوو کەوێنەی دڵێکی بەتیر پێکراوی تیا کردبوو، هەموو ئەو ڕۆژانەی دەهێنایەوە یاد کەپڕبوون لەگەوهەری مرۆڤایەتی و من لەگەڵیاو لەپاڵیا گوزەراندبووم، ژیان لەگەڵ زۆربادا چێژێکی تازەی هەبوو، ئیدی تەمەن بەدوادا هاتنێکی ماتماتیکیانەی ڕووداو، یان مەسەلەیەکی فەلسەفی بن بەست نەبوو، تەمەن لمێکی گەرمی بێژراوە بوو، من بەخۆشیەوە هەستم پێ دەکردکە بەنێو پەنجەکانمدا دەخزێتە خوارێ.

لەبەر خۆمەوە وتم: سلاو لە زۆربا، هەموو ئەو باوەڕە وشکو رووتانەی کە لەناوەوەی مندا دەلەرزین، زۆربا گیانێکی گەرمو ژیانێکی خۆشەویستانەی پێ بەخشین.

کاتێکیش ئەوم لانەبێت من دیسان دەست بەلەرزین دەکەمەوە،

پارچە کاغەزێکم هەڵگرت، کرێکارێکم بانگ کردو بروسکەیەکی پەلەم بەم جۆرە بۆ نووسی:

((بەپەلە بگەڕێرەوە))

-١٤-

دوا نیوەڕۆی ڕۆژی شەممەی یەکەم ڕۆژی مانگی ئازار بوو، پاڵم دا بوە تاوێرە بەردێکەوەو ڕووبەرووی دەریاکە سەرقاڵی نووسین بووم، ئەو ڕۆژە یەکەم پەڕەسێلکەم دیبوو، زۆری پی دڵخۆش بووم، نووسینی دژی بودام بێ هیچ بەرگریەك دەکەوتە سەر لاپەڕەی کاغەزەکەو، خەباتیشم لەگەڵیدا هاوسەنگی تێ کەوتبوو، ئیتر پەلەم نەبوو، لە ڕزگاربونی خۆیشم دڵنیابووم.

لەناکاودا بەسەر زیخەکەوە گوێم لەدەنگی پێ بوو، سەرم هەڵبڕیو پیرە فریشتە دەریایەکەی خۆمانم بینی، خۆی ڕازاندبووەوەو، وەك کەشتیەکی کۆن، بەهەناسە بڕکێ، بە درێژایی کەنارەکەدا دەهات، وەك نیگەرانی شتێك بێت، بەپەرۆشەوە هاواری کرد: نامە هاتوە؟

بەپێکەنینەوە وەڵامیم دایەوە: بەڵێ. لەبەری هەستامو پێشوازیم لێ کرد، وتم: زۆر شتی لەبارەی تۆوە تیایە، ڕۆژو شەو لەبیری تۆدایە، نووسیویەتی خەوو خۆراکی لێ بڕاوەو ئیدی بەرگەی دووری تۆ ناگرێت.

ژنی داماو کە هەناسەی لێ بڕابوو وتی: هەر ئەوەندەی وتوە؟ دڵم پێی سوتا، نامەکەم لەگیرفانم دەرهێناو خۆم وانیشاندا کە بۆی دەخوێنمەوە. پیرە فریشتەی دەریا دەمی بێ ددانی کردەوە، چاوە بچووکەکانی هێناو برد، هەناسەی لە خۆی بڕیو هەموو گیانی بوو بەگوێ.

من هەروا بەسەرزارەکی دەستم بە خوێندنەوە کرد، کە بەدەستی ئەنقەست گیرم دەکرد وام پیشان دەدا ناتوانم نوسینەکە باش بخوێنمەوە.

((سەرۆك، دوێنێ چوومە چێشتخانەیەکی ئاسایی بۆ ئەوەی نانی نیوەڕۆ بخۆم، زۆرم برسی بوو، لەپڕا کچێکی جوان، زۆر شۆخو شەنگ خۆی بەژووردا کرد، خوا یەك بوو بۆ

خۆی، ئای خوا! چەند لە بوبولینای خۆمی دەکرد! یەکسەر فرمێسک وەک کانی لەچاوما تەقیو گەروم گیرا، وام لێ هات نەتوانم تیکەیەک قووت بدەم، هەستام، پارەی خواردنەکەم داو رۆیشتم، منێک کە بەدەگمەن قەدیینم وەبیر دێتەوە ئەوەندە بەشەوقو شوورەوە دەرپەڕیم، سەرۆک، کەیەکسەر بەرەو کڵێسەی قەشە میناس چووم تا مۆمێکی بۆ دابگیرسێنم.

هەر بەدەم دوعا خوێندنەوە وتم: حەزرەتی قەشە میناس کاریێ بکە هەواڵی خۆشم لەفریشتە خۆشەویستەکەمەوە پێ بگات، کاریێ بکە لەزووترین کاتدا باسکمان لێک وەربێت))

هورتانس خانم کە ڕووی لە شادیا دەدرەوشایەوە دایە قاقای پێکەنین، من کە وەستابووم تا هەناسەیەک تازە بکەمەوەو درۆی نوێی بۆ هەڵبڕێژم لێم پرسی:

-بۆ پێدەکەنیت ئازیز؟ بۆ پێدەکەنیت؟ ئەو قسانە، بەپێچەوانەوە، من دەهێننە گریان..

هەر بەدەم پێکەنینەوە وتی: ئەگەر دەزانیت.. ئەگەر دەزانیت..

-چی؟ چی دەزانم؟

-باسکمان.. ئەو زۆڵە مەبەستی لە (باسکمان) قاچە، کە بەتەنیا دەبین بە قاچمان دەڵێت (باسکمان) باسکمان لێک وەربێت یەعنی هی ! هی ! هی !

-تۆ گوێ لەپاشماوەکەی بگرە، گیانە، تاسەرت سووڕبمێنێت، کەوتمە لاپەرە هەڵدانەوەو دیسان وام بۆ دەرخست کەنامەکە دەخوێنمەوە.

((ئەمڕۆیش بەبەردەمی دوکانی سەرتاشێکدا تێپەڕیم. لەوکاتەدا کابرای سەرتاش تەشتی پڕ لەئاوو سابوونەکەی لەدەرەوە دەڕشت، بۆنێکی خۆش هەموو کۆڵانەکەی پڕ کرد، دیسان کەوتمەوە بیری بوبولیناو دەستم بەگریان کرد، سەرۆک، من ئیتر ناتوانم بەرگەی دووریەکەی بگرم، بێگومان شێت دەبمو، سەیریش ئەوەیە کە شیعرم بۆ وتوە، پێریێ خەوم لێ نەدەکەوت، شیعرێکم پیاهەڵدا، داوات لێ دەکەم بۆی بخوێنیتەوە تابزانێت لەچ خەمو ئازارێکدام!

((ئاخ.. خۆزگا دەمانتوانی، منو تۆ

لەسەرە ڕێیەکدا پێک بگەشتینایە

ڕێگایەکی هێند فراوان کە خەمو ئازارەکانمان بگرێت

من ئەگەر تیکە تیکەیش بم، یان بەتەور ورد وردم کەن

ئێسقانە ورد کراوەکانم هەر بەرەو لای تۆ دێن))

هورتانس خانم بەچاوە ماتو نیوە بەسراوەکەیەوە شادو مەست، لەناخی دڵەوە گوێی گرتبوو، تەنانەت شریتە باریکەکەی دەوری ملیشی کە هەناسەی بە تەنگ هێنابوو لابردو چرچو لۆچەکەی ئازاد کرد، پێدەکەنیو بێدەنگ دەبوو، وات هەست دەکرد کە بیری، بەخۆشیو شادیەوە، لەدنیایەکی زۆر دووردا هەڵدەفڕێت.

مانگی مارت، سەوزە گیای تازە، گوڵی وردی سورو زەردو خەنەییو، ئاوی شیرینو زوڵاڵ، قوە سپیو ڕەشەکان پۆل پۆل دەیان خوێندو جووتیان دەگرت. قوە سپیەکان مێ بوون، ڕەشەکان نێر، دەنووکە نیوەکراوەکەیان ئەرخەوانی. مارماسیە شینەکان بەبریسکو هوڕ لە ئاوەکە دەهاتنە دەرێو لەگەڵ زەردەمارە گەورەکاندا لەیەکتر دەئاڵاندو دەئاڵاند هورتانس خانم گەڕابووەوە. تەمەنی چواردە ساڵیو لە ئەسکەندەریەو بیروتو ئەزمیرو کوستەنتەنیەدا، بەسەر مافوورەکانی خۆر هەڵاتەوە، پاشان لەکریتو لەسەر دەماخەی بەورشەو پرشەی کەشتیەکاندا سەمای دەکرد. ئێستا باشی لەبیرنەماون، هەمووشتێک لە زەینیدا تێکەڵو پێکەڵ بوون، سنگی بەرز دەبووەوەو کەنارەکان دەکرانەوە.

لەپڕا، ئەوکاتەی کە ئەو سەمای دەکرد، دەریا پڕ بوو لەو کەشتیانەی کە پێشەوەیان ڕەنگی ئاڵتونیو دواوەیان پڕ بوو لە خەیوەتی ڕەنگاو ڕەنگو ئاڵائاوریشمین، لە خەیوەتەکاندا ئەو پاشایانە بەدەردەکەوتن کە گوڵینکەی زێڕینیان بەتەر بووشی سوورەوە بوو، ئەو بەگە پیرو دەوڵەمەندانەیش کە دەچوونە زیارەتو دەستیان پڕبوو لەدیاری بەنرخ، ئەو کوڕو کاڵە بەگزادانەیش کە خەفەتبار بوون. هەروەها کەشتیەوانەکان بەکڵاوی سێ گۆشەی بریسکەدارو دەریاوانەکان بەیەخەی سپی ورشەدارو پانتۆڵی هەراویانەوە دەردەکەوتن. کریتیە لاوەکانیش پانتۆڵی فشو فۆڵی شینیان لەپێداو، پێڵاوی زەردو دەستە سرێکی ڕەشیشیان بەسەریانەوە بەستبوو.

هەر لەو کەشتیانەدا، زۆربای بەتواناو هەیکەل، کەهەوەس بازی لاوازی کردبوو، ئەنگوستیلەیەکی گەورەی دەزگیرانی لەپەنجەداو، تاجە گوڵینەیەکی نارنجی بەسەر قژە ماش‌و برنجیەکەیدا کردبوو، هاتە دەرێ. هەموو ئەو پیاوانەی کە لە تەواوی تەمەنی پڕ لەکارەساتیدا خۆشەویستی لەگەڵدا کردبوون لەوێ بوون، تەنانەت ئەو بەلەمەوانە پیرو کۆمەی کە ددانەکانی پێشەوەی کەوتبوون‌و شەوێک بە بەلەمەکەی لە ئاوەکانی کوستەنتەنیەدا گێڕابووی.

شەو داکەوتبوو، هیچ کەسێک نەی دەبینین، تێکڕا هەموویان دەهاتنە دەرێ، هەر لەوە کاتەداو لە دوایانەوە مارماسی‌و مارەکان‌و قوەکان جووت دەبوون.

پیاوەکان دەهاتنە دەرێ‌و چۆن مارە عاشقەکانی وەرزی بەهار کە لە یەکدی دەئاڵێن‌و دەفیشکێنن، ئەمانیش وەک هێشوو پێکەوە دەنووسان، لەناوەڕاستی ئەو هێشوانەدا، هورتانس خانم چواردەساڵە، بیست ساڵە، چل ساڵە، شەست ساڵە، سپی‌و سەرتاپا ڕووت‌و بەئارەقە تەڕ بوو، بەلێوە نیوە کراوەکانیەوە کە ددانی وردو تیژی دەردەخستن، بی جووڵەو، بی ئەوەی تێر بخوات بەمەمکە قوتەکانیەوە فیکەی لێ دەدا.

هیچ یەکێک لەو عاشقانە نە ون ببوون‌و نە مردبوون. هەموویان لە نێو سنگە چەقو داچەکیوەکەی ئەودا بەبەرگی شەڕەوە زیندو ببوونەوە، دەتوت هورتانس خانم کەشتیەکی گەورەی سێ ئەستووندەگی بوەو، هەموو عاشقەکانی– لەماوەی ئەو چل‌و پێنج ساڵی کارکردنەیدا پیایدا سەرکەوتوون‌و ئەنبارو سەکۆو گوریسیان تیا گرتوە، ئەویش، بەهەزار کونەوە، کەهەزار جار ئەوکونانە بەقیر گیرابێتن بەرەو دوا بەندەر کە زۆر دەمێک بوو شەیدای ئەوەبوو پێی بگات–واتا شووکردن–ڕێگای ناو ئاوی دەبڕی. زۆربایش بەهەزار دەم‌و چاوی جیاوازەوە: تورک، مەغریبی، ئەرمەنی، عەرەب، یۆنانی هورتانس خانم لە ئامێزی دەگرت، وەک ئەوەی هەموو ئەو کاروانە پیرۆزە بێ کۆتاییەی لە ئامێز گرتبێت.

پیرە فریشتەی دەریا هەستی بەوەستانی من کرد، لەپڕا خەونەکانی شلوێ بوون، پێڵوە قورسەکانی بەرزکردەوەو، لەگەڵ ئەوەدا کە بەپەرۆشەوە لێوی دەلێسایەوە، وەک لۆمەکردنێک لەبەر خۆیەوە وتی:

–هیچی تری نەوتوە؟

–لەمە زیاتر چیت دەوێت ، هورتانس خانم؟ ئەی نابینیت هەموو نامەكە هەر باسی تۆیە؟ بڕوانە، چوار لاپەڕەی تەواو، لەسوچێكیشدا وێنەی دڵێكی تیر لێدراوی تیایە، زۆربا دەڵێت خۆی وێنەكەی كێشاوە، بڕوانە چۆن خۆشەویستی دڵی زۆربای ئەم دیو ئەو دیو كون كردوە! لەداوێنی نامەكەیشدا دووكۆتر یەكدی ماچ دەكەنو، بەسەر باڵیانەوە بەپیتی زۆر ورد و نادیار بەمەرەكەبی سوور دووناو نووسراوە كە دەستیان لەملی یەكدایە:

هورتانس– زۆربا.

نە كۆترێك لەئارادا بوو نە نووسراوێك، بەڵام چاوە بچووكەكانی پیرە فریشتەی دەریا پڕببوون لەفرمێسكو هەرچیەكی پێ خۆشبوایە دەی بینی، بێ ئەوەی تێری لەو قسانە خواردبێت وتی:

–هیچی تر نەماوە؟ ئیتر هیچی دی نەماوە؟

هەموو ئەم قسانە–باسكەكانو سابونی سەرتاشخانەو كۆترە بچووكەكان–وشە گەلێكی جوانو قەشەنگ بوون، بەڵام بایەك بوونو تێ دەپەڕین، عەقڵی ژنانەی واقیع بینی ئەو شتێكی دەویست كەزیاتر هەستی پێ بكرێتو دڵنیا كەریش بێت، ئەو لەدرێژایی تەمەنیا گەلێك قسەی وا جوانی بیستبوو، چ سوودێكی لێ دیبوون؟ تازە دوای ئەو هەموو ساڵی ڕەنجو ناخۆشیە تەنیاو تەنیا ماوەتەوە.

پاشان بە ئاوازێكی سەركۆنەكردنەوە وتی:

–هیچی تر نیە؟ هیچ؟

وەك مێچكە ئاسكێكی گیر خواردو وای لەچاوم ڕوانی كەدڵم پێی سووتا، وتم:

–بۆ؟ شتێكی زۆر زۆر گرنگی تری وتوە، هورتانس خانم، هەر لەبەر ئەوە هێشتوومەتەوە بۆ دوایی.

هەناسەیەكی هەڵكێشاو وتی: چی...؟

–نووسیویەتی كە گەڕایەوە، خۆی بەسەر دەستو پێی تۆدا دەخات تا بەچاوی فرمێسكاویەوە داوای ئەوەت لێ بكات ببیتە هاوسەری. وادیارە سەبرو ئارامی لێ هەڵگیراوە، دەیەوێت بتكاتە ((ژنە چكۆڵەكەی))و ببیتە هورتانس خانم زۆربا، بۆ ئەوەی هەرگیز لەیەكدی جیانەبنەوە.

ئەمجارەیان چاوە بچکۆلە نمناکەکانی بەڕاستی کەوتنە فرمێسک ڕشتن، ئەمە ئەو پەڕی بەختەوەری ئەوو ئەو بەندەرەیش بوو کە بەتەواوی ئارەزوویەوە دەیویست پێی بگات.

هەموو حەسرەتی ژیانی ئەوەبوو خەیاڵی ئارام بێتو لەسەر پێخەفێکی حەلاڵ ڕاکشێتو ئیتر هیچی دی.

بەدەستی چاوی گرتو بەویقارو تەوازوعی ژنێکی خانەدانەوە وتی:

—باشە، قبووڵمە، بەلام تکایە بۆی بنووسە کەلێرە، لەم گوندەدا، تاجە گوڵی نارنج دەست ناکەوێتو پێویستە خۆی لەکاندیەوە بیهێنێت، دوو مۆمی سپیش بە قردێلەی گوڵ ڕەنگەوە، بادەمی برژاویش بێنێت، کراسێکی سپی بوکێنیو گۆرەوی ئاوریشمو دەم پاییەکی حەریریشم بۆ بکڕێت، لێفەو مەلافەی خۆمان هەیە، هەروەها تەختی خەویشمان هەیە.

لیستی داواکانی ڕێك خستو ئیدی لای وابوو کە بۆ لەوەودوا مێردێکی پیاوی ماڵی دەبێتو هەموو داواکاریەکانی بەجێ دێنێت.

لەپڕا هەستاو وەك ژنێکی مێردکردوی بەویقار وتی:

—پێشنیازێکم بۆ تۆ هەیە، پێشنیازێکی جیدی.

تۆزێك شڵەژاو وەستا.

—بیڵێ هورتانس خانم، من لە خزمەتدام.

—منو زۆربا پەیوەندیمان لەگەڵ تۆدا هەیە، تۆ پیاوێکی دڵسۆزیتو پشتمان لەزەوی نادەیت، دەبیتە شایەتی مارە بڕینمان؟

من مووچڕکێکم پیا هات، کۆن لەماڵی ئێمەدا کارەکەرێکی پیر هەبوو، ناوی دیاماندولا[١١٣] بوو، تەمەنی لە شەست ساڵ تێ پەڕی کردبوو، قەیرەکچ بوو، بەهۆی ئەوەوە کە هەرشووی نەکردبوو نێوە شێتو ڕکنو لەشیشی تەواو داکەوتبوو، بێ سنگو مەمكو سمێڵیشی لێ ڕوابوو، ئەم ژنە عاشقی میتسو[١١٤]ی شاگرد دوکانداریکی گەڕەك بوو، میتسو مێردمناڵێکی دێهاتی چڵکن بەلام بەڕەنگو ڕوو بوو، هێشتا خەتی نەدابوو،

[١١٣] Diamndouia

[١١٤] Mitso

ژنە هەمو یەك شەموانێك لە کورەی دەپرسی:

تۆ کەی لەگەڵ مندا زەماوەند دەکەیت؟ زووکە. بمهێنە، تۆ چۆن خۆتت بۆ دەگیرێت؟ من ئیتر ناتوانم.

شاگردەکە زۆلانە سەری دەنایە سەریو نەی دەویست مشتەریەکەی لەدەست بچێت. لەوەڵامدا دەی وت:

—منیش ئارامم لێ براوە، دیاماندولای خۆشەویستم، منیش لەمە زیاتر ناتوانم، بەڵام دەبێت تۆ خۆگربیت، ماوەیەك دان بەخۆتا بگرە تامنیش سمێڵم لێ دێت.

بەم جۆرە ساڵانێك تێ پەرینو دیاماندولای پیرێژن هەر چاوەڕوانی بوو، دەمارگیریەکەی کەم بوەوە، سەرئێشەکەی هێور بوو، لێوە بەبارەکانی کە هەرگیز تامی ماچیان نەچەشتبوو کەوتنە خەندە، ئیدی لە جاران چاکتر جلی دەشت، کەمتر قاپی دەشکاندو خواردنیشی نەدەسوتاند. شەوێك لەپەناوە پێی وتم:

—سەرۆکە چکۆلەکەم، تۆ ئامادەیت ببیتە شایەتی مارە برینەکەمان ؟

ئەمەندەم بەزەیی پیاهاتەوە قورگم پربوو لە گریان، پێم وت:

—بێگومان ئامادەم، دیاماندۆلا.

ئەم رووداوە گەلێکی ئازار دابووم، بۆیە کە هورتانس خانم هەمان رستەی دووبارە کردەوە مووچرکێکم پیاهاتو وەڵامیم دایەوە:

—بێگومان ئامادەم، هورتانس خانم، ئەوە شانازیە بۆمن.

هورتانس خانم هەستا، چەند تاڵە موویەك کە لە کڵاوەکەیەوە هاتبوونە دەرێ چاکی کردن، زمانی بەلچو لێویا گێراو وتی:

—شەو باش، هاورێم، شەوباش، هیوادارم هەرچی زووتر بگەرێیتەوە لامان.

چاوم لێ بوو بەلەنجەو لار دوور دەکەوتەوەو قەدو باڵا کەنەفتەکەی وەك کچی چواردە ساڵ بادەدا. شادمانی باڵی پێوەپێ گرتبوو، دەم پاییە کۆنو هەلگەراوەکانی چاڵی بچووك بچووكو قوڵیان بەسەر لمەکەوە جێ دەهێشت.

هێشتا باریکە رێگاکەی نەبڕیبوو کە دەنگی شیوەنو هاتو هاوار بەرزبوەوە، من هەستامو رام کرد، لەخوارەوە، بەرانبەر کەناری دەریا ژنان دەگریان، وەك شەپۆر بۆ

مردوویەك بگێڕن وابوو، چوومە سەر بەردێك و كەوتمە تەماشاكردن، لەگوندەكەوە، پیاو ژن بەڕاكردن دەهاتن و، لەدوایشیانەوە سەگەكان دەوەڕین، دووسێ سواریش لە پێشەوە دەیان ئاژوت و هەورێكی تاریكی تۆزو خۆڵیان بەرز كردبوەوە.

بەخۆم وت: بێگومان كارەساتێك ڕوویداوە. بەپەلە بەرەو كەنارەكە داكشام. هەراو زەناكە تا دەهات زیاتر دەبوو، لەو خۆراوابوونەدا، دووسێ پەڵەهەوری گوڵ ڕەنگی بەهاری بەئاسمانەوە كڕببوون، گەڵای سەوز دار هەنجیری پاكیزەی پیرۆزی تەواو داپۆشیبوو.

لەناكاو هورتانس خانمم بینی كە بەقژی ئاڵۆزو هەناسە بڕكێوە دەگەڕایەوە، تاكێك لەدەم پاییەكانی لەپێی هاتبوە دەری و بەدەستیەوە گرتبوو، بەدەم ڕاكردنەوە دەگریاو هاواری دەكرد:

–خواكەی من.. خواكەی من.

كەمنی دی سڵەمیەوەو لەوەدابوو بەسەرما بكەوێت، گرتم و لێم پرسی:

–بۆ دەگریت؟ چی ڕوویداوە؟

یارمەتیم دا تا دەم پاییە كۆنەكەی لەپێ بكاتەوە:

–من دەترسم.. دەترسم..

–لەچی؟

–لە مردن!

دۆخەكە بۆنی مەرگی لێ دەهات و ترسێك چۆكی لەسەر ئەو ناوە دانابوو، من باڵی شل و شادی هورتانسم گرت، بەڵام ئەو لەشە دا كەوتەو پیرە بەرگری دەكردو دەلەرزی. دیسان هاواری لێ هەستا:

–نامەوێت.. نامەوێت..

ئەوداماوە زۆر لەو ناوچەیە دەترسا كە مەرگی لێ نزیك كەوتبوەوە، نەكا ئیزرائیل لەوێ نزیك بێتەوەو ئەمی بیربكەوێتەوە... ئەویش وەك پیرەكانی دی دەیویست لەپاڵ گژو گیاكاندا خۆی بشارێتەوەو ڕەنگی سەوز لە خۆی بگرێت، یان لەزەویەكەدا خۆی وەشارێت و ڕەنگە ئەسمەرە تۆخەكەی لەخۆی بگرێت، بۆ ئەوەی ئیزرائیل نەتوانێت لێكیان جیابكاتەوە.

سەری کێشابوە ناو دەفەی شانە بەخۆو کۆمەکەیەوەو دەلەرزی. تانزیک دار زەیتونەکە خۆی بەکێش کرد، بالاً پۆشە پیناویەکەی کردەوەو وتی:

—بیدە بەسەرما، هاورێ، دامپۆشە، برۆ بزانە چی ڕوویداوە؟

—سەرماتە؟

—سەرمامە، دامپۆشە.

هێندە شارەزایانە دامپۆشی کە لەگەڵ زەویەکەدا جیا نەدەکرایەوە، پاشان ڕۆیشتم، وردە وردە لەکەنارەکە نزیك کەوتمەوەو وام لێ هات شیوەن گێڕەکان بناسم، میمیتو بەدەم ڕاکردنەوە بەبەردەمما تێ پەڕی، هاوارم لێ کرد:

—چی ڕویداوە، میمیتو؟

بێ وەستان وەڵامی دامەوە:

—خۆی خنکاندوە، لەئاودا خۆی خنکاندوە.

—کێ؟

—پاڤلی کوری مافراندونی.

—بۆ؟

—بێوەژنەکە..

ئەم وشەیە هەر بەئاسمانی ئەو خۆراوا بوونەوە بەستیو، لەپڕا لەشی نەرمو پڕ لە مەترسی بێوەژن کەوتە بەرچاو. من گەیشتمە لای ئەو تاشەبەردانەی کە هەموو خەڵکی گوندی لێ کۆببوونەوە، پیاوان بەسەری رووتەوە بێدەنگ وەستابوون، ژنان لەچکیان لێکەوتبوە سەرشان، قژیان دەڕنیەوەو هاوارو قیژەیان بوو، جەستەیەکی ڕەنگ بووردی هەڵ ئاوساو لەسەر چەوەکە دانرابوو، مافراندونی پیر بێ جووڵە بەسەر لاشەکەوە بوو تەماشای دەکرد، دەستی ڕاستی نابوە سەر دارەکەی دەستیو بەدەستی چەپیشی ڕیشە خۆڵەمێشیە لوولەکەی خۆی گرتبوو.

لەپڕا دەنگێکی بەرز لەناو خەڵکەکەوە هەستاو وتی:

—نەفرەتت لێ ژنی تاوانبار، خوا تۆڵەی ئەم تاوانەت لێ بکاتەوە. ژنێك گوڕی دایە خۆیو هەستایە سەرپێ، ڕووی لەپیاوەکان کردو وتی:

-یەعنی لەناوتاندا پیاوێك نیە سەری ئەم ژنۆکەیە بخاتە سەر ئەژنۆی‌و وەك كارە کۆرپە گۆشاو گۆش سەری ببڕێت؟ ئاخ!

ترسنۆکینە.

پیاوەکان تەماشایان دەکرد، ئەویش بی دەنگ‌و هێدی تفێکی بۆ هەڵدان.

کۆندۆمانۆلیۆ[١١٥]ی چاپچی هاواری بەسەر ژنەکەدا کرد:

-سووکمان مەکە، دلیکاترینا[١١٦] نابێت سووکمان بکەیت، لە گوندەکەماندا پیاوی ئازا زۆرە، دەی بینیت.

من خۆم بۆ نەگیراو دەنگم لێ هەڵبڕین:

-ئەمە شەرمە، برادەران، ئەوژنە داماوە چ تاوانێکی کردوە؟ ئەمە قەدەری خواییە، ئەی ئێوە لەخوا ناترسن؟

کەس وەڵامی نەدایەوە.

مانولاکاس[١١٧]ی ئامۆزای خنکاوەکە لەشە کەتەکەی دانەواندو لاشەکەی هەڵگرت، یەکەم کەس بوو بەرەو گوندەکەیان بوەوە.

ژنان دەیان لاواندەوە، دەم‌و چاوی خۆیان دەرنی‌و قژیان دەسکەنە دەکرد، کە بینیان وا لاشەکە دەبەن خێرا کەوتنە دوایان تا بیانگەنێ، بەڵام مافراندونی پیر دارەکەی دەستی هەڵبڕی‌و ئاماژەی دوورکەوتنەوەی کردن. ئەوان کەوتنە کەنارو خۆی بوە سەردەستەیان، ژنان هەر بەدەم شیوەن‌و گریانەوە کەوتنە دوای، پیاوان لەدواوە بێدەنگ دەڕۆیشتن.

هەموو لەودنیا نیوە تاریکەی ئێوارەیەدا ون بوون‌و، جارێکی تر دەنگی هەناسەی ئارامی دەریا کەوتەوە بەرگوێ، من تەماشای ئەم لاو ئەولای خۆم کرد، بەتەنیا مابوومەوە، بەخۆم وت: ((منیش دەگەڕێمەوە ماڵەکەم، ئەمڕۆیش بەشی خۆی خەم‌و ئازاری هەبوو)).

---

[١١٥] Kandomanolio

[١١٦] Delikaterino دەڵ وشەیەکی تورکیە بەمانای شێت، واتا کاترینی شێت. -ف-

[١١٧] Manolakas

بەدەم بیرکردنەوەو خەفەتەوە لاڕێکەم لەبەرگرتەوە، ئافەرینم لەو خەڵکە کرد کەئاوا بەگەرمیو پەرۆشەوە تێکەڵی ئازارە مرۆڤایەتیەکان دەبن: هورتانس خانم، زۆربا، بێوەژنەکەو پاڤلی نەگبەتیش کە بۆنەهێشتنی ئازارەکانی خۆی فڕێدایە نێو دەریاوە، دیلیکاتیرینا کە هاواری دەکرد بێوەژنەکە سەرببڕن، مافراندونیش کە نەی دەویست لەبەر چاوی خەڵکانی دی بگری، یان تەنانەت قسەیش بکات، تەنیا من بێ تواناو عاقڵ بووم، نەخوێنم جۆشا، نەکەسم لەبەر هەراو زەناکەی خۆش دەویستو نەڕقم لە کەس بوو، ئێستا پێم خۆش بوو گیروگرفتەکە هێور بکەمەوەو، هەموو تاوانەکان نامەردانە بخەمەگەردنی قەدەرەوە.

لەنێو تاریکو ڕوونی خۆراوادا ئاپۆ ئاناگنوستیم بینی کە هێشتا لەوێ لەسەر بەردێك دانیشتبوو، چەناگەی نابوە سەر دارە درێژەکەیو تەماشای دەریای دەکرد، بانگم لێ کرد. گوێی لێ نەبوو، لێی نزیك کەوتمەوە، بینیمی، سەری لەقاندو لەبەر خۆیەوە وتی:

—مرۆی نەگبەت! ئەوە لاوێکی تریش لەدەست دەرچوو، بەدبەخت، لەوە زیاتر نەی توانی خەمو ئازار هەڵبگرێت، خۆی فڕێدایە ئاوەوەو خنکا، ڕزگاری بوو.

—ڕزگاری بوو؟

—بەڵێ ڕزگاری بوو، کوڕم، ڕزگاری بوو، ئیدی ژیان بۆ ئەو چ کەڵکی هەبوو؟ ئەگەر بێوەژنەکەی بهێنایە زۆری نەدەبرد قسەو قسەلۆك دەستی پێدەکردو ڕەنگە سووكو ڕسوایيشی بەدوادا بهاتایە، ئەم ژنە سووکە هەردەڵێی ماینە، هەر کە چاوی بەپیاوێك دەکەوێت دەحیلێنێت، ئەگەر نەیشی هێنایە ئەوەیش هەردەبووە داخو حەسرەتێکی ژيانیو، وای بیر لێ دەکردەوە کە بەختەوەریەکی گەورەی لەدەست چوە، پێشەوەی گەرداوو پشتیەوەی هەڵدێر.

—وا مەڵێ، ئاپۆ ئاناگنوستی، هەرکەسێك گوێی لەم قسانەت بێت ئومێدبڕ دەبێت.

—نا، باوکە، مەترسە، بێجگە لەتۆ کەس لێرە نیە گوێی لەم قسانە بێت، تازە ئەگەر گوێیشیان لێ بێت بڕواناکەن، بڕوانە، تا ئێستا کەس هەبوە لەمن بەختەوەر تر؟ من خاوەنی کێڵگە، ڕەز، بێستانی زەیتونو خانووی دووقات بووم، دەوڵەمەند بووم، ژنێکم خۆش ویست چاكو گوێ ڕایەڵو هەر کوڕیشی بۆ دەهێنام، هەرگیز نەم دیوە ئەوژنە سەر

هەڵبڕێتو ڕوو بەڕوو تەماشام بکات، مناڵەکانیشم هەموو باوکێکی باشی خێزانەکانیان، من هیچ گلەییەکم نیە، نەوەی زۆریشم هەن، ئیدی چیم بوێت؟ ڕەگی من لەقوڵیدایە، بەڵام ئەگەر بڕیار بێت سەر لەنوی ژیان دەست پێ بکەمەوە وەك پاڤلێ بەردێك لە ئەستۆم دەبەستمو خۆم دەهاومە دەریاوە، تەنانەت بۆ ئەوانەیش کە بەختەوەرن ژیان هەر سەختە، بەڵێ، ئەم ژیانە سۆزانیە زۆر دڵڕەقە.

–بەڵام ئاپۆئاناگنوستی تۆڵەچیت کەمەو گلەیی لەچی دەکەیت؟

–پێم وتیت هیچ کەمو کەسرێکم نیە، بەڵام تۆ بڕۆو لەدڵی مرۆڤ بپرسە.

کەمێك بێدەنگ بوو، جارێکی تر لەدەریاکە وردبوەوە کەتاریکی چەتری لەسەر هەڵدابوو، پاشان بەدەم ڕاوەشاندنی دارەکەی دەستیەوە وتی:

–چاکە، پاڤلێ، تۆ کارێکی باشت کرد، لێگەڕێ با ژنان قیژەو هاواری خۆیان بکەن، ئەمانە ژننو عەقڵو هەستیان نیە، تۆ ڕزگارت بوو، پاڤلێ، باوکیشت ئەمەدەزانێت، هەر لەبەر ئەوەیشە کە ئاخت بۆ هەڵناکێشێت.

تەماشای ئاسمانو چیاکانی کرد کە وردە وردە تاریکی هەمووی دادەپۆشین. وتی: ئەمەیش شەو، چاکترە بگەڕێینەوە ماڵێ.

کتو پڕ وەستا، وەك لەهەموو قسەکانی پەشیمان بووبێتەوە وابوو، یان پەردەی لەسەر ڕازێکی گەورە لابردبێتو ئێستا بیەوێت بەسەری بکاتەوە.

دەستە ڕەق هەڵاتوەکانی نایە سەرشانمو بەزەردەخەنەیەکەوە وتی:

–تۆ گەنجیت، گوێ لەقسەی پیرەکان مەگرە، ئەگەر دنیا گوێی بۆ قسەی پیرەکان ڕابدێرایە ئێستا وێران ببوو، کەبێوەژنێك هاتە سەر ڕێت بپەڕە سەری، ژن بهێنەو نەوە بخەرەوەو هیچ لەمە دوو دڵ مەبە، هەموو ئەم سەر ئێشانە بۆ لاوەکانە.

* * *

گەیشتمەوە کوختەکەم، ئاگرم کردەوەو چای ئێوارەم لێنا، ماندو و برسی بووم، چڵێسانە دەستم بەخواردن کرد، بەتەواوەتی خۆم دایە دەست ئەو چێژە ئاژەڵیە.

لەناکاو میمیتۆم بینی سەرە بچووكو پانەکانی لەپەنجەرەکەوە هێنایە ژوورەوە، من لەو کاتەدا لەسەر ئەژنۆ دانیشتبووم و نانم دەخوارد، تەماشای کردم، زەردەخەنەیەکی نزۆڵانەی بۆ کردم.

–بۆ هاتوویت، میمیتو؟

–سەرۆک، لای بێوەژنەکەوە شتێکم بۆ هێناویت، زەمیلەیەک پرتەقاڵ، وتی ئەمە دوا بەرهەمی باخەکەیەتی.

من پەشۆکام، پێم وت:

–لای بێوەژنەکەوە؟ جابۆ میوەم بۆ دەنێرێت؟

–دەیوت لەبەر ئەو قسە باشانەی ئەم ئێوارەیە بەخەڵکی گوندی وتبوو.

–کامەیە قسەی باش؟

–من ئیدی نازانم، من تەنیا ئەوەم لەسەرە ئەو چی وتوە دووبارەی بکەمەوە.

زەمیلە پرتەقاڵەکەی ڕۆکردە سەر تەختەی نووستنەکەم، ناو کوختەکە پڕ بوو لە بۆنی خۆش.

–پێی بڵێ زۆر سوپاسی دیاریەکەی دەکەم و بەئاگایشی لەخۆی بێت، دەبێت ئاگای لەخۆی بێت و لەناودێدا دەرنەکەوێت، تێ گەیشتیت؟

پێی بڵێ تاماوەیەک باهەر لەماڵەوە بێت، تا ئەم پێش هاتە لەبیر دەکرێت، تێ گەیشتیت میمیتو؟

–هەر ئەوەندە، سەرۆک؟

–بەڵێ، هەر ئەوەندە، بڕۆرەوە.

میمیتو چاوێکی هەڵتەکاندو وتی:

–وتت هەر ئەوەندە؟

–ئیدی وەلبە.

ئەو ڕۆیشت، پرتەقاڵێکی ئاودارم پاک کرد کە بەشیرینی هەنگوین دەچوو؛ پاڵ کەوتم و نووستم، لەخەوما، هەموو شەوەکە لەژێر دارپرتەقاڵدا پیاسەم دەکرد، گرەیەک هەڵی دەکرد، سنگە ڕووتەکەم پڕدەبوو لە هەوا، چڵە ڕێحانەیەکم نابوە پشت گوێم، لاوێکی گوندیی تەمەن بیست ساڵان بووم و لە باخی پرتەقاڵدا پیاسەم دەکردو فیکەم دەکێشاو چاوەڕێ بووم، چاوەڕێی کێ بووم، نازانم، بەڵام لە خۆشیاندا دڵم دەیویست بوەستێت، سمێڵم بۆ سەرەوە بادەدا، بە درێژایی ئەو شەوە، لەژێر دارپرتەقاڵەکاندا گوێم بۆ دەریاکە ڕادێرابوو کەوەک ژنێک هەناسەی هەڵدەکێشا.

—١٥—

ئەو ڕۆژە ڕەشەبایەکی گەرمو توند، لەو بەری دەریاوە، لەبیابانە لماویەکەی ئەفریقاوە هەڵی کردبوو، هەورگەلێك، کە لەوردە لم پێك هاتبوو، وەك گەردەلوول کەوتبوە ئاسمانو، گەروو سیەکانی مرۆڤی پڕدەکرد، ددانی بەجیرە جیر دێنو چاوی دەسوتاندەوە، دەبوو دەرگاو پەنجەرەکان خڕ دابخەین تا ئەوتیکە نانەی دەی خۆین تۆزو خۆڵی لێ نەنیشێت. هەوا خەفەکەر بوو، لەو ڕۆژانەدا کە ئاوگەی ڕوەك بەرەو سەرەوە دەهاتو لەشی مرۆڤ تەمەڵیو داهێزران دای دەگرت، منیش کەوتبوومە ژێر باری تەمەڵیو بێتاقەتی وەرزی بەهارەوە، واتا دووچاری ماندووبوون، سنگ گیران، مێرووله کردنی هەموو لەش هاتبوومو، حەزم— حەزیان یادوەری؟ لە خۆشیەکی سادەو فراوان بوو.

بەلاڕێ بەردەڵانیەکەی نێو چیادا بەڕێ کەوتم. لەپڕا حەزی ئەوەم لا جووڵا بڕۆمە شارۆچکە کۆنەکەی ((مینوان))[1] کەدوای سێ چوار هەزار ساڵ تازە لەژێر خاکەوە سەری دەرهێنابوو، وائێستا لەژێر خۆرە ئەویندارەکەی کریتا خۆی گەرم دەکاتەوە، بەخۆم دەوت:

ڕەنگە دوای پیادە ڕەویەکی سێچوار سەعاتی ماندوویەتی بتوانێت ئەم لەش گرانیەی بەهارم لە کۆڵ بکاتەوە..

تاشە بەردە ڕەنگ خۆڵەمێشیە رووتەکان = رووتێکی بریسکەدار—و چیا چۆڵو هۆڵ بوو، ئەوەی من حەزی لێ دەکەم ، کوندە پەبوویەك کە تیشکە بەتینەکەی خۆر کوێری کردبوو، بەچاوە زەردو خڕەکانیەوە لەسەر بەردێك هەڵنیشتبوو، حاڵەتێکی ئاغرانەو

---

(1) مینوان MINOAN ناوی دانیشتوانی کۆنی کریتە کە سێ چوار هەزار ساڵ لەوەبەر هەر لەوێ دەژیانو شارستانیەتێکی درەوشاوەیان پێك هێنابوو. —ف—

جوان و ڕاز ئامێزی هەبوو، من لەسەر خۆو هێور ڕێگاکەم دەبڕی، بەڵام کوندەبەبوەکە ترساو بێ دەنگ باڵی گرت و لەنێو بەردەکاندا ونبوو.

هەواکە بۆنی پونگەی دەشتی لێ دەهات، یەکەمین گوڵی زەردو جوانی لەنێو درکەکانەوە کرابوونەوە.

کە گەیشتمە شوێن وێرانەی شارۆچکە کۆنەکە بەسەرسامیەوە لە شوێنی خۆما وەستام، ڕەنگە ئەوکاتە نیوەڕۆ بووبێت، چونکە تیشکی خۆرەکە بەشێوەیەکی ستوونی داکەوتبوە سەر وێرانەکەو شوێنەوارەکەی تەواو ڕووناک کردبوەوە، ئەو سەعاتە سەعاتێکی پڕلەمەترسیە لە وێرانەی شارە کۆنەکاندا، چونکە هەواکەی پڕە لەهاواروتارمایی. هەر ئەوەندەی چڵێک بچرکێت، مارمێلکەیەک بخشێت، هەورێک تێپەڕێت و سێبەر بکات ترسێک دەکەوێتە دڵی مرۆڤەوە، هەر بستۆکە خاکێک پێی پیا دەنێیت گۆڕی مردوویەکەو دەست بەهاوار دەکات.

وردە وردە چاوم بەتیشکە زۆرەکە ڕاهات، ئێستا لەنێو ئەم وێرانەیەدا هەست بە دەستی مرۆڤ دەکەم" دووشەقامی پان کە بە بەردی سپی بەرد ڕێژکرابوون، لەچەپ و ڕاستیانەوە کۆڵانی تەنگ و پێچاو پێچ جیا دەبوونەوە، لەناوەڕاستا، گۆڕەپانێکی بازنەیی هەبوو کە جێگای کۆبوونەوەی گشتیبوو، هەر لەپاڵیاو وەک پەیڕەویەک لە سیمای دیموکراتی، کۆشکی شاهانەو، دووڕیز ئ.. توون و، پلیکانەی بەردینی پان و، حەوشەو دیواری تر دروست کرابوون.

لە ناوەڕاستی شاردا، لەو شوێنەدا کە بەردەکان زیاد لەهەر جێگایەکیدی بەهۆی بەسەردا ڕۆیشتنی خەڵکەوە سوابوون، پێ دەچوو پەرستگایەک هەبووبێت، گەورە خواوەندێک بەمەمکی بەرجەستەی دوورلەیەکدیو، باسکی لەگەڵ ماراندا لوول خواردوو لەپەرستگاکەدا بووبێت.

لەهەموو شوێنێکدا شوێنەواری دوکان و مەخزەنی ڕۆن و زەیتون گیری و ئاسنگەری و دارتاشی و کارگەی گۆزەگەری دیاربوون، هێلانە مێروولەیەک بوو کە وەستایانە دەستێکی شارەزاو بەهرەمەند لە پەنایەکی ئەمیندا دروستی کردبوو، لەهەزاران ساڵی لەوەو بەرەوە مێروولەکان نابوود ببوون و نەمابوون، لەدوکانێکدا هونەرمەندێک سەرقاڵی هەڵکۆڵینی

گۆزەیەکی دوودەست بووە لەبەردێکی ڕەگاویدا، بەڵام بواری تەواو کردنی نەبوە، قەڵەمی هەڵکۆڵینەکەی لەدەست کەتووەو هەزاران ساڵ دوای ئەوە، لەنزیک کارە ناتەواوەکەیدا دەرکەوتبوەوە.

ئەو پرسیارانەی کە بێ هوودەو گەلۆرانە، هەمیشە بەرکت پێ دەگرن: بۆ؟ لەبەرچی؟ جارێکی دی دێنەوە سەرینی مرۆڤو دڵ ژەهراوی دەکەن، ئەو گۆزە تەواو نەکراوە، کەتواناو شەوقی ئەو مامۆستا هونەرمەندە، لە لووتکەی شادمانیو ئاسودەیی خۆیدا، بەسەریەوە وردو خاش ببوو، منی کێشایە ناو خەمو ئازارێکی بێ ئەندازەوە.

لەناکاودا، شوانێکی منداڵ کار، کە دەمو چاوی خۆر سوتاندبووی‌و ئەژنۆی ڕەش داگەڕابوو، قژە لوولەکەی بەدەستە سرێکی ڕیشوەدار بەستبوو، لەپاڵ ئەو کۆشکە کاولەدا بەسەر بەردێکەوە قوت بوەوەو هاواری کرد:

—هێی، هاوڕێ!

من حەزم بەتەنیایی بوو، خۆم لێ نەبان کرد، بەڵام شوانە مێردمناڵەکە پێکەنینێکی گاڵتە ئامێزی کردو وتی:

—خۆت مەکە بەکەڕ، هاوڕێ؟ جگەرەت پێیە؟ جگەرەیەکم بدەرێ چونکە لەم دەشتەدا خەم تەواو دڵی گرتووم.

ئەمەندە کاریگەرانە وشەکانی دوایی بەسەر زماندا ڕەت بون کە دڵم پێ سوتا، جگەرەم پێ نەبوو، ویستم پارەی بدەمێ، بەڵام تاڵی لێ گوزەراو هاواری لێ هەستا:

—پارەم بۆ چیە؟ بۆ دۆزەخ، کەی پارە بەکاری من دەخوات؟ من پێم وتیت خەم دای گرتوومو پێویستم بەجگەرەیەکە.

نا ئومێدانە وتم: پێم نیە، جگەرەم لا نیە.

شوانەکە بە تووڕەییەوە نووکی دارەکەی دەستی بەزەویەکەدا کێشاو هاواری کرد:

—پێت نیە! پێت نیە! ئەی چی لەگیرفانەکانتایە وا هەڵئاوساون؟

من بەدەم دەرهێنانی هەموو شتەکانی ناو گیرفانمەوە پێم وت:

—کتێبێك، دەستەسرێك، کاغەزو قەڵەم، چەقۆیەك، چەقۆت ناوێت؟

-هەمە، هەمووشتێکم هەیە، نان، پەنیر، زەیتون، چەقۆ، درەوش، چەرم بۆ پێڵاوەکانمو مەتارەیەکی ئاو، بەکورتی هەمووشتێکم هەیە، تەنیا جگەرە نەبێت، ئەمە وەك ئەوە وایە هیچم نەبێت، باشە، ئەی تۆ لەناو ئەم وێرانەیەدا چی دەکەیت؟

-تەماشای شوێنە درێنەکان دەکەم.

-چی لێ تێ دەگەیت؟

هیچ.

منیش هیچیان لێ تێناگەم، ئەوان مردونو ئێمە زیندوین، چاکتر وایە بچیت بەلای کاری خۆتەوە، برۆ، خوات لەگەڵ.

لەوە دەچوو رۆحی ئەو جێگا بێت، بۆیە وامنی دەردەکرد، منیش بێ سێودوو پێم وت: چاکە ، دەڕۆم.

بەهەمان کوێرە رێدا بەرەودوا گەڕامەوە.

بۆ چرکە ساتێك ئاورم دایەوە، شوانە ڕوواڵە[٢] خەم داگرتوەکەم بینیەوە کە لەسەر هەمان بەرد وەستابوو، قژە لوولەکەی لەژێر دەستەسرە ڕەشەکەوە هاتبوە دەرێو لەگەڵ بای باشوردا چەپۆکانی بوو، لەتەوێڵیەوە تا نووکی پێی ڕووناکی لێ دەباری، وام هەست دەکرد لە پەیکەرێکی جۆش خواردوی جوانی ڕاماوم، وا ئێستا داری شوانیەکەی لەسەر شانەو فیکە دەکێشێت.

من رێگایەکی ترم لەبەر گرتو بەرەو کەناری دەریاکە لێژ بوومەوە، جار ناجارە نەسیمێکی گەرمو بۆن خۆش کە لە باخە نزیکەکانەوە دەهات بەسەرماتێدەپەڕی، زەوی بۆنی عەتری دەدا، دەریا پێ دەکەنیو، ئاسمانی شینیش بریسكو هوڕی پۆلای هەبوو.

زستان جەستەو گیانمان دەپوکێنێتەوە، بەڵام وا گەرما کە سنگمان دەکاتەوە بەرێگاوەیە، من هەر بەدەم رۆیشتنمەوە لەناکاو بە ئاسمانەوە گوێم لە کۆمەڵێك دەنگی گڕی باڵندە بوو دەنگەکان هەر لە غاك غاکی قەلەڕەش دەچوون، سەرم بەرزکردەوە، ئەو دیمەنە سەر سووڕهێنەرەم بینی کە لە سەردەمی منالیمەوە تا ئێستا هەمیشە کاری لێ کردووم، قازو قولنگەکان وەك لەشکرێکی رێكو پێکی جەنگ لەناوچەکانی گەرمیانەوە

دەگەڕانەوەو، وەك لە ئەفسانەیشدا باس کراوە پەرەسێلکە یان لەسەر باڵی خۆیان و لەنێو کونە قووڵەکانی لەئیسکینەکەیاندا هەڵگرتوە،

ئەم ئاهەنگە ڕێك و پێك و هەڵە قبووڵ نەکەرەی ساڵ، ئەم چەرخ و فەلەکی گەردوونە، هەرچوار ڕووەکەی زەوی کە تیشکی خۆر بەدوای یەکدیدا ڕووناکیان دەداتێ، تێ پەڕینی ژیان، هەموو ئەمانە، یەك بەدوای یەکدا خستمیانەوە ناو گەرووی خەم و پەژارەکانەوە، جارێکی دی، ئەم بەئاگاهێنانەوە سەرسوڕهێنەرە. ڕەنگ و زایەڵەی قاز و قولنگەکان ئەوەیان لە مندا ورزژاند کە ئەم ژیانە تاقە ژیانی مرۆڤە و هیچ ژینێکی تر لەدوای ئەمەوە نیە، ئەگەر بمانەوێت تام و خۆشی بچێژین تەنیا لەم دنیایەدایەو هیچی تر. چ دەرفەتێکی خۆشی ترمان لەدنیاکەی دیدا بۆ نارەخسێت. [٢] ئەو ڕۆحەی گوێی لەم بەئاگاهێنانەوە دڵڕەقانە بێت، کە لە هەمان کاتدا پڕیشە لەدڵسۆزی، بڕیار ئەدات کە بە سەر خراپی و لاوازیەکانی خۆیدا سەربکەوێت و، تەمەڵی و ئومێدە بێ ئەنجامەکانی ببەزێنێت و، هەردوو دەستی، بەهەموو ئەو چرکە ساتانەی ژیانیەوە بگرێت کە بەردەوام هەڵدێن و ناگەڕێنەوە.

لە زەینی ئێمەدا گەلێك نموونەی گەورە و ئاشکرا هەن، ئەوەمان بۆ دەردەخەن کە مرۆڤ بێجگە لە گیاندارێکی سەرلێشێواو چی تر نیە، تەمەنیشی بە لەزەتی زۆر بچووك و هەوڵی نادروست و قسەی بێ مانا بەسەر دەبات، مرۆڤ دێتە سەر ئەوەی هاواربکات: ((ئای لەم ڕسواییە)) و ئیدی لێوی خۆی بگەزێت.

قاز و قولینگەکان ئاسمانیان بڕی و لەباکووردا ون بوون، بەڵام لە هەموو فڕینی بەردەوامیاندا، لەهەر شوێنێکدا ئەوان باڵیان پێکدا بدایە ئەو هاوار و ناڵەیەیان هەمیشە لە گوێی مندا دەزرنگایەوە، گەیشتمە سەر دەریاکە، لەکەناردا پێم هەڵگرت، چەند ناخۆشە بەکەنار دەریادا بڕۆیت و بەتەنیا بیت! هەموو شەپۆل و باڵندەیەکی ئاسمان هاوارت لێ دەکەن و ئەرکەکانت بەیاد دەهێننەوە. کە لەگەڵ کەسانی تردا بڕۆیت هەموو پێکەوە

---

ماموستای خوالێخۆشبوو محەمەمەدی قازی بۆ ڕوون کردنەوەی ئەم مەبەستە دێڕە شیعرێکی فارسی خەیامی لە پەراوێزدا نووسیوە کە ماموستا شێخ سەلامی شاعیر بەم شێوەیە کردویەتی بە کوردی:

ئەم نەقدە بگرە، ئەو قەرزە بەردە کە دەنگی دەهۆڵ هەر لەدوور خۆشە

پێدەکەنو دەدوێن، ئیتر ئەم دەنگانە لەوەت دەکەن گوێ بۆ دەنگی شەپۆلو باڵندەکان بگریتو بزانیت چی دەڵێن، ڕەنگە هیچیش نەڵێنو، هەر ئەوەندە بتان بینن ئێوە لە ڕۆیشتنو چەنەبازیدان، تەنیا تەماشاتان بکەنو بێدەنگ بن.

لەسەر وردە بەردەکان ڕاکشامو چاوم لێکنا، لەگەڵ خۆمدا وام بیرکردەوە کە : ((ئەم ڕۆحە چیەو چ پەیوەندیەکی نهێنی لە نێوان ئەوو دەریاو هەورو بۆنە خۆشەکاندا هەیە؟ هەر دەڵێیت خودی ڕۆحیش دەریاو هەورو بۆنی خۆشە ..)).

هەستامو کەوتمەوە ڕێ، وەك بڕیارێکم دابێت، چ بڕیارێك؟ نازانم.

لەپڕا لەپشت سەرمەوە گوێم لە دەنگێك بوو:

–بۆکوێ دەچیت، سەرۆك؟ بۆ دێر؟

ئاوڕم دایەوە، پیرەمێردێکی بەخۆوەی کورتە باڵابوو، داری لەدەست نەبوو، دەستە سڕێکی ڕەشی بە قژە سپیەکەیەوە بەستبوو، پێ دەکەنیو دەستی بۆ ڕادەوەشاندم، پیرێژنێك بەدوایەوە بوو، لە پشت ئەویشمەوە کچە ڕەشتاڵە چاو گەورەکەیان کە لە چکێکی سپی بەسەرەوە بوو، پیرەمێردەکە دیسان پرسیەوە: بۆ دێر دەچیت؟

خۆیشم ئەوەم هاتەوە یاد کە بڕیاری ئەوێم دابوو، چەند مانگێك بوو حەزم دەکرد بڕۆمە ئەودێرە بچووکەی ڕەبەنانەوە کەلەنزیك دەریاکەوە دروست کرابوو، بەڵام تا ئەوسا نەم توانیبوو ئەوخواستەم بهێنمە دی.

وا لە ناکاو، ئەم ئێوارەیە جەستەم بڕیارەکەیدا بوو.

لەوەڵامدا وتم:

–بەڵێ دەچمە دێرێ تاگوێ لەسروودی مریەمی پاکیزە ڕاگرم.

–هیوادارم ئەو حەزرەتە دەستی بەباڵتەوە بێت.

هەنگاوی هەڵگرتو گەیشتە لام.

–تۆ ئەو کەسەیت، ئەوەی پێی دەڵێن کارگەی خەڵوز؟

–بەڵێ ، خۆمم.

–چاکە، مریەمی پیرۆز خێرت بەسەردا بڕژێنێت، تۆ چاکە لەگەڵ خەڵکی ئەم گوندەدا دەکەیتو هەژاروخێزاندار دەژێنیت، خوات لێ ڕازی بێت.

دوای کەمێك، پیرەی زۆر زان، کەبێگومان دەیزانی کاروبارمان ڕوو لە کەسادیە بۆ دڵدانەوەم ئەم قسانەیشی کرد:

-کوڕم، ئەگەر تۆ قازانجیشی لێ نەکەیت دڵگران مەبە، ئەوە بزانە کە زەرەر ناکەیت، یەکسەر ڕۆحت بۆ بەهەشت دەچێت.

-منیش هەر ئەمەم مەبەستە، باوە گەورە.

-من ئەو خوێندەواریەم نیە، بەڵام جارێك لەکڵێسا شتێکم لە پەیڤەکانی مەسیح بیست کە لە مێشکمدا هەڵکەنراوەو هەرگیز لە یادی ناکەم، مەسیح فەرموویەتی:

((چیت هەیە بیفرۆشە بۆ ئەوەی مەزنترین گەوهەر بکڕیت)).

ئەو گەوهەرە مەزنەیش، کوڕم، ڕزگاری ڕۆحە، تۆیش بۆ بەدەست هێنانی ئەو گەوهەرە مەزنە ڕێگایەکی باشت لەبەرگرتوە.

گەوهەری مەزن! چەند جار ئەم ناوە لە تاریکایی زەینی مندا، وەك دڵۆپە فرمێسکێکی درشت درەوشاوە بێتەوە چاکە؟

هەردووکمان، منو پیرە لە پێشەوە دەڕۆیشتینو ژنەکان لە دوامانەوە، ژنەکان دەستیان وەك خاچ لێ کردبوو، ئێمە جار جارە ڕستەیەکمان دەهاویشت : ((چرۆی زەیتوون هەر دەبارێت؟)) لەوەی دەکرد هەردووکمان برسیمان بێت، چونکە باسەکەمان هەر دەوروخولی خواردنی دەداو نەمان دەویست بیگۆڕین.

-تۆ چ خواردنێکت لە هەموو پێ خۆشترە، باوە گەورە؟

-هەموو خواردنەکان، کوڕم، هەمووی، ئەوە گوناهێکی گەورەیە مرۆڤ بڵێت ئەم خواردنە باشەو ئەویان خراپە.

-بۆ؟ مرۆڤ بۆی نیە هەڵبژێرێت؟

-بێگومان نەو، هەقی ئەوەی نیە.

-ئاخر بۆ؟

-لەبەر ئەوەی خەڵکانێکی برسی هەن.

من شەرمم پێهاتو بێدەنگ بووم، هەرگیز دڵی من تا ئەم ڕادەیە گەورەیی‌و سۆزی بە خۆیەوە نەدیبوو.

زەنگی دێرە بچووكەكە لێیدا، هێندە دەنگێكی دڵگیرو بەسۆز بوو دەت وت دەنگی ناسكی ژنێكە.

پیرەكە نیشانەی خاچی كێشاو لەبەر خۆیەوە گوتی:

–ئەو پاكیزەیەی بوو بە قۆچی قوربانی پشتو پەنامان بێت، چەقۆیەك لەگەردنی دراوە هەر خوێنی لێ دەچۆڕێت، لەسەردەمی دزەكانی دەریادا...

پیرە لەبارەی مریەمی پاكیزەوە چیرۆكی وای دروست دەكرد وەك باسی ژنێكی ڕاستەقینە بكات وا بوو، كچێكی جوانو ئاوارەی ئازار چەشتوو، كە كافرەكان بەرخەنجەریان دابێتو، ئەویش بەگریانەوە لەگەڵ كوڕە منداڵەكەیدا لەخۆر هەڵاتەوە هاتبێت.

پیرەمێرد بەردەوام بوو.

–ساڵی جارێك، خوێنێكی گەرمو ڕاستەقینە لەزامەكانیەوە دا دەچۆڕێت، لەبیرمە جارێكیان، لەڕۆژی جەژنی ئەو حەزرەتەدا، ئەوسا كە هێشتا من سمێڵم نەكردبوو، خەڵكی بۆ زیارەتی ئەو لە هەموو گوندەكانەوە هاتبوون، ئەو ڕۆژە پانزەی مانگی ئاب بوو، ئێمەی پیاوان بۆ نووستن لە حەوشەكەدا ڕاكشابووین، ژنان لە ژوورەوەی دێردا بوون، من لەخەوەكەمدا مریەمی پاكیزەم بینی هاواری دەكرد، بەپەلە هەستام، گەیشتمە لای پەیكەرەكەیو دەستم نایە سەرملی، تۆ بڵێ چیم دیبێت باشە؟

هەموو پەنجەكانم لە خوێن هەڵكشان...

دیسان پیرە نیشانەی خاچی كێشایەوە، ئاوڕی دایەوەو سەیری ژنەكانی كرد، هاواری لێ كردن:

–دەی، پێ هەڵگرن، ژن گەل، واگەیشتین.

كەمێك دەنگی نزم كردو دیسان وتی:

–ئەوسا من ژنم نەهێنابوو، لەبەردەم پەیكەرەكەی ئەومەزنەدا لەسەردەم كەوتمو بڕیارمدا لەم دنیا پڕ لەدرۆو دەلەسەیە واز لێ بێنمو ببم بەقەشە.

لێرەدا دەستی بەپێكەنین كرد

وتم : بۆ پێدەكەنیت، باوەلێ؟

—ئاخر پێکەنینی گەرەکە، کورم، هەر ئەو ڕۆژی جەژنە، شەیتان بەبەرگی ژنانەوە لەبەردەممدا قوت بوەوە، ئا ئەوەتا..

بێ ئەوەی ئاوڕبداتەوە تەنیا بەپەنجە کەڵەی ئامازەی بۆ دواوە کرد، ئەو پیرێژنەی نیشاندام کەبی دەنگ بەدوامان کەوتبوو، وتی:

—ئێستا هەرکەس بیبینێت دڵی تێکەڵ دێت، تەماشایکە، ئەوسا کچێکی جوان بوو، وەك ماسی لە هەڵبەزو دابەزابوو، خەڵکی ناویان لێ نابوو:

((جوانی پێڵو درێژ)) بەڕاستیش ئەمە ناوێکی پڕ بەپێستی ئەو گەرۆڵە بوو، ئێستایش، ئاخ، ئێمەی داماو، ئەو پێڵوی چاوانە چیان لێ هات؟ هەموویان وەرین.

لەو چرکە ساتەدا، لەپشت سەرمانەوە، ڕێژن وەك سەگێکی دڕ کە زنجیر کرابێت نووزەیەکی لێوەهاتو هیچی نەوت:

پیرەمێردەکە بەدەستی ئامازەی کردو وتی:

—ئەمەیش دێرەکەیە.

ئەو دێرە بچووکە سپی پۆشە، کە لە کەناری دەریاو لەنێوان دوو تاشە بەردی گەورەدا دەبریسکایەوە، لەناوەڕاستا، گومەزی دێرەکە کەتازە سپیکاریان کردبوو وەك مەمکی ژن بچووكو خڕبوو، لەدەوری دێرەکە پێنج شەش ژووری دەرگا شین هەبوون، لە حەوشەیشدا. سێ داری سەروی گەورەو، بەدرێژایی دیوارەکنیش دار هەنجیری گەورەی کێوی دەکەوتنە بەرچاو.

ئێمە هەنگاومان داگرت، لاوژەی سروودە ڕۆحانیەکان لە پەنجەرە کراوەکانی دێرەوە دەگەیشتە لامان، هەوایش لێوان لێو بوو لە بۆنی خۆشی جەوی‌و شێی دەریا، دەرگای دەرەوەی گومەز بەسەرەکەی، کە کەوتبوە ناوەڕاستی دێرەکەوە، بەسەر حەوشە پاکژو بۆن خۆش‌و بە بەردی سپی‌و ڕەش فەرش کرابوەوە، بەدرێژایی دیوارەکانی لای ڕاست‌و چەپ، ریزە گوڵدانێکی گەڵای پەژم‌و گۆشەملەو ڕێحانە دانرابوون، چ هێوری‌و شادیەك! وائێستا خۆر بەرەو ئاوابوون دەچێت‌و دیوارە سپیەکانیش ڕەنگی گوڵ دەگرن.

دێرە بچووکەکە گەرم‌و کەمەکێکیش رووناك‌و بۆنی مۆمی لێ دەهات، ژن‌و پیاو پێچرابوونە دووکەڵی بخوورەوە، پێنج شەش ڕاهیبەی ژنیش کە خۆیان لەبەرگی ڕەش‌و

درێژی تەنكەوە پێچابوو، بەدەنگی نزمو خۆشەوە سروودی (خودای مەزنو بەتوانا) یان دەوت، ئەمانە زوو زوو ئەژنۆیان دەكوتاو دەنگی خشەخشی داوێنیان لەدەنگی باڵەگتنی مەل دەچوو.

ساڵانێك بوو من گوێم لە سروودەكانی مریەمی پاكیزە نەبوو بوو، لەگوڕو فیزی لاویدا ڕكم لەكڵێسا دەبووەوەو كەبەلایدا دەڕۆیشتم بەچاوی سووكەوە لێم دەڕوانی، بەڵام زەمان نەرمی كردبووم، تەنانەت هەندێك جار دەچوومە ئاهەنگە شكۆمەندە ئاینیەكانی وەك لەدایك بوونو ڤیجیل[٤] و ژیانەوەی مەسیحو، وەك ئەوەی جارێكی دی منداڵێك لەناوەوەی مندا زیندو بووبێتەوە خۆشیم وەردەگرت. تەزوە سۆفیانەكەی ساڵانی پێشتر گۆڕابون بەچێژێكی جوان ناسی، مرۆ وەحشیەكان بڕوایان وایە، هەركاتێك سازێك لە سازەكانی مۆسیقا بەكەڵكی سرووتە ئاینیەكان نەخوات، ئەوە هێزە خوایەكەی لە دەست دەداتو ئاهەنگەكەی خۆش دەبێت، لەمنیشدا پلەی ئایین هاتبوە خوارێو ببوو بەهونەر.

چوومە سووچێكەوە، پاڵمدایە ئەو كورسیە بریقەدارەوە كە ئایندارەكان هێند دەستیان پیا هێنابوو، وەك عاج سفتو سۆڵ ببوو، وەك ئەفسوون لێكراوێك، گوێم لە سروودەكانی سەردەمی بێزەنتی گرتبوو كە لە قووڵایی زەمانەوە دەهات ((سڵاو ئەی ئەو شكۆمەندەی كە بیری مرۆڤت ناگاتێ، سڵاو ئەی ئەو قووڵاییە بێ كۆتاییەی كە چاوی فریشتەیش ناتوانێت بتبینێت، سڵاو ئەی ژنی خوا كە هەر بەكچی مایتەوە، ئەی ئەو گوڵە سوورەی كە هەرگیز هەڵناوەریت))

دیسان ڕاهیبەكان كڕنووشیان دەبردو خشەخشی جلەكانیان لە دەنگی باڵی مەل دەچوو.

دەقیقە بە دوای دەقیقەدا تێ دەپەڕی، وەك ئەو فریشتانەی باڵیان بۆنی عەتری جەوی گرتوەو، خونچە نەكراوەكانی گوڵە سۆسەنیان لە دەست دایەو درووود بۆ جوانی مریەم دەنێرن.

---

[٤] Vigile ڕۆژی پێش هەر جەژنێكی گەورەی ئاینی لە مەسیحیەكان .-ف-

خۆر ئاوابون، ئێمەی لەناو شەفەقێکی مەخمەڵیو شیندا بەجێ هێشت، نازانم چۆن خۆمان لەناو حەوشەکەدا دیەوە، من لەگەڵ پیرە دایکی رۆحانی کەسەرپەرشتی دێرەکەی دەکردو دوو کچە راهیبەی تردا، لەژێر بەرزترین داری سەرودا بەتەنیا مابوومەوە، کچە راهیبەیەکی تازە کار هات، کەوچکێك مرەباو ئاوی ساردو قاوەیەکی دامیو لەسەر خۆ کەوتینە قسە کردن باشی موجیزەکانی حەزرەتی مریەمو خەڵوزی بەردو ئەو باڵندە ماڵیانەی کە لەبەهاردا دەکەونە هێلکەکردن، هەروەها باسی خوشکی رۆحانی ئۆدوکسیا[٥] کە نەخۆشی فێی لەگەڵدا بوو، ئەو بێچارەیە لەسەر بەرد رێژی دێرەکە کە تبوو، وەك ماسی هەڵدەبەزیەوە، گازی لەدەستی خۆی دەگرتو جلەکانی دادەدڕی.

دایکە رۆحانیەکە هەناسەیەکی هەڵکێشاو وتی:

—تەمەنی سیوپێنج ساڵە، ئەمە تەمەنێکی سەختو مەلعوونە سەعاتەکانی ناخۆش تێ دەپەڕن، بەڵکوو خانمی شەهید، حەزرەتی مریەم بەفریای بکەوێتو چاك ببێتەوە، تا دەپانزە ساڵی تر چاك دەبێتەوە.

من بەسەرسامیو لەژێرلێوەوە وتم: دە پانزە ساڵ!

دایکی رۆحانی تەنگەگرتیو وتی:

—بۆ دەپانزە ساڵ چیە؟ تۆ بیر لە نەمری بکەرەوە.

وەڵامیم نەدایەوە، دەمزانی نەمری ئەو دەقیقانەن کەتێ دەپەڕن. دەستە گۆشتنو سپیەکەی دایکی رۆحانیم ماچ کرد کە بۆنی بخووریان لێ دەهات، ئەنجا رۆیشتم.

شەو داکەوتبوو، دووسێ قاڵاو بەپەلە بۆ هێلانەکانیان دەگەڕانەوە، کوندە بەبوەکان بۆخواردن لە کلۆرەدارەکانەوە دەهاتنە دەرێ، هێلکە شەیتانۆکە، کرمی ترو درەخت، کرو مشکەکانی دەشت لەخاك وەردەکەوتن تاببنە خۆراکی کوندە بەبوەکان.

مارێکی بەنهێنی کەکلکی خۆی دەگەزێت تێم ئاڵابوو، زەوی دەزێو بێچوەکانی خۆی دەخوات، پاشان بەچکەی تری دەبێتو ئەوانیش هەر بەوجۆرە دەخوات.

تەماشای ئەم لاو ئەولای خۆم کرد، دنیا تەواو تاریك بوو، دواکەسی گوندەکە رۆیشتبوو، تەنیاییەکی زۆر کڕو کەس منی نەدەبینی، پێڵاوم داکەند، پێم لەناو ئاوەکەدا

Eadoxia

نوقم كرد، لەسەر زیخەكە ڕاكشام، هەستم دەكرد لەشی ڕووتم پێویستی بەوەیە بەربەردو ئاووهەوا بكەوێت، وتەی دایكە ڕۆحانیەكە ((نەمری)) رقی داگیرساندبووم، وای لێ دابووم هەستم دەكردئەو كەمەندەیە كەئەسپی كێویی پێدەگرن، ڕاپەڕیم تا لەكۆڵ خۆمی بكەمەوە، هەستم كرد پێم خۆشە بەلەشی ڕووتو سنگ بەسنگەوە زەویو دەریا هەست پێ بكەمو، بگەمە ئەو یەقینەی كەئەم شتە كاتیو خۆشەویستانە وجودیان هەیە.

لەقولایی دەروونمدا هاوارم له خۆم كرد :((تەنیا تۆیت بوونت هەیە، ئەی زەوی، من دوا منداڵی خۆتم كەشیری مەمكت دەمژمو بەری نادەم، تۆ ناهێڵیت زیاد لە چركە ساتێك من بژیم، بەڵام هەر ئەو چركە ساتە دەبێتە مەمكو من دەیمژم))

مووچركێكم پیا هات، وەك ڕوو بەڕووی مەترسیەك بووبێتمەوە وابوو، دەمزانی كە وشەی مرۆڤ خۆری -نەمری- بەرەو خۆیم كێش دەكات، ئەوە لەبیری خۆم هێنایەوە كەزەمانی ڕابوردو -كەی؟ ڕەنگە ساڵی پار بێت- بەپەرۆشەوە، بەچاوی بەستراوو چاوی كراوەوە بەسەر ئەو وشەیەدا دەچوومەوەو، هەر بەو شەوقو ئارەزوەوە خۆم فڕێ دەدایە ناویەوە.

كە لەقوتابخانەی گوند لەپۆلی یەكەمی سەرەتاییدا بووم، لەبەشی دوەمی كتێبی ئەلفو بێكەماندا بەشی خوێندنەوەی چیرۆكێكی فریشتەكانی تیابوو:

منداڵێكی بچووك كەوتبوە بیریكەوە، لەوێدا شارێكی سەر سوورهێنەری دیبوو، كە پڕ بوو لە باخی پڕ لە گوڵی بۆن خۆشو، دەریاچەیەكی هەنگوینو گردێك شیر برنجو بووكەڵەی یاری جۆراوجۆری منداڵانە، من كە لەسەرخۆ وشەكانم حینجە دەكرد لە گەڵ هەر حینجە كردنێكدا زیاتر دەچوومە ناو قووڵایی چیرۆكەكەوە، تا نیوەڕوانێك كە لەقوتابخانەوە بۆ ماڵ گەڕامەوە، چوومە پاڵ بیری ناوحەوشەكەمان كە لەژێر كەپرێكی مێودا بوو، زۆر بەشەوقو تاسەوە كەوتمە تەماشاكردنی ئاوە پاكو بێگەردەكەی، زۆری نەبرد وا هاتە پێش چاو كەمن ئەو شارە سەرسوورهێنەرە بەخانوو كۆڵانو منداڵانو ئەو كەپرە پڕ لەترێ یەوە دەبینم، ئیدی خۆم بۆنەگیرا، سەرم بۆناو بیرەكە لار كردەوە، باڵم كردەوەو پێم بە زەویەكەدا كێشا تا بەرز ببمەوەو خۆم فڕێ دەمە بیرەكەوە، بەڵام لەوكاتەدا دایكم بینیمی، قیژاندیو ڕای كردە سەرمو پشتێنی گرتم.

کەمنداڵ بووم خەریکبوو بکەومە بیرەوە، کەگەورە بووم خەریك بوو بکەومە ناو واژەی–نەمری–و واژەگەلێکی تری وەك (خۆشەویستی)و (ئومێد) و (نیشتمان) و (خوا)وە، کە لە هەروشەیەکیان تێ دەپەڕیم هەستم دەکرد لەمەترسیەك رزگار بوومو هەنگاوێك چوومەتە پێشێ، بەڵام نا، من تەنیا وشەکانم دەگۆڕیو ئەمەم بەڕزگار بوون دەزانی، وا دووساڵی تەواویشە کەوتوومەتە دوای واژەی –بودا–وەو پێوەی بەستراومەتەوە، بەڵام چاك هەست بەوە دەکەم کە بەهۆی بوونی زۆرباوە–بودا– دوابیرو دوا وشەی هەڵدێر دەبێتو ئیتر لەمەودوا بۆ هەمیشە رزگار دەبم.

–بۆ هەمیشە؟ ئەمەهەمان ئەو قسەیەیە کەهەموو جارێك بەخۆمانی دەڵێین.

لە جێگاکەم ڕاپەڕیم، لەتەوقی سەرمەوە تا نووکی پێم شادو دڵ خۆش بووم، جلەکانم لەبەرداکەندو خۆم دایە نێو دەریاوە، شەپۆلە شۆخو شەنگەکان شێتانە یاریان دەکرد، منیش هەر شێتانە گەمەم لەگەڵ دەکردن، کەماندووبووم هاتمەدەرێ، لەبەر شەوبا لەشم وشك کردەوەو، پاشان بەهەنگاوی گەورەو هێور کەوتمە ڕێ، بەوهەستەوە کە لەمەترسیەکی گەورە رزگارم بوو لەجاران توندوتۆڵ تر بەمەمکی زەویەوە نووسام.

-١٦-

هەر ئەوەندەی چاوم بەكەناری لینیت كەوت لەناكاودا وەستام، چرای كۆختەكە داگیرسابوو، لەگەڵ خۆمدا بیرم كردەوە:((بێگومان زۆربا گەڕاوەتەوە))

ویستم ئەو ماوەی رێگایە بەڕاكردن ببڕم، بەڵام خۆم گرت، بەخۆم وت:((دەبێت شادیەكەم دەرنەخەم، دەبێت خۆم تووڕە بكەم‌و سەرەتا لەگەڵیا بەشەڕبێم، من ئەوم بەكاری پەلە ناردبوە ئەوێ‌و ئەو هەمو پارەكەی لەهەوەس‌و ئارەزووی خۆیدا خەرج كردوەو داویەتە كچانی گۆرانی بێژی مەیخانە، وائێستایش دوای ئەوەی دوانزە رۆژ دواكەوتوە گەڕاوەتەوە، دەبێت خۆم تووڕە بكەم، بەڵێ، دەبێت وابكەم....))

هەنگاوم هێور كرد تا ڕكەكەم پێ بگات، هەوڵمدا خۆم تووڕە نیشان بدەم، ناوچاوم پێكداداو مشتم گرێ كرد، ویستم هەموو هەڵسوكەوتی مرۆڤێكی تووڕە لە خۆ بگرم، بەڵام سەر نەكەوتم. بەپێچەوانەوە، چەندە لەكۆختەكە نزیكتر دەكەوتمەوە شادمانتر دەبووم.

وردە وردە نزیك كەوتمەوەو لە پەنجەرە بچووكە ڕووناكەكەوە تەماشای ژوورەوەم كرد، زۆربا كەوتبوە سەرئەژنۆ، ئاگری نابوە وەجاخەكەوەو قاوەی دروست دەكرد، دڵم خۆی نەگرتوو هاوارم كرد: زۆربا. كت‌و پڕ دەرگاكە كرایەوەو زۆربا هاتە دەرێ پێ پەتی‌و بێ كراس سەری كێشایە تاریكیەكەو چاوی پێم كەوت، باوەشی كردەوە، بەڵام زوو خۆی گرت‌و دەستی شل بوو، بەدەنگێك كە دوودڵی تیا دەبینرا، كاتێك سەروچاوی هێنابوە پێشێ‌و بەرانبەرم بی جوڵە وەستابوو وتی :

-دڵ خۆشم بەبینینەوەت، سەرۆك.

ویستم دەنگم گرتر بێت، بەتەوسێكەوە پێم وت:

-منیش دڵخۆشم كە ئاخری زەحمەتی گەڕانەوەت كێشا، نزیك مەكەوە، بۆنی سابونی عەتراویت لێ دێت.

لەبەر خۆیەوە وتی :

—ئاه ، سەرۆك، خۆزگا دەتزانی چەندم خۆشتوه، چەندە خۆم ساویوه، پێش ئەوەی بگەمە لای جەنابت چەندم لفکە لەم پێستە نەحلەتیەداوە، بڕوانە، سەعاتێکە دەمەوێت خۆمی لێ پاك بکەمەوه، بەڵام ئەم بۆنە نەحلەتیە... بەهەرحاڵ چی لێ بکەم؟ ئەمە یەکەم جاری نیە، بەڵام بیەوێتو نەیەوێت هەردەبێت بڕوات.

من کە لەوەدا بووم بدەمە قاقای پێکەنین پێم وت : ((با بچینە ژوورێ، چووینە ژوورەوە، ژوورەکە بۆنی عەترو پۆدرەو سابوونو بۆنی ژنی لێ دەهات، کەلەسەر سندوقەکە چاوم بەریزێك جانتای دەستی ژنانەو قاڵبەسابوونی عەتریو، گۆرەویو چەترێکی سووری خۆر ڕەنگو شووشە عەترێکی بچووك کەوت، هاوارم لێ هەستا:

—باشە، بیلێ، ئەم شتانە بۆچین؟

زۆربا سەری داخستو لەژێر لێوەوە وتی :دیاریە.

من کەدەمویست بەتووڕەییەوە قسە بکەم ووتم :

—دیاری؟ دیاری چی؟

—پێت ناخۆش نەبێت، سەرۆك، دیاریە بۆ بوبولینای داماو،

ئاخر جەژنی پاك نزیکەو ئەو داماوەیش ........

جارێکی تر بەرم لە پێکەنینەکەم گرتو وتم:

تۆ ئەو شتەت بۆ نەهێناوە کە لەهەموو ئەمانە گرنگترە.

—چی؟

—حەو! تاجی بوکێنی!

—چی؟ تێت ناگەم!

ئەوسا هەموو ئەو ڕووداوەم بۆگێڕایەوە کە بۆئەو پیرە فریشتە عاشقەم دروست کردبوو .

زۆربا سەری خوراندو کەمێکی بیرکردەوە، پاشان وتی :

—نەدەبوو کاری وابکەیت، سەرۆك، بمبوورە، کارێکی چاکت نەکردوە، گاڵتەی ئاوا سەرۆك گیان .... خۆت دەزانیت کەژن بوونەوەرێکی لاوازەو زوو دەڕەنجێت. چەندجار دەبێت ئەمەت بۆ بڵێمەوە؟ وەك قاپی چینی وایە دەبێت بەئاستەم دەستی بۆبەریت.

من هەستم بەتەریقی كرد، پەشیمانیش بوومەوە، بەلاّم تازە كار لەكار ترازابوو، باسەكەم گۆڕی‌و لێم پرسی:

—ئەی سیمەكە؟ ئامێرەكان؟

—هەموویم هێناوە، هەر هەمووی، خۆت تێك مەدە، سیمی گوێزانەوە، لولا، بوبولینا... بەڵێ سەرۆك هەموو شتێك ئامادەیە.

جزوەی قاوەكەی لەسەرئاگرەكە داگرت، فنجانەكەی منی پڕ كرد، نانە كونجی كەلەگەڵ خۆیدا هێنابووی‌و حەڵوای هەنگوین كە دەیزانی زۆری حەز لێ دەكەم دایمێ‌و بەمیهرەبانیەوە وتی:

قوتوویەكی گەورەیش حەڵوام بەدیاری بۆ تۆ هێناوە، بزانە من تۆم لەبیر ناچێت، بۆتووتیەكەیش كیسەیەك بادامی كێویم هێناوە، من كەسم لەیاد نەكردوە، وەك دەمبینیت، تەواو لەسەر خۆمم، سەرۆك.

من هەر بەوجۆرەی لەسەر زەویەكە دانیشتبووم، لەنانەكونجی‌و حەڵواكەم خواردو قاوەیشم خواردەوە، زۆربایش قاوەی هەڵدەداو جگەرەی دەكێشا، تەماشای دەكردم‌و چاوی وەك چاوی مار ڕاپ دەكێشام، لەسەرخۆ لێم پرسی:

—بەڕاست، شەیتانی پیر، ئەو مەسەلەیەی ئازاری دەدایت توانیت چاری بكەیت یان نا؟

—كامە مەسەلە، سەرۆك؟

—كەئایا ژنیش مرۆڤەیان نا؟

زۆربا دەستە زلەكانی ڕاوەشاندو وتی:

—لەوەگەڕێ، ئەوە چار كراوە. بەڵێ ژنیش مرۆڤە، بوونەوەرێكە وەك ئێمەی پیاوو خراپتر، كەچاوی بەجزدانی پارەكەت دەكەوێت سەری گێژ دەخواوخۆت پێوە دەنووسێنێت، ئازادی خۆی لەدەست دەداو ئەو لەدەست دانەیشی پێ‌خۆشە، چونكە، وەك دەبینێت، لەپشت ئازادیەكەیەوە ئەوجزدانە پارەیە دەدرەوشێتەوە، بەلاّم بە زوویی ...ئاه... وەلیانكە، سەرۆك.

هەستاوجگەرەكەی لەپەنجەرەكەوە فرێدایە دەرێ، ئەنجا وتی:

-ئێستا قسەی پیاوانە دەکەین، وا((هەفتەی پیرۆز)) لەپێشمانەوەیەو ئێمەیش سیمان کڕیوە، کاتی ئەوەیە بڕۆینە دێرەکە، ئەو بەرازە پیسانە بدۆزینەوە، پێش ئەوەی تەلەفریکەکە ببینن‌و لووتیان بکەنە کەلەشاخ، ئەو بەلێنانەیان پێ ئیمزا بکەین کە پەیوەندیان بەدارستانەکەوە هەیە، تێ دەگەیت؟

کات بەسەر دەچێت، سەرۆك، ئەمە لەوکارانە نیە مرۆڤ سستی تیا بکات، تا تەنوور گەرمە نانی پێوەدە[1]، دەبێت کەشتیەکان بێن‌و دارەکان باربکەن، بۆئەوەی چیمان خەرج کردوە بیهێنینەوە جێگای، ئەم سەفەرەی من بۆ کاندی زۆری تێ چووە، دەبینیت کەشەیتان...

بێدەنگ بوو، دڵم پێی سووتا، لەمنداڵێك دەچوو لاساریەکی کردبێت‌و نەزانیت چۆنی پینە بکات، بەهەموو دڵە چکۆلەکەیەوە بلەرزێت.

لەناوەوەمدا لەخۆم خوڕی: ((تەریق نابیتەوە، پیاو! چۆنت دڵ دێنێت بهێڵیت گیانێکی واچەلەنگ لەترسا بلەرزێت؟ هەستە، تۆ ئیتر لەکوی دەتوانیت یەکێکی وەك زۆربا پەیدا بکەیت؟ هەستەو ئیسفنجەکە هەڵگرەو هەموو گوناهەکانی بسڕەوە)).

بەدەنگی بەرز وتم:زۆربا،گوێ بەشەیتان مەدە، چۆن ئێمە کارمان بەونیە، ئەوەی چوو.. چوو، تۆیش لەبیر خۆتی بەرەوە، سەنتوورەکەت هەڵگرەو دەست پێ بکە.

زۆربا ئامێزی کردەوە، وەك ئەوەی بیەوێت دیسان لەباوەشم بگرێت، بەڵام ئەمجارەیش دوودڵ بوو، باڵەکراوەکانی داگرتەوە.

بەهەنگاوێك خۆی گەیاندە دیوارەکە، لەسەرپەنجەی پێی خۆی بەرزکردەوەو سەنتوورەکەی هێنایە خوارێ، لەوکاتەدا کە بەرانبەر رووناکی چرا زەیتیەکە وەستابوو، من مووی سەریم بینی کەوەك بۆیاخ رەش بوو، پێم گوت:

-پێم بڵێ، پیرەسەگ، ئەم قژە چیە؟ ئەم قژە ڕەشەت لەکوێوە هێناوە؟

زۆربا کەوتە پێکەنین‌و وتی:

-بۆیەم کردوە، سەرۆك، بێ تاقەت مەبە، ئەو بەدمەزەبانەم بۆیە کردوە.

---

[1] لە دەقە ئەسڵیەکەدا بەم جۆرەیە:(( دەبێت ئێستا شتێکمان دەست بکەوێت)) و.ف

-بۆ؟

-چونکە ئابڕویان شکاندم، ڕۆژێك کە لەگەڵ لولادا پیاسەمان دەکردو، من دەستیم گرتبوو – نەك بە تەواوی دەستیم گرتبێت، هەر ئاوا بەسەری پەنجە- لەپڕا هەتیوکارێکی نەحلەتی، کەباڵای نەدەگەیشتە ئەژنۆم کەوتە ئازاردانمان، دایك قەحبەیە هاواری کرد: ((هۆی..پیرەمێرد... هۆی پیرەمێرد... تۆ بەباپیرەی دەشێیت.. ئەو کچە بۆ کوی دەبەیت؟))باشە، سرۆك؟ لۆلا تەریق بوەوەومنیش هەروا، جابۆئەوەی لەوەوداو کە پێکەوە گەڕاین تەریق نەبێتەوە هەرئەوشەوە چوومە سەرتاشخانەو قژم ڕەش کردەوە.

پێکەنیم، زۆربا بەتووڕەییەوە لێم ڕاماو وتی:

-بەلای تۆوە ئەمە پێکەنینی دەوێت، سەرۆك؟ لەگەڵ ئەوەیشدا گوێ بگرەو بڕوانە مرۆڤ چ گیاندارێکی سەیرە، من لەو ڕۆژە بەدوا تەواو بوومەتە مرۆیەکی دی، وەك ئەوەی کە بەڕاستی قژم ڕەشەو خۆیشم بڕوام بەمەهێنا- بڕوانە، مرۆڤ هەرشتێك کەلە بەرژەوەندیا نەبێت بەئاسانی لەبیری دەکات- منیش، سوێندت بۆدەخۆم کەلەو ڕۆژەوە تین‌و توانای لەشم زیاتربوەو لولایش هەستی بەمە کرد بوو، تۆ دەزانیت،سەرۆك، کەمن لێرە بەردەوام پشتم دێشا، ئەو ئازارەیش لەخۆیەوە ڕەویەوەو نەما، دەزانم بڕوا بەقسەکانم ناکەیت، چونکە کتێبەکانی تۆ ئەم شتانە نانووسێ.

پێکەنینێکی گاڵتەئامێزی کردو زوو پەشیمان بوەوە، وتی:

-ببورە، سەرۆك، تاقە کتێبێك کەمن لەتەواوی ژیانما خوێندبێتەوە ((سەندبادی بەحری))یە، تاقە ئامانجێکیش کەلێم وەرگرتبێت...

سەنتوورەکەی هێنایە خوارێ و لەسەرخۆو ئارام لە توربەکەی دەرهێنا، پاشان وتی:

-بچینە دەرێ، لێرە، لەناو ئەم چوار دیوارەدا، سەنتوور دڵی خۆش نابێت، ئەویش گیان لەبەرێکی کێویەو حەزی لەدەشت‌و دەرە.

چووینە دەرەوە، ئەستێرەکان چاوبرکێ یان بوو، ڕێگای کاکێشان لەم سەرەوە تائەوسەری ئاسمانی گرتبوو، دەریا هەڵدەچوو.

لەسەر زیخەڵانی کەنار دەریا کە دانیشتین، شەتاوەکان ژێر پێیان دەلێساینەوە، زۆربا وتی:

-کەتەنگانە دەرکی پێ گرتیت تۆبەرکی شادمانی بگرە.

ئەی چۆن، ڕەنگە تەنگانە وابزانێت لەپێمان دەخات؟ وەرە پێشێ سەنتوور گیان. وتم: زۆربا، ئاهەنگێکی ماکدۆنیایی ولاتەکەی خۆت بژەنە.

زۆربا وتی: ئاهەنگێکی کریتی ولاتەکەی تۆ دەژەنم، ئاهەنگێکە لەکاندی فێری بووم، لەوساوە کە ئەم گۆرانیە فێربووم ژیانم گۆڕاوە.

بۆ کەمێك کەوتە بیرکردنەوەو پاشان وتی:

-نا، ژیانم نەگۆڕاوە، بەلام ئێستا ئەوە دەزانم کە من لەسەر هەق بووم.

پەنجە زلەکانی نایە سەرسەنتوورەکەو ملی درێژکرد، بەدەنگە کێویو گڕە پڕلەخەمو خەفەتەکەیەوە چریکاندی:

((کە بڕیارتدا مەترسەو بڕۆپێشێ

جلەو بۆلاویەتیت شل بکە چونکە جارێکی ترنای بینیتەوە خەمەکان پەڕاگەندە بون، ناخۆشیە بچووکەکان هەلاتنو ڕۆح گەیشتە لووتکەی بەرزی خۆی، لوولا، خەلۆزی بەرد، تەلەفریك، (نەمری)و نیگەرانیە درشتو وردەکان هەموو بوونە دووکەلی شینو لەهەوادا بلاو بوونەوە.

بێجگە لەبالندەیەکی پۆلایین کەگیانی مرۆڤێك بوو گۆرانی دەوت هیچی تر نەمایەوە))

کەگۆرانیە غرور ئامێزەکەی کۆتایی هات هاوارم لێهەستا:

-زۆربا، هەموویم پێبەخشیت، ئەوکارانەی کردووتە حەلالتن، ژنە گۆرانی بێژەکە، قژە بۆیە کراوەکەت، ئەو پارانەی خەرجت کردوون، هەموویم پێ بەخشیت، دەی دەست پێ بکەرەوە.

ملە لاوازەکەی درێژ کردەوەو کەوتەوە گۆرانی وتن:

((ئازابەو پشت بەخوا ببەستە، چی دەبێت بابیێت

یان نیشانەکەت ناپێکێت یان بەمەبەست دەگەیت.

دە دوانزە کرێکاری نزیك بەکانەکە کەلەوێدا دەنووستن گوێ یان لەئاهەنگەکە بوو، هەستان، بەپەلە دابەزینە خواریو بەدەورماندا دانیشتن، گۆرانیەکەیان لاخۆش بوو، لەشیان کەوتە مێروولە، لەناکاوێکدا وەك ئیتر نەتوانن خۆ بگرن، نیوە ڕوتو بەهەمان

پانتۆڵی‌فش‌و فوڵیانەوە لە تاریکیەوە ڕابوون، ئەڵقەیان لەدەوری زۆرباو سەنتوورەکەی بەست، لەسەر بەردە گەورەکانی کەنارەکەدا کەوتنەسەماکردن . منیش لەناوەوەی خۆمدا هاتبوومە جۆش‌و بەبێدەنگی لێم دەڕوانین، بیرم دەکردەوە: ((ئەمەیە ئەو دەمارە ڕاستەقینەیەی کەمن بەدوایدا وێڵم ، چ دەمارێکی ترم ناوێت))

* * *

بەیانی ڕۆژی‌دوایی، پێش خۆرکەوتن، لەدالآنەکانی نێوتونێلەکەوە دەنگی قازمە لێدان‌وهاواری زۆربا دەهات، کرێکارەکان لەجۆش‌و خرۆشەوە کاریان دەکرد، تەنیا زۆربا دەیتوانی بەو جۆرە بیانخاتە گەڕ، لەگەڵ زۆربادا، کارکردن دەبوە شەراب‌و گۆرانی‌و خۆشەویستی‌و ئەوانی مەست دەکرد، خاك لەدەستی زۆربادا گیانی وەبەر دەهات، بەرد، خەڵوز، دار، کرێکار، هەموو لەگەڵ بزاوتی ئەودا هاوئاهەنگیان دەکرد، لەنێو دالآنەکاندا، لەبەر روناکی‌یە سپیەکەی چرا ئاستیلەکاندا، دەبوە جەنگ‌و زۆربا لەپێشیانەوە دەڕۆیشت‌و تەن بەتەن دەجەنگی، هەموو دالآن‌و دەمارێك ناوێکی لێ دەنان، سیمای دەبەخشیە هێزە بێ سیماکان، ئەوسا کەسیان لەژێر دەستی قوتار نەدەبوون.

دەی وت:((کەدەزانم ئەمە دالآنی کاناڤارۆیە (یەکەم دالآنی وا ناونابوو) ئیترخەیاڵم ئاسوودە دەبێت، بەناودەیناسم‌و ئیدی ئەو پرکێشی ئەوە ناکات خۆیم لێ بگۆڕێت، هەروەها (دایەگەورە)و (لاروگەوێر)و (دەڵەمین)یش، بڕوا بکە من هەموویان بەناویشەوە دەناسم)).

ئەو ڕۆژە بێ ئەوەی زۆربا بزانێت، من هاتبوومە ناو تونێلەکەوە، ئەو، وەك جاران، کەتەواو لەسەرخۆی بوو هاواری بەسەر کرێکارەکاندا دەکردو دەیوت:

—دەی کوڕینە، هیمەتکەن، هیمەت بۆ پێشەوە، دەبێت ئەم شاخە بێنینە سەرچۆك، ئێمە پیاوین، وانیە؟ هەموو گیانداری دڕندەین، خوایش بەبینینمان دەلەرزێت، ئێوە کریتی‌ومن مەکدونی، دەبێت بەیارمەتی یەکتری بەسەر ئەم چیایەدا سەربکەوین، نەك ئەو پاکۆمان بدات، ئێمە هەر ئەو کەسانەین کەشکستمان بەتورکی عوسمانیدا، دەشێت لەم چیا گەنیلەیە بترسین؟ دەی... بۆ پێشەوە...

یەکێك لە کرێکارەکان بە ڕاکردن هاتە لای زۆربا، من لەبەر روناکی چرا ئاستیلەکەدا دەم‌و چاوە لەڕو لاوازەکەی میمیتوم ناسی، بەدەنگە تیژەکەیەوە کە باش دانی بە. پیتەکاندا نەدەنا هاواریکرد: زۆربا، زۆربا..

زۆربا ئاوڕی دایەوە، کەمیمیتوی بینی تێگەیشت مەسەلەکە چیە، دەستە گەورەکانی هەڵبڕی‌و هاواری لێ کرد:

بڕۆ، گومبە لەبەرچاوم، دەی ، وەلبە.

بەلام ئەو گەمژەیە پێی داگرت‌و وتی :

—من لای خانمەوە هاتووم...

—پێم وتیت بڕۆو وەلبە. کارمان هەیە.

میمیتو بەرەو دواپێی لێ هەڵکرد، زۆربا بەبێزاریەوە تفی رۆکردە سەرزەویەکەو وتی: رۆژ بۆ کارکردنە، چونکە رۆژ بۆ پیاوە، شەو بۆڕابواردنە، چونکە شەو ژنە، نابێت شتەکان بەیەکدی تێکەڵ بکرێن.

لەوکاتەدا من چوومە پێشەوەو وتم:

—هاوڕێیان، وا نیوەڕۆیەو کاتی نان خواردنە، دەست لەکار هەڵبگرن.

زۆربا سەری وەرگێڕا، چاوی بەمن کەوت‌و ناوچاوی پێکدادا، وتی:

—ببوورە، سەرۆك، تۆهەقت بەسەرئێمەوە نەبێت، بڕۆ نانی خۆت بخۆ،ئێمە دوانزە رۆژە لەکار دواکەوتووین‌و دەبێت هەقی بکەینەوە، تۆ نۆشی گیانت بێت.

لە تونێلەکە هاتمەدەرێ‌و بەرەو دەریا داکەوتم، کتێبەکەی دەستم کردەوە، برسیم بوو، بەلام برسیەتیەکەم لەبیرکرد، بەخۆم وت:

((تێڕامانیش بۆخۆی کانزایەکە..دەی)) کەوتمە نێو تونێلەگەورەکانی بیرەوە.

کتێبەکە گران‌وماندو کەر بوو، باسی لەکێوە بەفرینەکانی تیبت دەکرد، باسی پەرستگا پڕ لەنهێنیەکان‌و ڕاهیبە بێدەنگ‌و زەرد پۆشەکان، ئەوانەی ئیرادەی خۆیان لەنوختەیەکدا خەست بکەنەوە شێوەکەی دەگۆڕن بۆشتێکی تر.

ترۆپکی چیاو ئەوهەوایەی لێوان لێوە لە رۆحیانەتەکان، ئەو شوێنەی ژاوە ژاوی بێ هوودەیی دنیا نایگاتێ، زاهیدی مەزن شاگردەکانی کەتەمەنیان لەنێوان شانزەو هەژدە

سالیدایە هەڵدەگرێتو، لەنیوەشەودا بەرەو کەنار دەریاچە بەستوەکەی سەرکێوەکەیان دەبات، شاگردەکان ڕووت دەبنەوە، سەهۆڵەکە دەشکێننوجلەکانیان دەخەنە ناو ئەو سەهۆلاوەوە، پاشان جلەکانیان لەبەردەکەنەوە تا هەربەلەشیانەوە وشك دەبێتەوە، دیسان دای دەکەننەوەو دەیخەنە، ناو سەهۆلاوەکەوە، جارێکی تر هەر لەبەری خۆیاندا وشکی دەکەنەوە، حەوت جار ئەم کارە دووبارە دەکەنەوە، پاشان، بۆ نوێژی بەیانی دەگەڕێنەوە پەرستگاکە.

بە لووتکەیەکی پێنج شەش هەزار مەتریدا سەردەکەون، ئاسوودە دادەنیشن، هەناسەی قووڵو ڕێكو پێك دەدەن، لەگەڵ ئەوەیشدا کە سەرو سنگیان ڕووتە سەرمایان نابێت، جامێك سەهۆڵیان بەدەستەوەیە، لێی ڕادەمێنن، ڕامانێکی قووڵ، تەواوی توانای ڕۆحی خۆیانی لەسەر ڕادەگرن، ئاوەکە دێتە کوڵو چای پێ لێ دەنێن.

زاهیدی مەزن شاگردەکانی لە دەوری خۆی کۆدەکاتەوەو پێیان دەڵێت:

((بەد بەخت ئەوکەسەیە کە سەرچاوەیەکی شادمانی لە ناوەوەی خۆیدا نیە.

((بەد بەخت ئەوکەسەیە کە دەیەوێت خەڵکی خۆشیان بوێت.

((بەد بەخت ئەو کەسەیە هەست بەوە ناکات کە ژیانی ئەم دنیاو ئەودنیا هەردووکیان وەك یەك وان.

* * *

شەو داکەوتبوو، ئیتر نەمدەتوانی شتێك بەچاکی بخوێنمەوە، کتێبەکەم هەڵگرتو کەوتمە تەماشاکردنی دەریا، بەخۆم وت:

((دەبێت خۆم لەشەڕی ڕۆحیانەتەکان ڕزگار بکەم... بەدبەخت ئەو کەسەیە کە ناتوانێت خۆی لە چنگی بوداکان، خواکان، نیشتمانەکان، بیروباوەڕەکان ڕزگار بکات))

لەپڕا دەریا ڕەش داگەڕا، مانگی نوێ بەرەو ئاوابوون داخزا، لەدوورەوە، لەباخەکاندا، سەگەکان وەڕینێکی ئومێدانەیان دەکردو بەتەواوی شیوو دۆڵەکاندا دەنگی دەدایەوە.

زۆربا، بەلەشی قوڕاویو لیتەی پیسەوە دەرکەوت، پارچە پارچەی کراسە دڕاوەکەی بەلەشیەوە تەکەی دەهات، لەپاڵما دانیشتو بەشادمانیەوە پێی وتم:

-کاری ئەمڕۆمان باش ڕۆیشتو زۆرمان ئیش کرد.

گوێم لە قسەکانی زۆربا بوو، بەڵام لەمانایان تێ نەدەگەیشتم، دیسان خەیاڵم لای تاشە بەردە دورو پڕ لە نهێنیەکان بوو، لێی پرسیم:

–بیر لە چی دەکەیتەوە، سەرۆك؟ مێشکت لەکوێیە؟

هاتمەوە سەرخۆم‌و ڕووم تێ کرد، تەماشای هاوڕێکەمم کرد سەرم لەقاند. لەوەڵامدا وتم:

–زۆربا، تۆ والەخۆت دەگەیت کە سەندبادێکی بەحریی گەورەیت‌و قسەی زلیش دەکەیت، لەبەر ئەوەی کەزۆر گەڕاویت، بەڵام بەد بەخت تۆ هیچت نەدیوە، هەرهیچ... هیچ، واتازە منیش وەك تۆم بەسەرهاتوە، دنیا زۆر لەوە گەورەترە کە من‌و تۆ تێی گەیشتووین، ئێمە سەفەردەکەین، زەوی‌و دەریا بەپێوە دەدەین، بەڵام هێشتا سەری لووتمان نەگەیشتۆتە ئەودیو دەرگایماڵەکانمانەوە.

زۆربا لچ‌و لێوی گرمۆڵە کردو هیچی نەوت، بەڵام وەك سەگی بەوەفا کە لێی درابێت لەژێر لێوەوە بۆڵەیەکی لێوەهات. من لەسەر قسەکانم ڕۆیشتم: زۆر چیای مەزن‌و بڵندهەن پڕن لە پەرستگا، لەو پەرستگایانەدا ڕاهیب گەلێك هەن بەبەرگی زەردەوە، ئەمانە مانگێك دوومانگ، شەش مانگ چوار مشقی دادەنیشن، تەنیا بەقووڵی لە شتێك ڕادەمێنن، یەك شت، تێ دەگەیت؟ نەك دووشت، یەك شت. ئەوان وەك ئێمە بیر لە ژن‌و کانی خەڵووزو کتێب، یان کتێب‌و کانی خەڵوز ناکەنەوە، ئەوان هەموو هەست‌و هۆشیان لەسەرشتێك خەست دەکەنەوەو ئەوسا موجیزە دەنوێنن.

موجیزە ئاوا ڕوو دەدات، تۆ، زۆربا، دیوتە کە وردبینێك لەبەر خۆردا ڕادەگریت‌و هەموو شەوقی خۆرەکە لە نوختەیەکدا کۆ دەکەیتەوە چی ڕوودەدات؟ زۆر نابات ئەو نوختەیە ئاگر دەگرێت.

بۆ؟ چونکە هێزی خۆر هەروا نەڕۆیشتوەو هەمووی لەسەر نوختەیەك کۆ بۆتەوە، بیری مرۆڤیش هەروایە ، مرۆڤ دەتوانێت بەکۆکردنەوەی هۆش‌و هەستی خۆی لە تاقە شتێکدا موجیزە دروست بکات، تێ دەگەیت، زۆربا؟

زۆربا هەناسەی لەگیرکەوتبوو، وەك بیەوێت هەڵێت تەکانێکی دایە خۆی، بەڵام خۆی گرت‌و لەژێر لێوەوە کەوت ورتە ورت:

—باشە، بەردەوامبە.

لەپڕا هەستایە سەر پێ، ڕاست وەستاو دەنگی بەرزكردەوە:

—بێدەنگ! بێدەنگ! بۆ ئەم قسانەم بۆ دەكەیت، سەرۆك؟ بۆ بیرم ژەهراوی دەكەیت؟ من بۆ خۆم ئاسودەم تۆ دەتەوێت تێكم بدەیت! كەبرسیم بوو خوا — شەیتان (بەقوڕداچم ئەگەر جیاوازی لەنێوان ئەم دوانەدا بكەم) پارچەیەك ئێسكێلیان هاویشتە بەردەمو منیش كەوتمە كڕاندنەوەی، كلكە سوتێم كردو بەدەنگی بەرز وتم: (سوپاس، سوپاس) بەلام وائێستا تۆ...

پێی بەزەویدا كوتا، پشتی تێ كردمو وای خۆ نواند كە بیەوێت بگەڕێتەوە كوختەكە، بەلام هێشتا توورە بوو، وەستاو كەوتە ناسزاكردن:

—پف... ئەم خوا — شەیتانە چ ئێسكێكی خستۆتە بەردەمی من! پیرێژنە گۆرانی بێژێكی نەگریس، كۆنە بەلەمێكی پۆخل.

چنگێكی بەزیخەكەدا كردو هەلیدایە ناو دەریاكەوە، بەدەنگی بەرز وتی:

—وەلێ ئاخر ئەوە كێیە؟ ئەوە كێیە ئێسقانێك فڕێ دەداتە بەردەممان؟

كەمێك وەستا، كەهیچ وەلامێكی نەبیست گڕی گرت:

—تۆ هیچ نالێیت، سەرۆك؟ ئەگەر ئەیزانیت پێم بلێ با منیش ناوەكەی بزانم، ئیدی تۆ هەقت نەبێت، دەزانم چۆن تۆلەی لێ دەكەمەوە، بەلام هەر ئاوا، بی ئەوەی بزانم بۆ كوێ دەچم؟ ئەوا سەرو گوێی خۆم دەشكێنم.

وتم: برسیمە، برۆ خواردنێك دروست بكە، بالەپێشدا شتێك بخۆین.

—یەعنی نابێت شەوێك شێونەكەین، سەرۆك؟ من مامێكی ڕاهیبم هەبوو، هەموو رۆژانی هەفتە بێجگە لە نانو خوێ چیتری نەدەخوارد، رۆژانی یەك شەممەو جەژنەكان كەمێك كەپەكی دەخستنە سەر، دەزانیت ئەم پیاوە سەدوبیست سال ژیا.

—سەدو بیست سال ژیا چونكە بڕوای هەبوو، زۆربا، خوای خۆی دۆزیبوەوەو ئیدی خەمێكی نەبوو، وەلێ ئێمە خوایەكمان نیە كە خۆراكمان بداتێ، كەواتە بێ زەحمەت ئاگرەكە بكەرەوە، چەند ماسیەكمان هەیە، شۆربایەكی خەستو خۆل بەپیازو بیبەری زۆرەوە كە هەردووكمان حەزی لێ دەكەین لێ بنێ، دوایی بابزانین...

زۆربا بەتووڕەییەوە وتی: چی بزانین؟ کەورگ پڕ بوو هەموو ئەم شتانە لەبیر دەچن.

-باشە، منیش هەر ئەمەم دەوێت، بەڕاستی خۆراك هەر ئەم کەلکەی هەیە، زۆربا، دەی لەسەر خوا، بڕۆ سوبێکی چاکی ماسی دروست بکە، ئەگینا سەرمان دەتەقێت. زۆربا لەشوێنی خۆی نەجوولا، لەجێگاکەیدا مت ببوو،

تەماشای کردمو وتی:

-گوێ بگرە، سەرۆك، دەمەوێت شتێکت پێ بڵێم، من دەزانم تۆ دەتەوێت چی بکەیت؟ بڕوانە، ئێستا کە قسەت لەگەڵدا دەکەم یەکسەر بروسکەیەك لەسەرایدمو هەموو شتەکانم بینی.

ڕاست بوومەوەو وتم: باشە بیلێ بیزانم زۆربا، من چیم دەوێت؟

-تۆ دەتەوێت دێرێك دروست بکەیت، بەڵێ، لەباتی ڕاهیب چەند لەنگە نووسەرێکی وەك خۆت پەیدا بکەیتو شەوو ڕۆژ ئیشو کارتان کاغەز ڕەش کردنەوە بێت، پاشان وەك ئەو قەدیسانەی کە لەوێنەدا دەیانبینین لەدەمتانەوە شریتی چاپکراو بێتە دەرەوە، ها، بۆی چووم؟

سەری خەفەتباریم دانەواند، ئەمە لە خەمە دێرینەکانی گەنجی من بوون، هەر تەواو وەك ئەوباڵە گەورانەی پەڕیان پێوە نەمابێت مەیلە سادەو ڕەسەنو ڕەواکان.. دامەزراندنی ئەنجومەنێکی مەعنەوی کە دە هاوڕێی یەکدڵ، لە مۆسیقازانو نیگارکێشو شاعیری تیابێت، هەموو ڕۆژەکە کاربکەینو شەوانە یەکتربببینین، پێکەوە بخۆینو گۆرانی بڵێینو کتێب بخوێنینەوەو پرسیارە گەورەکان بکەینو خەتی ڕاستو چەپ بەسەر وەڵامە کۆنەکاندا بهێنین. من پەیڕەوو پرۆگرامێکیشم بۆ ئەنجومەنەکە نووسی بوو، تەنانەت بارەگایەکیشم لە (سنت جان لوشاسوار)[٢] کە دەکەوێتە گوزەرگایەکی چیای (هیمتوس)[٣] ەوە پەیدا کردبوو.

زۆربا کەمنی وابەبێدەنگی بینی بەخۆشیەوە وتی:

---

Saint Jean-le-chassear (یەحیای راوچی).

Hymettus

—بڕوانە، چۆنم زانی، زۆرباشە، کەوایە، ئەی سەرۆکی دێری پیرۆز، منیش داواکاریەکم لێت هەیە. بمکە بەدەرگاوانی دێرەکە، بۆ ئەوەی بکەومە قاچاخچیەتی‌و، جارجارە هەندێك شتی سەیری وەك ژن‌و ماندولین[٤] و بوتڵە عەرەق‌و بەچکە بەرازی برژاو بهێنمە ئەو شوێنە پیرۆزەوە، هەموو ئەمانەیش تەنیا بۆ ئەوەی کە تۆ تەمەنی خۆت لەکاری هیچ‌و پووچدا بەخەسار نەدەیت.

زۆربا پێکەنی‌و خێرا بەرەو کوختەکە کەوتە ڕێ، منیش بەدوایدا هەنگاوی گورجم نا، بێ ئەوەی قسە بکات ماسیەکانی پاك کرد، منیش دارم هێناو ئاگرم کردەوە، کە سووبەکە پێ‌گەیشت کەوچکمان هەڵگرت‌و هەر لەناو مەنجەڵەکەدا دەستمان بەخواردن کرد.

کەسمان نەدەدواین، بەدرێژایی ئەو ڕۆژە هیچمان نەخواردبوو، بۆیە بەتەواوی ئیشتیهاوە چێشتەکەمان دەخوارد، شەرابیشمان نۆشی‌و بووژاینەوە.

زۆربا کەوتە قسەکردن‌و وتی:

—ئێستا سەرۆك، سەیر ئەبێت بوبولینا خانم بگاتە ئێرە، هەر جێگای ئەو خاڵیە، بەهەرحاڵ، سەرۆك، بەینی خۆمان بێت بیری ئەو نەعلەتیە دەکەم.

—دیارە تۆ ئیتر ناپرسیت کێ ئەوپارچە ئێسقانەی بۆ فڕێداویت؟

—ئای سەرۆك، جا کەی ئەوە شیاوی باسە؟ ئەوە وەك ئەسپێیەکە لەناو بارێك کادا، ئێسقانەکە هەڵگرەو گوێ بەو دەستە مەدە کە بۆی هەڵداویت، مەسەلەی سەرەکی ئەوەیە کە تامی هەیە یان نا؟ کەمێك گۆشتی پێوەیە یان نا؟ ئیدی ئەوی تریان...

من بەدەم بەپشتاکێشانی زۆرباوە وتم:

—خواردنەکە موجیزەی خۆی نواند! کە لەشی برسی هێو ربوەوە ڕۆحیش کەجاران دەیپرسی ئارام دەگریت، دەسەنتوورەکەت بێنە...

لەو ساتەدا کەزۆربا لە جێگاکەی هەستا گوێمان لەدەنگی پێیەك بوو کەبەسەر بەردەکاندا هەنگاوی خێرای دەنا، پەڕەی لووتە مواویەکەی زۆربا بەلەرەکەوتن، بەڕانی خۆیدا کێشاو لەسەرخۆ وتی:

---

[٤] Mandoline ئامێرێکی مۆسیقایە، لەسێ تاردەچێت، شەش ژێی هەیە، بەنووکی پەنجە یان بەنینۆك دەژەنرێت- فەرهەنگی عەمید. —و.

-دەڵێی مووی دێوت بۆ هەڵکرووزاندوە، خۆیەتی، ئەو دێڵە سەگە بۆنی زۆربای لەهەوادا کردوەو وا بۆ ئێرە دێت.

من هەستام وتم: من دەڕۆم، حەزم پێی نیە، دەچمە گەڕان و باژنۆکەیش لای تۆ بێت.

-شەوباش، سەرۆك.

-لەبیری نەکەیت، زۆربا تۆ بەڵێنت داوەتێ بیهێنیت، بەدرۆم نەخەیتەوە.

زۆربا هەناسەیەکی هەڵکێشاو وتی: یەعنی دیسان ژن بهێنمەوە؟ بۆ حەوت پشتم بەسمە.

بۆنی سابونی عەتری تادەهات نزیکتر دەبوەوە.

وتم: ئازابیت، زۆربا.

بەپەلە چوومە دەرێ گوێم لە دەنگی هەناسەی پیرە فریشتەی دەریابوو.

## -١٧ -

بەیانی ئەوشەوە، لەسپێدەدا، دەنگی زۆربا لەخەو هەڵی ساندم.

—چیە بەم بەیانی زوە؟ ئەم دەنگە دەنگەت لەچیە؟

ئەو بەدەم پڕکردنی کیسەکەیەوە لەخۆراك وتی:

—دەبێت کار بەجیدی بکرێت، سەرۆك، من دووهێسترم هێناوە، هەستە بابڕۆین بۆ دێرو بەڵێن نامەکان مۆربکەین، بۆ ئەوەی تەلەفریکەکە بخەینەکار، شێر تەنیا لەشتێك دەترسێت ئەویش ئەسپێیە، ئەسپێ دەمانخوات، سەرۆك...

پێکەنیمو وتم:

—بۆ بە بوبولینای بەسزمان دەڵێیت ئەسپێ؟

بەڵام زۆربا خۆی لە قسەکانم کەڕکردو پاشان وتی:

—بابڕۆین، پێش ئەوەی خۆر زیاتر سەر بکەوێت.

من زۆر بەتاسەوە بووم بەناو چیادا بگەڕێمو بۆنی دار کاژەکان بکەم. سواری هێسترەکان بووینو بەچایادا سەرکەوتین، لای کانەکەوە کەمێك وەستاین، زۆربا ڕاسپاردەکانی بەکرێکارەکان گەیاندو پێی وتن: ((دایە گەورە)) زیاتر قووڵ بکەن. جۆگەلەیەك ((بۆ دەڵەمین)) لێدەن با ئاوی تیا نەمێنێتەوە، (کاناڤارۆ) پاك بکەنەوە.

خۆر وەك ئەڵماسی ڕەسەن دەبریسکایەوە، تا سەردەکەوتین رۆحیش بڵندو بێگەردتر دەبوو، من بۆ جارێکی دی لە ڕۆحما هەستم بەهەوای پاكو هەناسەی ئاسوودەو ئاسۆی کراوەکرد، هەردەت وت رۆحیش گیاندارێکی خاوەنی سیپەلەو لووتەو پێویستیەکی زۆری بەئۆکسجین هەیە، چەندە لەناو تۆزو گەرد هەناسەی ئاپوورەدا بێت زیاتر خەفە دەبێت.

کە گەیشتینە ناو دارستانەکە خۆر گەیشتبوە بەرزی، لەوێدا هەوا بۆنی هەنگوینی لێ دەهات، با بەسەرماندا گڤەی دەکردو دەنگی لەدەنگی دەریا دەچوو.

زۆربا بەدرێژی ڕێگاکە لەنشێوی کێوەکەی دەکۆڵیەوە، بەخەیاڵ هەر چەندە مەترێكو مێخێکی بەزەویەکەدا دادەکوتا، سەری بەرز دەکردەوەو تەلەفریکەکەی دەبینی وا لە بەرخۆرەکەدا دەبریسکێتەوەو یەکسەر بەرەو کەناری دەریا دێتە خوارێ، ئەو دارە گەورە بڕاوانەیش کە بە تەلەفریکەکەوە بەسترابوونەوە دەنگیان لێوەدەهات و دەکەوتنە نشێوی، ئەوسا زۆربا هەردوو دەستی هەڵدەگلۆفتو دەیوت:

–بەهـ... بەهـ... چ کارێکی جوانە! چ سەرمایەیەکە؟ دەبێت بەم زوانە کیسەی بۆ هەڵدورینو هەموو کارەکانیشمان بەئەنجام دەگەن.

من بەسەرسامیەوە لێم دەڕوانی، وتی:

–ها.. لەبیرت نەچێت بڕیارەکەمان وایە پێش دروست کردنی دێرەکە بڕۆینە سەر ئەو کێوە بەرزە، وتت ناوی چیە؟ تب؟

تیبت، زۆربا، تیبت..بەلاَم ئێمە تەنها دووکەسین.. تۆ ناتوانیت ژن ببەیتە ئەوێ.

ئێستا کێ وتوویەتی ژن بەرمە ئەوێ؟ ئەگەرچی دوور لە هەرشتێك ژنی داماو کەڵکی زۆرەو نابێت تۆلێیان بخوێنیت، ئەوکاتەی کە پیاو کارێکی پیاوانەی وەك خەڵوز دەرهێنان یان پەلاماردانی شارو داگیرکردنی، یان ڕازونیازی لەگەڵ خوادا نیە ژن زۆر بەکەڵکە. لەو کاتانەدا پیاو بۆ ئەوەی دیق نەکات دەبێت چی بکات؟ دەبێت مەی بخواتەوە، یاری نەردێن بکات، ژن بازی بکات.. وچاوەڕێ بێت... چاوەڕێ بێت تا نۆرەی دەگاتێ... ئەویش ئەگەر بیگاتێ...

ماوەیەك بێدەنگ بوو، پاشان بەڕکەوە دووبارەی کردەوە:

–ئەگەر نۆرەی بێت، چونکە لەوانەیە هەر سەرەی نەگاتێ.

دوای کەمێکی تر وتی:

–نابێت ئەم حاڵە هەروا بمێنێتەوە، سەرۆك، یان دەبێت دنیا بچووکتربێتەوە یان من گەورەتربم، ئەگەر وانەبێت من تیا چووم.

ڕاهیبێك لای دارکاژەکانەوە دەرکەوت، قژی سورو ڕووی زەرد بوو، قۆڵی سەرخستبوو، شەوکڵاوێکی خڕی ئاوریشمینی لەسەر دا بوو، گۆچانێکی ئاسنی بەدەستەوە بوو

کەلەکاتی ڕۆیشتندا بەزەویەکەیدا دەکێشا، کەئێمەی دی وەستا، گۆچانەکەی بەرزکردەوەو پرسی:

بۆ کوێ دەڕۆن، بەڕێزینە؟

زۆربا وەڵامی دایەوە: دەڕۆینە پەرستگاکە بۆ نوێژکردن.

ڕاهیبەکە چاوە شینەکانی سوور هەڵگەڕابوون هاواری کرد:

–لەکوێوە هاتوون هەر بەو ڕێیەدا بگەڕێنەوە، مەسیحیەکان، بگەڕێنەوەو بیشزانن کە من ئەم قسانە لەبەرژەوەندی ئێوە دەکەم، ئەم پەرستگایە باخی مریەمی پاکیزە نیە بەڵکوو باخی شەیتانە، دەڵێن هەژاری و گوێ ڕایەڵی و داوێن پاکی تاجی سەری قەشەکانە، هەی هەی! ئەمانە قسەگەلێکی مفتن، من پێتان دەڵێم بڕۆن بەلای کارتانەوە، پارە، خۆبەزل زانین، منالْ بازی سێ کوچکە پیرۆزەکەیانە، زۆربا بەخۆشیەوە بەگوێیدا چرپاندم: یارۆ، باڵۆڵێکی تەواوە، سەرۆك.

لە ڕاهیبەکە نزیك کەوتەوەو پرسی:

–بەڕاست هاوڕێ، ناوت چیەو لێرە چی دەکەیت؟

ناوم زەکەریایە، هەرچیەکم هەیە کردوومەتە بووخچەیەکەوەودەڕۆمو دەڕۆم، چونکە لێرە لە مەزیاتر خۆم پێ ناگیرێت، فەرموو تۆیش ناوی خۆتم پێ بڵێو خەڵکی کوێیت؟

–کاناڤارو.

–کەس ئێرەی پێ قبووڵ ناکرێت، هاوڕێ کاناڤارو، هەموو شەوێك مەسیح بە ئاهوناڵەوە دێتو ناهێڵێت بنووم، منیش لەگەڵیا دەناڵێنم، ئینجا سەرۆکی دێرەکە –خوا لەناوی دەمی کوتێ– ئەم بەیانیە بانگی کردمو پێیوتم: ((چاکە، زەکەریا، تۆ ناهێڵیت هاوڕێ ڕۆحانیەکانی ئێمە خەویان لێ بکەوێت؟ بۆیە دەتکەمە دەرەوە) وتم((من ناهێڵم بنوون؟ من یان مەسیح؟ ئەوە مەسیحە هەموو شەوێك دەست بەئاهو ناڵین دەکات)) ئیدی ئەو پیاوە دوژمن بەمەسیحە گۆچانەکەی هەڵگرتو... بڕوانە ، بڕوانە، شەوکڵاوەکەی سەری لابردو پەڵەیەك خوێنی پیشاندابن کە بەقژی سەریەوە وشك هەڵاتبوو، وتی:

–منیش تۆزی پێڵاوەکانم تەکاندو بۆی دەرچووم.

زۆربا وتی: لەگەڵماندا بگەڕێوە، من لەگەڵ سەرۆکی دێرەکەدا ئاشتتان دەکەمەوە، وەرە لەگەڵمانداو ڕێگایشمان پیشان بدە، خوا تۆی بۆ ئێمە ناردوە.

ڕاهیبەکە کەمێك بیری کردەوە، چاوی بریسکایەوە، پاشان وتی:

–چیم دەدەنێ؟

چیت گەرەکە؟

–کیلۆیەك ماسی خوێکراوو قاپێك کۆنیاك.

زۆربا دانەویەوە، تەماشای کردو وتی:

–ناشێ شەیتان چووبێتە لاشەتەوە، زەکەریا؟

ڕاهیب موچڕکێکی تێ گەڕاو بەسەرسامیەوە وتی:

–چۆنت زانی؟

زۆربا وەڵامی دایەوە: من لە چیای ئاتۆسەوە دێمو ئەم شتانە دەزانم. ڕاهیب سەری دانەواند، بەئاستەم گوێمان لە دەنگی بوو کە وتی: بەڵێ، من شەیتانێکم تیایە.

–کەواتە ئەوە داوای ماسی خوێکراوو کۆنیاك دەکات؟

–بەڵێ، سێ جار بەنەعلەت بێت!

–زۆر باشە، قبووڵمانە، بێگومان جگەرەیش دەکێشێت.

زۆربا جگەرەیەکی بۆ هەڵداو ئەویش بەشەوقەوە گرتیەوەو وتی:

–بەڵێ، جگەرەیش دەکێشێت، سندانی لێدات.

بەرد ئەستێو پووشوەکەی لەگیرفانی دەرهێناو جگەرەکەی داگیرساند، فسێکی قووڵی لێداو دیسان وتی:

–بەناوی عیسای مەسیح.

گۆچانە ئاسنینەکەی دەستی بەرزکردەوە، بەرەو دواوە وەرگەڕاو پێشمان کەوت.

زۆربا چاوی لێ داگرتمو لە ڕاهیبی پرسی:

–باشە، ئێستا ئەم شەیتانەی تۆ ناوی چیە؟

ڕاهیبەکە بێئەوەی ئاوڕ بداتەوە وتی: یوسف.

من بەهاوڕێیەتی ئەم ڕاهیبە نیمچە شێتە دڵخۆش نەبووم، مێشکێکی نەخۆش وەك لەشێکی نەخۆش، لەیەك کاتدا هەم هەستی بەزەیم تیا دەجولێنێت هەم هەستی نەفرەت، بۆیە من هیچ قسەم نەدەکردو زۆربام سەرپشك کردبوو لەوەی دەیکات و دەیلێت.

هەوا پاك و بێگەردەکە ئیشتیهای خواردنی کردینەوە، لەژێر دار کاژێکی گەورەدا دانیشتین، توێشە بەرەکەمان ڕاخست، ڕاهیب بەهەڵەداوان دانەوی و چاوی پیادا گێڕا، زۆربا پێی وت:

–ها .. زەکەریا! هەر لەئێستاوە لیك بەدەمتا نەیەتە خوارێ، ئەمڕۆ دووشەممەی پیرۆزە، ئێمە فراماسونین(١) و بۆمان هەیە هەندێك گۆشت و مریشك بخۆین، خوالێمان خۆش دەبێت.

بەڵام بۆ تۆی پیرۆز حەڵواو زەیتونمان هەیە، وەرە...

ڕاهیبەکە دەستی بەریشە چڵکنەکەیدا هێناو بەدەنگێکی پڕ لە خۆشەویستیەوە وتی:

–منی بەندەی بچووکتان، زەکەریا، ڕۆژو دەگرم و تەنیا زەیتوون و نان دەخۆم و ئاوی ساردی بەسەردا دەکەم، بەڵام هاوڕێیانم، ئەم شەیتانە نەعلەتیەی کە ناوی یوسفە تۆزێك گۆشت دەخوات و زۆریشی حەز بەمریشکە، شەرابی نێو مەتارەکەیشتان دەخواتەوە.

نیشانەی خاچی کێشا، بەشەوق و خۆشیەکی زۆرەوە زەیتون و حەڵوای ماشیەوە بەپشتی دەستی دەمی سڕی و ئاوی خواردەوە، پاشان وەك ئەوەی لە خواردن بووبێتەوە جارێکی‌تر نیشانەی خاچی کێشاو وتیەوە:

–ئێستا نۆرەی ئەو سێ جار نەعلەتیەیە، یەعنی یوسف.

ئینجاپەلاماری گۆشت و مریشکەکەیدا. بەدەم گلاندنی تیکەی گەورە گەورەوە، تووڕەو تڕۆ لەبەر خۆیەوە دەی وت. دەبخۆ.. دەی لەعنەتی، بخۆ.

زۆربا زۆر بە دڵ گەرمیەوە پێی وت:

---

(١) فراماسون کۆمەڵێکی مەزهەبین و لەگەلێك وڵاتدا ئەندامیان هەبوە. لەسەر بنەمای برایەتی هاوکاریان لەگەڵ یەکتردا کردوە، بەهۆی هەندێك هێماو پەرلەی تایبەتیەوە یەکیان ناسیوە، لەسەدەی حەڤدە لەئینگلتەراو سەدەی هەژدە لە فەرەنسادا چالاکی سیاسیان دەست پێ کرد. و–ف

—ئافەرین راهیب، ئافەرین، من پێ بزانم تۆ لە دوولا مەستو حەیرانیت[٢].

پاشان ڕووی لەمن کردو وتی:

بەڕای تۆ چۆن پیاوێکە، سەرۆك؟

پێکەنیمو وتم: هەر لە خۆت دەچێت.

زۆربا مەتارە شەرابەکەی دایە راهیبو وتی:

—وەرە، یوسف، قومێکی لێدە.

راهیب مەتارەکەی گرتو وتی: بخۆرەوە نەعلەتی.

یەکسەر دەمی بەدەمی مەتارەکەوە نا.

خۆرەکە تەواو گەرمی کردبوو، ئێمە زیاتر خۆمان کوتایە ژێر سێبەرەکان، راهیبەکە بۆنی ئارەقی ترشاوو بخورو جەوی لێ دەهات، لەژێر هەتاوە بەتینەکەدا ئارەقەی لێ دەتکاو دەت وت خەریکە دەتوێتەوە، زۆربا ڕایکێشایە ژێر سێبەرەکەوە تا لە وەزیاتر بۆنی ناخۆش نەبێت.

زۆربا کە لە خواردن مڕ ببوو هاتە سەر چەنەبازیو پرسی:

—تۆ چۆن بوویت بەڕاهیب؟

ڕاهیب پێکەنینێکی تەوساوی کردو وتی:

—ڕەنگە وابزانیت لەبەر پیرۆزی ئەم کارەم هەڵبژاردوە؟ نەخێر، لەهەژاریدا، هاوڕێ، لەهەژاریدا، لەبەرئەوەی هیچم نەبوو بیخۆم بەخۆم وت : هیچ چارەیەك نیە بێجگە لەچوونە دێر، ئەگینا لەبرساندا دەمریت.

—ئێستا باشیت؟

لەخوا بەزیادبێت، بێگومان هەمیشە ئاهو ناڵەمە، بەڵام گرنگ نیە، ئاهو ناڵەکەم بۆ شتە دنیاییەکان نیە، من لەوشتانە دەڕیم، بمبوورن. بەڵێ، هەموو ڕۆژێك تێیان دەڕیم،

---

لە دەقە ئەسڵیەکەدا دەڵێن: .. تۆ دوو تیرت لەکەواندایە. وەرگێڕی فارسیەکە دەڵێت: .. تۆ لەدولا بار دەکەیت. محمودی مصاحبی کە وەرگێڕێکی تری فارسیە :.. دوو کاڵەکت بەدەستێك هەڵگرتووە. —وەرگێڕ—

ئاهو ناڵەکەم تەنیا بۆ ئەو دنیایە، من جوك دەگێرمەوەو قسەی خۆش دەکەمو ڕاهیبەکانی تر دەهێنمە پێکەنین.

ئەوان پێم دەڵێن شەیتان چوەتە لەشمەوە، جوێنم پێ دەدەن، بەڵام من بەخۆم دەڵێم:((ئەمە ڕاست نیەو من لەوە دڵنیام کە خوا گاڵتەو گەپی پێخۆشە، ڕۆژێك لەرۆژان پێم دەڵێت: وەرە ژوورێ، لێ بووکەکەمو وەرە ژوریێو بمخەرە پێکەنین)) بۆیە دەبینیت کە من وەك لێبووکی خوا دەچمە بەهەشتەوە.

زۆربا بەدەم هەستانەوە وتی:

–هاورێ، من لەوباوەڕەدام کە بەهەق سەرت بەشانتەوەیە، دەی بابڕۆین تا شەومان بەسەردا نەهاتوە.

جارێکی تر ڕاهیب پێشکەوت. کە بەچیاکەدا سەر دەکەوتین هەستم دەکرد منیش لەناوەوەی خۆمدا بەرەو دنیای ڕۆح هەڵدەکشێم، لەخەمە ناچیزەکانەوە بەرەو خەوە باڵاکانو، لەحەقیقەتە سادەکانەوە بەرەو گریمانە قورسەکان، لەپڕا ڕاهیبەکە وەستا، پەرستگایەکی گومەز خڕی بچووكوجوانی پیشان داینو وتی:

–ئەمەیش مەزاری ((تۆڵە خانمی ئێمە))یە

سڵاوێکی کردو نیشانەی خاچی کێشا.

من دابەزیمو چوومە میحرابە فێنکەکەی پەرستگاکەوە، لەسوچێکدا پەیکەرێکی کۆنم بینی دووکەڵ ڕەشی کردبوو، گەلێك شتی نەزر کراوی لەسەر کەڵەکە بوون، نەزرەکان بریتی بوون لەو پارچە ناسکە زیویانەی کە ناشیانە وێنەی پێ و دەستو چاوو دڵیان لەسەر هەڵکەنرابوو.

بەرانبەر بەپەیکەرەکە بەردەوام مۆمدانێکی زیوین دەسوتا.

زۆر بەبێدەنگی نزیك کەوتمەوە، پەیکەری مریەمی پاکیزەم بەڕوویەکی ترسناکی شەڕئەنگێزو گەردنێکی گیرو نیگای تووڕەو نیگەرانەوە بینی، کە لەباتی کوڕی خوا ڕمێکی ڕاستو درێژی بەدەستەوە بوو.

ڕاهیبەکە بەسەر سامیەوە وتی:

قوڕ بەسەر ئەوکەسەی دەستکاری پەرستگا بکات، حەزرەتی مریەم هێرشی بۆ دێنێت بەڕمەکەی لەشی کون کون دەکات. لەزەمانی کۆندا جەزائیریەکان هاتبوون ئاگریان لەم دێرە بەردابوو، بەڵام بڕوانە چی بەسەر ئەو کافرانەدا هاتوە: هەر لەوکاتەدا کە بەبەردەم دێرەکەدا تێدەپەڕن کتو پڕ مریەمی پیرۆز لەپەیکەرەکە ڕادەبێت، لەپەرستگا دەچێتە دەرێ، بەڕمەکەی تێیان دەکەوێتو هەموویان دەکوژێت. باپیرم باشی لەبیر بوو کە دارستانەکەی پڕ ببوو لەئێسکی ئەوکافرانە. لەوە بەدوا ناویان نا ((تۆڵە خانمی ئێمە)) پێشان ناوی ((بەزەیی خانم)) بوو.

زۆربا پرسی : بەڕاست باوە زەکەریا، پێش ئەوەی کافرەکان دێرەکە بسوتێن، بۆ ئەم حەزرەتە موجیزەی نەنواند؟

ڕاهیبەکە سێ جار نیشانەی خاچی کێشاو وەڵامی دایەوە:

–ئیرادەی خوا وابوو.

زۆربا بەدەم سواربوونی هێسترەکەوە لەبەرخۆیەوە وتی:

–بەساقەی خواو ئیرادەی وابم! دەی بابڕۆین!

دوای کەمێك، بەسەر بەرزیەکەوە کە دەوروبەرەکەی بەتاشە بەردو داری کاژ گیرابوو پەرستگای مریەمی پیرۆز دەرکەوت، دێرێکی هێورو خۆشو چەپەك، لەئامێزی لووتکەیەکی سەوزی سەر کەشو دەشتێکی جوانو فراواندا گونجانێکی تەواو قووڵی دروست کردبوو، بەلای منەوە ئەو دێرە چاکترینو چەپەکترین شوێن بوو کە مرۆڤ بتوانێت لە خەڵوەتدا ڕامێنێو بیر بکاتەوە.

بیرم کردەوە :((لێرەدا، گیانێکی ئارامو ڕەند، دەتوانێت باڵای مرۆڤ بگەیەنێتە ئاستی بڵندی ئاینێك. نەلووتکەیەکی هێند سەختو عاسیە کەمرۆڤ نەتوانێت بیگاتێو، نە دەشتێکی زۆر ئاسانو خۆش ڕەوە، بەڵکوو تەواو وەك ئەوەی کە ڕۆح دەیەوێت، تا بێ ئەوەی جوانیە مرۆڤ بەیەتیەکەی خۆی لەدەست بدات پیایدا سەربکەوێت.

بەخۆم وت((ئەم شوێنە نەقارەمان دروست دەکاتو نەکەسانی بەراز سیفەت، بەڵکو مرۆڤ دروست دەکات)) ئەگەر لێرەدا دێرێکی قەشەنگی کۆنی یۆنانی، یان مزگەوتێکی پاکژی ئیسلامی هەبوایە، ڕێی تێ دەچوو خوا بەبەرگی سادەی مرۆڤەوە بهاتایەتە ئێرە،

بەپێی پەتی بەسەر سەوزەگیای بەهاردا تێ بپەڕیایەو قسەی لەگەڵ خەڵکیدا بکردایە لەبەرخۆمەوە وتم:

چ شوێنێکی چاک، تەریك .. خۆش!

لەوڵاخەکان دابەزینو بەپێ کەوتنەڕێ، لەدەرگای دێرەکە تێپەڕینو بەرەو ژووری میوان سەرکەوتین، لەوێ ژەمەخواردنێکی ئاسایی لەخواردنەوەو مرەباو قاوەیان داینێ. خانەخوێکەمان کە پیاوێکی ڕۆحانی بوو هات، ڕاهیبەکان دەوریان داینو کەوتنە قسە، چاویان ناجۆرو لێویان تینوو بوو، ڕیش‌وسمێڵو بن باخەڵیان بۆنی سابرێنی لێ دەهات.

ڕاهیبێك بەنیگەرانیەوە لێی پرسین: ڕۆژنامەتان لەگەڵ خۆتاندا نەهێناوە؟

من بەسەر سامیەوە وتم: ڕۆژنامە؟ ئێرەو ڕۆژنامە؟

دووسێ ڕاهیبی تر کە قسەکەی منیان بەدڵ نەبوو دەنگیان لێ هەڵبڕی:

–هاوڕێ، بەڵێ ڕۆژنامە، بۆ ئەوەی بزانین چی لەدنیادا ڕووی داوە.

لەبەر هەیوانەکەدا وەستابوونو دەستیان بەشیشەکانەوە گرتبوو، وەك قەلە ڕەشکە دەیان قیڕاند، بەحەماسەتەوە باسی ئینگلیزو روس‌و ڤینزیلوس(٣) و پاشاکانیان دەکرد. دنیا ئەوانی وێل کردبوو، کەچی ئەوان وازیان لە دنیا نەدەهێنا، چاویان پر بوو لەشاری گەورەو پیشانگاو ژنو ڕۆژنامە...

ڕاهیبێکی قەڵەوی کولکن بەمشە مش لەجێگاکەی هەڵساو پێی وتم:

–شتێکم هەیە پێم خۆشە پیشانی تۆی بدەم، تا باری سەرنجی خۆتم پێ بڵێیت، ئێستا دەڕۆمو دەی هێنم.

دەستە کورتو تووکنەکانی نایە سەر سکی، دەم پا دڕاوەکانی بەسەر زەویەکەدا کێش کردو لەپشت دەرگایەکەوە ون بوو.

ڕاهیبەکانی دی پێکەنینێکی زۆڵانەیان کرد، باوکە خانە خوێکەمان وتی:

–باوە دومەتیوس(٤) دیسان چوو پەیکەری گڵینی ژنە ڕاهیبەکەی خۆی بهێنێت، ئەو پەیکەرە شەیتان لەژێر خۆڵدا بۆی شاردبووەوە، تا ڕۆژێك دۆمەتیوس لەکاتی کێڵانی

---

(٣) Venizeeios بڕوانە پەڕاوێزی لاپەڕە(٢٥)

(٤) Dometios

باخەدا دۆزیەوە، بردیە ژوورەکەی‌و ئیتر لەوە بەدوا ئەم نەگبەتە خەو نەچوە چاوی‌و لەوانەیشە تێك چووبێت.

زۆربا لە جێگاکەی هەستا، لەوەدا بوو بخنکێت، وتی:

–ئێمە بۆ ئەوە هاتووین بەرێز سەرۆکی دێر ببینین‌و بەڵێن نامەیەك مۆر بکەین.

راهیبی خانە خوێمان وتی:

–سەرۆك لێرە نیە، ئەم بەیانیە چوو بۆ گوند، دەبێت چاوەڕێی بکەن.

دومەتیوس گەڕایەوە، هەردوو دەستی بەجووت کراوی بۆ پێشەوە درێژ کردبوو، دەت وت جامی پیرۆزی بەهەردو دەستی گرتوە، لەسەرخۆ دەستی لەیەکدی کردنەوەو وتی: ئەمەیە.

من لێی نزیك کەوتمەوە، پەیکەرێکی زۆر بچووکی تاناگرایی [5] بوو، شەرمن‌و نیوەڕوت، لەنێو دەستە قەڵەوەکانی راهیبدا پێدەکەنی، بەتاقە دەستێکیشیەوە کە هەر ئەوەی مابووەوە ئاماژەی بۆ سەری خۆی کردبوو.

دومەتیوس وتی: ئەم دەست بۆ سەربردنەی مانای ئەوەیە کە گەوهەرێکی بەنرخی وەك ئەڵماس یان مرواری لەنێو سەردایە، تۆ چی دەڵێیت؟

ڕاهیبێك بەتێز پێ کردنەوە خۆی تێ هەڵقورتاندو وتی:

–من وای بۆ دەچم سەری ژان بکات.

بەڵام دومەتیوسی قەڵەو بەلچە شۆڕەکەیەوە کەلەلچی سابرێن دەچوو لەمنی دەڕوانی‌و بۆ وەڵامێك ئۆقرەی لێ بڕابوو.

خۆی وتی: من وای بۆ دەچم کە پێویستە ئەم پەیکەرە بشکێت. شەوانە خەوی لەچاوم تەراندوە، ئەی ئەگەر ئەڵماسێکی لەنێو سەردا بوو چی؟

من تەماشای ئەو کچە جوانەم کرد کە بەمەمکە بچووك‌و قوتەکانیەوە، لەم تاراوگەیەدا، لەنێو ئەم بۆنی بخوورو جەوی‌و ئەم خوا لە خاچ دراوانەدا کە نەفرەت لەلەش‌و پێکەنین‌و ماچ دەکەن وەستابوو.

---

(٥) Tanagra گوندێکی بچووکی یۆنانیە، بەدروست کردنی پەیکەرە گڵینەکانی کۆن، بەتایبەت ئەوانەی چوارسەدە پێش زاینی مەسیح کراون ناوبانگی دەرکردوە. –و.ف–

ئاه.. خۆزگا دەمتوانی رزگاری بکەم!

زۆربا پەیکەرە بچووکە گڵینەکەی بەدەستەوە گرت، دەستی بەلەشی جوان و ژنانەیدا هێناو پەنجەی نایە سەر مەمکە قوت و گۆپکە تیژەکانی و وتی:

-تۆ، ئەی راهیبی چاك، نابینیت کە ئەمە شەیتانە؟ ئەرێ، ئەمە خودی شەیتانەو چ گومانێك لەمەدا نیە، نیگەران مەبە، من ئەو مەلعونە باش دەناسم، تەماشای مەمکی خڕو قوت و تەڕو تازەی بکە، باوکە دومەتیوس، مەمکی شەیتانیش هەروایە، من ئەمە چاك دەزانم.

ڕاهیبێکی گەنج لەدەرگاوە دەرکەوت، خۆر قژی ئاڵتونی و دەم و چاوی خڕو گەنەموو دەرکردووی رووناك کردەوە.

راهیبێك کەزمانی وەك زمانی مار ژەهراوی و لەپێشدا قسەی دەکرد، چاوی لەباوکی رۆحانی و خانە خوێکەمان داگرت و هەردووکیان پێکەنینێکی شەیتانانەیان بۆ یەکتری کرد. وتیان: باوە دومەتیوس ئەوە گابریلی (٦) شاگردتانە.

دومەتیوس بەپەلە پەیکەری گڵینی ژنەکەی هەڵگرت و وەك بەرمیل بەرەو دەرگای دەرەوە غلۆر بووەوە، شاگردە جوانکیلەکە هێورو لەسەرخۆ لەپێشیەوە دەڕۆیشت و، هەردووکیان لە ڕاڕەوە درێژو ڕووخاوەکەدا ون بوون.

من ئاماژەم بۆ زۆربا کردو هەردووکمان لە ژوورەکە چووینە دەرێ، هەواکە گەرمیەکی خۆشی هەبوو، لەناوەڕاستی حەوشەکەدا بۆنی دارنارنجێکی گوڵ گرتوو هەموو ئەو ناوەی پڕکردبوو، لەنزیك دارەکەوە، لەدەمی بەرانێکی لەمەڕمەڕ دروست کراوەوە ئاو فوارەی دەبەست، من سەرم خستە بەری و هەستم بەفێنکی کرد.

زۆربا بەبێزاریەوە وتی:

-ئەمانە چ جۆرە مرۆڤێکن؟ نەپیاون، نەژن، هێسترن.. ئاه! مردنیان لەم حاڵەیان چاکترە.

زۆرباش سەری خستە ژێر ئاوە ساردەکەو دەستی بەپێکەنین کرد، پاشان وتی: ئاه! بۆ مردن چاکن، هەریەکەو شەیتانێکی تیایە، یەکێك ژنی دەوێت و یەکێکی تر ماسی،

(٦) Gavrili

ئەویان پارەو ئەمیان ڕۆژنامە، کۆمەڵێکی کەرو بێ عەقڵن، ئەمانە بۆ نایەنە ناو خەڵکەوە تالەو شتانە تێربن کە دەیانەوێت‌و ئیدی سەری خۆیان نەیەشێنن؟

جگەرەیەکی داگیرساندو لەژێر دار نارنجە گوڵ کردوەکەدا لەسەر کورسیەك دانیشت‌و وتی: دەزانیت کە من حەزم لەشتێك دەبێت چی دەکەم؟ ئەمەندەی لێ دەخۆم کە لە دڵم بدات‌و ئیتر جارێکی دی ئارەزووی نەکەم، یان ئەگەر ئارەزوویشی بکەم دڵم تێکەڵ بێت. من لەمنداڵیمدا شێتی گێلاس بووم، ئەوەندەیشم پارە نەبوو کەژەمێکی باشی لێ بکڕم، بۆیە چەندە گێلاسم بکڕیایەو بخواردایە دیسان حەزم لێ دەکردەوە، شەوو ڕۆژ لەبیری گێلاسدا بووم‌و ئازارم پێوە دەکێشا، تا ڕۆژێك ڕقم هەستا، یان شەرم گرتمی، نازانم کامیان بوو، بەڵام بەڕاستی هەستم بەوە کرد کەمن بەندەی گێلاسم، هەر ئەمەیش منی کردبوە جێی پێکەنینی خەڵکی، جاچیم کرد؟ شەوێك هەستام‌و لەسەرخۆ گیرفانەکانی باوکم گەڕام، ((مەجیدی))یەکی زیوم دۆزیەوەو هەڵم گرت، بەیانی زوو چوومە لای باخەوانێك‌و زەمیلەیەك گێلاسم کڕی، چوومە پەنایەکەوەو دەستم بەخواردنی کرد، ئەوەندەم خوارد ئەوەندەم خوارد تاورگم هەڵئاوسا، دوای کەمێك گەدەم دایە ئێش‌و کەوتمە ڕشانەوە، بەڵێ سەرۆك. ڕشامەوەو ڕشامەوە، ئیتر لەوساوە نەچوومەوە سەر گێلاس خواردن‌و حەزەکەم تیا مرد، بەجۆرێك تەنانەت ئەگەر وێنەی گێلاسیشم بدیایە تێك دەچووم، ئیدی بەتەواوی ڕزگارم بوو، تەماشام دەکردو دەموت: ((ئیتر پێویستم پێت نەماوە)) پاشان ئەم کارەم لەگەڵ خواردنەوەو تووتنیشدا کرد، هەڵبەتە هێشتا شەراب دەخۆمەوەو جگەرە دەکێشم، بەڵام هەرکاتێك بمەوێت وازیان لێ دێنم‌و ئیتر ئەوە نەما ئارەزوو هەموو شتێکم پێ بکات، بۆ نیشتمانیش هەروا، زۆرم حەز پێ بوو، ئەمەندەم خوارد تالیی تێر بووم، پاشان دڵم تێکەڵ هات‌و لەشەڕی ئەویش ڕزگار بووم.

پرسیم: ئەی لەگەڵ ژندا؟

—نۆرەی ئەو سۆزانیانەیش دێت، بەڵێ، نۆرەیان دێت، بەڵام کە تەمەنم بوە حەفتا ساڵ.

کەمێك بیری کردەوە، بەڵام لەبەرئەوەی ئەو ژمارەیەی بەکەم زانی چاکی کردەوەو وتی:

—هەشتا ساڵ، سەرۆك، ئەزانم پێکەنینت بەم قسەیە دێت. باوابێت، چەند دەتوانیت پێ‌بکەنە، مرۆ وارزگاری دەبێت، گوێت لە من بێت سەرۆك، ئەوەیش بزانە کە ڕێگای تر بۆ رزگار بوون نیە، بێجگە لەوەی کە مرۆڤ ئارەزووی چی کرد تێری لێ بخوات، نەك ئەوەی بەتەواوی خۆی لێ مەحروم بکات، بەڵێ هاوڕێ، تۆ چۆن دەتوانیت خۆت لەشەڕی شەیتان رزگار بکەیت ئەگەر خۆت نەبیتە شەیتان‌و نیوێك؟

دومەتیوس بەهەناسە برکێ لەحەوشەکەدا دەرکەوت، ڕاهیبە جوان‌و قژ زەردەکەی بەدواوە بوو.

زۆربا لە جوانی‌و سەنگینیەکەی ورد بووەوەو لەبەر خۆیەوە وتی:

—دەڵێی فریشتەیەکی تورەیە:

بەجووتە لەو پلیکانە بەردینانە نزیك دەکەوتنەوە کە دەی گەیاندنە ژوورەکانی سەرەوە، دومەتیۆ سەری وەرگێڕا، تەماشای راهیبە شاگردەکەی کردو شتێکی پێ وت، شاگردەکە وەك ئەوەی داوایەك ڕەت بکاتەوە سەری ڕاوەشاند، بەڵام زوو سەری قایل بوونی دانەواند، دەستی لەکەمەری پیرە ڕاهیب ئاڵاندو بەپلیکانەکاندا سەر کەوتن.

زۆربا پرسی:

—دەبینیت، سەرۆك؟ دەبینیت؟ کارەساتی سادوم‌و عامورایە[(٧)]، دووڕاهیب سەریان کێشا، چاویان لێك داگرت، بەچرپە شتێکیان بەگوێی یەکداداو دایانە پێکەنین.

زۆربا بەرکەوە وتی: چ بەدرەگەزێکن! گورگ یەکتری ناخۆن بەڵام ڕاهیب بەڵێ. تەماشایا بکە چۆن گاز لەیەکدی دەگرن؟

ئایا دیوتانە ژن لەگەڵ ژندا وابکات؟

پێکەنیم‌و وتم: بەڵام ئەمانە پیاون.

—لێرە، سەرۆك، جیاوازی لە نێوان ژن‌و پیاودا نیە، من پێت دەڵێم ئەمانە هەموو هێسترن، تۆکەیفی خۆتە چ ناوێکیان لێ دەنێیت:

---

دوو شاری کۆنی فەلەستینن کە خەڵکەکەی بەداوێن پیس ناویان دەرکردبوو، وەك تەورات دەڵێت بروسکەیەك وێرانی کردن، ئەمەیش تۆڵەیەکی ئاسمانی بوو، ناوی سادوم‌و عامورا زیاتر لەگەڵ بەچە بازیدا دێت. —و.ف—

((گابریل)) یان ((گابریلا)) ((دومەتیوس)) یان ((دومەتیا)) بابڕۆین، سەرۆك، تازوە بەڵگەنامەکان مۆر بکەین‌و بڕۆین بەپێی کاری خۆمانەوە، تا لێرە زیاتر بمێنینەوە هەرچی ژن‌و پیاوە لەبەرچاومان دەکەوێت.

دەنگی نزمتر کردەوەو دووبارە وتی :

-منیش پڕۆژەیەکم هەیە..

-دێوانەییەکی تر؟ زۆربا؟ تۆ بیر لەوە ناکەیتەوە کەبەشی خۆت شێتیەتیت کردوە؟ دەی، فەرموو، بزانم چ پڕۆژەیەکە؟

زۆربا شانی هەڵتەکاندو وتی:

جا چۆنت پێ دەڵێم، سەرۆك، بمبوورە، تۆ پیاوێکی چاکی‌و چەند بتوانیت یارمەتی خەڵکی دەدەیت، ئیتر هەر کەسێك بێت، بۆ نموونە ئەگەر زستان ئەسپێیەك بەسەرلێفەکەتەوە ببینیت ئەی خەیتە ژێر لێفەکەوە تا سەرمای نەبێت، بۆیە من بڕوا ناکەم لەقسەی چەتەیەکی پیری وەك من تێ بگەیت؟ من ئەگەر ئەسپێیەك ببینم دەی پلیشێنمەوە، ئەگەر مەڕێکم دەست بکەوێت سەری دەبڕم، لەشیشی دەدەم‌و لەگەڵ برادەرەکانمدا دەیخۆم، بێگومان تۆ بەمن دەڵێیت ئەمە مەڕی تۆنیە، ڕاست دەکەیت، بەڵام سەرۆك گیان، هەڵمەچۆ، تۆ هەوەڵ جار لێگەڕێ بامەڕەکە بخۆین، پاشان لەسەرخۆ دابنیشین‌و قسە لەسەر ئەوە بکەین کە ئەوە مەڕی منە یان هی تۆیە، ئەوکاتەی کەمن بەدەنکە شقارتە سەرگەرمی پاك کردنەوەی بن دانەکانم تۆ هەرچی ئەڵێی بیڵێ.

دەنگی قاقای پێکەنینی زۆربا ناوحەوشەکەی پرکرد، زەکەریا ترسی لێ نیشت‌و گەڕایەوە، پەنجەی لەسەر لێوی داناو، بەئەسپاییی‌و لەسەر پەنجەی پێی لێمان نزیك کەوتەوەو وتی:

-وس، پیِمەکەنن، لەسەرەوە، لەپشت ئەو پەنجەرە بچووکە کراوەیەو گەورە قەشە کاردەکات، ئەوی کتێبخانەیە، دەنووسێت، ئەو پیاوە پیرۆزە بەدرێژایی ڕۆژ دەنووسێت، دەنگتان بەرزمەکەنەوە،

---

پیتی -ا- لەدوای ناوەوە نیشانەی مێینەیە، وەك پیتی (ة) لەزمانی عەرەبیدا نیشانەیە بۆ مێ. و-ف

زۆربا قۆڵی گرت‌و وتی:

–ها، باوه یوسف، به‌ڕاست من ده‌مویست بتبینم، بابرۆینه ژووره‌وه‌و پێكه‌وه هه‌ندێك قسه بكه‌ین.

پاشان ڕووی له‌من كردو وتی:

–تۆ له‌م به‌ینه‌دا، سه‌رۆك، برۆ سه‌رێك له‌كلێسا بده‌و ته‌ماشای په‌یكه‌ره كۆنه‌كان بكه. من چاوه‌ڕێی سه‌رۆكی دێرم، ڕه‌نگه بۆ هاتنه‌وه‌ی زۆری نه‌مابێت، به‌تایبه‌تی تۆ خۆت مه‌خه‌ره هیچ مه‌سه‌له‌یه‌كه‌وه، چونكه تێكی ده‌ده‌یت، كاره‌كان بخه‌ره ئه‌ستۆی من، چونكه من پرۆژه‌م هه‌یه.

زۆربا سه‌ری نایه بن گوێم‌و وتی:

به‌نیوه قیمه‌ت دارستانه‌كه‌مان ده‌ست ده‌كه‌وێت، هه‌قت نه‌بێت،

ها:

قۆڵی به‌قۆڵی ڕاهیبه شێته‌كه‌دا كردو به‌په‌له بۆی ده‌رچوو.

—١٨—

به بەردەرگای پەرستگاکەدا تێ پەڕیمو چوومە ناو فەزای نیوە تاریکو ساردو بۆنی خۆشیەوە، پەرستگاکە چۆڵو هۆڵبوو، مۆمدانە برونزیەکان کز دەگڕان، پەیکەر بەندێکی دارین کە بەوردیو تایبەتی دروست کرابوو هەموو پشتەوەی پەرستگاکەی داگیرکردبوو، هەردەت وت کەپرێکی لەژێر دروست کراوە هێشوە ترێی پێدا هاتۆتە خوارێ، لەسەرەوە تا خوارێ دیوارەکان بەوێنەو نیگاری نیوە کوژاوە ڕازابوونەوە، وێنەی ئەو زاهیدە بەسامانەی لەپەیکەری ئێسکێن دەچوون، باوە ڕۆحانیە پیرۆزەکان، دیمەنی ئازاردانی مەسیح، فریشتەی توندو تووڕە کەقژیان بەشریتی پان بەستبوو، شریتەکان ڕەنگی شینو سووری خۆیان بواردبوو.

لەسەرەوە، بەتاقێکەوە، مریەمی پاکیزە بە ئامێزی والآیەوە دەگریو دەپاڕێتەوە، لەبەردەمیا چراوگێکی قورسی زیوین دەسوتێت، شەوقێکی پەرت لەدەمو چاوی ڕەنجدیوی مریەم دەداتو نەوازشی دەکات. من هەرگیز چاوی پڕ لەخەمو ئازارو دەمو لێوی چین تێکەوتوو چەنەی هەڵکەوتووی کە مانای بەورەیی ئەوی دەبەخشی لەیاد ناکەم. بەخۆم وت: ئەمە ئەو دایکەیە کە لەناخۆشترینو تەنگژەترین ڕۆژانی تەمەنیا دڵخۆشو بەختەوەر بوە، چونکە هەست دەکات لەڕەحمی ئەوەوە کە نەمرنیە شتێك لەدایك بوە کە نەمرە.

کە جارێکی تر بەبەردەمی دەرگای پەرستگاکەدا تێ پەڕیم خۆر لە ئاوابووندا بوو، بە خۆشیەوە لە ژێر دار نارنجەکەدا دانیشتم، گومەزی پەرستگاکە ڕەنگی گوڵی گرتبوو، دەت وت گزنگی بەیانیە، ڕاهیبەکان بۆ حەسانەوە چوبوونە ژورەکانیانەوە، ئەوان بە شەو نەدەنووستنو دەبوو هێزێکیان بەبەردا بێتەوە، ئەو شەوە جارێکیدی مەسیح لە خاچی

جولجو[1] بەسەر دەكەوت‌و دەبوو ئەوانیش لەگەڵیدا بۆ ئاسمان هەڵكشێن، دووبەرازی مێچكە ڕەش بەگوانی پەمەییانەوە لەژێردار خرنوكی شامیە كەوتبون‌و وەنەوزیان دەدا، كۆترەكانیش بەسەر سەربانەكانەوە بەسەر یەكتردا دەفسین.

لەگەڵ خۆمدا بیرم لەوە كردەوە كە تاكەی دەتوانم بژیم‌و هەست بەدلۆڤانی زەوی‌و هەواو بێدەنگی‌و ئەم بۆنە خۆشە بەهاریەی نارنج بكەم؟ پەیكەری باخوسی[2] پیرۆز كە لەپەرستگاكەدا بینیبوم دڵمی لێوان لێو كردبوو لەخۆشی‌و شادمانی، هەموو ئەو شتانەی بەقوڵی دەچنە دڵەوە: لە سوربون لەسەر عەشقەوە بیگرە تا بەردەوامی لەسەر هەوڵدان دیسان بۆ من ئاشكرا بوون، درووود لەو پەیكرە بچووك‌و جوانەی لاویەتی مەسیح كە ئەڵقە ئەڵقەی قژی وەك هێشوە ترێی ڕەش بەسەر تەوێڵیا هاتبووە خوارێ، دیونیسوس[3] ی خوای جوانی‌و خەڵوەت‌و باخۆسی پیرۆز لەمندا تێكەڵ بەیەكتری دەبوون‌و دەبوونە یەك. لەژێر گەڵای مێوو لەژێر بەرگی ڕاهیبدا، ئەو لەشەی خۆر سوتاندبووی‌و، بەردەوام بۆ خۆش ویستنی ژیان لەهەڵچوون‌و نەسرەوتندا بوو، ئەوە تەنیا جەستەی یۆنان بوو.

زۆربا گەڕایەوەو هەر لەدوورەوە هاواری كرد:

—سەرۆكی دێر هات‌و كەمێك قسەمان پێكەوە كرد، دەبێت تاڕادەیەك دڵنەوایی بكەین، دەڵێت ئامادە نیە هەر ئاوا مفت دارستانەكە لەكیس بدات، كابرایەكی ناقۆڵایەو زۆر داوا دەكات، بەڵام هێشتا نەكەوتووینەتە دان‌وستانەوە، بێگومان خۆم بەلایەكیدا دەخەم.

—جادڵنەوایی بۆ بكەین؟ ئێمە پێشان ڕێك نەكەوتبووین؟

زۆربا پاڕایەوەو وتی:

---

(١) Golgotha شوێنێكە لە دەرەوەی (بیت المقدس) دەڵێن عیسا لەوێ لەخاچ دراوە، هەر لەو شوێنەدا كەنیسەی قیامەت دروست كراوە.

(٢) Bacchas لەئەفسانەی یۆنانیدا خوای مەی‌و خواردنەوەیە. —و—

(٣) Dionysos لە ئاینی یونانیان دا خوای ئاوس بوون‌و شەرابە، پەیڕەوی لێ كردنی لەگەڵ خواردنەوەی، سەما، موسیقا، سەربڕینی حەیوان‌و قوربانی كردن دایە، ڕۆمیەكان لەگەڵ باخوسدا بەیەكی دەزانن.

-تکات لێ دەکەم، سەرۆك، تۆ خۆتی تێ هەڵمەقورتێنە، دەزانم کارەکە دەشێوێنیت، تۆ تازە بەتازە باس لەڕێکەوتنی کۆن دەکەیت! ئەوە خوالێی خۆش بوو، ناوچاوت بەیەکدا مەدە، وتم خوالێی خۆش بوو، ئێمە ئەم دارستانەمان بەنیوە قیمەت دەست دەکەوێت.

-دیسان چ فرۆفێڵێکت لەژێر سەردایە، زۆربا؟

-تۆ هەقت بەسەرەوە نەبێت، ئەمەیان کاری خۆمە، من چەرخەکە رۆن ئەکەمو ئەیخەمە گەڕ، تێ دەگەیت؟

-ئاخر بۆ؟ من تێ ناگەم.

لەبەر ئەوەی لە (کاندی) من لەوە زیاترم خەرج کرد کە پێویست بوو، چونکە (لولا) گیرفانی هەڵتەکاندم، مەبەستم ئەوەیە گیرفانی تۆی هەڵتەکاند، تۆ وادەزانیت من ئەوانەم لەبیرکردوە؟ مرۆڤ ئابرۆی هەیە. تۆ چۆنی تێ دەگەیت؟ برامان براییو کیسەمان جیایی، من پارەم خەرج کردوەو دەبێت بیدەمەوە، حسابیشم کردوە، لولا حەوت هەزار دراخمای تێ چوەو دەبێت ئەوبڕە پارەیە لەم دارستانە دەربێنم، دەبێت سەرۆکی دێر، پەرستگا، حەزرەتی مریەمی پاکیزە ئەو قەرزانەی لولا بدەنەوە، ئەمەیە پڕۆژەی من، ئێستا دڵت ئاوی خواردەوە؟

-هەرگیز، بۆ دەبێت حەزرەتی مریەم بەر پرسیاربێت لە زیادە خەرجی تۆ؟

-بەرپرسیارەو زیاتریش، خودی ئەو حەزرەتە کوڕێکی بوە خوای ئێمەیە، ئەم خوایەیش منێکی زۆربای دروست کردوەو ئامێرێکی داوەتێ کە خۆت دەیزانیت، ئەم ئامێرە نەعلەتیە، هەر ئەوەندەی من چاوم بەژنێك بکەوێت ئیتر هەراسم لێ هەڵدەگرێت، وام لێ دەکات سەری کیسەی پارەکەم بکەمەوە، ئەزانیت؟ بۆیە ئەو حەزرەتە بەر پرسیارەو لەبەرپرسیاریش زیاترەو ناچاریشە بیداتەوە.

-زۆربا، من حەز بەم قسانە ناکەم.

-ئەوە شتێکی ترە، سەرۆك، لێگەڕێ باجارێ ئەو حەوت هەزار لیرە کەمە رزگار بکەین، دوای ئەوە قسەی لێ دەکەین، تۆ ئەو گۆرانیەت بیستوە کەدەڵێت: ((ئازیزەکەم، وەرە جارێ ئەوینم لەگەڵدا بکە، پاشان من دەبمەوە بەپوورت))؟

باوە رۆحانیە قەڵەوەكەی خانە خوێمان، بەدەنگێكی لەسەرخۆی راهیب ئاسا وتی:

—بفەرموون بۆ ژوریّ، شێو ئامادەیە.

بۆ ژووری نان خواردن چووینە خواریّ، ژوورەكە گەورەو كورسیو مێزی درێژو باریكی تیابوو، هەوای ناوژوورەكە بۆنێكی توندی پاشماوەی ڕۆنی لیّ دەهات، بەسەر دیواری ژوورەكەوە وێنەی (دوا شێوی مەسیح)[٤] كرابوو، یانزە هاوڕێی دڵسۆزی وەك مەڕ لە دەوری مەسیح مۆڵیان خواردبوو، بەرانبەریان، تەنیا یەهودای قژ خورمایی، ناوچاو قۆقز، هەڵۆ لووت، وەك مەڕی گەڕی ڕانەكە پشت لەوان بەتەنیا وەستا بوو، مەسیحیش هەر تەماشای ئەوی دەكرد.

باوە راهیبی خانە خوێمان دانیشت، من لای ڕاستیەوەو زۆربا لای چەپیەوە دانیشتین، وتی:

—ئێمە بەرۆژوین، ببوورن كە نە ڕۆن زەیتمان هەیە نە شەراب، تەنانەت بۆ ئێوەی موسافیریش، هەر چۆنێكە بەخێربێن.

ئێمە نیشانەی خاچمان كێشاو بیّ دەنگ زەیتونو تەڕە پیازو لۆبیاو حەڵوامان كردە قاپەكانمانەوە، هەرسێكمان وەك كەروێشك لەسەر خۆو هێور كەوتینە خواردن.

باوەی خانە خویّ وتی: ژیانی ئەم دنیایە ئەمەیە، خاچو رۆژو، بەڵام سەبرتان هەبێت، برایان، سەبرتان هەبێت، وا رۆژی قیامەت نزیكەو بەهەشتی خوایش هەر نزیكە.

من كۆكیم، زۆربا بۆ ئەوەی بێدەنگم بكات پێی بەپێمدا نا، بۆ گۆڕینی باسەكەیش وتی:

—من باوە زەكەریام بینی...

باوەی رۆحانی خانە خوێمان ڕاپەڕیو بەدوودڵیەوە وتی:

---

(٥) Last supper دوا نـان خـواردنی حـەزرەتی مەسیحە لەگـەڵ دوانـزە هاورێكەیدا، لەودانیشتنەدا مەسیح ئامارە بەوە دەكات كە یەهودا دەیداتە دەستەوە، خۆیشی نانو شەراب دەداتـە هاورێكانیو پێیـان دەڵێـت: هـەمووتان لێـی بخۆنـەوە، چونكە ئەمـە خوێنی منەو لە سـەردەمی نوێـدا بـۆڵ خـۆش بـوونی گونـاهی زۆر كـەس دەڕژێـت، هـەر ئەوشـەوە عیسـا دەستگیركراو لەخاچ درا. —و—

–ئەو شێتە نەعلەتیە شتێکی پێتان وتوە؟ ئەو بۆتە گاڵتەجاڕی حەوت شەیتان، ئێوە گوێ لەقسەی مەگرن، گیانی پیسەو لەهەرشوێنێکیشدا بلاوی دەکاتەوە.

زەنگی کلێسا ئاوازێکی غەمگینی لێ بەرز بوەوە کەنیشانەی دەست پێ کردنی هەفتەی ماتەمینیە، باوەی رۆحانی خانە خوێمان نیشانەی خاچی کێشا، لەجێگاکەی هەستاو وتی:

–دەبێت من برۆم، ڕێو ڕەسمی ئازارکێشانی مەسیح دەستی پێکرد، دەبێت ئێمە خاچەکەی لەگەڵدا هەڵبگرین، ئێوە ئەمشەو هەر لێرە بمێننەوە، دیارە سەفەر ماندوی کردون، بەڵام بەیانی زوو بۆ نوێژ ئامادەبن.

هەر کەڕاهیب پێی هەڵگرت زۆربا لەبەرخۆیەوە کەوتە پرتەو بۆڵە:

–بەد ڕەگەز، پیس، درۆزن، هێستر.

–چیتە زۆربا؟ زەکەریا شتێکی پێ وتوویت؟

–وەلیکە، سەرۆك، کارت پێوە نەبێت، ئەگەر ڕێکەوتن نامەکان مۆر نەکەن دەزانم چیان بەسەردێنم.

چووینە ئەو ژوورەی بۆیان ئامادە کردبووین، لەسوچێکدا پەیکەری مریەمی پاکیزە دانرابوو، رووەتی نووساندبوە ڕوومەتی کوڕە ئاسمانیەکەیەوە چاوەگەورەکانی پڕبوون لە فرمێسك.

زۆربا سەرە زلەکەی ڕاوەشاندو وتی:

–سەرۆك، دەزانیت حەزرەتی مریەم بۆ دەگری؟

–نا

–چونکە هەموو ئەو ڕێکەوتنانەی کەلێرەدا جێبەجێ دەکرێن ئەو بەچاوی خۆی دەیبینێت، ئەگەر من پەیکەری پیرۆزم دروست بکردایە وێنەی حەزرەتی مریەمم بێ چاوو گوێو لووت دەکرد،چونکە دڵم پێی دەسوتێت.

لەسەر پێخەفە زبرو ناخۆشەکان ڕاکشاین، کۆڵەکەکانی بن میچەکە بۆنی دار کاژیان لێ دەهات، بۆنی گوڵە بەهارە لەپەنجەرە کراوەکەوە دەهاتە ژورێ، جارجارە دەنگی غەمگینی شینو شەپۆڕ وەك شەپۆلی با لە حەوشەکەوە دەهات، هوزارێك لەنزیك

پەنجەرەکەوە کەوتە خوێندن، یەکێکی کەمێك لەو دوورتر بۆی سەندەوە، یەکێکی تریش، هەموو کەوتنە خوێندن، ئەو شەوە لێوان لێوبوو لەخۆشەویستی.

من خەوم لێ نەدەکەوت، دەنگی هوزارو نالەی مەسیح تێکەڵ ببوون، منیش لەنێو دارنارنجە بەگوڵ داپۆشراوەکاندا دەمویست بکەومەدوای ئاسەواری پەڵە خوێنەکانی مەسیحو بەسەر جولجوکاندا سەرکەوم. لەو شەوە شینە بەهاریەدا ئارەقەی ساردی مەسیحم دەبینی کە بەسەر جەستە شەکەتو ماندوەکەیدا دەڕژا، دەستە لەرزۆکەکانیم دەبینی چۆن درێژی کردبوون، وەك بپاڕێتەوە یان سواڵ بکات، خەڵکی بێ دەستەڵاتی جەلیل[٥] بەپەرۆشەوە کەوتبوونە دوایو هاواریان دەکرد:

(هوشیعان، هوشیعان)[٦] ئەوان چڵی درەختیان لەدەستاو جلەکانیان لەبەرپێی مەسیحدا ڕادەخست، مەسیح تەماشای ئەوانەی دەکرد کە خۆشی دەویستن، بەڵام هیچ کەسێکیان ئاگایان لەدەردو ئازاری ئەونەبوو، تەنیا خۆی دەیزانی کەبەرەو کوشتارگای دەبەن.

لەژێر ئەستێرەکاندا، بێدەنگ دەگریا، دڵخۆشی دڵە ئینسانیەکەی خۆی دەدایەوە کە پڕبوو لەهەراسو هەڵچوون، دەی وت:((تۆ،دڵی من، دەبێت تۆیش وەك دەنکە گەنم. بچیتە ژێر خاکو بمریت، مەترسە، ئەگینا چۆن دەبیتە گوڵە گەنم؟ چۆن دەتوانیت ئەوکەسانە تێر بکەیت کە خەریکن لە برساندا بمرن؟)

بەڵام دڵە ئینسانیەکەی ئەو خۆ بەخۆ لەبزاوتو لەرزیندابوو، نەی دەویست بمرێت...

زۆری نەبرد کە دارستانی دەوری دێرەکە پڕبوو لە دەنگی هوزار، لەنێوان لقو گەڵاو ئاونگ لێ کەوتوەکاندا ئاوازێکیان دەخوێند تێکەڵ لە خۆشەویستیو ئارەزوو، لەگەڵ ئەودەنگانەدا دڵی بێچارەی مرۆڤ دەلەرزیو دەگریاو دەماسی.

---

[٥] Galilee ناوچەیەکی کشتوکاڵی باکوری فەلەستینە، لەوێ عیسا پەیامی پێغەمبەری بۆ هات. -و-

[٦] ئاماژەیە بە ئایەتی ۸،۹ لەبەشی ۲۱ ئینجیلی مەتی، لەوێدا باسی لەوە دەکات کە خەڵکانێك کەتبوونە بەردەم دوای مەسیحو هاواریان دەکرد: هوشیعان، کوڕی داودو مزگێنی لەو کەسەی کەناوی خوای هەڵگرتوە -و-

منیش، ورده ورده، بێ ئەوەی هەست بەخۆم بکەم، لەگەڵ ئازاری مەسیحو گۆرانی هوزاردا، وەك ڕۆحێك بیەوێت بڕواتە بەهەشتەوە، خەوم لێکەوت.

* * *

هێشتا سەعاتێکم خەو نەکردبوو کەڕاپەڕیم، هاوارم کرد:

–زۆربا، گوێت لێ بوو؟ دەنگی دەمانچەبوو، ها!

زۆربا لەسەر تەختەی نووستنەکەی دانیشتبوو جگەرەی دەکێشا، لەوکاتەدا کە ڕکەکەی خۆی دەخواردەوە وتی:

–دڵت هیچ نەکات، سەرۆك، لێ یان گەڕێ با ئەم بەرازانە لەیەکتر بەرین.

لەڕاڕەوەکەدا دەنگی ئاهو ناڵە پەیدا بوو، دەنگی دەم پا دەهات کە بەسەر زەویەکەدا ڕادەکێشرا، دەنگی کرانەوەو داخستنی دەرگاکانو، کەمێك دوورتر دەنگی پیاوێکی بریندار.

لەتەختە خەوەکە هاتمە خوارێو دەرگام کردەوە، پیرە مێردێکی لاوازی وشکەڵاتو لەبەردەممداڕوا، هەردوو دەستی کردەوە، وەك بیەوێت ڕێگاکەمان لێ بگرێت، شەو کڵاوێکی سپیو نووك تیژی لەسەرداو کراسێکی سپی کەتاسەر ئەژنۆی دەهات لەبەردابوو.

–تۆ کێیت؟

لەوەڵامدا وتی: قەشەی گەورەو دەنگی لەرزی.

خەریك بوو بدەمە قاقای پێکەنین، گەورە قەشە ئەی کوا کاڵای ڕازاوەی؟ بەرگی سورمەچینی؟ تاجی قەشایەتی؟ عاسای دەستی؟ گەوهەری گرانبەهای؟ ئەمە یەکەمجارم بوو گەورە قەشەیەك بەبەرگی خەوەوە ببینم.

–ئەو دەنگی دەمانچەیە چی بوو بەڕێز؟

لەسەرخۆ ئێمەی بۆلای ژوورەکە بردو لەبەرخۆیەوە وتی:

–نازانم، بەڕێز، نازانم...

زۆربا هەر لەسەر ڕایەخەکەیەوە قاقایەکی کردو وتی:

–دەترسیت؟ وەرە ژووری، پیرەمێرد، هەر لای ئێمەیش بمێنەوە، ئێمە راهیب نین، لێمان مەترسە.

من لەسەرخۆ وتم: زۆربا، رێزی زۆری بگرەو قسەی لەگەڵدا بکە، یارۆ گەورە قەشەیە.

–باوکە، گەورە قەشەیی بەکراسی خەوتنەوە ناکرێت. پێم وتیت وەرە ژووری.

زۆربا خۆی هەستا، قۆڵی گرتو هێنایە ناو ژورەکەوەو دەرگای بەست. لەکیسەکەی قاپێك ئارەقی رومی دەرهێنا، پەرداخێکی بچووکی لێ پڕکردو وتی:

–بینۆشە، هاورێ، ئەمە توانا بەدڵت دەدات.

پیرەمێردەکە پێکەکەی هەڵداو هاتەوە سەرخۆی، لەسەر جێگاکەی من ڕاکشاو پاڵی بەدیوارەکەوەدا.

وتم: گەورەو بەڕێز، ئەو تەقەی دەمانچەیە چی بوو؟

–نازانم، کوڕم.. من تانیوەی شەو لەکاربووم و ڕۆیشتبوومەوە بنووم. لەپڕا لەژورەکەی تەنیشتم، ژوری بابا دومەتیوس گوێم لە دەنگێك بوو.

زۆربا بەدەم قاقای پێکەنینەوە وتی:

–ئا! ئا! تۆ زۆر ڕاستت کرد، زەکەریا، ئەم بەرازە پیسانە!

گەورە قەشە سەری داخستو لەژێرەوە وتی:

–لەوە دەچێت دز بووبێت.

دەنگی هاوارو ناڵەی ناو ڕاڕەوەکە نەمابوو، دێرەکە جارێکی تر کەوتبووەوە نێو باوەشی بێدەنگی، گەورە قەشەکە بەچاوی میهرەبانیو ترسەوە وەك بپاڕێتەوە تەماشای کردمو پرسی:

–کوڕم، خەوت نایەت؟

هەستم دەکرد نایەوێت بڕواتو بەتەنیا لەژورەکەیدا بێت، دەترسا، لەوەڵامدا وتم: نا، خەوم نایەت، لێرەبە.

دەستمان بەقسان کرد، زۆربا پاڵی دابوە سەرینە کەیەوەو جگەرەکەی دەپێچایەوە.

گەورە قەشەکە پێی وتم: وات دەبینم لاوێکی خوێندەوارو تێگەیشتوبیت، من لێرە کەسم چنگ ناکەوێت قسەی بۆ بکەم، من سێ بۆچونم هەیە کە ژیانم شیرین‌و خۆش دەکەن، حەز دەکەم ئەو سیانە بەتۆیش بڵێم، کورم.

بێ ئەوەی چاوەڕێی وەڵامی من بێت دەستی پێکرد:

-یەکەمین بۆچوونم ئەوەیە کە شێوەی گوڵ کاردەکاتە سەر ڕەنگی‌و ڕەنگیشی کاردەکاتە سەر ئەدگارەکانی، بۆیە هەرگوڵێك کاریگەریەکی جیاوازی هەیە لە سەر لەشی مرۆڤو پاشانیش لەسەر رۆحی. هەر لەبەر ئەوەیە ئێمە کە بەگوڵجارێکدا تێ دەپەڕین دەبێت زۆرمان ئاگا لەو گوڵانە بێت کە تازە خونچەیان کردوە.

بێدەنگ بوو، لەوە دەچوو چاوەڕێی ڕای من بێت، من لەخەونمدا ئەو پیرەمێردەم لەگوڵزارێکدا دەبینی کە بەترسەوە لەزەوی ڕادەماو، بەدوای گوڵو شێوەو ڕەنگیاندا دەگەڕا، لەوە دەچوو ئەو پیرەمێردە داماوە ترسێکی سۆفیانە بەلەرزی هێنابێت. چونکە وای دەزانی گوڵزارەکانی بەهار پڕن لەفریشتەو شەیتانی ڕەنگاو ڕەنگ.

-با بێینە سەر بۆچوونی دوەم: هەر بیرێك کاریگەریەکی حەقیقی بوبێت‌وجودێکی حەقیقی هەیە، واتا لێرەدا هەیەو زیندوە، نەك شتێك بێت‌و بچێت‌و کەس نەی بینێت، ئەو بیرە لەشێکە چاوو دەم‌و پێی‌و سکی هەیە، یان نێرە یان مێ، بۆیە یان دوای پیاو دەکەوێت یان ژن، هەر لەبەر ئەمەیە کەئینجیل دەڵێت:((وشە دەبێتە لەش))

جارێکی تر بەنیگەرانیەوە تەماشای کردمەوە، لەبەرئەوەی بەرگەی بێدەنگیەکەی نەگرتم بەپەلە دەستی پێ کردەوە:

-سێیەم بۆچوونم ئەمەیە: لەم ژیانە کاتیشماندا کە هەر دەبێت بمریت نەمری وجودی هەیە، بەڵام زۆر ئەستەمە ئێمە بەتەنیا پەی بەو وجودە بەرین. ژیانی رۆژانەی ئێمە گومڕاو سەرگەردان دەکات، تەنیا چەند کەسێکی هەڵبژاردە دەتوانن تەنانەت لەم ژیانەدا هەست بەو نەمریە بکەن. لەبەرئەوەیش کە دەشیا ئەوانی دی گومڕابن خوا بەزەیی پیایاندا هاتەوەو دینی بۆ ناردن، ئێستا کۆمەڵانی خەڵکیش دەتوانن دەرکی نەمری بکەن.

گەورە قەشە كۆتایی بەقسەكانی هێنا، پێدەچوو ئاسودە بووبێت. چاوە بچووك و بێ پێڵوەكانی بەرزكردەوەو بەزەردەخەنەیەكەوە لێی ڕوانیم، وەك بڵێ:((ئەوەتا، هەرچیەكم هەبوو پێم دایت، تۆیش بۆ خۆتیان بەرە)).

هەڵوێستی ئەو پیرەمێردە لەڕولاوازە كەنەدیو نەناسیو هەموو ئەزموونی تەمەنی خۆی بەڕاست گۆییەوە پێبەخشیم كاری زۆری لێكردم، فرمێسك كەوتە ناوچاوم، دەستمی خستبوە ناو هەردوو دەستیەوەو تەماشای دەكردمو، لێی پرسیم:

—حەز دەكەم بیروڕات دەربارەی بۆچوونەكانم بزانم؟

ئەو دەیویست وەڵامێكی بدەمەوە كە ئاخۆ ئەو كەڵكی لەبەرهەمەكانی تەمەنی خۆی دیوە یان نا.

من دەمزانی كەلە سەروی حەقیقەتەوە ئەركێكی زۆر گرنگترو زۆر ئینسانی تر هەیە، لەوەڵامیدا وتم:

دەشێت ئەم بۆچوونانەی تۆ گەلێك گیان ڕزگار بكەن.

گەورە قەشە ڕووی كرایەوە ئەم وتەیە پاساو بوو بۆ هەموو تەمەنی، بەخۆشیەوە دەستی گوشیمو لەسەرخۆ وتی:

—سوپاست دەكەم، كوڕەكەم.

لەوكاتەدا زۆربا لەگۆشەیەكەوە ڕاپەڕیو هاواری كرد:

—منیش بۆچوونی چوارەمم هەیە.

شڵەژامو لێم ڕوانی، قەشە ڕووی تێ كردو وتی:

—بێڵێ، كوڕم، خواپیرۆزی بكات، بۆ چوونەكەی تۆ چیە؟

زۆربا زۆر بەجیدی وتی:

—دوان و دوان دەكاتە چوار.

گەورە قەشە بەسەرسامیەوە لێی ڕوانی.

زۆربا لەسەر قسەكانی ڕۆیشت: بۆچوونی پێنجەمیشم هەیە، پیرەمێرد، ئەویش ئەوەیە كەدوان و دوان ناكاتە چوار. ئێستا، تۆ، لەم دوو بۆچوونە كامیانت لاچاكە بۆ خۆتی دابنێ.

گەورە قەشەكە بەنیگایەكی پرسیار ئامێزو دەنگێكی كزەوە وتی:

—من تێ ناگەم.

زۆربا دایە پرمەی پێکەنین‌و وتی: منیش تێ ناگەم.

ڕووم لەپیرەمێردە لاوازو پەشۆکاوەکە کردو بابەتی قسەکانم گۆڕی.

لێم پرسی:

—تۆ، باوکی پیرۆز، لێرە، لەم پەرستگایە لە چ بوارێکدا کاردەکەیت؟

—پاکنووسی ئەو دەست نووسە کۆنانە دەکەم کە پەیوەندی بێرەوە هەیە، کوڕم، ئەم ڕۆژانەیش سەرقاڵی کۆکردنەوەی ئەونارزناوو سیفەتانەم کەکڵێسەکەمان بەناوی مریەمی پاکیزەی بەخشیوە.

هەناسەیەکی هەڵکێشاو وتی:

—پیربوومو کاری ترم بۆ ناکرێت، لەپێڕست کردنی ئەو هەموو نازناوانەی مریەمی پاکیزەدا هەست بەئاسودەیی گیانم دەکەم‌و بەدبەختیەکانی ئەم دنیایەم لەبیر دەچێتەوە.

ئانیشکی دادایە سەر سەرینەکە، چاوی لێکنا، کەوتە ورتە ورت، وەك وڕێنە بکات:

((گوڵی سوری نەژاکاو، زەوی بەپیت، دار مێو، کانی، کانی موجیزەساز، پەیژەی ئاسمان، کەشتی رزگاربوون، کلیلی بەهەشت، کازیوە، چرای نەمری، مەشخەڵان، قەڵای بەرگری، ئاسودەیی‌و بێ خەمی، شادمانی، ڕوناکی ڕێگای کوێران، دایکی هەتیوان، سفرە، خوان، ئاشتی، دڵنیایی، عەتر، شایی، شیرو هەنگوین...))

زۆربا بەئەسپایی وتی:

—کەوڵە کۆنە وڕێنە دەکات.. دایپۆشم تا سەرمای نەبێت...

لەجێگاکەی هەستا، پەتوەکەی پیاداو سەرینەکەی بۆ چاك کرد، وتی:

—وەك بیستوومە حەفتاو حەوت جۆر شێتی هەیە، ئەمەیان حەفتاو هەشتەمە.

سەر لەبەیانی بوو، دەنگێکمان هاتە گوێ هەر لەدەنگی سەرنج دەچوو، من خۆم دانەواندبوو، لەپەنجەرە بچووکەکەوە تەماشای دەرەوەم دەکرد، لەگزنگی ئەو بەیانیەدا ڕاهیبێکی لەڕولاوازم بینی، پەردەیەکی ڕەش‌و درێژی بەسەر خۆیدا کێشابوو، بەهێمنی بەدەوری حەوشەکەدا دەگەڕاو، بە چەکوشێکی بچووک بەپارچەدارێکی درێژیدا دەکێشاو

ئاوازێکی لێ هەڵدەستا. دەنگی ئەو پارچەدارە پڕ لەخۆشەویستیو ئاهەنگو ئاوازبوو، هەموو ئەو ناوەی بەوبەیانیە داگیرکردبوو، هوزارەکان بێدەنگو باڵندەکانی بەیانییش لەنێو درەختەکانەوە کەوتبوونە خوێندن.

من بەتەواوی ئەفسونگیری ئەو ئاهەنگە خۆشو دڵفرێنە بوبوم کە لەو ئامێری سەنجەوە دەهاتە گوێم، بەخۆم وت: ئاهەنگە گەورەو گرانەکانی ژیان، تەنانەت لەو کاتەیشدا کە دادەتەپن، دەتوانێت تەواوی شێوەی خۆی، بەگشت ویقارو رەسەنایەتیەکیەوە بپارێزێت، رۆح هەڵدێت، بەڵام مەنزڵگاکەی خۆی بەسەلامەتی دەپارێزێت، مەنزڵگایەك کەبەدرێژایی چەند سەدە، وەك سەدەف، کە بەجۆرێکی فراوان و ئاڵۆز دروستی کردوە تا بەئاسودەیی تیابژی.

بیرم کردەوە: کڵێسا گەورەو شکۆمەندەکان، کەلەشاری گەورەو ئاپوورەی خوانەناسەکاندا دەیان بینین، وەك ئەو سەدەفانە بەتاڵن، وەك گیاندارەکانی پێش مێژوو کە بێجگە لەپەیکەرێکی ئێسکین هیچیان لێ بەجێ نەماوەو باران و خۆر تووشی لووسی و داخۆرانی کردوون.

لەدەرگای ژوورەکەیاندا‌ین، دەنگی نەرمی باوەی رۆحانی خانەخوێمان بوو کەوتی: دەی برایان، هەستن بۆ نوێژی بەیانی.

زۆربا لەجێگاکەی ڕاپەڕی‌وبێ ئاگا هاواری کرد:

—ئەو دەنگی دەمانچەیە چی بوو؟

کەمێك گوێ قوڵاغ بوو، کڕوبێدەنگ، هێشتا راهیبەکە لەپشت دەرگاکەوە بوو، چونکە دەنگی هەناسە گیرەکەی دەهات.

زۆربا پێی داگرت و ئەمجارەیان زۆر بەڕکەوە پرسی:

—وتم ئەودەنگی دەمانچەیە چی بوو؟

---

Simandr یان Semantron پارچە دار یان ئاسنە لەسەردەمی ئیمپراتۆرەکانی رۆمی شەرقیدا لەکڵێسا ئارتدوکسیەکاندا لەباتی زەنگی کڵێسا بەکاردەهات، دەنگەکەی خۆش و بەئاهەنگە. و.ف

گوێمان لەدەنگی ئەو هەنگاوانە بوو کەخێرا دوور دەکەوتنەوە، زۆربا بەتەکانێك خۆی گەیاندە دەرگاکەو کردیەوە، تفێکی بەرەو لای ڕاهیبەکە هەڵداو وتی:

–گەمژەکان، قەشەکان، ژنو پیاوانی ڕاهیب، کارمەندو خزمەتکارانی کڵێسا، تف لەڕووی هەمووتان، هەمووتان هیچو پووچن.

وتم: بابڕۆین، زۆربا ئێرە بۆنی خوێنی لێ دێت.

زۆربا لەژێر لێوەوە وتی: خۆزگا هەر بۆنی خوێن بوایە، تۆ، سەرۆك، ئەگەر پێت خۆشە بۆ نوێژی بەیانی بڕۆ. منیش دەڕۆم، سەروبنێك دەکەم، گوێیەك هەڵدەخەم بزانم شتێك تێ دەگەم.

خەریك بوو لەو حاڵە دڵم تێکەڵ دەهات، پێم وتەوە:

–بابڕۆین، تکات لێ دەکەم، شت ئەوەندە بەگران مەگرە، خۆت لەشتێکەوە مەگلێنە کە چ پەیوەندیەکی بەتۆوە نیە.

زۆربا دەنگی لێ هەڵبڕی و وتی:

–دەمەوێت خۆم لە شتێك هەڵقورتێنم کە پەیوەندی پێمەوە نیە.

کەمێك بیری کردەوەو پاشان زەردەخەنەیەکی زۆڵانەی کردو وتی :

–وای بۆ دەچم کە شەیتان بیەوێت کارێکی گەورەمان بۆ ڕێك بخاتو ئەنجامی بدات. تۆ دەزانیت، سەرۆك، دەشێ ئەوفیشەکی دەمانچەیە لەسەر ئەم دێرە چەند بکەوێت؟ حەوت هەزار دراخما.

دابەزینە ناو حەوشەکە، ئەو شوێنەی بۆنی درەختە گوڵ کردوەکانو خۆشی ئەو بەیانیەو شادیە ئاسمانیەکەی تیا هەست پێ دەکرا، زەکەریا چاوەڕێمان بوو، بەپەلە هاتو قۆڵی زۆربای گرت، بەدەم لەرزینەوە دەمی نایە پەناگوێ و وتی:

–کاناڤارۆی برا، بابڕۆین.

–دەنگی دەمانچەی ئەمشەو چیبوو؟ کەسیان کوشتوە؟ دەی بیڵێ، ڕاهیبن، ئەگینا دەتخنکێنم.

چەناگەی راهیب کەوتە لەرزین، تەماشای ئەملاو ئەولای خۆی کرد، کەس لەحەوشەکەدا نەبوو، دەرگای ژوورەکان بەسترابوون، شەپۆلی دەنگی مۆسیقای لەدەرگای کراوەی پەرستگاوە بۆ دەرەوە دەهات.

راهیب ورتە ورتێکی کرد:

—هەردووکتان بەدوای مندا وەرن، ئێرە سادومو عامورایە.

بەماتە ماتەو بەپاڵ دیوارەکاندا حەوشەکەمان جێ هێشتو لەباخەکە چووینە دەرێ. گەیشتینە ئەو گۆرستانەی کە سەد مەترێك لەولای پەرستگاکەوە بوو، هەنگاومان بەسەر گۆرەکاندا نا، زەکەریا پاڵی بەدەرگا بچووکەکەی پەرستگاوە ناو ئێمەیش لەدوایەوە چووینە ژورێ، لەناوەڕاستی پەرستگاکەدا، لەسەر حەسیرێك، لاشەیەك، بەبەرگی ڕاهیبیەوە پێچرابووەو لەوێدا کەوتبوو، مۆمێك لەژوور سەرىو یەکێکی تر لەخوار قاچیەوە دەسوتا.

من خۆم بەسەر مردوەکەدا لارکردەوە، تەزوویەك هەموو لەشی داگرتم لەبەر خۆمەوە وتم:

—منداڵە ڕاهیبەکە، قوتابیە جوانو قژ ئاڵتوونیەکەی باوە دومەتیوسە.

بەدەرگای پەرستگاکەوە، پەیکەری میکائیلی فریشتە، بەباڵی کراوەو شمشێری هەڵکێشراویەوە، بەدەمپایی سوورەوە، ئاگری لێ دەباری.

راهیبەکە هاواری کرد.

—ئەی میکایلی فریشتە، بڵێسەو ئاگر ببارێنە، هەموویان بسووتێنە، ئەی میکایلی فریشتە، شەقێك بهاوەو لەوێنەکەت بێرە دەرێ، شمشێرەکەت بڵندکەو بیوەشێنە، ئەی بۆ گوێت لەدەنگی دەمانچەکە نەبوە؟

—کێ کوشتوویەتی؟ کێ؟ دومەتیوس؟ دەبێلێ.

راهیبەکە خۆی لەدەست زۆربا دەربازکردو، لەبەرپێی پەیکەری میکایلی فریشتەدا لەسەردەم کەوت، ماوەیەك بەسەری بەرزو چاوی دەرپەرپویو دەمی کراوەیەوە بێ جووڵە مایەوە، وەك سووسەی شتێك بکات وابوو.

لەپڕا بەتەواوی خۆشحاڵیەوە هەستا، وەك بڕیارێکی سەختی دابێت وابوو. وتی:

–دەڕۆم هەموویان دەسووتێنم، میکایلی فریشتە جوولا.

–خۆم بینیم– ئاماژەیشی بۆ من کرد.

لەپەیکەرەکە نزیک کەوتەوە، لێوە ئەستوورەکانی بەشمشێری فریشتەکەوە ناو وتی:

–سوپاس بۆ خوا، من دڵنیابوومەوە.

زۆربا ژێر باڵی ڕاهیبی گرت‌و وتی:

–وەرە ئێرەوە، زەکەریا، من چیت پێ دەڵێم دەبێت بیکەیت.

ڕووی لەمن کردو وتی:

–سەرۆک، پارەم بدەرێ، من خۆم بەڵێن نامەکان مۆردەکەم، ئەوانەی ناو ئەم دێرە هەموویان گورگن‌و تۆیش بەرخیت، ئەوان دەتخۆن، وازبێنە بۆخۆم، پێت قەڵس نەبێت کە من ئەم بەرازە چەپەڵانە بەیدەست بکەم، نیوەڕۆ، کەدارستانەکە دەکەوێتە نێو گیرفانمانەوە دەڕۆین دەی بابڕۆین، زەکەریای هاوڕێم.

ئەوان یەکسەر بەرەو پەرستگاکە چوون‌و من لەژێر دار کاژەکاندا کەوتمەگەڕان، خۆر کەوتبوە ناوەڕاستی ئاسمان‌و شەونم بەسەر گەڵاکانەوە دەبریسکایەوە، قومریەك لەبەردەممدا هەڵفری، بەسەر دار هەرمێ کێویەکەوە نیشتەوە، کلکی هەڵتەکاندو دەمی کردەوە، تەماشای منی کردو دووسێ جار دەنگێکی گاڵتە ئامێزی لێوەهات.

من لای دار کاژەکانەوە راهیبەکانم لەحەوشەکەدا دەبینی بەریز بۆ دەرێ دەهاتن، هەموو کووڕو پارچەیەکی ڕەشیان بەشانەوە بوو، نوێژ تەواو ببوو، بەرەو هۆڵی نان خواردن دەچوون، بەخۆم وت:

((حەیف ئەم خەڵوەت کێشی‌و ئەم گەورەییە بێ گیانە))

ماندوو بووم، چونکە شەو نەنوستبووم، لەسەرگیاکە ڕاکشام، بۆنی گوڵە وەنەوشەی کێوی، گوڵەتاوس، گیاپەژم، گوڵەمریەمە، ئەو ناوەیان عەتراوی کردبوو. مێرووی برسی، بەگیزەگیز، وەك دز دەچوونە نێو گوڵەکانەوەو شیلەکەیان دەمژین. لەدورەوە، چیای شەفاف‌و ئارام، وەك تەمێکی بزۆکی بەرتیشکی خۆر دەبریسکایەوە، من هەستم بەهێوری خۆم کردو چاوم لێکنا، هەستێکی شاراوە نهێنی خۆشم بەسەردا هات، دەت وت هەموو ئەم موجیزە سەوزەی کە دەوری منی تەنی بوو خودی بەهەشت بوو، ئەو تەڕو تازەیی‌و

سووك باریە، ئەو خومار بوونە كەمە خوابوو بۆ خۆی. بەردەوام خوا خۆی دەگۆڕێت، (بەختەوەر ئەوكەسەیە بتوانێت خوا هەردەمامكێكی كردبێت بیناسێتەوە) خوا جارێك پەرداخێك ئاوی ساردە، جارێك مندالێكە خۆی دەهاوێژێتە سەر ئەژنۆت، یان ژنێكی ئەفسونگەرە، یان تەنیا لەگەڕانێكی كورتی بەیانیان دەچێت.

هێدی هێدی هەموو شتەكانی دەوروبەرم بێ ئەوەی شێوەیان بگۆڕێ دەبوونە خەون، من بەختەوەر بووم، ئیدی ئەوی‌و بەهەشت ببوونە یەك، ژیان لەبەرچاوما ببوە گولێكی دەشت‌و دلۆپێكی درشت هەنگوینی تیابوو، رۆحی منیش ببوە مێش هەنگ‌و شیلەكەی دەمژی.

لەناكاو لەو دۆخە خۆش‌و پڕ لە ئارامیەیان كردم، لەپشت سەرمەوە گوێم لەدەنگی پێ‌و چرپە چرپێك بوو، لەهەمان كاتدا دەنگێكی خۆش هات‌و وتی:

— سەرۆك، ئیتر ئێستا دەڕۆین.

زۆربا لەبەردەمما وەستا، چاوە بچووكەكانی پرشنگێكی شەیتانانەیان دەدا، زۆر بێ دەربەستانە پرسیم: بڕۆین؟ تەواو؟

زۆربا دەستی بەگیرفانی سەرەوەی چاكەتەكەیدا كێشاو وتی:

—بەلێ، تەواو، دارستانەكە لە گیرفانمدایەو هیوادارم بۆمان سەر بەخێربێت، ئەوەیش ئەو حەوت هەزار دراخمایەی كە بۆ لولام خەرج كرد.

بەستەیەك پارەی لەگیرفانی چاكەتەكەی دەرهێناو وتی:

—بیگرە، ئەمە ئەو قەرزەیە كە دەتدەمەوەو ئیدی خەجالەتت ناكێشم، بەلام پارەی گۆرەوی، جانتا، عەترو چەتری خاتو بوبولینای تیایە، هەروەها بستەی توتی‌و، بێجگە لەمانە پارەی ئەو حەلوایەیش كە بەدیاری بۆم هێنا بوویت.

وتم:

—من پێشكەش بە خۆتی دەكەم، زۆربا، بڕۆو مۆمێكی بەئەندازەی بالای خۆت بۆ ئەو پاكیزەیە دابگیرسێنە كە سوكایەتیت پێ كرد.

زۆربا سەری وەرگێڕا، باوە زەكەریا بەبەرگێكی چلكنی سەوز داگەڕاوو جوتێ پێلاوی دڕاوەوە بەرەو لای ئێمە دەهات.

هەوساری دوو هێستری بەدەستەوە بوو ڕای دەکێشان.

زۆربا بەستەیەک پارەی پیشانداو وتی:

-ئێمە ئەم پارەیە لەبەینی خۆماندا دابەش دەکەین، باوکە یوسف، تۆ سەد کیلۆماسی خوێ کراو دەکڕیت، ئەوەندەی لێ دەخۆیت تا ورگت دەتەقێتو دەی هێنیتەوەو ئیسراحەت دەکەیت وەرە، دەستت بێنە.

ڕاهیب پارەکەی وەرگرت، خستیە باخەڵی‌و وتی: نەوتی پێ دەکڕم، زۆربا سەری نایە بن گوێی ڕاهیب‌و پێی وت:

-دەبێت چاوەڕێ بکەیت تا شەو دادێت، هەموو ئەم ڕیش بزنانە بخەونو بایەکی توندیش هەڵبکات. ئەوسا نەوت بەهەر چوارلای دیوارەکاندا دەکەیت، پاشان هەرچیەکت دەست کەوت لەپەڕۆو پیتاڵی کۆن لەنەوتی هەڵکێشەو ئاوری بدە، تێگەیشتیت؟

ڕاهیب موچڕکی هاتێ:

-بۆ دەلەرزیت؟ هاوڕێ، مەگەر فریشتە ئەم فەرمانەی پێنەکردویت؟ کەواتە نەوت بکڕە، نەوتی زۆر، خوات لەگەڵ.

سواری ولاّخەکان بووین، من بۆ دواجار تەماشای دێرەکەم کرد، پرسیم: هیچ تێگەیشتیت، زۆربا؟

-دەربارەی دەنگی دەمانچەکە دەڵێیت؟ سەرۆک، من پێم وتیت خۆت ناڕەحەت مەکە، زەکەریا ڕاست دەکات، ئێرە سادومو عامورایە، دومەتیوس ئەو ڕاهیبە منداڵە جوانەی کوشتوە، وایە.

-دومەتیوس؟ بۆ؟

-سەرۆک، پێت دەڵێم دەستی تێوەمەدە بابۆنەکەی زیاد نەکات، زۆربا ڕووی بەرەو دێرەکە وەرگێڕا. ڕاهیبەکان سەریان داخستبوو، دەستیان کردبوە خاچ، لەهۆڵی نان خواردنەکە دەردەکەوتنو دەچوونە ژوورەکانیانەوە.

زۆربا هاواری کرد: نەعلەتی هەمووتان لەمن بێت، ئەی باوکانی پیرۆز.

Scanned by CamScanner

-١٩-

شەوداكەوتبوو، لای كۆختی كەنار دەریاكەمان دابەزین، یەكەم كەس كەلەبەردەم كۆختەكەدا بەگرمۆڵەیی بینیمان بوبولینا بوو، كەچرامان داگیرساندو دەمو چاویم بینی زۆر سەرسامی كردم.

-چیتە، هورتانس خانم؟ خوا نەكردە نەخۆشیت؟

ئەو داماوە، فریشتەكەی دەریا، لەوكاتەوەی كە هیوای گەورەی شووكردن كەوتبوە دڵیەوە بە تەواوی گۆڕابوو، هەموو ناسكیو دڵفڕێنیە بێ وێنەكەی خۆی لەدەست دابوو، ئەو دەیویست گشت رابوردوی خۆی بكوژێنێتەوەو، ئەو پەڕە ڕەنگاڵەییانەی كەلەپاشاو بەگو دەریا سالارەكانی وەرگرتبوون‌و خۆی پێ ڕازاندبونەوە فڕی یان بدات، ئیتر چ ئارەزوویەكی نەبوو بێجگە لەوەی ببێتە مرۆڤێكی جیدیو بەڕێزو پاكو شەریف. خۆی لەئارایشتو خۆڕازاندنەوە دەپاراست،

ژنێكی سادەو ستەم دیدەی خوا كەتاقە مەبەستی شووكردن بوو.

زۆربا ورتەی لێوە نەدەهات، سمێڵە تازە بۆیە كراوەكەی بەرِكەوە بادەدا. دانەویەوە، مقەڵیەكەی ئاگرداو بۆ دروست كردنی قاوە ئاوی خستە سەر تاگەرم بێت.

لەناكاودا گۆرانی بێژی پیر بەدەنگێكی گڕەوە هاتە قسەو وتی:

هەی دڵ ڕەقی بێ بەزەیی.

زۆربا سەری بڵند كردو تەماشای كرد، چاوی میهرەبانتر بوو، هەرگیز نەدەبوو بەرانبەر بەخۆی گوێی لەدەنگێكی بەسۆزی ژنێك بێتو بتوانێت خۆی بگرێت،(دڵۆپێك فرمێسكی ژن دەیتوانی لەخۆیدا نوقمی بكات.)

زۆربا هیچی نەوت، قاوەو شەكری لە جزوەكە كردو تێكی دا، پیرە فریشتەی دەریا بەنازو نووكەوە وتی: بۆ پێش ئەوەی بمهێنێت. بەدرێژایی ئەم هەموو وەختە خەمو ئازارم

پێ دەچێژیت؟ من ناوێرم لەگوندا دەربکەوم، شەرەف و ئابڕوم چوە، ئاخریەکەی خۆم دەکوژم.

من لەبەر ئەوەی ماندو بووم لەسەر تەختەکە لێی ڕاکشام ئانیشکم دادایە سەر سەرینەکەو تەماشای ئەو دیمەنە پێکەنیناوی دڵتەزێنەم دەکرد.

–ئەی بۆ تاجە گوڵینەی بوکێنیت نەهێناوە؟

زۆربا هەستی بەلەرزینی دەستە گۆشتنەکەی بوبولینا کرد بەسەر ئەژنۆیەوە. ئەم ئەژنۆیە، ئەو چڵەدارە وشکە بوو کە بوبولینا دوای هەزارو یەک جار نقوم بوون دەیویست پێی بگاتە وشکانی.

زۆربا هەستی بەئازاری ژنە دەکردو دڵی نەرم دەبوو، بەڵام ئەمجارەیش هیچی نەوت، قاوەی کردە سێ فنجانەوە.

ژنە بەدەنگێکی لەرزۆکەوە دووبارەی کردەوە: ئازیزم، بۆچی تاجەگوڵینەی بوکێنیت بۆ نەهێنام؟

زۆربا بەلالووتێکەوە وەڵامی دایەوە: کاندی گوڵی جوانی تیانەبوو.

هەریەکەو فنجانێك قاوەی داینێ و خۆی چوە سوچێکەوەو لەسەر قسەکانی ڕۆیشت:

–نامەم بۆ ئەسینا ناردوە گوڵی جوانمان بۆ بنێرن، هەروەها ڕام سپاردوە مۆمی سپی و قوتووی نوقڵ و بادامی شیریمان بۆ بێت.

لەگەڵ قسەکردندا خەیاڵی زۆربا زیاتر هەڵدەگیرساو چاوی پرشنگی دەدا، وەك شاعیر، کە لە چرکەساتی داهێناندا بەرەو ئاسمانێك باڵ دەگری کە لەوێدا خەون و حەقیقەتەکان تێکەڵی یەکتری دەبن و، وەك دووخوشك پێك شاد دەبنەوە، هەر بەو جۆرەی کە چوار مشقی دانیشتبوو دەحەسایەوە.

قاوەی هەڵدەداو جگەرەیەکی تریشی پێ کرد، بۆ زۆربا ئەوڕۆژە ڕۆژێکی خۆش بوو، چونکە پەیمان نامەی دارستانەکەی لەگیرفاندابوو، قەرزەکانی دابوەوە، ئێستا خۆشحاڵ بوو. لەپڕا تێ هەڵچوەوە:

–بوبولینا ژیکەڵەکەم، دەبێت زەماوەندەکەمان دەنگ بداتەوە، دەبینیت چ بەرگێکی جوانی بوکێنیم بۆ ڕاسپاردویت، ئەوینەکەم، بڕوابکە من تەنیا بۆ ئەومەبەستە ئەو ماوەیە

لە کاندی مامەوە. دوو خەیاتی ژنانەی ناودارم لەئەسیناوە هێناو پێم وتن:((ئەو ژنەی دەمەوێت بیکەمە هاوسەرمی خۆم لەخۆرهەڵاتو خۆرئاوادا دەگمەنە، پاشای چوار دەوڵەتی مەزن بوو ئێستا بێوەژنە، چونکە چوار دەوڵەتەکە مردنو ئەو ئێستا بەوە قایلە شوو بەمن بکات، بۆیە داواکارم کەکراسی بوکێنیەکەیشی دەگمەن بێت، کراسێکی ئاوریشم کەبەمرواریو ئەستێرەی زێڕین ڕازێنرابێتەوە))

خەیاتەکان هاواریان لێ هەستاو وتیان :((کراسێکی لەو جۆرە بێ ئەندازە جوان دەردەچێتو سەرنجی میوانەکان ڕادەکێشێت.

وتم: ((باشترە، من ئەویانم مەبەست نیە، گرنگ ڕازی بوونی خۆشەویستەکەی خۆمە)).

هورتانس خانم پاڵی دابوە دیوارەکەوەو گوێی گرتبوو، زەردەخەنەیەکی گرانو کراوە بەسەر دەمو چاوە چکۆڵەو چرچاویەکەیدا بلاوبوەوە، قردیلەکەی گەردنی لەوەدا بوو بکرێتەوە، نیگایەکی وشکی لەزۆربا گرتو بەئەسپایی وتی:

—دەمەوێت شتێکت بەگوێدا بچرپێنم .

زۆربا چاوی لێ داگرتمو سەری لێ نزیك خستەوە.

هاوسەری ئایندە کەزمانە بچوکەکەی خزاندبوە ناو گوێچکە گەورەو تووکنەکەی زۆرباوە بەچرپە وتی:

—ئەمشەو شتێکم بۆ هێناویت .

دەستە سڕێك کە سوچێکی گرێ دابوو، لەبەرکی دەرهێناو بۆ زۆربای ڕاگرت، زۆربا بەدووپەنجە دەستە سڕەکەی گرتو خستیە سەر ئەژنۆی خۆی، ئینجا سەری بۆلای دەرگاکە وەرگێڕاو کەوتە تەماشاکردنی دەریاکە.

ژنە پرسی : گرێکە ناکەیتەوە، زۆربا؟ دەڵێی پەلەت نیە؟

زۆربا وەڵامی دایەوە : باجارێ قاوەیەك بخۆمەوە جگەرەیەك بکێشم، پێویست بەکردنەوەی ناکات، خۆم دەزانم چیتیایە!

پیرە فریشتەی دەریا لێی پاڕایەوەو وتی: بیکەرەوە، گرێکە بکەرەوە.

—وتم باجارێ جگەرەکەم بکێشم.

زۆربا تەماشایەکی وای کردم کەپڕ بوو لەسەر کۆنەکرد، وەك بڵێت: ((ئەمە هەمووی پەنی تۆیە)) لەسەرخۆ کەوتە جگەرەکێشان، لەگەڵ ئەوەیشدا کەلەدەریاکە ڕامابوو، دووکەڵی جگەرەکەی لەهەردوو کونی لوتیەوە بۆ دەرەوە ڕادەدا. وتی:

سبەینێ بای بیابان هەڵ دەکات، ئاوو هەوا دەگۆڕێت، درەختەکان پڕ دەبن‌و مەمکی کچانیش بەرز دەبنەوە، بەجۆرێك کە لەمەمکداندا خۆیان ناگرن. داخ لەدەست ئەم بەهارە نەگریسە کە شەیتان دروستی کردوە

بێدەنگ بوو، دوای کەمێك کەوتەوە قسە:

—سەرۆك، لەوە ورد بویتەتەوە، کەهەموو شتە جوانەکانی ئەم دنیایە شەیتان دروستی کردوون؟ ژنی جوان، بەهار، گۆشتی برژاوی بەچکە بەراز، شەراب‌و هەموو ئەوانەی کەشەیتان دروستی کردوون. بەڵام خوا، قەشە، ڕۆژو، بەیبونی کوڵاو، ژنی نایشرینی دروست کردوە، ئاخ..

ئەمەی وت‌و خێسەیەکی لە هورتانس خانمی داماو کرد، هورتانس لەگۆشەیەکدا کزۆڵەی کردبوو، گوێی بۆ قسەکانی هەڵخستبوو. زوو زوو دەپاڕایەوەو دەیوت: زۆربا، زۆربا:

بەڵام زۆربا جگەرەیەکی تری پێ‌کردو کەوتە تەماشاکردنی دەریا، دیسان وتیەوە: لەبەهاردا شەیتان فەرمانڕەوایە، پشتێن شل دەکات، دوگمەی کراس دەکاتەوەو پیرێژن دەکەوێتە ئاهو ناڵە.. هێی، بوبولینا خانم دەستت لابدە.

ژنی بێچارە دیسان کەوتەوە پاڕانەوە: زۆربا، زۆربا.

نوشتایەوەو دەستەسڕە چکۆلەکەی هەڵگرت‌و نایەوە ناودەستی زۆربا، جا زۆربا جگەرەکەی فڕێداو گرێکە کردەوە، وا دەستی کراوەیەو دەڕوانێت، بەبێزاریەوە ڕتی: ئیدی ئەمە چیە، بوبولینا خانم؟

پیرە فریشتەی دەریا بەدەم لەرزینەوە لەبەر خۆیەوە وتی:

—ئەنگوستیلەن، ماڵەکەم، ئەنگوستیلەی دەزگیرانی، ئێرە شایەتەو شەوەکەی خۆشەو خواییش لێمان دەڕوانێت، وەرە یەکدی دیاری بکەین، زۆرباکەم.

زۆربا تاوێك تەماشای منو جارێك هورتانسو جارێکی دی تەماشای ئەنگوستیلەکانی دەکرد، لەناوەوەیدا گەلێك شەیتان لەکێشمەکێشمدا بوون، بەڵام کەسیان بەسەر ئەوی تردا سەرنەدەکەوت. ژنی داماو بەترسو لەرزەوە سەیری دەکردو بەنازەوە دەیگوت: زۆرباکەی خۆم، زۆرباکەم.

من لەسەر تەختی خەوەکەم دانیشتبووم‌و چاوەچاوی ئەوە بووم بزانم زۆربا لەم هەموو ڕێگایانەی کەلەبەردەمیدا کرابوونەوە کامیان لە پێش دەگرێت. لەناکاوێکدا سەری ڕاوەشاند، دیار بوو بڕیاری خۆی دابوو، دەمو چاوی ڕووناك بوەوە، دەستی پێکداداو بەرزە پێ لەجێگاکەی هەستا.

—بابڕۆینە دەرێ، بچینە ژێر ئەستێرەکان تاخوا بمانبینێت. سەرۆك، تۆ ئەنگوستیلەکان بێنە، بەڕاست، دەزانیت ویردەکان بخوێنیت؟

من پێکەنین گرتبوومی، لە وەڵامدا وتم:

نا، بەڵام گرنگ نیە.

من لەسەر تەختە خەوەکە هاتبوومە خوارێ، دەمویست لەهەستاندا یارمەتی ئەو ژنە میهرەبانو بێچارەیە بدەم، زۆربا وتی: بەڵام من خۆم دەیزانم، لەبیرم نەبوو پێت بڵێم من ماوەیەك لەناو ئەومنداڵانەدا بووم کەسرودی کڵێسایان دەخوێند. لەگەڵ قەشەدا دەچوومە ئاهەنگو تەعمیدو مردوو ناشتن‌و سروودەکانی کڵێسام لەبەربوو. وەرە بوبولیناکەی خۆم، وەرە باڵندەکەم، بجوڵێ، وەرە پاپۆڕە فەرەنسیەکەم لەلای ڕاستمەوە بوەستە.

لەهەموو شەیتانەکانی ناوەوەی زۆربادا ئەوشەیتانەیان سەرکەوتبوو کە گەپ بازو دڵساف بوو. زۆربا کە ئەو ژنە بێچارەیەی بینی وابەچاوە کەم تینەکانیەوە، بەشەوقو تاسەوە لێی دەڕوانێت بەزەیی تێ گەڕاو دڵی بەو گۆرانی بێژە سووتا.

کەبڕیارەکەیدا لەبەرخۆیەوە دەیوت:

—ڤیروسیا، من کە بتوانم ڕەگەزی مێ ڕازی بکەم بۆ نەیکەم؟ دەی بابڕۆین.

بەدرێژایی کەنار دەریاکەدا بەڕێ کەوت، قۆڵی هورتانس خانمی گرت، ئەنگوستیلەکانی دایە دەستم، ڕووی لەدەریا کردو کەوتە درووود خوێندن: ((خوای گەورە، تاماوین لێمان پیرۆزبکە، ئامین))

پاشان ڕووی تێ کردم و وتی:

–تۆیش ئەرکی خۆت بەجێبێنە، سەرۆك.

وتم: ئەمشەو سەرۆك و مەرۆك نیە، من شایەتی مارەبڕینەکەم.

–کەواتە ئاگاداربە، کەهاوارم کرد هوهی، هوهی، تۆ ئەنگوستیلەکەمان لەدەستکە.

بەو دەنگە ناقۆڵایەوە کە هەر لە زەڕین دەچوو دیسان کەوتەوە درووود خوێندن:

((بۆ بەندەی خوا ئالکسیس و کەنیزەکی خوا هورتانس، کە بۆ یەکدی دەست نیشان کراون و بۆ ئەوەی ئاسودە بژین، ڕوو لەدەرگای خوا دەکەین)).

من کە بەزۆر ڕێگام لە پێکەنین و فرمێسکەکانم دەگرت، لەوەڵامی دوعاکانی ئەودا منیش کەوتمە نزاکردن.

Kyria eleison Kyria eleison[١]

(خوا بەزەییت پێماندا بێتەوە، خوا بەزەییت پێماندا بێتەوە)

زۆربا وتی: ئەمانە درووودی تریان لەگەڵدایە، بەڵام خوا بمگرێت[٢] ئەگەر هیچم لەبیرمابێت. بەهەرحاڵ بابچینە ناو کرۆکی باسەکەوە.

وەك ماسی بازرەقەی پەست و هاواری کرد: هوهی.. هوهی.. دەستە زل و زبرەکەی بۆ درێژ کردم، بەدەزگیرانەکەی وت: تۆیش دەستت بێنەرە پێشێ.

هورتانس دەستە قەڵەوو لەرزۆکەکەی کەجل شۆردن ڕێ ڕێی کردبوو بۆ پێشەوە درێژکرد، من ئەنگوستیلەکانم لەپەنجەیان کرد، زۆربا کە ئاگای لەخۆی نەمابوو وەك دەروێش هەرایەکی کردو وتی:

((بەندەی خوا ئالکسیس، دەبێتە هاوسەری کەنیزەکی خوا هورتانس، بەناوی باوك و کوڕو روح القدس، پیرۆزبێت، ئامین، کەنیزەی خوا هورتانس دەبێتە هاوسەری بەندەی خوا ئالکسیس))

---

[١] لەسرووده ئاینیەکان کەلە کتێبی ڕاسپاردەکانی کۆندا هەیەو پاشان هاتە نێو کلێسای ئەرتودوکسی ڕۆمی خۆر هەڵاتیەوە. و–ف

[٢] لەدەقە ئەسڵیەکەدا دەڵێت: سێدارەم بۆ هەڵخرێت ئەگەر هیچم لەبیرمابێت. و–ف

-باشە، ئیدی تەواو، وەرە باڵندەكەم، تا بۆ یەكەمین جار لە هەموو تەمەنتا، ماچێكی حەڵاڵت بكەم.

بەڵام هورتانس خانم خۆی بەزەویدا دابوو، هەردوو قاچی زۆربای لەباوەش گرتبوو دەگریا، زۆربا، بەهەستی پڕ لەبەزەییەوە سەری ڕاوەشاندو وتی:

-ژنی بێچارە، چ داماوێكن؟

هورتانس خانم هەستا، داوێنی كراسەكەی تەكاندو ئامێزی كردەوە، زۆربا هاواری لێ هەستا هی! هی دەستت لادە، ئەمڕۆ سێ شەمەی پیرۆزەو ڕۆژی ڕۆژوگرتنە.

ژنە لەبەر خۆیەوە كەوتە ورتە ورت: زۆرباكەی خۆم...

-پەلە مەكە خۆشەویستم، پەلە مەكە تا ڕۆژی جەژنی پاك، گۆشت دەخۆین‌و هێلكەی سوور دەشكێنین، ئێستا كاتی ئەوەیە بگەڕێیتەوە ماڵێ، ئاخر ئەگەر بەم شەوە خەڵكی لێرەدا بت بینن چیت پێ دەڵێن؟.

بوبولینا نیگایەكی پاڕانەوە ئامێزی كرد، زۆربا وتی:

-نا، نا، ڕۆژی جەژنی پاك، سەرۆك، لەگەڵمان وەرە.

زۆربا سەری هێنایە لای گوێم‌و وتی:

-بیكە بەخاتری خوا، سەرۆك، بەتەنیا جێم مەهێڵە، من هیچ تاقەت‌و حەوسەڵەیەكم نیە.

بەرەو گوندەكە بەڕێ كەوتین، ئاسمان دەدرەوشایەوە، بۆن‌و بەرامەی دەریا هەمولایەكی داگیركردبووین‌و باڵندەكانی شەو جریوەو جووكەیان بوو.

پیرە فریشتەی دەریا شادمان‌و دڵتەنگیش، خۆی ئاوێزانی باسكی زۆربا كردبوو، لەدوامانەوە پەلكێش دەكرا.

بوبولینا بۆ دواجار گەیشتبوە ئەو بەندەرەی كە مەبەستی بوو، ئەو هەموو ژیانی لەگۆرانی وتن، سەما، گاڵتە پێ كردنی ژنانی نەجیبدا بەسەربردبوو، بەڵام هەرگیز بەختەوەر نەبووبوو، جاران كە عەتری لەخۆی دەداو دەم‌و چاوی لەسوراوو سپیاو دەنا، بەرگی ڕەنگاو ڕەنگی دەپۆشی‌و، بەشەقامەكانی ئەسكەندەریەو بیرۆت‌و قوستەنتەنیەدا تێ دەپەڕی، ژنانی دەبینی كە شیریان بەمنداڵەكانیان دەدا سنگی مێروولەی دەكردو

دەپەنما، گوێی مەمکی ڕاست دەبووەوە، تەواو ئارەزووی لەوەبوو کە خۆزیا دەمی زارۆکێك مەمکی ئەویشی دەمژی، ئەو بەدرێژایی تەمەنی هەناسەی هەڵدەکێشاوو حەسرەتی ئەوەبوو جووتەیەکی هەبێت، شووبکات و منداڵێکی ببێت. بەڵام هەرگیز باسی ئەو خەمو خەفەتەی لای کەس نەکردبوو، وا ئێستا، سوپاس بۆ خوا، هەرچەندە درەنگ کەوتوە، بەڵام لەمەچاکتر نابێت، چونکە ئەگەرچی شەپۆلەکان کوتاویانەو لە هەمووشتێك ڕووت بۆتەوە، بەڵام وا ئێستا گەیشتۆتە ئەو بەندەرەی کە هەمیشە ئارەزووی دەکرد.

بوبولینا، جارجارە سەری هەڵدەبڕی، لەژێرەوە تەماشای ئەو چەتەوڵەی دەکرد کە لەگەڵیا دەڕۆیشت، لەگەڵ خۆیدا بیری کردەوە: ((ئەمە ئەو پاشایە نیە کەتەڕبووشی گولێنکە زێڕی لەسەردابێت، کوڕە بەگێکی جوانیش نیە، بەڵام هەرچیەکە لەهیچ باشترە، سوپاس بۆ خوا، دەبێتە مێردم، مێردی ڕاستەقینەم.

زۆربا هەستی بەقورسی لەشی بوبولینا دەکرد، بەدوای خۆیدا بەکێشی دەکردو پەلەی ئەوەی بوو زوو تربگاتە گوندو لەشەڕی ڕزگاری بێت. ژنی بێچارە بەسەر بەردەکاندا هەڵدەنووتا، نینۆکی پێی هەڵکەنرابوون. مێخەکەکانی پێی ئازاریان دەدا، وەڵێ هیچی نەدەوت، جا بۆ بیلێت؟ بۆ سکاڵا بکات؟ هەموو شتەکان بەمەیلی ئەو شکاونەتەوە.

ئێمە لەدار هەنجیری کیژو باخی بێوەژن تێپەڕیبووین، کە خانووە بەراییەکانی گوندمان بینی وەستاین.

پیرە فریشتەی دەریا کە لەسەر نووکی پێی خۆی بەرزکردبووەوە تا دەمی بگاتە دەمی دەزگیرانەکەی، بەهێمنیو نازەوە وتی:

–شەوباش،ماڵەکەم.

بەڵام زۆربا سەری دانەنەواند

ژنە لەوەدابوو بکەوێتە سەرزەویەکە، وتی:

–دەی باشە، باخۆم بخەمە بەرپێت و ماچیان بکەم، ئەوینەکەم.

زۆربا هەڵوێستی ژنەکە زۆری کار لێ کرد، نەی هێشت ئەو کارەبکات، لەباوەشی گرت و وتی:

–نا، نا دەبێت من ماچ بکەم، خۆشەویستم، من، بەڵام ماندوم و ناتوانم، شەوباش.

ئێمە لێی جوێ بووینەوە، هێورو بێدەنگ، بەقووڵی هەوای پاکو بۆنی خۆشمان هەڵمژیو بەرەو دوا گەڕاینەوە.

لەناکاوێکدا زۆربا ڕووی تێ کردمو پرسی:

—چی بکەم، سەرۆك؟ پێ بکەنم یان بگریم؟ تۆ ڕێگایەکم بۆدابنێ.

من وەڵامیم نەدایەوە ، نەیشم زانی بۆ گەرووم گیرا بوو. لەبەر گریان؟ یان لەبەرپێکەنین بوو؟

لەپڕا زۆربا وتی: بەڕاست، سەرۆك، ئەو خوا ناقۆڵا کۆنەی کە هەرگیز نەی دەهێشت ژنێك بکەوێتە گلەیو گازندە ناوی چییە؟ من هەندێك شتم لەبارەی ئەو خوایەوە بیستوە، گوایە ئەویش ڕیشی خۆی لە بۆیە دەنا، وێنەی دڵو تیرو فریشتەی دەریای لەسەر باڵی دەکوتاو، شیوەی خۆی دەگۆڕیو خۆی دەکردە گا، قوو، یان بەرانو دوور لەڕووت بەگوێ درێژیش، ناوی چی بوو؟

—وابزانم مەبەستت زیوسە[١٤٢]، چی بەبیرهانیتەوە؟

زۆربا کە دەستی بەرەو ئاسمان هەڵبڕیبوو وتی:

—گیانی شادبێت، دیارە ئەم خوایە ڕۆژانی سەختی بەسەربردەوەو ڕەنجو ئازاری چەشتوە، بڕوا بکە سەرۆك شەهیدێکی ڕاستەقینە بوە بۆ خۆی، من شتێك لەوبارەیەوە دەزانم، تۆ گشت قسەی ناو کتێبەکانت قووت دەدەیت، وەلێ ئەوە بزانە ئەوانەی ئەم کتێبانە دەنووسن قسە گەلێك دەهاون کە مایەی پێکەنینە، بەڕاست ئەو کەسانە چی لەژنو ئەو پیاوانە دەزانن کە دوای ژن دەکەون؟ هیچ.

بەگاڵتەو پێکەنینەوە، پێم وت: زۆربا، تۆ خۆت بۆ کتێبێك نانووسیتو هەموو نهێنیەکانی دنیامان بۆ لێك بدەیتەوە؟

—بۆ؟ تەنیا لەبەر ئەوەی کە ئەو نهێنیانەی تۆ باسیان لێوە دەکەیت من بەردەوام لەگەڵیاندا دەژیمو کاتی ئەوەم نیە بیان نوسمەوە. جارێك شەڕ، جارێك ژن، جارێك شەرابو جارێکی تر سەنتوور، ئیتر کەی فریای ئەوە دەکەوم قەڵەم لەدەست بگرمو

---

[١٤٢] Zeus گەورە خوای یۆنانی کۆن کە خوای هەورو بروسکەیش بوو، پەرستگاکەی لەچیای ئەلپ بوو، ڕۆمیەکان بەژوربیتەر ناوی دەبەن. و-ف

قسەی بێ مانا بنووسم؟ هەر لەبەر ئەوەیش کە قەڵەم کەوتۆتە دەست نووسەری بێکار، ئەوانەی لەناو نهێنیەکاندا دەژین کاتی نوسینیان نیە، ئەوانەیش کە کاتیان هەیە بەدوای نهێنیەوە نین، تێ گەیشتی؟

-باشە، بابگەڕێینەوە سەر باسەکەی خۆمان، لەبارەی زیوسەوە دوایت؟

زۆربا هەناسەیەکی هەڵکێشاو وتی: ئاخ، ئەوبێچارەیە، تەنیا من دەزانم چ جەخارێکی کێشاوە، بێگومان ئەو زۆری ژن خۆش ویستوە، بەڵام نەك وەك ئەوەی کە ئێوەی نووسەر خەیاڵی لێ دەکەن، نا، بەهیچ جۆرێك، ئەو دڵی بەژن دەسوتا، ئاگای لەگشت ئازارو مەینەتیەکانیان بوو، خۆی بۆ بەخت دەکردن، لەهەرشوێنێکی ئەم سەرزەمینە کچێکی قەیرەی بدیایە کە تاسەو ئارەزوی لەچك کردندان، یان ژنێکی جوان-یان ناشیرینو تەنانەت دزێویش-ی بدیایە، کە لە دووری مێردە بەسەفەر چوەکەیان خەوی لێ ناکەوێت، ئەو خوا دڵ نەرمو بەبەزەییە نیشانەی خاچی دەکێشا، جلەکانی دەگۆڕی، دەچوە شێوەی ئەو کەسەوە کە ئەو ژنە دەیویستو دەچوە ژورەکەیەوە.

((ئەو زۆر گوێی بەخۆشەویستیە بچووکەکان نەدەدا، هەندێك جاریش شکستی تیا دەخواردن، ئەمە بۆ؟ ئاخر ئەو نێریە داماوە کەی دەتوانێ لەگەڵ ئەم هەموو مێچکەیەدا جووت بێت! هەندێك جار ماندو دەبوو، سەرو دڵی دەگیرا، تۆ نێریت دیوە دوای جووت بوونی لەگەڵ چەند بزنێکدا چی بەسەر هاتوە؟ ئاو بەدەمیا دێتە خوارێو چاوی لێڵ دەبێتو کۆکە دەیگرێتو بەحاڵە حاڵ خۆی بەپێوە دەگرێت. چاکە، زیوسی داماویش هەمیشە لەم بارە ناخۆشەدا بووە، بەیانیان زوو دەگەڕایەوە ماڵێو دەیوت: ((ئاه.. خواکەی من، باشە کەی دەتوانم تێر بخەوم، من خۆم بەسەرپێوە ناگرم)) بەردەوام ئاویش بەدەمیا دەهاتە خوارێ.

((بەڵام لەناکاوێکدا گوێی لە نالەیەك دەبوو: لە خوارەوە، لەسەر زەوی، ژنێك پێخەفەکەی لەسەر خۆی فرێداوە، هاتۆتە هەیوانی ماڵەکەو تارادەیەك ڕوتو قووتە، هاوارو نالەیەتی، زیوسەکەمان دڵی پێی دەسوتێو بەدەم ناڵینەوە دەڵێت:

هەی داماو، دەبێت دیسان بگەڕێمەوە سەر زەوی، لەوێ ژنێك هاوارو نالەیەتی، دەڕۆم بۆ ئەوەی ئاسودەی بکەم))

((ئەمەندە ئەم کارە دوبارە بوەوە تا هەرچی ئاوی ژیانی تیابوو ژنان هیچیان تیانەهێشت، پشتی شکاو کەوتە ڕشانەوە، شەپڵە لێیداو گیانی دەرچوو، لەوکاتەدا میراتگرەکەی کە عیسای مەسیح بوو لەدایك بوو، کە خوای پیری بەو داماویەوە بینی هاواری لێ هەستاو وتی: ((خۆتان لە ژن دووربخەنەوە، خۆتان لەژن دووربخەنەوە))

من لەم سروشتە خۆشەی زۆربا دەست خۆشیم کردو لەپێکەنیندا لوول بووم.

تۆ ئازادیت پێ بکەنیت، سەرۆك، بەڵام ئەگەر ئەو خوا-شەیتانە ڕەونەقێك بداتە کارو کاسبیەکەمان- ئەگەرچی بڕوا ناکەم بیکات- بەڵام، بەهەرحاڵ دەزانیت بەتەمای کردنەوەی چ بنکەیەکم؟

بنکەی دەلالّی ژن هێنان، هەموو ئەو ژنە بەدبەختانەی نەیان توانیوە شوویەك لەتۆڕی خۆیان بنێن و ئێستا خۆیان تاقی دەکەنەوە، قەیرەکچەکان، ناشیرینەکان، شەل و گێرو چەپ و خێلەکان، قەمموورەکان لەژوورێکدا پێشوازی لەهەموو ئەمانە دەکەم، دیواری ژوورەکە بەوێنەی کوڕی جوان دەڕازێنمەوە پێیان دەڵێم:

((دەی خانمە جوانەکان، هەڵبژێرن، کام لەم پیاوانەتان دەوێت، من وادەکەم ببنە مێردتان)) ئێنجا لاوێك دەدۆزمەوە کە کەم و زۆر لەوێنەی سەر دیوارەکە بچێت، بەرگێکی لەبەردەکەم کە لە هەمان بەرگی ناو وێنەکە بکات، پارەی دەدەمێ و پێی دەڵێم:

((لە فلانە کۆڵان، فلان ژمارە، ژنێکی لەم حاڵەو لەم ڕەنگە هەیە، بڕۆ لەگەڵیا دەرگای ئەوین بکەرەوە، گوێ مەدەیە پارەکەی خۆم دەیدەم، لەگەڵیابنوو، ئەو وتە خۆشانەی کە ئاسایی مێرد بەژنی دەڵێ و تا ئێستا بەرگوێی ئەو بەدبەختە نەکەوتوە تۆ پێی بڵێ، سوێندیشی بۆ بخۆ کە بەم زوانە دەی خوازیت، تۆزێ لەزەتیش بەو نەگبەتە بگەیەنە، لەو لەزەتانەی کەتەنانەت بزن و کیسەڵ و هەزار پێیش چەشتوویانە.

((خۆ ئەگەر بزنە پیرێکی وەك بوبولینایش پەیدا بوو، کەکەس، ئەگەر زێڕی دنیایشی بدەیتێ نەتوانێت دڵی بداتێ، ئەوسا، ئەم بەندە دڵسۆزەتان، زۆربا، بەڕێوەبەری بنکەی دەلالّی ژن هێنان،

نیشانەیەکی خاچ دەکێشمو هەر خۆم ئەو ئەرکە دەکێشم. پاشان، تۆ دەبیستیت کە هەموو بێ عەقڵەکانی ئەم دەورو بەرە دەڵێن: تەماشای ئەم پیرەمێردە حەشەریە بکەن! یەعنی چاوی نابینێت؟ لووتی بۆن ناکات؟

-بۆ ، بۆ، کەرینە، من چاوم هەیە، بۆ ئەی دلڕەقینە، من لووتم هەیە، بەلام خۆ دڵیشم هەیەو دڵم بەم ژنە دەسوتێت، (کەمرۆڤ دڵی هەبوو ئیتر هەموو چاوو لووتی دنیایشی هەبێت بێ نرخەو گوێیان پێ نادات))

((کاتێك کەئەم هەرزەییەم چك دەکاتو ماڵی سەفەری ئەو دنیام دەپێچمەوە حەزرەتی بوترس، دەرکەوانی بەهەشت، دەرگای بەهەشتم لێ دەکاتەوەو پێم دەڵێت: ((فەرموو، زۆربای داماو، فەرموو زۆربای شەهیدی هەرە گەورە، برۆ لەپاڵ زیوسی هاورێتا لێی ڕاکشێ، بحەسێوە، گیانەکەم، تۆ ئەرکەکانی سەر زەویت بەچاکترین شێوە ئەنجام داوە، ڕەحمەتی منت لێ بێت))

زۆربا هەردەیوت، بەخەیاڵ داوی دادەناو خۆی تێ دەکەوت، وردە وردە برِوای بەچیرۆکەکانی خۆی دەکرد، چێژی وەردەگرتو پێی خۆشبوو، لەوکاتەدا کە بەبەر دار هەنجیری کیژێدا تێ دەپەڕین هەناسەیەکی هەڵکێشاو وەك بیەوێت سوێند بخوات دەستی درێژ کردو وتی:

-خەم مەخۆ، بوبولیناکەی خۆم، ئەی کۆنە کەشتی پیروتێك شکاوم، خەم مەخۆ، من دڵت ئاسودە دەکەم، ئەگەر چی چوار دەوڵەتی گەورە دەستیان لێ بەرداویت، جوانی وازی لێ هێناویتو خوایش هەروا، بەلام من، زۆربا، دەستت لێ بەرنادەم.

کەگەیشتینە کوختەکەی کەنار دەریامان شەو لەنیوە تێ پەڕیبوو، با هەڵی کرد، لەباژێرەوە، لەئەفریقاوە، بای گەرمی باشوور کەدرەختو مێوو مەمکی کچانی کریتی پێدەگەیاند، هەموو دوورگەکە، کەبەپاڵ دەریادا ڕاکشابوو، بەترسو لەرزەوە، هەناسەی گەرمی بایان وەردەگرت کە ئاوگی ڕوەکیان دەجوولاند، زیوس-زۆربا بای باشوور تێکەڵ بەیەکدی دەبوون، من لەو شەوە تاریکەدا بەڕوونی دەمو چاوێکی بەدەماری پیاوانەم دەبینی، کەبەسەرو ریشێکی ڕەشی رۆن لێ دراوەوە، بەلێوی سوروگەرمیەوە بەسەر هورتانس خانمی زەویدا دەنوشتایەوە.

—٢٠—

هەر كە گەیشتین لەسەر جێگاكانمان ڕاكشاین، زۆربا بەدڵ خۆشیەوە دەستی هەڵگلۆفتو وتی:

—ئەمڕۆ ڕۆژێكی خۆش بوو، سەرۆك، بێگومان لێم دەپرسیت مەبەستم لە-خۆشی- چیە؟ زۆرشتە. كەمێك بیر بكەرەوە، سەر لەبەیانی ئەمڕۆ چەند كیلۆمەترێك دوور لێرە لەپەرستگابوین. حسابمان بۆ سەرۆكی دێر- كە ئێستا لەعنەتمان بۆ دەنێرێت- كرد، پاشان بۆ ئێرە، بۆ كوختەكەی خۆمان گەڕاینەوە، بوبولینا خانمان بینیو بووینە دەستگیرانی یەكتر، فەرموو، ئەمەیش ئەنگوستیلەی دەست گیرانی كە زێڕی هەژدە عەیارە، خۆی دەیوت دوو لیرەی ئینگلیزی لەو لیرانەی كە دەریاسالاری ئینگلیزی لە كۆتایی سەدەی ڕابردوودا داویەتیو هێشتا لای ماوە، بەقسەی خۆی ئەو دوو لیرەیەی بۆ ڕێو ڕەسمی كفنو دفنەكەی هەڵگرتبوو، بەڵام وا ئێستا ئەمەی زیاتر لاپەسەندبوە كە بیداتە زەرەنگەرێك تا ئەم ئەنگوستیلانەی لێ دروست بكات، بەڕاستی مرۆڤ نهێنیەكی سەیرە!

وتم: زۆربا، بخەوەو بحەسێوە، ئیتر ئەمڕۆ بەسە، سبەی ڕێو ڕەسمێكی شكۆمەندمان لەپێشە، دەبێت یەكەمین مێخی تەلەفریكەكە دابكوتین، بەئیستفیانی قەشەیشم وتوە بێت.

—چاكت كرد، سەرۆك، ئەمە بیرێكی باشە، با ئەو قەشە ڕیش بزنیە بێتو پیاو ماقوڵانی گوندیش هەربێن، مۆمی بچووكیان دەدەینێ دایگیرسێنن، ئەم ڕێو ڕەسمە كاریگەریەكی چاكی دەبێتو لە بەرژەوەندی كارەكانمانە، تۆ تەماشای كاری من مەكە، من خوایەكی تایبەتیو شەیتانێكی تایبەتی خۆم هەیە، بەڵام خەڵكی...

دەستی بەپێكەنین كرد، خەوی لێ نەدەكەوتو سەری هاتبوە جۆش، دوای كەمێك وتی: ئاه، باوە گەورەم، خوالێی خۆش بێت، داوێن پیسێكی هەرزەبوو، هەروەك خۆم،

لەگەڵ ئەوەیشدا ئەو پیرە مێردە بەدرەگەزە چوەبوە زیارەتی مەزاری پیرۆز و ببوە (حاجی)[١٤٣] خوا خۆیشی دەزانێت بە چ مەبەستێك چووبوو، کەگەڕایەوە ناو گوند یەکێك لەهاوکارەکانی کە پیاوێکی درو لەهەموو تەمەنیا کارێکی باشی نەکردبوو پێی وت: ((باشە، هاوڕێ، تۆلەومەزارە پیرۆزەوە پارچەیەك خاچی پیرۆزت بۆ نەهێنام ؟ باوە گەورەی فێڵباز لەوەڵامدا وتی: چۆن بۆم نەهێناویت؟ بۆ تۆ وادەزانیت لەبیرم چووبیت؟ ئەمشەو وەرەماڵێو قەشەیش لەگەڵ خۆتدا بهێنە کە بەرەکەتمان پێ ببەخشێت، ئەوسا منیش ئەو پارچە خاچەت دەدەمێ، بزەڵە بەرازێکی برژاوو شەرابیش لەگەڵ خۆتا بێنە تاڕێو ڕەسمەکە ببێتە ئاهەنگ.

ئەو شەوە باوە گەورەم گەڕایەوە ماڵێ، لەتاکێکی دەرگا کۆنو کرم خواردوەکەی خانوەکەی پارچەیەکی زۆر بچووکی هەر بەئەندازەی دەنکە برنجێك لێ کردەوە، بەتۆزێك لۆکەیەوە پێچا، دڵۆپێك ڕۆن زەیتونی بەسەردا کرد، چاوەڕێ ما، دوای ماوەیەك، کابراو قەشەو بەچکە بەرازو شەراب گەیشتن، قەشە شاڵەکەی لەملی کردەوەو پیرۆزبایی لێ کردن. کابرا ئەو پارچە تەختە–بەقیمەتە–ی وەرگرتو پاشان، هەرسێکیان پەلاماری گۆشتە برژاوەکەی بزەڵە بەرازەیان دا، جا، سەرۆك، بڕوام پێ بکە، ئەو پیاوە لەبەردەم ئەو پارچە تەختەیەدا کەوتە سەر ئەژنۆو کردیە ملی، لەو ڕۆژە بەدواوە بوە مرۆڤێکی ترو تەواو گۆڕا، دایە کێو، چوە ناو ((ئارماتول))[١٤٤] و ڕێگرە چیا نشینەکانو کەوتە سوتاندنی گوندی تورکەکان، جومێرانە بەناو دەست ڕێژی گوللە باراندا تێ دەپەڕیو نەدەترسا، جا بۆ بترسێت؟ ئەو پارچەیەك خاچی پیرۆزی پێوە بوو گوللە نەی دەبڕی.

زۆربا دایە قاقای پێکەنینو وتی:

---

[١٤٣] مەبەست حاجی ئاینی ئیسلام نیە، بەڵکوو هەرکەسێك چوبێتە دیدەنی مەزارێکی پیرۆز. و–ف

[١٤٤] Armatoes ژاندرمەی یۆنانی کە لەسەدەی شانزەوە تا نۆزدە لەگەڵ کلێسای کلینت (Kleftes) ەکاندا یان چەتە کێو نشینەکاندا دژی تورکانی عوسمانیو بولگارەکان لەشەڕی سەربەخۆیی وڵاتدا بەشداریان کرد. و–ف

–مەسەلەی سەرەكی بڕوایە، كە بڕوات بوو پارچە تەختەیەك كە لە دەرگایەكی كۆنت كردبێتەوە دەبێتە شتێكی پیرۆز، كەبڕوایشت نەبوو هەرچی خاچی پیرۆز هەیە تاكە دەرگایەكی كۆن ناهێنێت. لای من، ئەم پیاوە، كە عەقڵی بەم بڕوا بەخۆ بوونو ئازایەتیەوە كاری دەكردو، ڕۆحیشی لەهەرشوێنێكەوە دەستت لێ بدایە دەكەوتە تەقینەوەو پزیسك هاویشتن جێگای ئافەرینو دەست خۆشی لێ كردن بوو.

–زۆربا تۆ قەت چوویتەتە شەڕەوە؟

دەمو چاوی گرژ كردو لەوەڵامدا وتی:

–بڵێم چی؟ لەبیرم نیە، چ شەڕێكت مەبەستە؟

–مەبەستم ئەوەیە كە هیچ كاتێك لە شەڕی نیشتمانیدا بەشداریت كردوە؟

–ناكرێت باس لەشتی ترەوە بكەیت؟ چاك وایە واز لە كەر بازاڕیەكانی ڕابوردو بێنین.

تۆ بەمە دەڵێیت كەر بازاڕی ، زۆربا؟ تەریق نابیتەوە؟ تۆ باسی نیشتمان وا دەكەیت؟

زۆربا سەری بەرزكردەوەو سەیری كردم، من لەسەر تەختەی خەوەكە ڕاكشا بوومو چرا نەوتیەكە لەلای سەرمەوە دەگڕا، ماوەیەكی زۆر هەروا مۆڕەی لێ كردمو پاشان دەستی خستە ناو هەردولای سمێڵیو وتی:

–ببوورە سەرۆك، تۆ كابرایەكی ساكاریتو قسەت لەقەبارەی خۆتدا نیە، ئەم هەموو قسانەی من بۆ تۆم كردوە لەوە دەچێت با بووبێتنو بەلای گوێتا تێ پەڕیبن[١٤٥].

من بەرپەرچیم دایەوەو وتم: چی؟ هەڵە نەكەیت، زۆربا، من زۆرباش تێ دەگەم.

–بەڵی تۆ بەسەر تێ دەگەیت، تۆ دەڵێیت: ((فلانە شت باشە، فلانە شت خراپە، وایە یان وانیە، تۆ هەقتە یان هەڵەیت)) بەڵام ئەمەی تۆ بەكوێمان دەگەیەنێت؟ ئەوكاتەی تۆ قسە دەكەیت من تەماشای باسكو سنگت دەكەم، باشە، ئەو ئەندامانەی لەشی تۆ چی دەكەن؟ لاڵنو هیچ ناڵێن، دەڵێی دڵۆپێك خوێنینیان تیا نیە، كەواتە تۆ دەتەوێت بەچی تێبگەیت؟ بەسەرت؟ حەی! حەی!.

من بۆ ئەوەی زیاتر بیجوڵێنم گوڕەیەكم لێ كرد:

---

[١٤٥] لەدەقە ئەسڵیەكەدا دەڵێت:((وەك ئەوە وایە گۆرانیم بۆ وتبێتیت، وەرگێڕی فارسیەكە كردوویە بە : لەوەدەچێت یاسینم بەگوێتا خوێندبێت.–و–

—ڕوونتر بدوێ، زۆربا، باز بەسەر وەڵامدا مەدە، من لەو بڕوایەدام کەتۆ هەرگیز خەمی وڵاتت نەخواردوە، وانیە، نامەرد؟

زۆربا زۆر تووڕە بوو، مستەکۆڵەیەکی وای بەدیوارەکەدا کێشا کە دەنگ لە تەنەکەکان بەرزبوەوە، بەڕکەوە وتی:

منێك کە ئێستا لەبەردەمی تۆدا دانیشتوم، ڕۆژێك لەڕۆژان بەقژی سەرم وێنەی کڵێسای سانت سوفیام[١٤٦] لەسەر پارچە قوماشێك چنیوەو، وەك چاوەزار لەملم کردەوەو بەسەر سنگما هاتۆتە خوارێ، بەڵێ، سەرۆك، من بەم دەستە زبرو بەم قژەمەوە، کەئەوسا وەك خەڵوزی ڕەش وابوو ئەوەم چنی، هەرمن کە ئێستا لەبەردەمتامو قسەت لەگەڵدا دەکەم، لەگەڵ پاولوملاس[١٤٧] لەچیاکانی مەکدۆنیادا ڕاکە ڕاکەم بوو، ئەوسا دلێرێکی بەهەیکەل بووم باڵام لەم کۆختە بەرزتربوو، بەبەرگی تایبەتی نەتەوەییەوە، بەتەڕبووشی سورو شاوری زیوینو چاوەزارو کێردو فیشەکدانو دەمانچەوە، سەرتاپای لەشم نوقمی ئاسنو زیوو بزمار بوو، کە بەڕێگادا دەڕۆیشتم دەنگی خرنگو هوڕی شتەکانم ئەوەندە بەرزبوون دەت وت لەشکرێك بەڕێوەیە. وەرە، تەماشا بکە، تەماشا.. ئیدی!.

دوگمەی کراسەکەی کردەوە، پانتۆڵەکەی بردە خوارێو فەرمانیدا:

—ئەو چرایە بێنەرە پێشێ.

چراکەم لەجەستە لاوازو لەبەر خۆر سوتاوەکەی نزیك خستەوە، لەشی پڕ بوو لەجێ زامی قووڵو شوێنەواری فیشەكو شمشێر، لەشی بێژنگێك بوو بۆخۆی.

—ئێستا وەرە لەولاوە تەماشا بکە.

وەرچەرخا، پشتی نیشاندامو وتی:

—بڕوانە، پشتم تاقە ڕوشانێکی پێوە نیە، تێدەگەیت؟ چراکە بەرەوە جێگای خۆی.

---

[١٤٦] Sainte-sophia کلێسای ڕۆمی شەرقی کە لەساڵی ٥٣٢تا ٥٣٧ بەفەرمانی ئیمبارتۆر کوستانتین دروست کرا، پاشان تورکانی عوسمانی دوای داگیر کردنی قوستەنتەنیە کردیان بەمزگەوتی ((ئایا سوفیا)) ئێستا کراوەتە مۆزو.و-ف

[١٤٧] Pavio Melas ئەفسەرێکی یۆنانی کە لەشەڕی بەرگری میللی بولگاردا ئازایەتی زۆری نواندو وەك شۆڕشگێڕێك ناوی دەرکرد. و.ف

بەتوورەیی‌و بۆڵە بۆڵەوە وتی:

(-کەر بازاڕە، ئیدی، حەیاچوونە، ئاخر ئەم ئادەمیزادە کەی دەبێتە مرۆڤ؟ مرۆڤ پانتۆڵ لەپێ دەکات، یەخەو بۆینباخ دەبەستێت، کڵاو لەسەر دەکات، کەچی هێشتا هێسترە، گورکە، ڕێویە، بەرازە، ئێمەی مرۆڤ خۆمان بەوێنەی خوا دەزانین، کێ؟ ئێمە؟ ئای لەو قسە پڕوپووچانە.)

دەت وت یادوەریەکی ترسناکی هاتۆتەوە بەرزەین، چونکە تا دەهات توورەتر دەبوو، لەبەینی ددانە تاق‌و لۆق‌و خوراوەکانیەوە هەندێك وشە دەردەپەڕین تێیان نەدەگەیشتی.

لەجێگاکەی هەستا، گۆزە ئاوەکەی نا بەسەرەوەو بینی پێوەنا، لەوەدەچوو فێنك بووبێتەوە، ماوەیەك هێور بوو.

وتی: تۆ دەست لەهەرشوێنێکمەوە بدەیت دەناڵێنیت، سەرتاپای لەشم بێجگە لەزام‌و برین شتێکی تر نیە، تۆیش ئەوسا باسی ژنم لەگەڵدا دەکەیت! من لەوکاتەوەی کەبەڕاستی هەستم کرد بوومەتە پیاوێکی واقیعی، ئیتر بۆ تەماشاکردن سەرم بە لای ژندا وەرنەگێڕا، تەنیا بۆ چرکە ساتێك، وەك کەڵەشێر هەستم دەکردن‌و دەڕۆیشتم بەلای کاری خۆمەوە، بەخۆم دەوت: ئەم مەکر بازە پیسانە دەیانەوێت ئاوی گیانم بمژن، ئای ! هەرچی ژن هەیە بۆ دۆزەخ، بابڕۆن)).

ئینجا تفەنگەکەم کردەشانم‌و بەڕێ کەوتم، وەك سەربازێکی میللی دامە نێو کەژو چیا، ڕۆژێك، لەبوولێڵدا گەیشتمە گوندێکی بولگاریا، لەگەوری ماڵە قەشەیەکی بولگاریدا، کە ئەویش بەرگری میللی‌و خوێن ڕێژێکی سەرسەخت بوو خۆم شاردەوە، ئەوشەوانە جلی قەشایەتیەکەی دادەکەندو بەرگی شوانی لەبەردەکرد، چەکی هەڵدەگرت‌و دەچوە نێو گوندی یۆنانیەکانەوە. بەیانی زوو، پێش خۆر هەڵاتن دەگەڕایەوە گوندەکەی خۆی ، هەموو لەشی خوێن‌و لیتە بوو، پاشان بۆ نوێژی بەیانی بەرەو کڵێسا دەبوەوە. چەند ڕۆژێك پێش گەیشتنی من، لەکاتێکدا کەمامۆستایەکی یۆنانی لەناوجێگادا خەوتبوو قەشە کوشتبووی، ئیدی منیش چوومە گەوری قەشەوە، لەدوای دوومانگاکەیەوە لەسەر تەختێك لەسەر پشت لێی ڕاکشام‌و چاوەڕێم کرد، نزیکی عەسر بوو کە قەشە بۆ ئالیکدانی مانگاکان هاتە گەورەکەوە، زوو خستمە ژێرو وەك مەڕ گۆشاو گۆش سەرم بڕی، هەردوو

گوێم لەبنا هەڵکەندو خستمنە گیرفانمەوە، ئەوسا من گوێی براوی بولگاریەکانم کۆ دەکردەوە،تێ دەگەیت؟ بۆیە گوێی قەشەیشم هەڵگرت و بۆی دەرچووم.

((دوای چەند رۆژێك لەقرچەی نیوەڕۆدا، وەك دەست گێڕێك گەڕامەوە هەمان گوند، چەکەکەم لەچیا شاردبووەوە، خۆم بەنیازی کڕینی نان و خوێ و پێڵاو بۆ هاوڕێ یان هاتبوومە خوارێ. لەبەردەم ماڵێکدا پێنج منالی ڕەش پۆش و پێ پەتیم بینی کەدەستی یەکتریان گرتبوو سواڵیان دەکرد، منالەکان سێ کچ و دوو کوڕ بوون تەمەنی هەرە گەورەکەیان لەدەساڵ تێنەدەپەڕی، بچوکترینیشیان ساوایەکی شیرە خۆر بوو، کچە گەورەکەیان ساواکەی گرتبوە باوەشی، ماچی دەکردو دەیلاواند، تا نەگری، نەم زانی چۆن، بەڵام وەك لە غەیبەوە پێم وترابێت وام بەسەردا هات کەلێ یان نزیك بکەومەوە.

بەزمانی بولگاری لێم پرسین:

–رۆڵەکانم، ئێوە مندالی کێن؟

کوڕە گەورەکە یان سەرە بچووکەکەی بەرز کردەوەو وتی:

–ئێمە مندالی ئەو قەشەیەین کەچەند رۆژێك پێش ئێستا لەگەوڕەکەماندا سەریان بڕی.

هەردوو چاوم پڕ بوون لەفرمێسك و زەوییش وەك بەرداش بەدەوری سەرما خولی خوارد، پاڵم بەدیوارەکەوە دا تا وردە وردە سەرەگێژیەکەم ڕەویەوە. وتم: مندالان وەرنە پێشەوە، وەرنە نزیکمەوە.

((کیسە پارەکەم کەپڕ بوو لەلیرەی تورکی و مەجیدی دەرهێنا، بەچیچکانەوە دانیشتم و هەرچی لەکیسەکەدا بوو ڕۆم کردە سەر زەویەکە، پێم وتن: ((دەی،هەڵگرن، چەندتان دەوێت بیبەن))

منالەکان خۆیان خستە سەرزەویەکەو کەوتنە کۆکردنەوەی لیرەو مەجیدیەکان، من هەرهاوارم لێ دەکردن کە: هەمووی بۆ ئێوەیە، هەمووی بەرن بۆ خۆتان.

پاشان زەمیلەکەیشم کەپڕ بوو لەخرتکەو پرتکە بۆم بەجێ هێشتن و وتم: ((ئەمانەیش هەر بۆ ئێوەیە، هەمووی بۆ خۆتان بەرن))

ئینجا کەوتمە لاڕێو لەگوندەکە دەرچووم، دوگمەی کراسەکەمم کردەوە، ئەو وێنەیەی کلێسای سانت سوفیا کە خۆم نەخشم لەسەرکردبوو لەملمم کردەوە، پارچە پارچەم کردو دامە دەم باوە، زۆر خێرا کەوتمە ڕێ ((واتا ئێستایش هەر بەڕێوەم))

زۆربا پاڵی بەدیوارەکەوە داو رووی تێ کردمو وتی:

–بەم جۆرە لە شەڕی ئەو ڕزگار بووم.

–لەشەڕی نیشتمان؟

بەدەنگێکی هێور، بەڵام سوور لەسەر وتەکانی، وتی: بەڵێ، لەشەڕی نیشتمان.

دوای چرکە ساتێك وتی:

–رزگاری لەشەڕی نیشتمان، لەشەڕی قەشە، لەشەڕی پارە، وردە وردە کەوتمە لەبێژنگ دانی هەموو شتەکان، چەندە لەمەندا هەڵکشام، زیاتر لەبێژنگم دەداو شتەکانم جیا دەکردەوە، تا بارەکەم سووك بوو، چۆنت پێ بڵێم؟ خۆم ڕزگار کردو بووم بەمرۆڤ.

چاوی زۆربا پرشنگی دەداو دەمە کراوەکەیشی لەخۆشیاندا پێدەکەنی، دوای کەمێك بێدەنگی دیسان دەستی پێ کردەوە، هێند دڵی پڕ ببوو نەی دەتوانی بەری لێ بگرێت.

–سەردەمانێك دەم وت ئەمە تورکە، ئەمە بولگاریەو ئەمە یۆنانی، سەرۆك، من کاری وام بۆ وڵاتەکەم کردوە ئەگەر بۆت باس بکەم تووکی سەرت ڕاست دەبێتەوە، سەری خەڵکم بڕیوە، دزیم کردوە، دێم سوتاندوە، دەست درێژیم کردۆتە سەر ژنو خێزانم لەناو بردوە. بۆ؟ بە بیانووی ئەوەوە کە ئەمانە تورکی یان بولگارین، تف لەخۆم، زۆرجار جوێن بەخۆم دەدەمو دەڵێم: برۆ ونبە، بێژو، بۆ دۆزەخ، کەرپیاو. بەڵام ئێستا بەخۆم دەڵێم: ئەمە پیاوێکی باشە، ئەمەیان پیاوێکی دزێوە، ئیتر بولگاریە یان یۆنانی، بۆمن جیاوازی ناکات. چاکە یان خراپ؟ ئەمە تاقە شتێکە کە من ئێستا لەبارەی خەڵکەوە دەیپرسم، تەنانەت لەئێستادا کە ڕوو لەپیریم، سوێند بەو نانەی کەدەیخۆم، وام لێ هاتوە کە ئەو پرسیارەیش نەکەم. بەڵێ، هاوڕێ، مرۆڤ چاك بێت یان خراپ دڵم پێی دەسوتێت، بە هەموویان، کە بەد بەختێك دەبینم، ئەگەرچی خۆیشم وا نیشان بدەم کە پەیوەندیم پێوە نیە، بەڵام دڵم دەسوتێتو بەخۆم دەڵێم: ئەم بێچارەیە دەخوات، دەخواتەوە، خۆشەویستی دەکات، دەترسێت، ئەویش خوایەکو شەیتانێکی هەیە، ئەویش دەمرێت،

لەژێرخاکدا دەنوێت‌و دەبێتە خۆراکی مارو مێرو، ئەی داماو! ئێمە هەمووومان براین‌و هەموو دەبینە خۆراکی کرمەکان.

((خۆ ئەگەر ئەو کەسە ژن بێت، ئاه– دڵم پێم دەڵێت بگریم، گریانی بەخوڕ، بەڕێزت تاوە ناتاوێك سەر دەنێیتە سەرم‌و دەڵێیت من ژنم زۆر خۆش دەوێت، ئاخر سەرۆك، چۆنم خۆش نەوێن؟ ئەوانە مرۆڤ گەلێکی لاوازن‌و خۆیشیان نازانن چی دەکەن، هەر ئەوەندەیش کە دەست بکوتێتە سنگیان ئیتر خۆیانت دەدەنە دەستەوە، ((جارێکیان چوومە گوندێکی بولگاریەکانەوە، کوێخای گوندەکە پیاوێکی نامەردی یۆنانی بوو، لە دەمیەوە دام، خەڵکی گوندەکە گەمارۆی ئەو خانوەیاندا کەمنی تیابووم، من خۆم گەیاندە باڵە خانەی سەرەوە، لەوێوە سەربان بەسەربان کەوتمە بازدان، مانگە شەویش بوو، وەك پشیلە لەبانێکەوە بۆ بانێکی تر بازرەقەم دەبەست، بەڵام ئەوان دوای سێبەرەکەم کەوتبوون، کەوتنە سەربان‌و دامیانە بەرتەقە، جامن چی بکەم باشە؟ خۆم هەڵدایە حەوشی ماڵێکەوە، ژنێکی بولگاری بەجلی خەوەوە نوستبوو، کەمنی بینی دەمی کردەوە بقیژێنێت، بەڵام من دەستم بۆ درێژکردو لەسەر خۆپێم وت:((بەزەیی، بەزەیی، دەنگ مەکە)) مەمکیم گرت، ڕەنگی لەرووپەڕیو تێك چوو، زۆر لەسەر خۆ وتی ((وەرە ژورێ، بانەمان بینن))

((چوومە ژوورەوە، ئەو دەستی گوشیم‌و پرسی: تۆ یۆنانیت؟

وتم بەڵێ یۆنانیم، ئاشکرام مەکە)) خۆم بەکەمەریەوە چەسپاند، هیچی نەوت، چوومە ناو جێگاکەی‌و لەخۆشیا دڵم کەوتبوە لەرزین، بەخۆم دەوت: ((تەماشا، ئەی زۆربای نەعلەتی، ئەمەیش ژن، ئەم گیانلەبەرە ئینسانیە، ئێستا چیەو کوێیە؟ بولگاری؟ یۆنانی؟ پاپو[١٤٨]، چ فەرقێکی هەیە؟ ئەم ئێستا مرۆڤێکە، مرۆڤێك دەم‌و مەمکی هەیەو حەز لەخۆشەویستی دەکات، تۆ تەریق نابیتەوە بوونەوەرێکی وابکوژیت، هەی نامەرد.

((ئەمە هەموو ئەو قسانە بوون کە بەدرێژایی ئەو ماوەیەی لەئامێزی گەرمی ئەو ژنەدا بووم لەگەڵ خۆمدا دەمکرد، بەڵام ئاخۆ ئەم نیشتمانە بەقوڕگیراوە هێشتی هەروا ئاسوودە بم؟.

---

[١٤٨] پاپو Papous ڕەش پێستەکانی دانیشتوی کینیای تازەو دورگەکانی دەوری بەریتانیای تازە کە دەکەونە باکورو خۆرهەڵاتی ئوسترالیاوە. و.ف

Scanned by CamScanner

بەیانی زوو، هەر بەو جلانەوە کە ئەو ژنە بولگاریە پێی دام ڕۆیشتم، بێوەژن بوو، جلەکانیش هی خواڵێ خۆش بووی مێردی بوو، لەسندووقی دەرهێناو دایە من، ئەژنۆی ماچ کردمو لێم پاڕایەوە کە جارێکی تر بچمەوە لای.

((بەڵێ، بەڵێ، شەوی داهاتوو چوومەوە، ئاخر من پیاوێکی نیشتمان پەروەر بووم، تێ دەگەیت؟ دڕندەیەکی کێوی، گەڕامەوە، بەڵام بەتەنەکەیەک نەوتەوە، ئاگرم لەگوندەکە بەردا، بێگومانم کە ئەوژنە بێچارەیەیش لەگەڵ ئەوانی تردا سوتاوە، ناوی لودمیلا[١٤٩] بوو))

زۆربا هەناسەیەکی هەڵکێشا، جگەرەیەکی داگیرساندو دوای ئەوەی دووسێ مژی لێدا فڕێیدا.

—تۆ دەڵێیت نیشتمان.. و باوەڕت بە وڕێنەی ناو کتێبەکانتە. دەبێت تۆ بڕوا بە قسەی من بکەیت، مادامەکی نیشتمان هەیە مرۆڤیش ئەو دڕندەیەیە کە هەیە، دڕندەی کێوی، بەڵام من، لەخوا بەزیادبێت ڕزگارم بوو، تەواو، ئەی تۆ؟

من وەڵامیم نەدایەوە، ئەم پیاوەی کە بەرانبەرم دانیشتوەو، لەگەڵ خوێنو گۆشتی خۆیدا لەشەڕو خەڵك کوشتنو خۆش ویستندا

—واتا هەموو ئەوشتانەی کە من بەهۆی کاغەزو مەرەکەبەوە دەمویست بیزانم—ژیاوە من ئیرەییم پێدەبرد. گشت ئەو مەسەلانەی کە من دەمویست بەگۆشەگیری خۆمو لەپشت کورسیەوە گرێکانی بکەمەوە، ئەم پیاوە، لەناوچیادا، لەهەوای ئازادو بەشمشێری خۆی چارەسەری کردبوون.

بێئەوەی هەست بەئاسوودەیی بکەم پێڵوم نانە سەریەك.

زۆربا ماندو ببوو، پرسی:

—خەوتی، سەرۆك؟ منی بێ عەقڵیش قسەت بۆ دەکەم!

بەدەم بۆڵە بۆڵەوە پاڵ کەوت، دوای کەمێك کەوتە پرخە پرخ.

---

[١٤٩] Ladmilla

بەدرێژایی ئەو شەوە من نەم توانی چاو لێك بنێم، هۆزارێك، بۆیەکەمین جار، ئەوشەوە دەنگی هاتە بەرگوێ، تەنیاییەکەی ئێمەی پڕکرد لەخەمێك کەبەرگەی نەدەگیراو، من لەپڕا هەستم کرد کە فرمێسك بەچاوما دێتە خوارێ.

گەرووم گیرابوو بەیانی زوو هەستام و لەپاڵ دەرگاکەوە تەماشای دەریاو وشکانیم کرد، هەستم کرد کە دنیا لەماوەی تاقە شەوێکدا گۆڕاوە، بەرانبەرم، بەسەر زیخەکەوە، پنچکە گیایەکی دڕکاویم بینی کە تادوێنێ گیایەکی چکۆلەی نابوودابوو،کەچی ئەمڕۆ نوقمی نێو گوڵی وردی سپیببوو، لەدوورەوە بۆنێکی خۆشی دارلیمۆو نارنجە گوڵ کردوەکان هەوایان پڕ کردبوو، چەند هەنگاوێك چوومە پێشێ، لەتەماشا کردنی ئەو موجیزەیەی کە بەردەوام لە نوێ بوونەوەدا بوو تێر نەدەبووم.

لەناکاوێکدا، لەدواوەگوێم لە بانگێکی شادی بوو، ئاوڕم دایەوە، زۆربایش نیوەڕوت لە خەوهەستابوو ، هاتبوە بەردەم دەرگاکە، وەك نیمچە پەشۆکاوێك سەیری بەهارە نوێکەی دەکرد، بەسەرسامیەوە پرسی :

–ئەمە چیە، سەرۆك؟ ئەمە موجیزەیە، ئەو پانتاییە شینەی کەلەو دامێنەوە دەجمێت ناوی چیە؟ دەریا؟ ئەی ئەمەی کەبەرهەڵبێنەیەکی سەوزی لە گوڵ و گیای لەخۆ بەستوە چیە؟ زەوی؟ ئەمە کام هونەرمەندە ئەمانەی درووست کردوەو دەستی پێدا هێناون! سوێند دەخۆم، سەرۆك، من یەکەمجارمە ئەمانە دەبینم.

چاوی ئاوی تێزابوو.

من گوڕەیەکم لێ کرد: ها، زۆربا، شێت بوویت؟

–بۆ پێ‌دەکەنیت، سەرۆك؟ بۆ نابینیت؟ ئەو خوارە ئەفسوناوی بوە.

ئیدی زۆربا دەرپەڕی و کەوتە سەماکردن، ئینجا وەك جوانویەکی بەهار لەناوگیاکەدا کەوتە تەپ و تل.

خۆرکەوت، من ناولەپم لەبەردەم هەتاوەکەدا ڕاگرت تا گەرم ببنەوە، چڵەکان لەچرۆکردندا بوون، سنگەکان هەڵدەئاوسان، ڕۆحیش وەك درەخت دەپشکوت، مرۆڤ وای هەست دەکرد کە گیان و لەش لەیەك مادە پێك هاتوون.

زۆربا بەقژە پڕ لەشەونمو خۆڵاویەكەیەوە لەسەر زەویەكە هەستابوو، هاوارێكی كرد: زووكە، سەرۆك، بڕۆین خۆمان بگۆڕین، ئەمڕۆ ڕۆژی پیرۆزبایی كردنەكەیە، قەشەو پیاو ماقوڵانی گوند زوودێن، ئەگەر بمان بینن چۆن لەناو ئەم گژوگیایەدا تەپاوتلمانە ئابڕوی پڕۆژەكەمان دەچێت، با یەخەو بۆینباخ دەركەین‌و سیمایەكی جیدیمان هەبێت، گرنگ نیە مرۆڤ سەری نەبێت، بەڵام دەبێت كڵاوی هەبێت، بەخوا، سەرۆك، ئەم دنیا قێزەونە هەرشیاوی ئەوەیە تف لەدەمو چاوی بكەیت.

بەرگمان پۆشی، كرێكارەكان گەیشتن‌و پیاوماقوڵانی گوند پەیدا بوون،

—خۆت قورس ڕابگرە، سەرۆك، پێ مەكەنە، نابێت كارێك بكەین پێمان پێبكەنن.

لەپێش هەموویانەوە، قەشە ئیستیفان بەبەرگە چڵكنەكەیەوە كە گیرفانەكانی شیوەلۆكێك بوون بۆ خۆیان دەڕۆیشت، لەڕێو ڕەسمی پیرۆزباییدا، مردووناشتندا، مارەبڕین‌و زەماوەندو تەعمید كردندا، هەرچیەكیان بدایەتێ، لەمێوژ، ناشیرینی، كێكی پەنیر لەسەرو خەیارو گۆشت‌و جل‌و نوقڵ‌و شتی دی، هەمووی بەسەریەكدا دەكردو دەی قلْپاندنە ناو ئەو شیوەتۆكانەوە. شەو، پیرێژنەكەی هاوسەر، پاپادیار[١٥٠] چاویلكەی لەچاودەكردو، هەموو ئەو خواردەمەنیانەی بەدەم كاوێژی خۆیەوە لێك جیادەكردەوە.

لەدوای قەشە ئیستیفانەوە پیاو ماقوڵانی گوند بوون:

كندو مانولیوی چایچی‌و دنیادیدە، چونكە تا كانە رۆیشتبوو شازادە جۆرجی بینیبوو، ئاپۆ ئاناگنوستی بەكراسی سپی‌و قۆڵی هەراویەوە كەلە سەرخۆو دەم بەپێكەنین بوو مامۆستای قوتابخانە بەویقارو شكۆمەندی‌و داری دەستیەوە، دواكەسیش، ماڤراندونی بەهەنگاوی لەسەر خۆو گرانیەوە دەهات، دەستەسرێكی ڕەشی بەسەریەوە بەستبوو، كراسێكی ڕەش لەبەرداو چەكمەیەكی ڕەشی لەپێدابوو، لەژێر لێوەوە سڵاوێكی تاڵ‌و مۆنی كردو پشت بەدەریا لەلایەكەوە وەستا.

زۆربا بەدەنگێكی پڕ لەویقارەوە وتی: بەناوی پەروەردگارمان، عیسای مەسیحەوە.

كەوتە پێش كۆمەڵەكەو هەموو بەویقارێكی ئاینیەوە دوای كەوتن. یادوەری كۆنی سازدانی ڕێو ڕەسمی ئەفسوناویەكان جارێكی دی لەسنگی گوندنشینەكاندا سەری

---

[١٥٠] Papadia

هەڵدایەوە، هەموو چاویان لەقەشەکە بڕیبوو، دەت وت چاوەڕێی بینینی ئەوە بوون کە قەشە لەگەڵ هێزە نادیارەکاندا تێ هەڵبچێتو دەریان بکات. هەزاران ساڵ پێش ئێستا، جادووکەر دەستی بەرز ڕادەگرت، ئاوی پیرۆزی بەهەوادا دەپژاند، ویردو دوعای بەنهێنیو زۆرکاریگەری لەژێر لێوەوە دەخوێند، ڕۆحە نەگریسەکان هەڵدەهاتن، هەرلەوکاتەدا، ڕۆحە پاکەکان کە لەئاووخاکەوە وەدەردەکەوتن دەهاتنە کۆمەکی مرۆڤ.

هەموو گەیشتینە ئەوچاڵەی کەنزیک بەدەریا، بۆ دانانی یەکەم مێخی تەلەفریکەکە هەڵکەنرا بوو، کرێکارەکان قەدی دار کاژێکیان بەرزکردەوەو ستوونی لەنێوچاڵەکەیان نا، ئیستیفانی قەشە ملوانکە خاچەکەی لەگەردن کرد، بخووردانەکەی لەدەست گرت، لەگەڵ تەماشاکردنی مێخەکەدا دەستی کرد بەخوێندنی ئەو دروودانانەی کەڕۆحە نەگریسەکان ڕاودەنێن: ((خوا بکات ئەم مێخە بەسەر بەردێکی سەختەوە خۆی بگرێتو باو بۆران نەتوانن بیجولێنن.. ئامین))

زۆربا نیشانەی خاچی کێشاو بەدەنگی بەرز وتی: ئامین، پیاو ماقوڵانی گوندیش لەبەر خۆیانەوە وتیان : ئامین.

کرێکارەکانیش کەلەدوای هەموەوە بوون وتیان: ئامین.

قەشە ئیستیفان دوعای کردو وتی:

–خوای گەورە کارتان لێ پیرۆز بکاتو خێرو بەرەکەتی ئیبراهیمو ئیسحاقتان بداتێ.

زۆربا کاغەزێکی سەد دراخمایی خستە دەستیەوە. قەشەکە تەواو شادمان بوو وتی: بەرەکەتی خۆمت پێشکەش دەکەم.

گەڕاینەوە کۆختەکەو زۆربا شەرابو پێش خۆراکی ڕۆژانی ڕۆژوگرتن کە قرژاڵی برژاوو ڕۆبیانی سوورە کراوو، پاقلەی لە ئاو کراوو، زەیتونی داینێ. دوای ئەوە پیاو ماقوڵانی گوند، لەسەرخۆو بەدرێژی کەنار دەریادا گەڕانەوەو ماڵی خۆیان، ڕێو ڕەسمی ئەفسوناوی گەیشتبوە کۆتایی.

زۆربا بەدەم دەست هەڵگلۆفتنەوە وتی:

–ڕێو ڕەسمەکە زۆرباش بەڕێوە چوو.

ئەو جلانەی داکەندو جلی کاری لەبەرکرد، قازمەکەی هەڵگرت، پاشان ڕوو بەکرێکارەکان وتی:

–دەی کوڕینە، بابڕۆین، نیشانەی خاچ بکێشنو بەرێکەون.

بەدرێژایی ئەو ڕۆژە زۆربا سەری بڵند نەکردو بەشەوقەوە کاری دەکرد، کرێکارەکان لەبەینی پەنجامەتردا چاڵێکیان هەڵدەکەندو دارمێخیان تیا دادەکوتا، ڕیزی دارمێخەکان

بەهێڵێکی ڕاست ڕوو بەلووتکەی کەژەکە دەچوو. زۆربا بەردەوام ئەندازەی دەگرت‌و حسابی دەکردو فەرمانی دەدا، بەدرێژایی ئەو ڕۆژە نەخۆراکی خوارد، نەجگەرەی کێشاو نەپشووی‌دا، هەموو هۆش‌و هەستی بەلای کارەکەوە بوو. هەندێك جار پێی دەوتم:

—هۆی، ئەوەی کە ئەم دنیایەی ئێستا کەوتۆتە ئەم حاڵە ناخۆشەوە ئەوەیە کە هەموو کاریان بەنیوە ناچڵ دەکەن، نیوەی بیروباوەڕیان دەردەبڕن، نیوە تاوانبارو نیوەچاکن، ئیتر هەروا بڕو تاکۆتایی‌و مەترسە سەردەکەویت.

خوا ڕقی لەنیوە شەیتان زیاترە وەك لەشەیتانی تەواو:

ئێوارە کە لەکارکردن گەڕایەوە ماندوو مردوو لەسەر زیخەکە لێی ڕاکشاو وتی:

—من لێرەدا دەنووم‌و تاسبەی بەیانی هەڵناسم، پاشان دەڕۆینەوە بۆ کارکردن، هەندێکیش بۆ شەو کار دادەیم.

—بۆچی ئەوەندەت پەلەیە زۆربا؟

کەمێك داماو پاشان وتی:

—بۆچی؟ چاکە، مەعلومە، بۆ ئەوەی بزانم ئەولێژیەم ڕاست کردۆتەوە یان نا. ئەگەر هەڵەمان کردبێت ئەوە حسابمان فت، سەرۆك، من چەند زووتر لەو مەسەلەیە بگەم چاکترە.

خێراو بەئیشتیهاوە کەوتە نان خواردن، دوای کەمێك دەنگی پرخە پرخەکەی ئەو ناوەی پڕکرد، بەڵام من، تاماوەیەکی زۆر خەوم لێ نەکەوت‌و چاوم بڕیبوە ئەستێرەکانی ئاسمان، ئاسمانم بەهەموو هەسارەکانیەوە دەبینی کە هێدی هێدی لەجێ گۆڕکێ‌دا بوون‌و، کاژەڵاکی منیش وەك ڕوانگەیەك، لەگەڵ ئەستێرەکاندا جێگای خۆی دەگۆڕی. ئەم ڕستەیەی مارکۆس ئۆریلیوس[١٥١] کە وتوویەتی :

((تەماشای گەڕانی ئەستێرەکان بکە، دەڵێیت تۆیش لەگەڵیاندا دەگەڕێیت)) دڵی پڕکردم لەکێش‌و ئاهەنگ.

---

[١٥١] Marcus Aurelius ئیمپراتۆری ڕۆمانی (١٢١-١٨٠ز) کە ئیمپراتۆر ئانتوان کردیە کوڕی خۆی، لەجێی خۆی دایناو کچەکەی خۆیشی (فوستین)ی دایە. لەساڵی ١٦١ تا ١٨٠ ئیمپراتۆری کرد، لەگەڵ ئەشکانی‌و جەرمەنیەکاندا شەڕی کردو کتێبێکی بەناوی (بیرەکان)ەوە بەزمانی یۆنانی کەلەبارەی ڕەوشتە لە حیکمەتی ڕواقیەکانەوە نووسی. و-ف

—٢١—

رۆژی جەژنی پاکبوو، زۆربا خۆی گۆڕیبوو، گۆرەوی ئاوریشمینی ئەستووری ڕەنگ باینجانی لەپێ کردبوو، دەی وت یەکێك لەکیژە هاوڕێکانی مەکدۆنیای بۆی ناردووە، لەسەر تەپۆڵکەیەکی نزیك بە کۆختەکەمان بەدوودڵیەوە هەر دەهاتو دەچوو، دەستی نابوە پشت برۆ پڕەکانی تا خۆر لەچاوی نەدات، تەماشای دەورووبەری گوندەکەی دەکرد.

—ئەم پیرە ورچی دەریایە نەهات، ئەم نەگبەتو پیسە نەهات، ئەم ئاڵا کۆنو دڕاوە نەهات.

پەپوولەیەکی بچووك بەباڵ پێکدادان گەیشتو ویستی بەسەر سمێڵی زۆرباوە بنیشێتەوە، ئەو ختووکەی هاتیو بە لووتی فوویەکی لێ کرد، پەپوولەکە بەهێوری ڕۆشتو لەناو تیشکی خۆرەکەدا ون بوو.

ئەو ڕۆژە ئێمە چاوەڕێی هورتانس خانم بووین تا پێکەوە جەژنی پاك بکەین، بەرخێکمان بۆ برژاندن لەشیش دابوو، سفرەیەکی سپیمان لەسەر لمەکە ڕاخستبوو، هێلکەمان ڕەنگ کردبوو، بڕیارمان وابوو کە نیوە گاڵتەو نیوە جیدی ئەوڕۆژە میوانداریەکی گەورە لەسەر شەرەفی ئەو سازبکەین، ئەم پیرە فریشتە خەپەتۆڵەو عەتراویو کەمێك پواوەمان، لەو کەنارە چەپەکەدا هێزێکی سەیری هەبوو، کاری تێ کردبووینو، کەلامان نەدەبوو وامان هەست دەکرد شتێکمان لێ ون بوە. بۆنی کۆلۆنیا، پەڵەی سوور، ئاوێزەیەك، لەنجەی مرواریەك، دەنگێکی دوو توخم، دووچاوی تیژی ئاوتێزاو.

چەند چڵە دار مۆردو غارێکمان بڕیو تاقێکی سەرکەوتنمان دروست کرد بۆ ئەوەی بەژێریا تێ پەڕێت، بەسەر تاقەکەوە چوار ئاڵای ئینگلیزیو فەرەنسیو ئیتاڵیو رووسی، لەناوەڕاستو کەمێك سەرو تردا، پارچەیەکی سپی کەنارشینمان هەڵکردبو، بێگومان لەبەر ئەوەی کە ئێمە دەریا سالار نەبووین تۆپمان نەبوو بیتەقێنین، بەڵام بڕیارمان دابوو

کەبەسەر بەرزییەکەوە بمێنینەوەو، بەدوو تفەنگی خوازراوەوە هەر کە بینیمان پیرە ورچی دەریا خەرامان بەکەنارەکەدا بەرەو لامان دێت بیان تەقێنین، بۆ ئەوەی پاداشتێك لە شکۆمەندیو گەورەیی ڕابووردی ئەو، لەو کەنارە تەریکەدا زیندووبکەینەوە، تا ئەو بەدبەختو هەژارە بۆ چرکە ساتێك بکەوێتەوە خەونەکانەوەو، وابزانێت هێشتا ژنێکی جوانو سوورسپیو، مەمك سفتو سوڵەو پێڵاوەکانی هەر دەبریقێنەوەو گۆرەوی حەریری لەپێدایە. ئاخر، ئەگەر زیندو بوونەوەی دوای مەرگی مەسیح مزگێنیەك نەبێت بۆ گەڕانەوەی لاویەتیو توانای ئێمەو، پیرێژنێکی بەنازو نووکیش تەمەنی نەگەڕێتەوە بۆ بیست ساڵی ئیتر ئەو زیندوبوونەوەیە چ کەڵکێکی هەیە؟

زۆربا بەدەم هەڵکێشانەوەی گۆرەویە ڕەنگ بادامیەکانیەوە کە بەردەوام دادەکشانە خوارێ لەبەرخۆیەوە هەر دەیبۆڵاندو دەیوت: ئەم پیرە ورچەی دەریایە نەهات، ئەم پیسو نەگبەتە نەهات، ئەم ئاڵا کۆنو دڕاوە نەهات.

—وەرە دابنیشە زۆربا، وەرە لەسایەی ئەم دار خڕنووکەدا جگەرەیەك بکێشە، ئێستا دەردەکەوێت.

ئەو بۆ دواجار تەماشایەکی پڕ لە چاوەڕوانی ڕێگاکەی کرد، ئینجا هاتو لەژێر دارخڕنووکەکەدا دانیشت، نیوەڕۆ نزیك دەبووەوەو هەوا گەرم دادەهات، لەدوورەوە دەنگی زەنگەکانی جەژنی پاك، شادو پڕ نەرم دەهاتە گوێ، جار ناجارێکیش بادەنگی چەنگێکی[١٥٢] کریتی بۆ دەهێنایەن، لەهەموو گوندەکەدا، وەك شانەی هەنگ لە وەرزی بەهاردا ببووە بەژاوە ژاو.

زۆبا سەری ڕاوەشاندو وتی:

—ئیدی ئەوسەردەمە تێپەڕی کەلە هەموو جەژنێکی پاکدا گیانی منیش لەگەڵ مەسیحدا زیندو دەبووەوە، ئەوە نەما، ئێستا تەنیا لەشم زیندو دەبێتەوە.

یەکێك کە میوانداری دەکرێت یەکەمجار خواردنێکی بۆ ڕادەگرن، پاشان خواردنی دوەمو سێیەم، داوای لێ دەکەن ئم تیکەیە بخۆ، ئەمەیش هەر بخۆ، ئەوانی دوای ئەویش

---

[١٥٢] چەنگ: لەو سازانەیە کە ژێدارنو کۆن ٤٦ ژێیان هەبوو بەپەنجە لێ دەدران((هارپ)).

هەروا، تاورگی پڕدەبێت لەخۆراکی زۆرو بەتام. بەڵام ئەو هەموو خۆراکە نابێتە پاشماوەو پیسی، بەڵکوو شتێکی لێ دەمێنیتەوە کە هەروا بەفیڕۆ ناڕوات‌و دەبێتە خۆش مەشرەبی‌و سەماو گۆرانی‌و تەنانەت دڕدۆنگیش. هەر ئەو تۆزە خواردنەیە کەمن ناوی زیندو بوونەوەی لێ دەنێم.

دیسان ڕاست بوەوە، تەماشایەکی ئاسۆی کردو بڕۆی پێکدادا. وتی: مێرد منداڵێك بەڕاکردن بەرەو ئێرە دێت.

خۆیشی بەرەو لای تەتەرەکە چوو. مێرد منداڵەکە لەسەر نووکی پێی خۆی بڵند کردو چرپەیەکی دا بەگوێی زۆربادا، ئەو تەکانێکی خواردو تووڕە بوو، لەبەر خۆیەوە وتی:

—نەخۆشە؟ نەخۆشە؟ دەی بڕۆ وەلبە، ئەگینا کاژیلەت دەهاڕم.

گەڕایەوە لام‌و وتی:

—سەرۆك، من سەرێکی ئاوایی دەدەم بزانم ئەو پیرە ورچی دەریایە چیەتی؟ تۆ کەمێك سەبربکە، دووهێلکەی سوورم بدەرێ تاپێکەوە بیشکێنین، زوو دێمەوە.

دووهێلکە سوورەکەی خستە گیرفانی، گۆرەویە بادامی ڕەنگەکەی هەڵکێشایەوەو بەرێکەوت.

من لەسەرەوە هاتمە خوارێ‌و لەسەر زیخە فێنکەکە ڕاکشام، شەماڵێکی خۆشی هەڵکردبوو، چینی ورد ورد دەکەوتە سەر ڕووی دەریاکە، دوو نەورەس بەسەر شەپۆلە هێورەکانەوە نیشتنەوە. پەڕی گەردنیان گیف کردبوو، بەدەم تەکانی شەپۆلەکانەوە لارو لەنجەیان بوو، دیاربوو چێژێکی پڕ لە ئارەزوویان لە شەپۆلە سازو گونجاوەکانی دەریا وەردەگرت، من وام هەست دەکرد کە شادمانی‌و خۆشی ئەو باڵندانە لەوەدایە کە ئاوە ساردەکە بەرسنگ‌و سکیان دەکەوێت.

هەر بەدەم تەماشاکردنی ئەو باڵندانەوە لەگەڵ خۆمدا کەوتمە بیر کردنەوە:

((ئەمە ئەو ڕێگایەیە کەدەبێت پیایدا بڕۆیت، واتا دەبێت ئەو ئاهەنگە سەرەکیە بدۆزیتەوەو، بەو پەڕی دڵنیاییەوە پەیڕەوی لێ بکەیت))

دوای سەعاتێك، لەکاتێکدا کە زۆربا بەخۆشحاڵیەوە سمێڵی بادەدا گەڕایەوەو وتی:

ئەم ڕۆژانەی دواییدا، واتا لە
-بێچارەیە سەرمای بوە، گرنگ نیە، ئەم ژنە فەرەنگیە[١٥٢] لەسەر شەرەفی من، بۆ بەجێ هێنانی ڕێو ڕەسمی
هەفتەی پیرۆزدا، وەك خۆی دەڵێت لەسەر شەرەفی من، بۆ بەجێ هێنانی ڕێو ڕەسمی
نوێژو دوعای نیوە شەو چۆتە کڵێساو لەو بەینەدا سەرمای بوە. من بای پشتیم گرتو
بەڕۆن چرا لەشیم هەنوو، پەرداخێکی بچووکیش ئارەقی نەی شەکرم دەرخوارد دا،
بێگومانم سبەی بەیانی چاك دەبێتەوە، بەڕاستی ئەم پیرە ماینە لەخۆیدا مرۆڤێکی
خۆشە، خۆزگا لەوێ دەبوویتو گوێت لێ دەبوو کە لەشیم چەور دەکرد چۆن وەك کۆتر
دەیگماند، وەك ختووکەی بدەیت وابوو.

لەسەر سفرە دانیشتینو زۆربا لیوانەکانی پڕکرد، بە خۆشەویستیەوە وتی:

-بەخۆشی ئەو، هیوادارم مەرگ درەنگ دەستی بیگاتێ.

ماوەیەك خواردمان، خواردمانەوەو بێدەنگ بووین، با کە دەنگی دوور ئارەزوو بەخشی
چەنگی وەك گیزەگیزی هەنگ بۆ دەهێناین. جارێکی تر مەسیح بەسەر هەیوانی
ماڵەکانەوە زیندو دەبوەوەو بەرخی قوربانیو نانی شیرینی جەژنی پاك دەبوونە ئاوازێکی
عاشقانە.

کە زۆر لەخواردنو خواردنەوە مڕ بوو، گوێچکە پڕ لەموەکانی گرتو لەبەرخۆیەوە
وتی:

-دەنگی چەنگە، لەناودێدا سەمایە.

راپەڕی، شەراب سەری گەرم کردبوو، هاواری کرد:

-باشە، پێم بڵێ ئێمە وەك دوو چۆلەکەی تەنیا لێرە چی بکەین؟

بائێمەیش بیکەینە سەما، تۆ دڵت بەو بەرخە ناسوتێت کە خواردمان؟ یەعنی دەتەوێت
ئەو بەرخە هەرئاوا بە بەلاش بڕوات؟ باوەلێ ، هەستە بابڕۆین بیکەین بەسەماو گۆرانی.
زۆربا زیندو بۆتەوە.

-کەمێك ئارامبە زۆربای لەعنەتی، شێت بوویت؟

---

[١٥٢] بەگشتی لەخۆرهەلاتدا بەخەڵکانی ئەورووپایی و بەتایبەت کاسۆلیکەکان دەوترێت- فەرەنگی- هورتانس خانمیش فەرەنسیەکی کاسولیك مەزەبە. و-ف

–بەشەرەفم، سەرۆك، بۆ من جیاوازی نیە، بەڵام دڵم بۆ بەرخو هێلکەی سوورکراوو نانە شیرینی پاكو سەر شیرو پەنیر دەسوتێت.

سوێند دەخۆم ئەگەر من تەنیا نانو زەیتونم بخواردایە دەم وت:

((دەی بابڕۆین بخۆین، جەژن بۆ چی؟))

نانو زەیتون هیچ نیە، چیە؟ نانو زەیتون لەوە زیاتر ناهێنێت، بەڵام ئێستا دڵنیابە کە خوا هەڵناگرێت بهێڵین ئەم خۆراکە باشەی ئەمشەو هەر ئاوا بەهەوانتە بڕوات، هەستە بابڕۆینو بیکەینە جەژنی زیندوو بوونەوە، سەرۆك.

–من ئەمڕۆ لەسەر خۆم نیم، تۆ بڕۆو لەباتی منیش سەما بکە.

زۆربا قۆڵی گرتمو هەڵی ساندم.

–دەی هاوڕێ، مەسیح زیندوبۆتەوە، ئەگەر من وەك تۆ لاو بومایە بەسەر بۆ هەموو شوێنێك دەچووم، بەسەر ڕۆیشتن بۆ هەموو شوێنێك، بۆ کار، بۆ خواردنەوە، بۆ خۆشەویستی کردن، نەترسانیش نەلەخواو نە لە شەیتان، ئەمەیە مانای گەنجی.

–ئەوە بەرخەکەیە لەلەشی تۆدا دەدوێت، زۆربا، ئەو وەك کێویی لێ هاتوەو بوە بەگورگ.

–نا، گیانە، ئەو بوە بەزۆرباو ئەمەیش زۆربایە کە لەگەڵ تودا دەدوێت. تۆ بەڕاستی گوێ لەقسەی من بگرە، پاشان چیت بەدەمدا هات بیلێ، من سەندەبادی بەحریم، بێگومان مەبەست ئەوە نیە کە هەموو دنیام بەپێوەداوە، نا، بەهیچ شێوەیەك، بەڵام من دزیم کردوە، پیاوم کوشتوە، درۆم کردوە، بێ ئەژمار لەگەڵ ژناندا نوستوومو سەرپێچیم لەگشت فەرمانەکان کردوە[١٥٤] بۆ نموونە چەندن؟ دەفەرمانن؟ خۆزگا بیستو پەنجاو سەدیش بونایە تاسەرپێچیم لەهەمووی بکردایە.

---

[١٥٤] The Commandments دە فەرمانی خوایی کەلەکتێبی عەهدی کۆندا هەیەو لەکێوی تورر بۆ موسا هاتۆتە خوارێ. فەرمانەکان ئەمانەن: خوا پەرستی، پەیمان نەبەزاندن، ناوی خوا بەخراپ نەبردن، ڕێزی دایكو باوك، نەکوشتن، زینا نەکردن، دزی نەکردن، شایەتی درۆ نەدان، چاو لەژنی دراوسێ نەبڕیت، چاو لەماڵی دراوسێ نەبڕیت. –و–

بەم ئاکارەیشەوە ئەگەر خوایەك هەبوایە من ناترسم لەرۆژی قیامەتدا بەرەو ڕووی ببمەوە. نازانم چۆنی بڵێم کە تۆ تێی بگەیت؟ من بڕوا ناکەم هیچ شتێك لەمانە بایەخێکیان هەبێت. یەعنی خوا هەموو هۆش‌و هەستی خۆی دابێتە ئەم کرمانەی زەوی‌و حساب‌و کیتابی هەموو شتێکیان لەگەڵدا بکات کە دەیکەن؟ یەعنی ئەگەر کرمێکی نێر سواری کرمێکی مێی پاڵ خۆی ببێت، یان لەهەینی پیرۆزدا تیکەیەك گۆشت بخوات خوا بەو سەرەوە تووڕە دەبێت، دەیکاتە هەراو زەناو دنیای لێ تاڵ دەبێت؟ ئاه.. بڕۆن وەلێن.. ئەی مێملەکانی سەرسفرە، قەشە ورگ هەڵاوساوەکانی شۆربا خۆر.

من بۆ ئەوەی زیاتر تووڕەی بکەم پێم وت:

—باشە، زۆربا، دەشێت خوا لەسەر ئەوەی کە خواردوتە لێت نەپرسێتەوە، بەڵام لەسەر کردەوەکانت ئەوە گومانی تێدا نیە.

—من پێت دەڵێم لەو لایەنەیشەوە ناپرسێتەوە، بێگومان پێم دەڵێیت تۆ زۆربای نەخوێندەوار ئەمە لەکوێ دەزانیت؟ بەڵام لەزانینی دڵنیام، چونکە بۆ وێنە ئەگەر من دوو کوڕم هەبێت، یەکێکیان عاقڵ‌و ڕێك‌و پێك‌و پاشەکەوت کەرو خوا پەرست، ئەوی دی پیسکەو چڵێس‌و درو ژنانی، بێگومان من هەردوکیانم لەسەر خوانی خۆم قبووڵە، نایشزانم تەنانەت بۆ دوەمیانم لاچاکترە، دەشێت لەبەر ئەوەبێت کە ئەمیان زیاتر لەخۆم بچێت؟ بەڵام کێ ناڵێت من لەقەشە ئیستیفان زیاتر، کە شەوو ڕۆژ خەریکی خوا پەرستی‌و پارە کۆکردنەوەیە لەخوا ناچم؟

((خوا خۆیشی باش دەژی، مرۆڤ دەکوژێت، ناعەدالەتی دەکات، عەشق بازی دەکات، کار دەکات، حەزی لە شتی قەدەغەیە، تەواو وەك من، حەز لەهەر شتێك بکات دەیخوات، هەرژنێکی بوێت دەستی دەخات، بۆ نموونە تۆ ژنێك دەبینیت کە لەجوانیدا دەڵێی ئاوی زوڵاڵ‌و ڕەوانە، کە دەیبینیت دڵت وەك گوڵ دەپشکوێت، کەچی لەپڕا زەوی دەم دەکاتەوەو هەڵی دەلوشێت، ئەو ژنە بۆکوێ چوو؟ کێ بردی؟ ئەگەر ژنێکی چاك‌و خانەدان بێت دەڵێت خوا بردوویەتی، ئەگەر ژنێکی بەدکاربێت دەڵێن شەیتان فڕاندویەتی، بەڵام من، سەرۆك، پێشان پێم وتوویت‌و ئێستایش دووبارەی دەکەمەوە کە خواو شەیتان هەر یەکن))

((من بێدەنگ بووم‌و لێوی خۆم گەست، وەك ئەوەی بەر لە وشەیەك بگرم كە دەبوایەست بێتە دەرێ" هەم وشەو هەم هاوارێكی بەرز، پاشان ئەو هاوارە چ مانایەك دەبەخشێت؟ نەفرەت، خۆشی، نائومێدی یان رزگاری؟ نازانم؟))

زۆربا دار دەستەكەی هەڵگرت، شەوكڵاوەكەی لەسەر نا، وەك بەزەیی پیامدا بێتەوە تەماشای كردم‌و بۆ چركە ساتێك لێوی جووڵا، وەك بیەوێت شتێكی تربخاتە سەر قسەكانی، بەڵام بێدەنگ مایەوەو بەسەری بەرزو هەنگاوی خێراوە بەرەو گوندەكە كەوتە رێ.

من لەبەر رووناكی ئەو سەرلە ئێوارەیەدا سێبەری زەبەلاحیم بەسەر چەوەكەوە دەبینی كەدەجولاو دار دەستەكەی ڕادەوەشاند، هەموو كەنارەكە لەگەڵ ڕۆیشتنەكەی زۆربادا دەژیا، ماوەیەكی زۆر گوێ قولاغ بووم‌و گوێم لە دەنگی پێی گرت كەوردە وردە نەدەما، لەناكاوێكدا وەك هەستم بەتەنیایی كردبێت لەجێگاكەم ڕاپەڕیم، بۆ؟ تا بۆ كوێ بچم؟ نازانم، گیانم چ بڕیارێكی نەدابوو، بەڵكوو ئەوە لەشم بوو كە هەستابوە سەرپێ، تەنیا ئەو بوو كە بێ ئەوەی ڕاپرسیم بكات بڕیاری خۆی دابوو.

لەشم، وەك ئەوەی فەرمانم پێ بدات بەتوندی وتی:

بۆ پێشەوە" منیش بەهەنگاوی پتەوو چوستەوە بەرەو گوندەكە هەنگاوم نا، جار ناجارێك دەوەستام‌و بۆنی بەهارم دەكرد، زەوی بۆنی بەیبوونی لێ دەهات، كە وردە وردە لەباخەكان نزیك دەكەوتمەوە وەك شەپۆل بۆنی دار لیمۆو نارنج‌و نەستەرەنی گوڵ گرتووم بەسەردا دەهات، لەخۆر ئاواوە، ئەستێرەی سەر لەئێوارە شادو دڵخۆش دەستی بەسەماكرد.

لەڕێگادا، بێ‌ئەوەی ئاگام لەخۆم بێت وتەكانی زۆربام دووبارە دەكردەوە:

((دەریا، ژن، مەی، كاری گران)) ، ((دەریا، ژن، مەی، كاری گران،))

سەر بەنێو كارو مەی‌و عەشقدا بكەیت، نەلە خواو نە لە شەیتان بترسیت.. ئەمەیە تەمەنی لاوی))

ئەم قسانەم بۆ خۆم دەكردو دوبارەم دەكردنەوە، وەك بمەوێت تاوێك بدەمە دڵم‌و لە ڕۆیشتن بەردەوام بم.

لەپڕا وەك گەیشتبێتمە جێ مەبەستەکەم، وەستام کوێ بوو؟ سەیری ئەم لاو ئەولای خۆم کرد، لەبەردەم باخی بێوەژنەکەدا بووم، لەپشت پەرژینی قامیشو هەنجیرە کێویلەوە دەنگی زوڵاڵی گۆرانی ژنانەیەك دەهات، چوومە پێشێو گەڵاکانم لادا، لەژێر دارپرتەقاڵێکدا ژنێکی ڕەش پۆشی مەمك قوت وەستابوو، بەدەم گۆرانی وتنەوە چڵە گوڵ گرتوەکانی دەبڕی، لەو تاریكو ڕوونی ئێوارەیەدا سنگی نیوە ڕووتیم بینی چۆن دەبریسکایەوە، هەناسەم گیرا، بەخۆم وت،((ئەمیش گیانلەبەرێکی دڕندەیەو خۆیشی دەزانێت، ئەم پیاوانە لەبەردەمیدا چ بوونەوەرێکی هەژارو بی سەرو بێ ئاگاو زەلیلن، دەبێت ئەمیش وەك هەندێك مێروو-ئاخونی پیرۆز ، کوللە، جاڵجاڵۆکە- لەبەرەبەیاندا نێرەکەی بخوات))

ئایا بێوەژنەکە ئاگای لەوەبووە کەمن لەوێدام؟ لەپڕا گۆرانیەکەی بڕیو ڕووی وەرگێڕا، لەچاوتروکانێکدا چاومان بەر یەکتدی کەوت، هەستم بەئەژنۆ سستی خۆم کرد، وەك لەو دیو قامیشەکانەوە پڵنگێکی مێم دیبێت وابوو، بەدەنگێکی گیراوەوە پرسی: ئەوە کێیە لەوێ؟

سەرپۆشەکەی دابەرسیداو سنگی داپۆشی، دەمو چاوی تێك چوو.

من ویستم بڕۆم، بەڵام کتو پڕ قسەکانی زۆربا دڵیان پڕکردمو هێزم دایە بەر خۆم ((دەریا، ژن، مەی))

لەوەلامدا وتم: منم، منم، دەرگا بکەرەوە.

دوای ئەم وشانە ترس هەموو گیانی داگرتمو ویستم ڕابکەم، بەڵام تەریق بوومەوەو بەسەرخۆمدا زاڵ بووم.

-تۆ کێیت؟

لەسەرخۆو بەپارێزو بێدەنگیەوە هاتەپێشێ، ملی درێژکرد، چاوی نیوە نوقاو کرد تا چاکتر بزانێت کێیە، دیسان خۆی بۆ پێشەوە چەماندەوە، چاوە چاوێکی تری کردو هەنگاوێکی دی بۆ پێشەوە نا، دەمو

دەست ڕووی کرایەوە، سەری زمانی بەلێویا هێنا، بەدەنگێکی نەرمتر وتی: سەرۆك؟

هەربەو جۆرەی کە خۆی جۆر کردبوو ئامادەی بازدان بوو هاتەپێشێو جارێکی تر لەسەرخۆ وتی: سەرۆک؟

-بەڵێ.

-وەرە ژوورێ.

* * *

بەیانی دابوو، زۆربا گەڕابووەوەو لەبەردەمی کۆختەکەدا دانیشتبوو، جگەرەی دەکێشاو لەدەریای دەڕوانی، وەك چاوەڕێی من بکات وابوو.

هەرکە دەرکەوتم سەری بڵند کردو لێم ڕاما، پەڕەی لووتی وەك پەڕەی لووتی تاژی ڕاو دەلەرزی، ملی درێژکرد، هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا، بۆنی پێوە کردمو دەمو دەست ڕووی گەشایەوە، لەوە دەچوو بۆنی بێوەژنەکەی لە لەشی کردبێت.

بەئەسپایی هەستا، پڕبەپڕی هەموو لەشی پێکەنی، باوەشی بۆ کردمەوەو وتی:

-دەتپەرستم.

من پاڵ کەوتمو چاوم لێکنا، گوێم لە هەناسەی هێوری دەریا گرت کە ئاهەنگێکی گونجاو بوو، هەستم کرد خۆیشم وەك باڵندەی دەریا بەسەر شەپۆلەکانەوە دێمو دەچم، هەر بەدەم ئەو دابەزینو سەرکەوتنە ئارامەوە خەوم لێ کەوتو خەونم بینی، ژنێکی زەلامی ڕەش لەسەر زەویەکە دانیشتبوو، وەك پەرستگایەکی گەورەی کۆنم هاتە بەرچاو کەلە مەرمەڕی ڕەش دروست کرابێت، بەنیگەرانیەوە بەدەوریدا دەگەڕام تادەرگای چوونە ژوورەوەکەی بدۆزمەوە ، بەڵام بەزەحمەت دەگەیشتمە درێژیی پەنجە بچکۆلەی قاچی. لەودەمەدا کە بەدەوری پاژنەی پێیدا دەگەڕام دەرگایەکی ڕەشم بینی کە لە دەرکی ئەشکەوت دەچوو. دەنگێکی ناخۆشم گوێ لێ بوو کە فەرمانیدا:

((وەرە ژوورەوە)) منیش چوومە ژوورێ.

نزیك نیوەڕۆ لەخەو هەستام، خۆرەکە لە پەنجەرەکەوە هاتبوە ژوورێو جێ خەوەکانی نوقمی رووناکی کردبوو، تیشکەکەی هێند توند لەو ئاوێنە چکۆڵەی دەدا کە بەدیوارەکەوە هەڵواسرابوو دەت وت دەیەوێت بیکاتە هەزار پارچەوە.

خەونی ژنە زنجیە زەلامەکەم بیرکەوتەوە، دەریا ورتە ورتی بوو، دیسان چاوم لێك نایەوەو هەستم بەشادمانی کرد. وەك ئاژەڵێکی درندە کە دوای خواردنی نێچیرەکەی لەبەر خۆر ڕادەکشێ‌و دەسەت بە لستنەوەی دەستو دەمی دەکات لەشم سووكو حەساوە بوو، ڕۆحیشم وەك لەشم تێرو هێور بوو، دەت وت وەڵامێکی زۆر ئاسانی بۆ ئەو پرسیارە دژوارانە دۆزیوەتەوە کە ئازاری پێوە دەکێشان.

هەموو خۆشیەکانی شەوی ڕابردوو لەناخی بوونی مندا بازرەقەیان دەبەست، وەك ئاوی ساردی جۆگاکان بڵاو دەبوونەوەو ئەو گڵەیان تێر ئاو دەکرد کە منی لێ دروست کرابووم. هەر بەو شێوەیەی کە ڕاکشابوومو چاوم لێك نابوو وام دەهاتە بەرچاو کە دەنگی چرکە چرك‌و کرانەوەی وجودی خۆم دەبیستم، ئەوشەوە یەکەمجارم بوو بەڕوونی هەستم بەوە کردبێت کە ڕۆحیش جەستەیە، ڕەنگە جەستەیەکی بزۆز تریش بێت، ناسك‌و ئازادتر، بەڵام هەر ئەو جەستەیەیەو، جەستەیش ڕۆحە، ڕۆحێکی کەمێك خەواڵوو، ماندووی ڕێگای دوورو شەکەتی ئەوبارە قورسانەی بەمیراتی بۆی ماونەتەوە.

بەسەر سەرمەوە هەستم بەسێبەرێك کرد، چاوم کردەوە، زۆربا لەبەر دەرگاکە وەستابوو بەخۆشیەوە لێی دەڕوانیم، بەزمانی خۆش‌و شیرینی دایکانە پێی وتم:

هەڵمەستە، کوڕم، هەڵمەستە، ئەمڕۆیش هەر جەژنە، بنوو، بەدەم خۆ ڕاست کردنەوەوە وتم : خەوی تەواوم کردوە.

زۆربا بەپێکەنینەوە وتی: باهێلکەیەکت بۆ دروست بکەم، هێلکە هێزی تازەت وەبەر دێنێتەوە.

بێ وەڵامدانەوە خێرا بەرەو کەنار دەریا چووم، مەلەم کردو لەبەر هەتاوەکە لەشم وشك کردەوە، هێشتا بۆنێکی خۆش‌و توندم لەکونە لووت‌و سەرلێوو بن پەنجەکانم هەست پێ دەکرد. بۆنی گوڵی پرتەقاڵ یان ڕۆنی درەختی غاز، کەژنانی کریتی بەقژیانیدا دەسوون.

بێوەژنەکە پێش ڕۆژێك باقەیەك گوڵە نارنجی چنیبوو، تا ئەو شەوەو لەو کاتەدا کە خەڵکی گوند لەژێر سپی دارەکاندا خەریکی سەماو هەڵپەڕکێ دەبن‌و کڵێسا چۆڵە بۆ مەسیحی بەرێت، پەیکەری پیرۆزی سەر قەرەوێڵەی نوستنەکە، چەپکێك گوڵی لیمۆی

بەسەرەوە بوو، وێنەی غەمگینی مریەمی پاکیزە بەچاوی گەورەو بادامیەوە لەنێو گوڵەکانەوە دەردەکەوت.

زۆربا هاتو ئەو هێلکەیەی بۆی کردبوومە ناو کوپێکەوە، لەگەڵ دوو پرتەقاڵو پارچەیەك کێکی جەژنی پاکی لاوە دانام، بەشادیی‌و هێمنی دایکێکەوە کە بەدەوری کورە لەشەڕ گەڕاوەکەیدا بێت‌و بچێت ئاوا دەیلاواندم، خۆشەویستانە تەماشای کردم‌و ڕۆیشت، وتی:

دەڕۆم چەند دار مێخێکی تر دەچەقێنم.

من لەبەر تیشکی خۆرەکەدا لەسەرخۆ کەوتمە خواردن‌و ئەوەندە بەقووڵی هەستم بە بزاوتی لەشم کرد وەك ئەوەی بەسەر دەریایەکی ساردو سەوزەوە بم وابوو، نەم دەهێشت زەینم ئەو چالاکیی لەشم قۆرخ بکات‌و لەئاشەکەی خۆیدا بمهاڕێت‌و بیرۆکەی لێ دروست بکات. سەرتاپای جەستەم دابووە دەست لەزەتێکی حەیوانی، تەنیا هەندێك جار لەدەورو بەری خۆم‌و ناوەوەم‌و لەموجیزەی ئەم دنیایە ڕادەمام‌و بەخۆم دەوت:

((چیە؟ چیە وا دنیا بەم جۆرە لەگەڵ پێی دەست‌و گەدەماندا ڕاهاتوە؟))و دیسان چاوم دەنایەوە سەر یەك‌و کڕ دەبووم

لەپڕا لەسەر جێگاکەم هەستام، چوومە ناوکۆختەکەوە، دەستنووسەکەی بودای خۆم هەڵگرت‌و، گەیشتبوومە کۆتایی نووسینەکە، ئەو شوێنەی کە بودا لەژێر دارە پڕ لە گوڵەکەدا ڕاکشاوە، دەستی بڵند کردو بەو پێنج ڕەگەزەی کە خودی خۆی پێك هێناوە، یەعنی- خاك‌و ئاوو باو ئاگرو ڕۆح- فەرمانی داوە کەلەیەکتری بترازێن.

من ئیدی پێویستم بەوە نەبوو وێنای دەردو ئازاری خۆم بکەم، چونکە لەوە تێپەڕیبووم‌و کاری خۆم لەگەڵ بودادا گەیاندبووە کۆتایی، بۆیە دەستم بەرز کردەوەو فەرمانم بە بودا کرد کەلەناو جەستەی مندا بتوێتەوە.

زۆر بەپەلە، بەیارمەتی وشەو هێزی ئەفسوناویەوە جەستەو ڕۆح‌و بیری بودام وێران کرد، بێڕەحمانە دوا وشەی خۆم نووسی، دوا هاوارم کردو ناوی خۆم بەقەڵەمی سوورو گەورە نووسی، ئیتر تەواو ببوو.

بەپەتێك دەست نووسەكەم بەست، هەستم بەشادیەكی سەیر دەكرد، وەك ئەوەی دەستو پێی دوژمنێكی مەترسیدارم بەستبێت، یان ببوومە ئەو وەحشیانەی كە دەستو پێی مردوە ئازیزەكانیان دەبەستن تا نەتوانن لەگۆڕ بێنە دەرێو بین بەگیانە وێڵەكان. لەناكاوێكدا كچۆڵەیەكی پێ پەتی بەڕاكردن گەیشت، كراسێكی زەردی لەبەرداو هێلكەیەكی سووری توند بەدەستەوە گرتبوو، وەستاو بەواق وڕماویەوە لێی ڕوانیم. من بۆ ئەوەی هانی بدەم بەدەمیەوە پێكەنیم و لێم پرسی:

–ها، چیە؟ چیت دەوێت؟

لووشەیەكی كردو بەهانكە هانكەوە وتی:

–خانم منی ناردوە پێت بڵێم بچیتە لای، ئەو لەجێدا كەوتوە، تۆ زۆربایت؟

–زۆر باشە، دێم.

هێلكەیەكی سوورم خستە دەستەكەی تریەوە، كچۆڵەكە دەستی گرمۆڵە كردو ڕایكرد هەستامو كەوتمە ڕێ، دەنگی ژاوە ژاوی گوند وردە وردە نزیك دەبوەوە، ئاوازی دڵنەوازی چەنگو قیژەو هاوارو دەنگی تفەنگو گۆرانیی شادی. كە گەیشتمە گۆڕەپانی گوندەكە كوڕو كچانی ژێر سپیدارە تازە گەڵا كردوەكە كۆببوونەوەو ئامادەی سەما كردن بوون، پیرەمێردەكان بەئەڵقە لەسەر كورسی دانیشتبوون، چەناگەیان نابوە سەر دار دەستەكانیانو تەماشایان دەكردن، پیرێژنەكان لەدوای ئەوانەوە دانیشتبوون، لە ناوەڕاستیسەما كەراندا فانوریوی[١٥٥] چەنگ ژەنی ناو دار دانیشتبوو، گوڵاڵە سوورەیەكی بەهاری لەپشت گوێچكەی دانابوو، بەدەستی چەپی ڕاست چەنگەكەی خستبوە سەر ئەژنۆی، بەدەستی ڕاستیشی ڕیشە زەنگۆڵە دارەكانی پێ دێنا.

من كە بەوێدا تێ دەپەڕیم بەدەنگی بەرز وتم: ڕۆژی زیندوبوونەوەی مەسیحە" شەپۆلێك دەنگ بەخۆشیەوە وەڵامیان دامەوە:

بەڕاستی ڕۆژی زیندو بوونەوەی مەسیحە.

---

[١٥٥] Fanaruio

چاوێکی خێزم بەنێو کۆمەڵەکەدا گێڕا، کوڕانی قەدوبالا جوانی باریکەلە، پانتۆڵی فش‌و فۆڵ لەپێ، دەستە سڕێکیان لەسەریانەوە پێچابوو، کەنارەکانی وەك قژی لوول تاڵەکانی بەسەر لاجانگ‌و تەوێڵیاندا هاتبوە خوارێ، کچۆڵەکانیش بەملوانکەی پلپلە زێڕی‌گەردنیان‌و دەسماڵی سپی گوڵ گوڵیەوە سەریان دانەوا ندبوو، دڵیان لەچاوەڕوانیدا کەوتبوە لەرزین.

چەند دەنگێك ڕوو لەمن وتیان:

–سەرۆك، فەرموو لامان دانیشە.

بەڵام من تازە تێپەڕیبووم.

هورتانس خانم لەسەر قەروێڵەی خەوەکەی تەنیا شتێك کە بۆ ئەو بە وەفاداری مابوەوە ڕاکشابوو، تا روومەتی سوور داگیرابوو و دەکۆکی.

هەر کە چاوی پێم کەوت هەناسەیەکی پڕ لە ئازاری هەڵکێشاو پرسی:

–ئەی زۆربا کوا، سەرۆك؟ زۆربا لە کوێیە؟

–زۆربا حاڵی باش نیە، لەو ڕۆژەوە تۆ کەوتویت ئەویش نەخۆشە، وێنەکەتی بەدەستەوەیە، تەماشای دەکات‌و هەناسە هەڵدەکێشێت.

پیرە فریشتەی داماو لە خۆشیا چاوی لێك ناو لەسەرخۆ وتی:

بیلێرەوە.

–منی ناردوە تا بزانم چیت پێویستە، خۆیشی هەرچەندە تەندروستی باش نیەو ناتوانێت بەئاسانی بەڕێدا بڕوات، بەڵام پێی وتم، ئەمشەو دێتە لات. لەوە زیاتر خۆی لەبەر دووری تۆدا ناگرێت.

–بۆم بلێرەوە ، بیلێرەوە، بیلێرەوە.

–لەئەسینایشەوە بروسکەیەکی پێگەیشتوە، تیا نووسراوە بەرگی بوکێنی ئامادەیەو تاجە گوڵینەیش ، هەموویشیان بەکەشتی ناردوەو بەم زوانە دەگەن.. مۆمی سپی‌و شریتی گوڵ ڕەنگیشیان ناردوە.

–بەردەوام مبە، بەرەوام مبە...

-خەو گرتبووی، ڕیتمی هەناسەدانەکەی گۆڕاو کەوتە وڕێنە کردن،ژوورەکە بۆنی کۆلۆنیاو ئامۆنیاکو ئارەقەی لەشی لێ دەهات، لەپەنجەرە کراوەکەوە، بۆنێکی ناخۆشی پاشماوەی مریشکو کەروێشکی حەوشەکە دەهاتە ژورێ.

هەستامو لەژوورەکە چوومە دەرێ، لەبەردەرگاکەدا میمیتۆم تووش هات کە ئەو ڕۆژە پێلاوو پانتۆڵی تازەی لەبەرکردبوو، چڵێك ڕێحانەیشی خستبوە پشت گوێی.

پێم وت: میمیتۆ، بەپەلە بڕۆ بۆ گوندی کالوو[156] پزیشك لەگەڵ خۆتدا بێنە.

پێش ئەوەی قسەکەم تەواو بکەم میمیتۆ پێلاوە تازەکانی داکەند، خستیە بن دەستی تازە لەڕێگا نەدڕێن.

-زوو بڕۆو پزیشکەکە بدۆزەرەوە، بەناوی منەوە سلاوی لێ بکەو پێی بلێ سواری ماینەکەی بێتو هەر ئێستا بگاتە ئێرە، پێی بڵێ خانم زۆر نەخۆشە، بلێ داماوە سەرمای بوە، تای لێ هاتوە و خەریکە دەمرێت، لەبیرت نەچێت، هەموو ئەم قسانەی پێ بلێ، ها، ڕابکە بت بینم.

-بەسەرچاو، بەسەرچاو، دەڕۆم.

تفی لەناو لەپی کردو بەخۆشحالیەوە هەردوو دەستی پێکدا ساوین، بەلام لەجێی خۆی نەبزوت، لەسەرخۆ تەماشای دەکردم.

-پێم وتیت بڕۆ، دەی..

دیسان لەجێی خۆی نەبزوت، چاوێکی لێ داگرتمو زەردەخەنەیەکی شەیتانانەی کرد، وتی: سەرۆك، من شووشەیەك گولاوی پرتەقالم بەدیاری بۆ هێنایت.

هەروەستا. دەیویست لێی بپرسم کێ ئەوەی بۆ ناردوم، بەلام من دەنگم نەکرد.

بەپێکەنینەوە پرسی: چاکە" سەرۆك، ناپرسیت کێ ئەوەی بۆ ناردویت؟ دەیوت: بیکات بەسەروقژیا تابۆنی خۆش بێت.

-بێدەنگبە، زووکە بڕۆ.

دیسان تفی لەناو هەردوو لەپی کردەوەو بەدەنگێکی بەرز وتی:

-بەسەر چاو، بەسەرچاو، مەسیح زیندو بۆتەوەو..

لەچاو ون بوو.

[156] Kalo

—٢٢—

سەمای جەژنی پاکی ژێر دار سپیدارەکان لەوپەڕی جۆش‌و خرۆشدا بوو، سەرچۆپی کێش لاوێکی کەتەو تۆکمە، ئەسمەرێکی تەمەن نزیك بیست ساڵ بوو، ڕوومەتی بە گەنەموو داپۆشراوو هێشتا گوێزانی لێ نەکەوتبوو، لە درزی کراسەکەیەوە قژە پڕو لوولەکەی سەرسنگی وەك پەڵەیەکی ڕەش دەینواند، سەری بەپشتا خستبوو، وەك دوو باڵی باڵندە هەردوو قاچی بەسەر زەویەکەدا دەهێناو دەبرد، جارجارە تەماشای کچێکی دەکرد، سپیاتی چاوی بەجۆرێکی هێورو نیگەران کەر لەنێو دەم‌و چاوە ئەسمەرەکەیەوە دەدرەوشایەوە.

من لە لایەکەوە شادو لەلایەکی ترەوە سەرم سوڕما بوو، لەماڵی هورتانس خانمەوە دەگەڕامەوە، بۆ ئاگا لێ بوونی ژنێکم ڕاسپارد بوو، وا ئێستا بەخەیاڵی ئاسوودەوە بۆ تەماشا کردنی سەمای کریتیەکان دەچووم. لەئاپو ئاناگنوستی نزیك کەوتمەوەو لەپاڵیا لەسەر کورسیەك دانیشتم.

بەگوێما چرپاند: ئەو لاوە سەرچۆپی کێشە کێیە؟

ئاپۆ ئاناگنوستی دایە پێکەنین‌و وەك دەست خۆشی بکات وتی:

—ئەم ناقۆڵایە لە ئیزرائیلی گیان کێش دەچێت! ئەمە سیفاکاسی [١٥٧] شوانە، بەدرێژایی ساڵ لەنێو چیاکاندا ڕان دەلەوەڕێنێت، لەڕۆژانی جەژنی پاکدا دێتە خوارێ تا چاوی بەخەڵك بکەوێت‌و هەڵپەڕێت.

پیرەمێرد هەناسەی هەڵکێشاو لەبەر خۆیەوە وتی:

—خۆزگا لەتەمەنی ئەودا دەبووم، بەشەرەفم ئەگەر وەك ئەو گەنج بوومایە پەلاماری قوستەنتەنیەم دەدا.

[١٥٧] Sifakas

کوڕه لاوەکە سەری ڕاوەشاند، بانگی لێ بەرزکردو وەك بەرانێك لەوەرزی جووت بەستندبێت مرقەیەکی ئاژەڵیانەی کردو هاواری لێ هەستا.

—لێده، فانوریو، لێده تاوەکوو مەرگ بمرێت.

بەڕاستیش بەردەوام مەرگ دەمردو پاشان زیندو دەبووەوە، ئەوە هەزاران ساڵە کوڕوکچ لەژێر درەختە گەڵا تەڕەکاندا، وەك سپیدارو سنەوبەرو بەڕوو چنارو خورمای بڵندا سەمادەکەن، پاشان هەزاران ساڵی تر بەهەوەس و ئارەزوییەکی داگیرساوەوە سەما دەکەنەوە، دەمو چاوەکان دەگۆڕێن، دەبن بەخاك و دەگەڕێنەوە لای زەوی، بەڵام لەجێگای ئەوان ڕووی تر لە خاك دەردێن، لەڕاستیا سەماکەر یەکێك زیاتر نیەو دەمامکی زۆری هەیەو نەمرەو هەمیشە تەمەنی بیست ساڵە.

لاوەکە دەستی بڵند کرد تا سمێڵی بابدات، بەڵام سمێڵی نەبوو، جارێکی تر گوڕاندی: لێده، فانوریو، لێده، ئەگینا دەتەقم.

چەنگ لێدەرەکە باڵی ڕاوەشاند، دەنگی ئامێرەکە بەرز بووەوە، ژێیەکان تاویان سەند، لاوەکە بازرەقەی بەست و سێجار لەهەواداو بەبەرزی باڵای یەکێك پێی پێکداداو، بەنووکی پێڵاوەکەی دەستە سڕەکەی سەری ئەوەی لەپاڵیدا بوو مانولاکاس—ی پاسەوانی دارستانەکەی لەسەری کردەوە.

هەموو قریوەیان لێ هەستا: ئافەرین سیفاکس.. کچان مووچڕکیان پیاهات و سەریان داخست.

بەڵام لاوەکە هێدی هێدی و بێ ئەوەی سەیری کەس بکات، دەستی نابوە سەر کەمەری توندو باریکی و چاوی شەرمی لەزەوییەکە بڕیبوو هەر هەڵدەپەڕی.

لەپڕا هەڵپەڕکێکە وەستا، ئاندرولیو[١٥٨]ی نۆکەری پیری کڵێسا، لەکاتێکدا کە هەردوو دەستی بەرەو ئاسمان بەرزکردبووەوەو بەڕاکردن دەهات بەزمانی تێکەڵو پێکەڵەوە هاواری دەکرد:

—بێوەژنەکە ، بێوەژنەکە، بێوەژنەکە.

---

[١٥٨] Androulio

یەکەمین کەس کە شاییەکەی تێکداو بەرەو ڕووی چوو مانولاکاسی پاسەوانی دارستانی گوند بوو، لە گۆڕەپانی گوندەوە، کڵێساکە کە هێشتا بەچڵی مۆردو غار ڕازا بووەوە لەدامێنەوە دەبینرا، سەماکەران کە خوێن بەری چاوی گرتبوون وەستان‌و، پیرەکانیش لەسەر کورسیەکانیان ڕاست بوونەوە. فانوریو چەنگەکەی لەسەر ئەژنۆی ڕاکێشا، گوڵی سووری جەژنی پاکی لەپشت گوێی کردەوەو بۆنی کرد.

هەموویان لەحاڵێکدا کە ڕق بەجۆشی هێنابوون هاواریان کرد:

-لەکوێیە؟ ئاندرولیو، لەکوێیە؟

لەکڵێسایە، نەفرەت لێکراوە بە با قەیەك گوڵە لیمۆوە هاتۆتە ناو کڵێساوە.

پاسەوانەکە کەوتە پێش‌و بانگی کرد: کوڕینە، بابڕۆین.

لەوکاتەدا بێوەژن کە دەسماڵێکی ڕەشی بەسەریدا دابوو لەبەردەرگای کڵێساکەوە دەرکەوت‌و نیشانەی خاچی کێشا.

لەگۆڕەپانەکەوە کۆمەڵێك دەنگ کردیانە هەرا!

-بەدبەخت! قەحبە، تاوانبار: بە چ ڕوویەکەوە هاتۆتە دەرێ!

سۆزانیە ئابڕوی گوندی بردوە.

هەندێك بەدوای پاسەوانەکەدا بەرەو کڵێسا چوون‌و، هەندێکیش لەسەرەوە کەوتنە بەرد باران کردنی، بەردێك بەرشانی ژنەکە کەوت، هاواری لێ هەستا، بەهەردوو دەستی دەم‌و چاوی گرت، لەکاتێکدا کە خۆی چەماندبووەوە هەنگاوی بەرەو پێشەوە نا تاهەڵبێت، بەڵام تازە لاوەکان گەیشتبوونە بەردەم کڵێساکەو مانولاکاس چەقۆی هەڵکێشابوو.

بێوەژن کەلەترسا کەوتبوە قیژەو هاوار بۆدواوە گەڕایەوە، خۆی کووڕ کردو بەدەم کەوتن‌و هەستانەوەوە بەرەو کڵێسا هەڵات تا لەوێدا خۆی پەنا بدات، بەڵام لەوێ، لەبەردەرکی کڵێسادا، ماڤراندونی پیر وەستابوو، هەردوو دەستی کردبوە خاچ‌و دەرگاکەی پێ گرتبوو.

بێوەژن بازێکی بەرەو لای چەپداو قەدی دار سەروێکی گەورەی ناو مەیدانەکەی لەباوەش گرت، بەردێك لەهەوادا وژەی هات، بەر سەری کەوت‌و دەسماڵەکەی کەوتە خوارێ، قژی کرایەوەو ڕژایە سەرشانی.

دار سەروەکەی توند لەئامێز گرتبوو هاواری دەکرد:

–بۆ خاتری خوا، بۆ خاتری خوا.

کچەکان لەسەرەوە، لەناوەڕاستی مەیدانەکەدا بەڕیز وەستابوون‌و گۆشەیەکی سەرپۆشە سپیەکەیان بەددانیان گرتبوو، بەپەرۆشەوە لەدیمەنەکەیان دەڕوانی، پیرێژنەکان کە بە دیوارەکانەوە قرسابوون هاواریان دەکرد: بیکوژن، دەی بیکوژن.

دووگەنج پەلاماریان داو گرتیان، فانیلە ڕەشەکەی دڕاو مەمکە سپیەکانی کە دەت وت بەفرن بریسکانەوە، خوێن لە تەپڵی سەریەوە بەتەوێڵ‌و گۆناو گەردنیا دەهاتە خوارێ.

بەدەم هانکە هانکی ماندوبوونەوە هەر هاواری بوو:

–بۆ خاتری خوا!

ڕژانی خوێن‌و بریسکەی مەمکەکانی لاوەکانی هێنابوە جۆش.

چەقۆکانیان لەپشتێنەکانیان کردەوە.

مانولاکاس هاواری لێ کردن: دەست ڕابگرن، ئەمە هی منە. ماقراندونی کە پێش دەرگای کڵێساکەی گرتبوو دەستی بەرزکردەوە، هەموو دەستیان ڕاگرت، بەدەنگێکی قەبەوە وتی:

–هێی! مانولاکاس ، خوێنی ئامۆزاکەت هاوارت لێ دەکات، دەی ئاسوودەیکە.

من لەسەر دیوارێکەوە کەخۆم چو بوومە سەری بازمدا، هاتمە خوارێ‌و خێرا بەرەو کڵێساکە چووم، پێم لەبەردێك هەڵکەوت‌و بەدەما ڕەهێڵ بووم.

لەوکاتەدا سیفاکاسی شوان بەوێدا هات، چەمایەوەو وەك چۆن لەپشتی پشیلەیەك دەنەوێن ئاوا پشتی گرتم‌و خستمیە سەر پێ، وتی:

هەستە، شلە شاری، تۆ چیت لەم گێژاوە داوە؟ بڕۆ بەلای کاروباری خۆتەوە.

پێم وت: سیفاکاس تۆ دڵت بەو ژنە ناسوتێت؟ بەزەییت پیایدا نایەتەوە؟

کێویە پێکەنینێکی وەحشیانەی کردو وتی:

–من ژن نیم تا دڵم بسوتێت! من پیاوم.

بەچەند قەڵەم بازێك خۆی گەیاندە مەیدانی دەوری کڵێساکە، منیش کەوتمە دوای، بەڵام هەناسەم لێ بڕابوو.

ئێستا بەهەموو دەوری بێوەژنیان گرتبوو، بێدەنگیەکی کڕ ئەو ناوەی داگیرکردبوو، بێجگە لەهەناسە برکێی قوربانیەکە چ دەنگێکی تر نەدەهاتە گوێ.

مانولاکاس نیشانەی خاچی کێشا، هەنگاوێك چوە پێشێ‌و چەقۆکەی بەرزکردەوە، پیرێژنەکان لەسەرەوەو بەسەر دیوارەکانەوە لەخۆشیا کەوتبوونە قاژوقیژ، کچەکانیش دەسماڵەکانیان کێشایە خوارێ‌و دەم‌و چاوی خۆیانیان پێ داپۆشی

بێوەژنەکە سەری بەرز کردەوە، دەمی چەقۆکەی بەسەر سەری خۆیەوە بینی، ناڵەیەکی لێوەهات هەر لەناڵەی پارێن دەچوو. لەبن دار سەروەکەدا کەوت‌و سەری نایە نێوان هەردو شانیەوە، زوڵفی سەر زەویەکەی داپۆشی‌و لەدواوە گەردنە سپیەکەی بریسکایەوە.

ماڤراندونی پیر دەنگی هەڵبڕی‌و وتی: من چاوەڕێی دادپەروەری خوام. نیشانەی خاچیشی کێشا

هەر لەو چرکە ساتەدا لەدوامانەوە دەنگێکی قەبە بەرزبوەوە:

–چەقۆکەت دابنێ، مرۆڤ کوژ.

هەموو بەسەرسامی ئاوڕمان دایەوە، مانولاکاس سەری بەرزکردەوە، زۆربا بەرانبەری ڕاوەستابو، لەڕقا بازووی بەم لاو ئەولادا هەڵدەسوڕاند، هاواری کرد:

–پێم بڵێن ئێوە شەرم‌و حەیاتان نیە؟ ئەمە چ ئازایەتیەکە بۆ کوشتنی ژنێك هەموو خەڵکی گوندێك کۆببنەوە؟ نەکەن ئابڕوی کریت بەرن.

ماڤراندونی گوراندی:

–زۆربا، تۆ بڕۆ بەپەی کاری خۆتەوەو خۆت لەئیشی ئێمە هەڵمەقورتێنە.

ڕووی لەبرازاکەی کردو دیسانەوە پێی وت:

–دەی مانولاکاس، بەناوی مەسیح‌و مریەمی پاکیزەوە، بیوەشێنە. مانولاکاس ڕاپەڕی، بێوەژنی گرت‌و دای بەزەویدا، ئەژنۆی لەسەر سکی داناو چەقۆکەی هەڵبڕی، لەچاوتروکانێکدا زۆربا قۆڵی مانولاکاسی گرت‌و هەربەو جۆرەی کە دەستە سرە گەورەکەی لەدەوری دەستی خۆی ئاڵاندبوو هەوڵیدا چەقۆکەی لە دەست دەر بهێنێت.

بێوەژن کەوتە سەر ئەژنۆو بۆ ڕاکردن سەیری ئەملاو ئەولای خۆی کرد، بەڵام دێهاتیەکان بەردەمی دەرگاکەیان گرتبوو، لەدەوری حەوشەو لەسەر کورسیەکان ئەڵقەیان بەستبوو، کە بینیان بێوەژن بەتەمای هەڵهاتنە هەنگاوێکی دی هاتنە پێشێو ئەڵقەکەیان تەنگتر کرد.

لەومیانەیەدا، زۆربا هێورو چالاکو بڕوا بەخۆو خوێن سارد لە شەڕدا بوو، من کە لەنزیك دەرگاکەوە وەستابووم بەنیگەرانیەوە تەماشای ئەنجامی شەڕەکەم دەکرد. دەمو چاوی مانولاکاس لەڕق شین ببوەوە، سیفاکاسو چەتەولێکی دی هاتنە پێشەوە بۆ ئەوەی یارمەتی پاسەوانەکە بدەن، بەڵام مانولاکاس زۆر بەتووڕەیی چاوی سووڕاندو تێی خوڕین:

—بۆ دواوە، بۆدواوە، کەس نزیك نەکەوێتەوە.

جارێکی تر بەرکەوە پەلاماری زۆربای دایەوەو وەك گا کەوتە سەرهاوێشتن. زۆربا بێ ئەوەی هیچ بڵێت لێوی خۆی گەست، بازوی ڕاستی پاسەوانی باداو بۆ ئەوەی خۆی لەسەر هاویشتنەکەی رزگار بکات لەشی بەلای ڕاستو چەپدا نوشتاندەوە، مانولاکاس کە قین شێتی کردبوو هەڵبەزیەوەو گوێچکەی زۆربای بەدەما بردو بەهەموو هێزی گازی لێ گرت. خوێن لە گوێچکەوە فیچقەی کرد.

من ترسامو هاوارم کرد: زۆربا. چوومە بەرەوە تا کۆمەکی بکەم، ئەو بەدەنگی بەرز وتی: بڕۆ ئەولاوە، سەرۆك، تۆ هەقت نەبێت.

زۆربا مشتێکی توندی بەژێر سکی مانولاکاسدا کێشا، ئەو کێویە یەکسەر بەریداو ددانی لێك کرانەوە، گوێی زۆربا کەتانیوەی بڕابوو بەربوو، ڕەنگی شین هەڵگەڕاوی گۆڕا، زۆربا کتو پڕ وای لێدایەوە لەسەر زەویەکە خستی، چەقۆکەی لەدەست سەندو کردی بەدوو کەرتەوە.[١٥٩] بەدەستە سڕەکەی خوێنی گوێچکەی سڕی، دەمو چاوە ئارەقاویەکەیشی پی وشك کردەوەو هەموو دەمو چاوی بوو بەخوێن، ئینجا خۆی ڕاست کردەوەو تەماشای ئەملاو ئەولای کرد، چاوی ئاوساوو سووڕ داگەڕا بوون، بەدەنگی بەرز بەبێوەژنەکەی وت:

—هەستەو لەگەڵمدا وەرە.

---

[١٥٩] لەدەقە ئینگلیزیەکەیدا دەڵێت: (..بەرەو دیواری پشتەوەی کڵێساکە تووڕیدا)

بەرەو دەرگای حەوشی کڵێساکە کەوتە ڕێ.

بێوەژن هەستا، بۆ ڕۆیشتن هەموو توانای خۆی بەکاربرد، بەڵام دەرفەتی نەبوو، ماقراندونی پیر وەك هەڵۆی ڕاو پەلاماری ژنەکەی داو لەسەردەم بەزەویدا کێشا، پرچە درێژو ڕەشەکەی سێجار بەدەوری دەستی خۆیدا باداو بەزەبری چەقۆیەك سەری بڕی و هاواری کرد:

-من ئەم تاوانە لەئەستۆی خۆم دەگرم.

سەری قوربانیەکەی فڕێدایە بەر دەرکی کڵێساکەو پاشان نیشانەی خاچی کێشا.

زۆربا سەری وەرگێڕا، کە ئەم دیمەنە سامناکەی بینی مشتێك لەسمێڵی خۆی ڕنیەوە، من چووم بەلایەوەو قۆڵم گرت، ئەو سەری لارکردەوەو چاوی تێ بڕیم، دوو دڵۆپ فرمێسکی گەورە بەلای پێڵوەکانیەوە قەتیس مابوون.

بەدەنگێکی نزم وتی: بابڕۆین، سەرۆك.

زۆربا ئەوشەوە هیچی نەخواردو نەخواردەوە، دەی وت:

((رق گەرووی گرتم و هیچی پیا ناچێتە خوارێ)) گوێی بەئاوی سارد شت، پارچەیەك لۆکەی لە ئارەق هەڵکێشاو برینەکەی پێ بەست، لەسەر دۆشەکەکەی دانیشتبوو، سەری نابوە نێو هەردو دەستی و بیری دەکردەوە.

لەسەر زەویەکە پاڵ کەوتبووم و پاڵم دابوە دیوارەکەوە، هەستم دەکرد لەسەرخۆ فرمێسکی گەرم بەگۆنامدا دێتە خوارێ، مێشکم کاری نەدەکردو بیرم لای هیچ نەبوو، وەك گیرۆدەی خەمێکی منداڵی قووڵ هاتبم، دەگریام.

لەپڕا زۆربا سەری بڵند کردو وەك تەرەقە تەقیەوە، دەستی بەهاوار کردو قسەکانی ناوەوەی خۆی خستە سەر زمانی.

-من پێت دەڵێم، سەرۆك، هەرچیەك لەم دنیایەدا ڕوودەدات ناعەدالەتیە، ناعەدالەتی، ناعەدالەتی. منی کرمی خاك، منی زۆربای هێلکە شەتانۆکە بەمە قایل نیم، بۆ دەبێت لاوەکان بمرن و ئەم کەوڵە کۆنانە بمێنن؟ بۆ دەبێت منداڵی بچووك بمرێت؟

من کوڕێکم هەبوو، دیمتری چکۆڵەم، لەتەمەنی سێساڵیدا مرد، هەتاماوم، گوێت لێمە؟ هەتا ماوم لەو زوڵمەی خوا خۆش نابم، ئەو ڕۆژەی دەمرم، ئەگەر خوا ڕووی ئەوەی

ئەگەر خوایەکی ڕاستی بێت دەبێت لەتەریقیا ببێت بەئاو، دەبێت خۆیم بۆ دەربخات، بەڵێ، ئەو بەرانبەر بەمن، منی منی هێلکە شەیتانۆکە زۆربا ناو، تەریق دەبێتەوە.

وەك ئازارێکی هەبێت دەمو چاوی تێك چوو، دیسان خوێنی زامەکەی بەربوو، بۆ ئەوەی هاوار نەکات لێوی خۆی گەست.

وتم: زۆربا ئارامبە، من ئێستا برین پێچەکەت دەگۆڕم.

جارێکی تر گوێچکەیم بەئارەق شت، شووشە گوڵە پرتەقاڵەکەم کە بێوەژنەکە بۆی ناردبووم و لەسەر قەرەوێڵەکەم دۆزیمەوە هەڵم گرت و کەمێك لۆکەم پێ تەڕکرد.

زۆربا کە زۆر بەتاسەوە بۆنی دەکرد وتی:

–گوڵاوی پرتەقاڵ؟ بەه بەه، گوڵاوی پرتەقاڵ؟ بیکە بەقژیشمەوە. ئاوا، زۆرباشە، بیکەرە ناو دەستیشمەوە هەمووی تێکە، دەی.

زۆربا گەڕبوەوە نێو جەگەی ژیان، من مات و سەراسیمە تەماشام دەکرد، وتی:

–واهەست دەکەم دەچمە نێو باخی بێوەژنەکەوە.

دەستی کردەوە بەناڵەو زاری، لەبەرخۆیەوە وتی:

–چەندان ساڵ، چەندان ساڵی پێچوە تا زەوی توانیویەتی لەش و لارێکی وا دروست بکات؟ هەرکەسێ سەیری بکردایە بەخۆی دەوت: ((ئاه! خۆزگا من تەمەنم بیست ساڵ بوایە، بە تەنیا لەگەڵیا بژیامایەو منداڵمان ببوایەو دنیامان پڕکردایە، ئەویش نەك منداڵ، بەڵکوو خوای ڕاستەقینە)) بەڵام تازە..

بەرزە پێ هەستا، چاوی پڕببوون لە فرمێسك، وتی:

–سەرۆك، من ناتوانم، خۆم ناگرم، دەبێت بڕۆم، دەبێت ئەمشەو دووسێ جار بەکێودا هەڵگەڕێم و بێمەوە خوارێ، بۆ ئەوەی ماندو بمو کەمێك هێور ببمەوە، ئاخ، ئەی بێوەژنی نازدار، حەزم لێیە شیوەنێکت بۆ بگێڕم.

چوە دەرێ، ڕووی لە چیا کردو لەتاریکیا لەچاو ون بوو.

لەسەر قەرەوێڵەکەم ڕاکشام، چراکەم کوژاندەوە، جارێکی تر، هەر بەو نەریتە ناشیرین و نامرۆییەی خۆم کەوتمەوە گۆڕینی واقیع و داماڵینی لەخوێن و گۆشت و ئێسقان و گۆڕینی بۆ بیرۆکەیەکی ڕووت و، بەستنەوەی بەیاسا گشتیەکانەوە تا گەیشتمە ئەو

ئەنجامە نەفرەت لێ کراوە کە هەرچی ڕووی داوە زەرورەتی خۆی هەبوەو، لەوەیش زیاتر، بۆ سەقام گیربوون‌و هاوسەنگی ڕاگرتنی دنیا بەکەڵکیش بوە. لەدواجاریشدا گەیشتمە ئەو خۆ تەفرەدانە پۆخڵ‌و درێوەی کە هەرچی ڕووی داوە هەق بوەو دەیشبوو ڕوویدات.

سەربڕینی بێوەژن لە کەللەی دام، سەرم. کە کوورە هەنگێك بوو ساڵانێك هەموو ژەهرەکانی تیا دەگۆڕا بەهەنگوین ئاوەژوو بوو، بەڵام دەم‌و دەست فەلسەفەکەم ئەم ئاگادارکردنەوە ترسناکەی قۆستەوە، بەکۆمەڵێك وێنەو فڕوفێڵیەوە پێچاو جووڵەی لێ بڕی، مێش هەنگەکانیش کەزەردەواڵەیەکی برسی بۆ تاڵان کردنی هەنگوینەکەیان خۆ بەکورەکەیاندا دەکات هەر ئاوا لەمۆمەکەیەوە دەپێچن.

دوای چەند سەعاتێك، بێوەژن ببوە سەمبولێك‌و ئارام‌و دەم بەپێکەنین لەیادوەریمدا قەراری گرتبوو، لەناو دڵما خۆی پێچابوە مۆمێکەوەو ئیتر نەی دەتوانی لەمندا ترسێك دروست بکات‌و مێشکم بۆ خۆی بەرێت. ڕووداوە ترسناکەکەی ئەو ڕۆژە دەکشاو لەکات‌و شوێندا بڵاو دەبوەوە. لەگەڵ ئەو شارستانیە گەورانەدا کە لەناو چوون یەکسان دەبوو، شارستانیەتەکان لەگەڵ چارەنووسی زەویدا دەبوونە یەك‌و زەوییش لەگەڵ چارەنووسی دنیادا– هەر بەو جۆرە، کە دەگەڕامەوە لای بێوەژن، بەمل کەچ‌و گوێ ڕایەڵی یاسا گەورەکان دەم بینی، هێورو بێ جووڵە لەگەڵ بکوژەکانیدا ئاشت دەبوەوە.

زەمان لە وجودی مندا مانا ڕاستەقینەکەی خۆی دۆزیبوەوە، بێوەژنەکە، هەزاران ساڵ پێش شارستانیەتی (ئیجە)[١٦٠] مردبوو، چانی کنوسوسیش[١٦١] بەزوڵفی لوولیانەوە، هەر ئەم بەیانیە لەپاڵ ئەم دەریا دەم بەپێکەنینەوە مردبوون.

---

[١٦٠] Egeenne مەبەست شارستانیەتی ئەو گەلانەیە کە دانیشتوی خۆرهەلاتی دەریای ناوەڕاستبوون‌و لەدوورگەکانی یۆنان‌و کەنارەکانی دەریای ئیجەو بەتایبەتی دوورگەی کریت‌و پلوپونزادا فراوان بوون. و.ف

[١٦١] Cnossos پایتەختی کریتی کۆنە کە لە دووهەزار ساڵی پێش زایندا ناوبانگی زۆر بڵاو بوە، بارەگای شا شامینوس بوە. لەکۆتایی سەدەی نۆزدەدا بەهۆی هەڵکەندنی زۆرەوە شوێنەواری کۆن‌و بەنرخی شارستانیەتی مینوینی تیا دۆزرایەوە. و–ف

خەو بردمیەوە، وەك چۆن ڕۆژێك لەڕۆژان مەرگیش ئەوە دەكات— جا چ شتێك لەوە حەقیقەت تر.؟ من لەسەر خۆ كەوتمە ناو تاریكستانەوە، نازانم زۆربا كەی گەڕاوەتەوە یان هەر گەڕاوەتەوە یان نا! بەیانی بەسەر كێوەكەوە بینیم كە هاواری دەكردو بەسەر كرێكارەكاندا دەی شیڕاند.

ئەو كارانەی كرێكارەكان ئەنجامیان دابوو هیچی بەدڵ نەبوون، سێ كرێكار كەسەرپێچیان لەڕوویدا كردبوو دەری كردن، خۆی قازمەی لەدەست گرتو كەوتە كردنەوەی ڕێگایەك كە بۆ هەڵگرتنی دار مێخەكان لەناوەڕاستی بۆتەی دڕكو بەردەكاندا نیشانە كرابوو. بەكێوەكەدا سەركەوت، داربڕەكان بینی دار سنەوبەرەكانیان دەبڕیەوە، بەگژیاندا چوو، یەكێكیان بەتەوسەوە پێكەنیو لەژێر لێوەوە من منێكی كرد، زۆربا پەلاماری دایە.

لەخۆرئاوادا شەكەتو ماندو بەجلی دڕاوەوە هاتە خوارێو لەكەنار دەریاكە لەپاڵما دانیشت، بەزەحمەت دەیتوانی دەمی بكاتەوە، كە كەوتە قسەكردن وەك بەڵێن دەرێك كە دەیەوێت بەپەلە ناوچەكە سەروبن بكات تا تا كەمترین كاتدا زۆرترین قازانج بكاتو پاشان بڕوات، هەر ئاوایش زۆربا سەری زمانو بنی زمانی بریتی بوو لە باسی داری خانوو سیمو خەڵوزی لینیت.

لە چركە ساتێكدا كە من ئاسودەییم تێ گەڕابوو ویستم دەربارەی بێوەژنەكە قسە بكەم، كەچی زۆربا دەستە زلەكەی درێژكردو نایەسەر دەمم، بەدەنگیكی نزم وتی: بێدەنگبە.

من شەرم دای گرتمو بێدەنگ بووم، لەكاتێكدا كە ئێرەییم بەدەردو ئازاری زۆربا دەبرد بەخۆم وت:

(ئەمەیە پیاوی ڕاستەقینە، پیاوێكی خوێن گەرم، ئێسك پتەو، كە خەم دای دەگرێت فرمێسكی درشتی ڕاستەقینە دەڕژێت، كە شادیش دەبێت نایەوێت شادمانیەكەی لەبێژنگی بیروباوەڕە میتافیزیكیەكان بدات.)

سێ چوار ڕۆژێك بەو جۆرە تێپەڕی، زۆربا بێ ئەوەی هەودا بداتو بخواتو بخواتەوە بەردەوام كاری دەكرد، سەرگەرمی چەقاندنی دارمێخەكان بوو، شەوێك پێم وت خاتوو

بوبولینا هێشتا نەخۆشەو پزیشکیش نەهاتۆتە سەری، بێچارەیە ورێنە دەکاتو هەمیشە ناوی تۆی لەسەر زمانە.

دەستی گرمۆڵە کردو وتی: زۆر باشە.

لەبەرە بەیانی رۆژی ئایندەدا چوو بۆ گوندو زوویش گەڕایەوە.

پرسیم: بینیت؟ چۆن بووم؟

وتی: هیچی نیە، دەمرێت.

بەهەنگاوی فراوان بەرەو چیاکە بوەوە.

هەر ئەوشەوە، بێ ئەوەی شێوبکات، داردەستەکەی هەڵگرتو چوە دەرەوە، لێم پرسی: بۆ کوێ دەڕۆیت زۆربا؟ بۆ گوندەکە؟

–نا، دەڕۆم پیاسەیەك دەکەم، زوو دێمەوە

بەهەنگاوی فراوان بەرەو گوندەکە پێی لێ داگرت.

من ماندو بووم‌و چوومە ناو جێ، دیسان مێشکم کەوتەوە گەڕان بەدنیادا، یادوەریەکان هاتنەوە بەرزەینم، خەمەکان گەڕانەوە، خەیاڵم بەسەر دوورترین بیرۆکەدا فڕیو لەدواییدا دیسان بەسەر زۆرباوە نیشتەوە، لەگەڵ خۆمدا بیرم کردەوە: ((بەڕاست ئەگەر زۆربا لەرێگادا تووشی بەتووشی مانولاکاسەوە بێت، ئەو دێوە کریتیە، ئەو شێتە ڕق ئەستوورە پەلاماری زۆربا دەدات. دیارە لەماوەی ئەم چەند رۆژەدا هەر لەماڵەوە ماوەتەوەو خۆی خواردۆتەوە، شەرم دەکات لەناو دێدا دەربکەوێت بەڵێنی داوە ئەگەر زۆربای دەست بکەوێت ((وەك ماسی ساردین پارچە پارچەی بکات)) دوێنێ شەو، لەنیوەی شەودا یەکێك لەکرێکارەکان دیویەتی بەچەکەوە بەدەوری کوختەکەماندا گەڕاوە، ئەگەر ئەم ئێوارەیە ئەم دوانە رێکەوتی یەکدی بکەن خوێن دەڕژێت)).

ڕاپەڕیم‌و لەجێگاکەم هەستام، جلم لەبەرکردو بەپەلە رێگای ئاواییم لەبەرگرت. شەو هێورو شێدارو بۆنی شەوبۆی لێ دەهات، دوای کەمێك، لە تاریکیدا زۆربام بینی وەك مرۆیەکی ماندو هێواش هێواش دەڕۆیشت، جار جارێك دەوەستا، تەماشای ئەستێرەکانی دەکردو گوێی دەگرت، پاشان خێراتر دەکەوتەوە ڕێ، من گوێم لەدارەکەی دەستی بوو کەبەر بەردەکان دەکەوت.

لە باخی بێوەژن نزیك کەوتەوە، هەوا بۆنی لیمۆو لاولاوی لێ دەهات، لەوکاتەدا، لەپاڵ دارنارنجەکانی نێو باخەکەوە، دەنگی دڵنەوازی هوزار، وەك خورەی ئاوی شیرین بەرز بوەوە، هوزار لەتاریکیەکەدا دەی خوێندو دەی خوێندەوە، بەجۆرێك کەهەناسەی لەسنگی مرۆڤدا گیردەدا. زۆربایش کە ئەو هەموو هەوا خۆش‌و بێگەردە هەناسەی بەگیرهێنابوو یەکسەر وەستا.

لەناکاوێکدا قامیشە پەرژینەکانی باخەکە جووڵان‌و لەگەڵا تیژەکانیانەوە دەنگێك هات کە لەدەنگی دەمی تیژی پۆڵا دەچوو.

دەنگێکی ڕقاوی‌و ناخۆش بەرزبوەوە:

–هێی، کابرا، پیرەمێردی خەڵەفاو، ئاخری هاتیتە بەردەستم.

من لەجێگاکەمدا وشك بووم، دەنگەکەم ناسی.

زۆربا هەنگاوێك چوە پێشەوە، دارەکەی دەستی بەرزکردەوەو پاشان وەستا، من لەبەر ڕووناکی ئەستێرەکاندا هەموو جم‌و جووڵەکەیم دەبینی.

گەنجێکی زەلام بەبازێك لەناو قامیشەکانەوە هاتە دەرەوە، زۆربا ملی درێژ کردو هاواری لێ کرد: تۆ کێیت؟

–من، مانولاکاسم.

–ڕێگای خۆت بگرەو بڕۆ.

–تۆ ئابڕوی منت بردوە زۆربا.

–من ئابڕوی تۆم نەبردوە، مانولاکاس، پێم وتیت بڕۆ بەپەی کاری خۆتەوە. تۆ کوڕێکی بەتوانایت، بەڵام بەخت یاری نەکردیت، بەخت کوێرە، بۆ تۆ ئەمە نازانیت؟

مانولاکاس (من گوێم لەدانە جیڕەی بوو) وتی:

–بەخت یان بێ بەختی، کوێر یان چاوساغ، دەبێت من ئەو پەڵەی خەوشە بشۆرمەوە، هەر ئەمشەویش، تۆ چەقۆت پێیە؟

زۆربا وەڵامی دایەوە: نا، من ئێرە تەنیا ئەم داردەستەم پێیە.

زۆربا لە جێگاکەی نەجووڵا.

دەنگی گاڵتە پێکردنی مانولاکاس بەرز بوەوە کە وتی:

-دەترسیت؟ پێم وتیت برۆ، دەی.

زۆربا کە کەم کەم تووڕەیی سەری لێ دابوو وتی:

-چەقۆم بۆچیە، هاوڕێ؟ چی لە چەقۆ بکەم؟ لەبیرتە لەکڵێسا کە تۆ چەقۆت پێبوو من هیچ، وانیە؟ لەگەڵ ئەوەیشدا وابزانم فریایخۆم کەوتم.

مانولاکاس گوڕاندی:

-ها، هێشتا گاڵتەم پێ دەکەیت؟ تۆ بۆ ئەم کارە کاتێکی خراپت هەڵبژاردوە. چونکە من چەکدارمو تۆ نا، برۆ چەقۆکەت بێنە، مەکدۆنی پیس، با دەستو پەنجەیەك پێکەوە گەرم بکەین.

زۆربا لەداخا دەنگی لەرزیو پێی وت:

-تۆ چەقۆکەت فرێ بدەو منیش دارەکەم، ئەوسا پێکەوە دەستو پەنجەیەك گەرم دەکەین، دەی کریتی پیس.

زۆربا دەستی هەڵێناو دارەکەی فرێدا، من لەناو قامیشەکاندا گوێم لەدەنگی داکەوتنی بوو.

دیسان زۆربا هاواری کرد: چەقۆکەت فرێدە.

من بەهێواشیو لەسەر نووکی پێ نزیك کەوتبوومەوە، لەبەر ڕوناکی ئەستێرەکاندا توانیم بریسکەی چەقۆکە ببینم کە ئەویش کەوتە ناو قامیشەکانەوە.

زۆربا تفی لەناو دەستی خۆی کرد، وەك سەرەتای خۆ ئامادەکردن هەڵبەزەیەکی کردو وتی: یاالله، وەرە پێشێ.

مانولاکاسیش تەکانێکی بەخۆی داو گوڕەیەکی کرد.

بەڵام پێش ئەوەی دەستیان بەیەکتری بگات من خۆم خستە ناوەڕاستیانو بەسەریاندا خوڕیم:

-بوەستن، تۆ، مانولاکاس، وەرە ئێرە، تۆیش زۆربا وەرە، شەرم ناکەن؟

دوو نەیارەکە هێدی هێدی لەیەکتر نزیك کەوتنەوە. دەستی ڕاستی هەردوکیانم گرتو وتم:

—دەست بدەنە یەكدی، ئێوە هەردوكتان دوو مرۆی چاكو ئازان، لەگەڵ یەكتردا ئاشت بینەوە.

مانولاكاس لەكاتێكدا كە هەوڵی ئەوەی بوو دەستی بكێشێتە دواوە وتی:

—ئەو ئابڕوی منی بردوە...

وتم: مانولاكاسی ئازا، كەس ناتوانێت بەئاسانی ئابڕووی تۆ بەرێت، خەڵكی گوند هەموو دەزانن تۆ كوڕێكی ئازاو دلێریت، ئیتر بیر لەڕووداوەكەی ئەو ڕۆژەی كڵێسا مەكەرەوە، ئەوە ساتە وەختێكی شووم بوو تێپەڕی‌و تەواو بوو، لەلایەكی ترەوە، لەبیرت نەچێت كە زۆربا پیاوێكی ئاوارەی خەڵكی مەكدونیایە، لای ئێمەی كریتی زۆر شوورەییە دەست لەڕووی میوانێكدا بەرز بكەینەوە كە هاتبێتە وڵاتەكەمانەوە.. دەی... دەستت بێنە ئەمەیان جوامێریەكی ڕاستەقینەیە، پاشان دەڕۆینە كۆختەكە، جامێك شەراب دەخۆینەوەو مەترێك سوسیسیش دەبرژێنین تا پەیوەندی‌و هاوڕێیەتیمان كۆكتر بێت، بەڵێ، مانولاكاسی دلێر.

كەمەری مانولاكاسم گرت، كەمێك دوورم خستەوە، بەگوێیدا چرپاندم:

—لەبیرت نەچێت كە ئەوپیرە، جوان نیە بۆ لاوێكی بەهێزی وەك تۆ لەگەڵ ئەودا تێ بكەوێت.

مانولاكاس خاو بوەوەو وتی:

—باشە، لەبەرخاتری تۆ وازی لێ دێنم.

هەنگاوێكی بەرەو لای زۆربا ناو دەستە گەورەو گرانەكەی هێنایە پێشێ، وتی: ها، هاوڕێ زۆربا، ئەوەی چوو چوو، دەستت بێنە.

زۆربا وتی: تۆ گوێی منت بریندار كرد، خوا لێت خۆش بێت، باشە، ئەوە دەستم.

هەردووكیان ماوەیەكی زۆر دەستی یەكتریان گوشی، هەرتوندتر دەیان گوشی‌و لەیەكدی ڕادەمان، من ترسام نەكا پەلاماری یەك بدەنەوە.

زۆربا وتی: تۆ زۆر توند دەست دەگوشیت، مانولاكاس، دیارە مرۆیەكی بەهێزو توانایت.

—تۆیش هەر وایت، ئەگەر دەتوانیت با لە سەردەست گوشین بەردەوام بین.

هاوارم لێ کردن: بەسە بابڕۆین هاوڕێیەتیەکەمان بەشەراب تێر ئاوبکەین.

من لەناوەڕاستا بووم، زۆربا لای ڕاستو منو مانولاکاس لای چەپەوەو، گەڕاینەوە کۆختەکەی کەنار دەریامان.

بۆ گۆڕینی باسەکە وتم: ئەمساڵ دەغڵو دان باش دەبێت.. باران زۆر باریوە. بەڵام هیچ کامێکیان وەڵامیان نەدامەوە، هێشتا قینێکیان هەر تیا مابوو.

هەموو ئومێدێکی ئایندەم بەشەراب بوو، گەیشتینە کوختەکە، وتم: مانولاکاسی ئازا، خۆش هاتیت بۆ کوختەکەمان، تۆ، زۆربا، سوسیسەکان ببرژێنەو شەرابێك بێنە.

مانولاکاس لەبەردەم کوختەکەدا لەسەر بەردێك دانیشت، زۆربا گوزەیەك سپیداری هەڵگرت، سوسیسەکانی برژاندو سێ پێك شەرابی تێکرد.

من پەرداخەکەمم بەرز کردەوەو وتم:

–بەخۆشی هەردووکتان، بەخۆشی تۆ، مانولاکاسی ئازا، بەخۆشی تۆ، زۆربا، پێکەکانتان لێك بدەن.

هەردووکیان پەرداخەکانیان بەرز کردەوەو لێکیان دان، مانولاکاس چەند دڵۆپێك شەرابی ڕژانە سەر زەویەکەو بەدڵنیاییەوە دووجار وتی:

–وەك ئەم شەرابە خوێنم برژێت ئەگەر هەرگیز لەڕووی تۆدا دەست بەرز بکەمەوە، زۆربا.

زۆربایش چەند دڵۆپێکی ڕژانە سەر زەویەکەو وتی:

–خوێنی منیش وەك ئەم شەرابە برژێت ئەگەر ئەو گوێچکەیەم کە تۆ بریندارت کردەوە تا ئێستا لەبیرخۆم نەبردبێتەوە، مانولاکاس.

## -٢٣-

لەسپێدەدا زۆربا هەستا، لەسەر قەرەوێڵەکەی دانیشتو ئێمەی هەستاند:

-خەوتوویت، سەرۆک؟

-چی هەیە، زۆربا؟

-خەوم دیوە، خەوێکی سەیر! وابزانم زۆری پێ ناچێت سەفەرێك دەکەین، گوێ بگرەو پێ بکەنە، لێرە، لەبەندەرەکەدا، کەشتیەکی گەورەی بەقەدەرشارێك وەستابوو، شووتی لێدەداو ئامادەی ڕۆیشتن بوو، منیش بەڕاکردن لە گوندەکەوە دەهاتم کەپێی بگەم، تووتیەکم بەدەستەوەبوو، گەیشتمو سواری کەشتیەکە بووم، بەڵام کەشتیەوانەکە هاتو بەسەرما نەڕاندی: ((بلیت! من پڕ مشتێك پارەی کاغەزم لەگیرفانم دەرهێناو وتم: چەند دەکات؟وتی هەزار دراخما، وتم: ئای باوکە! قورسی مەکە، ئەی هەشت سەد دراخما چۆنە؟ وتی: نەخێر، هەزار دراخما بەڵام من هەر هەشت سەدم پێیە، وەریگرە یەك دینار کەمتر ناخوات، ئەگینا فەرموو زوو دابەزە)) من ڕك گرتمیو وتم: ((گوێ بگرە، کەشتیوان، بۆ خۆت چاکە ئەم هەشت سەد دراخمایەی کەدەت دەمێ وەری بگریت، ئەگینا ڕادەبمو تۆی بێچارە پارەکەت لەکیس دەچێت))

زۆربا قاقا پێکەنیو بەسەرسامیەوە وتی:

-مرۆڤ چ مەکینەیەکی سەیرە! تۆ پڕی دەکەیت لەنانو مەیو ماسیو توروو، لەوانە ئاهو پێکەنینو خەون دێتە دەرەوە، کارگەیە، ئیتر، من واهەست دەکەم لەمێشکی ئێمەدا سینەمایەکی دەنگی هەیە وەك ئەم سینەمایانەی کە قسەی تیا دەکەن.

زۆربا لەناکاودا لەسەر قەرەوێڵەکەی هاتە خوارێو بەنیگەرانیەوە وتی:

-بەڵام بۆچی تووتی؟ ئەو تووتیەی کە لەگەڵ خۆمدا دەمبرد چ مانایەك دەدات؟ ئای دەترسم کە .....

هێشتا قسەکەی تەواو نەکردبوو کە تەتەرێکی کورتە باڵای قەڵەوی قژ سوور، وەك شەیتانێکی راستەقینە، بە هەناسە برکێ لەدەرگاکە هاتە ژورێو وتی:

-بۆ خاتری خوا! خانمی داماو هەر هاواریەتی تا پزیشکێکی بێننە سەر، دەڵێت خەریکە بمرێتو مەرگی ئەویش ویژدانتان دەهێنێتە ژارو ژەنگ.

هەستم بەشەرمەزاری کرد، ئەو تەنگو چەڵەمەیەی بەهۆی بێوەژنەوە تووشمان هات ئێمەی بەیەکجاری لەو هاورێ کۆنەمان دابرِی.

تەتەری قژ سوور، خۆش قسە بوو دیسان وتی:

-ئەو خانمە هەژارە ئازار دەکێشێت، کۆکەیەك دەیگرێت، میوانخانەکە دەخاتە لەرزین، بەڵێ، بەڵێ، وەك کۆکەی چوارپێ.

ئوحو! ئوحو! هەموو گوندی هەژاندوە.

من هاورم لێ کرد: پێ مەکەنە، بێدەنگبە.

پارچە کاغەزێکم هەڵگرتوو شتێکم نووسی.

وتم: بەڕاکردن ئەم نامەیە بگەیەنەرە پزیشك، تا بەچاوی خۆیشت نەیبینیت سواری ماینەکەی بوەو کەوتۆتە رێ نەگەرِێیتەوە. تێ گەیشتیت؟ دەی راکە..

تەتەرەکە نامەکەی وەرگرت، ئایە بەرپشتێنەکەیو لەچاو ون بوو.

زۆربا هەستابوو، بەپەلەو بێ ئەوەی قسەیەك بکات جلی لەبەر کرد.

پێم وت: کەمێك راوەستە، منیش لەگەڵتا دێم.

وتی: پەلەمەو... کەوتە رێ.

دوای کەمەکێك منیش بەرەو گوندەکە کەوتمە رێ، باخی بێوەژن بۆنی خۆشی لێ دەهاتو چۆڵ بوو، میمیتۆ، کزو مۆن وەك سەگی لێ دراو لەبەردەرگاکە دانیشتبوو، لەرو لاواز، چاوبەقووڵاچوو سووردا‌گەراو، ئاورِی دایەوە، منی بینیو بەردێکی هەڵگرت.

من خەمبارانە تەماشای باخەکەم کردو لێم پرسی:

-لێرە چی دەکەیت، میمیتۆ؟

یادوەری دووباسکی گەرمو بەتین لەخۆی گرتم...

بۆنی گوڵی لیمۆو ڕۆنی درەختی غار لەهەوادا شەپۆلی دەدا، لەتاریکو ڕونی ئێوارەدا، دووچاوی جوانو ڕەشی بێوەژنم دەبینی کە گڕی ئارەزوو دەیسوتاندنو، ددانە تیژو سپیەکانی کە بەگەڵا گوێز ساوی بوونی دەبریسکانەوە.

میمیتۆ ورتە ورتێکی کردو وتی:

–بۆ دەپرسیت؟ بڕۆ، بڕۆ بەلای کاری خۆتەوە.

–جگەرەت دەوێت؟

–من لەمەودوا جگەرە ناکێشم، ئێوە هەمووتان پیسو بێژون، هەمووتان، هەمووتان.

کەوتە هانکە هانکو بێدەنگ بوو، وەك بەدوای وشەیەکدا بگەڕێتو دەستی نەکەوێت.

–هەمووتان ڕسواو بەدبەختو درۆزنو مرۆڤ کوژن...

وەك لەکۆتاییدا ئەو وشەیەی دۆزیبێتەوە کە بەدڵیەتیو ئاسودەی دەکات دەستی پێکدادا. بەدەنگی بەرز وتی:

مرۆڤ کوژینە، مرۆڤ کوژینە، مرۆڤ کوژینە...و دەستی بەپێکەنین کرد.

دڵم گیراو بەهەنگاوی گورج دوورکەوتمەوە، لەبەرخۆمەوە وتم:

–هەقتە، میمیتۆ، هەقتە.

پێش ئەوەی بگەمە ناو دێ ئاپۆ ئاناگنوستی پیرم بینی کەبەسەر دار دەستەکەیدا چەمابووەوە، زەردەخەنەیەکی کەوتبوە سەر لێوو بەوردی تەماشای ئەودوو پەپوولە زەردەی دەکرد کە لەناوگژو گیا بەهاریەکەدا دوای یەکتری کەوتبوون. ئێستا کەتەواو پیر بوە ئیتر دڵی لەکێڵگەو ژنو منداڵەکانی بەرداوەو، کاتی ئەوەی هەیە بەخوێن ساردیەوە چاو بەدنیادا بگێڕێت، سێبەری ئێمەی بەسەر زەویەکەوە بینیو سەری بڵند کرد:

بەمنی وت: چی بەم بەیانی زوە گەیاندیتیەتە ئێرە؟

بەڵام وەك ئەوەی هەستی بە دوودڵیو پەشۆکانی من کردبێت، بێ ئەوەی چاوەڕێی وەڵام بێت وتی:

–تازوە کارێك بکەن، کوڕم، من لەوە دڵنیا نیم تا تۆ دەگەیت ئەو مابێت... ئاە بێچارەی بەد بەخت.

ئەو قەرەوێڵە گەورەیەی کە ئەو هەموو خزمەتەی کردبوو، کە بە وەفاترین هاوڕێی هورتانس بوو برابوە ناوەڕاستی ژوورێکی بچووکەوەو تەواو پڕی کردبووەوە. بەسەر سەریەوە ڕاوێژکەرە تایبەتیو وەفادارەکەی، تووتیەکە، بەتاجی سەوزو کڵاوی زەردو چاوی بچووكو شەیتانیەوە، ڕاماوو دوودڵو خەمبار چەمابووەوە، تەماشای خاوەنەکەی دەکرد کەلەخواریەوە ڕاکشابوو دەینالاند، وەك ئینسان سەری کەمێك بەلایەکدا لار کردبووەوە تا گوێی لەئاهو ناڵەکەی بێت.

نا، نا. ئەمە ئەو ئاهو ناڵە پڕ لەخۆشەویستیو ئارەزوانەی جارانی ئەو نیە کە ئەم باشیان دەناسێت، ئەو نازو عیشوەیە نیە کە لە گمەی کۆتر دەچوو، ئەو پێکەنینانەیش نیە کە ختووکە دەمی پێ دەکردنەوە.

ئەو دڵۆپە ئارەقە وردو ساردانەی بەسەرو چاوی خانمەکەیدا دەهاتنە خوارێو، قژی وەك پەتك لێ هاتووی کەنەشۆراوو نەشانە کراو بەلاجانگیەوە قرسابوو، کرژیو لوول بوونی سەرتەختی نووستنەکەی، هەموو ئەوانە یەکەمجار بوو تووتی دەی بینیو پێ یان نیگەران دەبوو. ویستی هاوار بکات: کاناڤارو، کاناڤارو بەڵام دەنگ لەگەرووی دەرنەدەهات.

خانمە هەژارەکەی هەر دەینالاند، باسکە لاوازو چرچەلۆکەکانی مەلافەکانی بەرز دەکردەوەو لای دەدان، لەوە دا بوو بخنکێت، سەرو چاوی هەڵئاوسابوو، بۆنی ئارەقەی ترشاوو ئەو گۆشتەی لێدەهات کە لەسەرەتای بۆگەن کردندا بوو، پێڵاوە کۆنو شڕەکانی لەژێر قەرەوێڵەکەوە هاتبوە دەرێو بەبینینی دڵ بەیەکدا دەهات. پێڵاوەکان زیاد لەخاوەنەکەی کاریان لەمرۆڤ دەکرد.

زۆربا کە لە سەرینی نەخۆشەکەدا دانیشتبوو تەماشای جوتە پێڵاوەکەی دەکردو نەی دەتوانی چاویان لێ کەلابخات.

لێوی هەڵقرچاندبوو تا نەهێڵێت فرمێسکەکانی برژێنە خوارێ، من چوومە ژوورەوەو لەپشت سەریەوە دانیشتم، بەڵام ئەو گوێی لەدەنگی پێی من نەبوو.

ژنی بێچارە هێند تەنگە نەفەس بوو لەوەدابوو بخنکێت، کڵاوێک کەبەقوماشی سوور گوڵی تیا کرابوو زۆربا دای گرتو کەوتە باوەشێن پێ کردنی نەخۆشەکە، ناشیانە دەستە گەورەکانی بەتوندی ڕادەوەشاند، وەک بیەوێت خەڵوزێکی شێدار گەش بکاتەوە.

نەخۆشەکە چاوە ترس زەدەکانی کردەوەو سەیری ئەملاو ئەو لای خۆی کرد، شوێنەکە هەموو تاریک بوو، هیچ کەسێك، تەنانەت زۆرباشی نەدەبینی کەکڵاوە گوڵدارەکەی بەدەستەوە بوو. لەبەرچاویا هەموو شتێکی دەوروبەری تاریکو ترسناک بوون، هەڵمی شین لەسەر زەویەکەوە بەرز دەبوەوەو وێنەکەی دەگۆڕا، یەعنی بەشێوەی دەمی داچەقاو، قاچی چنگدار، باڵی ڕەشیان لێ دروست دەبوو، نینۆکەکانی لەسەرینەکەی کەفرمێسکو لیکو ئارەقەی لەش پەڵە پەڵەیان کردبوو گیر کردو هاواری کرد:

–من نامەوێت بمرم، نامەوێت.

دووژنی شین گێڕی ئاوایی کەپێشتر ئاگادار کرابوونو تازە گەیشتبوون هاتنە ژورەکەوە، لەسەر زەوی دانیشتنو پاڵیان بەدیوارەکەوە دا.

تووتیەکە بەچاوە خڕەکانی مۆڕەی کردو بەڕقەوە لەدووژنەکەی ڕوانی، ملی هێنایە بەرەوەو هاواری کرد: ((کاناڤ..)) بەڵام زۆربا بەتووڕەییەوە دەستی بۆ قەفەزەکە درێژ کرد، باڵندەکە کڕ بوو.

دیسان ئەو هاواری پڕلە نائومێدیە بەرز بوەوە:

–من نامەوێت بمرم، نامەوێت.

دوولاوی بێ مووی خۆر ئەنگاز لای دەرگاکەوە سەریان هاوردە ژورێ، بەوردی لەنەخۆشەکەیان ڕوانی، بەخۆشیەوە ئاماژەیەکی زیرەکانەیان بۆ یەکتری کردو لەچاو ون بوون.

هەر ڕاستەوخۆ دوای ئەوە، لەحەوشەکەوە گوێمان لەقیرە قیڕو باڵە فڕێ بوو، یەکێك کەوتبوە گرتنی مریشکەکان.

یەکەمین شین گێڕ دایکە مالاماتنیا[١٦٢] سەری نایە لای هاوڕێکەیەوەو وتی:

١٦٢ Malamatenia

–بینیتن، پووره لنیو[١٦٢] بینیتن ؟ ئەم سواڵکەره برسیانە پەلەی ئەوەیانە زوو سەری مریشکەکان هەڵکەنن‌و بیان خۆن، هەرچی خوێری‌و بێ کارەی گوندە لەحەوشەکەدا کۆبوونەتەوەو هاکا دەستیان کردە تالان کردن.

ئینجا ڕووی لە قەرەوێڵەی نەخۆشەکرد کە لە گیانەڵادا بوو لەژێر لێوەوە وتی :

–زووکە بمرە، پیرێژن، زووکە بائێمەیش شتێکمان دەست بکەوێت.

میمکە لنیۆ کە چرچی خستبوە دەمە بچووک‌و بێ ددانەکەیەوە وتی:

–ڕاستت دەوێت دایکە مالاماتنیا، ڕاستت دەوێت، ئەوە ڕاستە کە ئەم منداڵانە دەیکەن. خوالێخۆش بووی دایکم ئامۆژگاری دەکردین‌و دەیوت: ((ئەگەر دەتەوێت بخۆیت بفرێنە، ئەگەر دەیشت دەوێت هەت بێت بدزە)) چاکتر وایە تا زوە شینەکەمان بگێڕین تا مشتێك برنج، هەندێك شەکر، یان مەسینەیەکمان دەست بکەوێت‌و گیانی مردوەکە بەدۆعای خێر شاد بکەین. ئەم داماوە نەمناڵی هەبوو نەکەس‌و کار، ئەی کێ مریشك‌و کەروێشکەکانی بخوات؟ کێ شەرابەکانی بخواتەوە؟ کێ دەبێتە میراتگری ئەو هەموو وردکەو پرتکەو بەکرەو شانەو نوقڵ‌و شیرینیانەی؟

ئای، دایکە مالاماتنیا خوالێم نەگرێت، من بەرلەتۆ دان بەوەدا دەنێم کەزۆرم حەز لێیە چی دڵم دەیەوێت هەڵی بگرم بۆ خۆم.

دایکە مالاماتنیا باسکی هاوڕێکەی گرت‌و وتی:

–هێور بە، باجی، زۆر پەلە مەکە، منیش سوێندت بۆ دەخۆم هەر وەك تۆ بیر دەکەمەوە، بەڵام جارێ لێگەڕێ بایارۆ گیانی دەربچێت.

لەم کاتەدا، نەخۆشە گیان لەسەر لێوەکە زۆر بەزەحمەت دەستی لەژێر سەرینەکەیدا دەگێڕاو دەگەڕا، ئەو کاتەی هەستی بەمەترسیەکە کردبوو لەسندوقە بچوکەکەیدا خاچێکی دەرهێنابوو کە لەئێسکی سپی بریسکەدار دروست کرابوو، هێنابوویە ناوجێگاکەیەوە، ساڵانێك بوو ئەو خاچەی لەنێو کراسی دڕاوو کالا کۆنە مەخمەڵیەکانیدا لەناو سندوقەکە لەبیر چوبوو، وەك ئەوەی مەسیح دەرمانێك بێت کەلەکاتی نەخۆشیدا

[١٦٢] Lenio

نەبێت نابێت بخورێت. کاتێکیش کە مرۆڤ خۆش دەژیو دەخواتەوەو عیشقبازی دەکات ئەوە بەکەڵکی هیچ نایەت.

هەر بەدەست کوتان خاچەکەی دۆزیەوەو نووساندی بەسنگە ئارەقاویەکەیەوە، لەوکاتەدا کە بەتاسەوە ئەو دوا خۆشەویستی خۆی گرتبوە ئامێز لەبەر خۆیەوە ورتە ورتی بۆ دەکرد:

مەسیحی دلۆڤانم، مەسیحی ئازیزم.

ئەگەر چی وشەکان نیوە فەرەنسیو نیوە یۆنانی بوون، بەڵام لێوان لێو بوون لەخۆشەویستیو دۆستی، بەجۆرێك دەیوتن زمانی گۆی نەدەکردو لە وشەکان تێنەدەگەیشتی.

توتیەکە گوێی لە دەنگی بوو، هەستی کرد ئاهەنگی دەنگەکە گۆڕاوە ، کەوتەوە یادی شەوە خۆشەکانی رابوردوو، بەدەنگی گڕی کەڵەشێرێك کەهاواری خۆر بکات وتی:

—کاناڤارو،کاناڤارو.

ئەمجارەیان زۆربا جووڵەی نەکرد تاتووتیە کە بیدەنگ بکات، تەماشای ژنەکەی دەکرد چۆن دەگریاو خوای لە خاچ دراوی ماچ دەکرد.

لەوکاتەدا ناسکیو بێگەردیەکی کتو پڕ کەوتە نێو دەمو چاوە سیسەکەیەوە.

دەرگاکرایەوەو ئاناگنوستی پیر کە شەوکلاوەکەی بەدەستەوە بوولە سەرخۆ هاتە ژوریّ. چوەلای نەخۆشەکەوە، سەری هێنایە خواریّ، کەوتە سەرئەژنۆ وتی:

—ئەیخانمی میهرەبان،لێم ببوورە تاخوایش لە تۆ ببوورێت،لێم ببوورە ئەگەر جارێك وشەیەکی ناخۆشم پیٚوتبیت، ئاخرخۆ ئێمە قەدیس نین!

بەڵام خانمی میهرەبان ئیدی تەواو بێدەنگ کەوتبوو، نوقمی دنیایەکی ئارامو خامۆش بوو کە دەنگی ئاناگنوستی پیری نەدەبیست، هەموو خەمو ئازارەکانی، دەردو ناخۆشیەکانی پیری، گاڵتە پێکردنیو قسەی ساردو سڕ ئەوشەوە خەماویانەی کە لەبەر دەرگای خانوە چەپەکەکەی خۆی دادەنیشتو، وەك هەر ژنێکی ئاساییو شەریف گۆڕەوی گوندیانەی دەچنی نەمابوونو توابوونەوە ئەو رۆژێك لەرۆژان ژنێکی جوانو شیکی پاریسی بوو، دڵبەرێکی هێند دڵنەواز کەپیاو خۆی لەبەردەمیا نەدەگرتو، لەسەر

ئەژنۆی سەمای بەچوار دەوڵەتی گەورە کردبوو، چوار کەشتی گەورە سەری ڕێزیان بۆ دانەواندبوو.

ڕەنگی دەریا شینێکی لاجیوەردیە، شەپۆلەکان لەکەف چڕیندان، قەلا سەر ئاوکەوتوەکان لەبەندەرەکەدا سەما دەکەن، دەنگی شەکانەوەی ئالا ڕەنگالەییەکانی سەر ئەستوندەکان بەرزن، بۆنی کەوی برژاوو ماسی سوورەوە کراو لووت پڕ دەکات، میوە بەستوەکان لەدەفری بلورینی نەخشاودا دەهێننو سەرە دارینەی بوتڵە شەمپانیاکان دەردەپەڕنو لەبن میچی ئاسنی کەشتیە جەنگیەکان دەدەن.

ڕیشی ڕەش، زەرد، خۆڵەمێشیو خورمایی، چوار جۆر عەتر: کۆلۆنیا، وەنەوشە، میسک، عەنبەر، دەرگاکانزاییەکان دادەخرێنو پەردە ئەستوورەکانیان دادەدرێنەوە، چراکان دادەگیرسێن، هورتانس خانم، چاوانی لێك دەنێت، ئای.. خودایە.. هەموو سەردەمانی خۆشیو بەختەوەری ئەوو هەموو ڕۆژانی ڕەنجو ئازارەکانی تەنیا چرکەساتێك بوونو بەس...

خانم لەسەر ئەم ئەژنۆوە دەکەوێتە سەر ئەویان، دەستی لەقۆڵی کراسە زێڕ کفتەکانی دەردەهێنێت، پەنجەی دەخاتە ناو ڕیشە پڕو عەتراویەکان، ناویانی لەبیرنەماوە، بەڵام وەك توتیەکەی خۆی تەنیا ناوی کاناڤارۆی لەیادە، چونکە ناوی کاناڤارۆ لەهەموو ناوەکان جوانترەو تەنیا ناوێکیشە کە تووتیەکە دەتوانێت بیڵێت، هەموو ناوەکانی تر بەگرێو گۆڵو ئاڵۆز بوونو لەبیر چووبوونەوە.

هورتانس خانم هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشاو زۆر بەتاسەوە خاچەکەی بەسنگیەوە نووساند، لەو کاتەدا کە خاچەکەی بەمەمکە داکەوتوەکانیدا دەقرساند وڕێنەی دەکردو لەبەر خۆیەوە دەیوت:

—کاناڤارۆ، کاناڤارۆی چکۆڵەم...

پوورە لنیۆ لەبەر خۆیەوە وتی: ئیدی وردە وردە نازانێت چی دەڵێت، دیارە فریشتە پاسەوانەکەی خۆی بینیوەو ترساوەو، با لەچکەکانمان بکەینەوە بچین بەلایەوە.

دایکە مالاماتنیا وتی: بۆ تۆ لەخوا ناترسیت؟ ئەو هێشتا زیندوە دەتەوێت شینی مەرگی بۆ بگێڕین؟

پووره لنیۆ لەژێرەوە گوڕاندی:

–حەو ! دایکە مالاماتنیا تۆ لەبری ئەوەی لەبیری سندوقو جلو بەرگو تفاقی دوکانو مریشکو کەروێشکەکانیا بیت پێم دەڵێیت با جارێ گیان بسپێرێت! ئەوەی گرتی بردی.

ئەمەی وتو لەجێگاکەی هەستا، ئەویان بەتووڕەییەوە کەوتە دوای، هەردووکیان لەچکە ڕەشەکانی سەریان کردەوە، قژی سپیو تەنکیان بەرداوەو بەکەناری قەرەوێڵەکەوە چەسپین، یەکەمجار پووره لنیۆ بەدەنگێکی بەرزی ناخۆش کە لەشی دەهێنایە لەرزین کەوتە لاواندنەوە.

–لی ی ی ی ی!

زۆربا لەسەر جێگاکەی ڕاپەڕی، قژی هەردوو پیرێژنەکەی گرتو بەرەو دوا ڕایکێشان، بەدەنگی بەرزوتی :

–بێدەنگ، پیرە قەلە ڕەشینە، بۆ نابینن هێشتا ژنەکە زیندوە؟ دەی بڕۆن ملتان بشکێنن.

دایکە مالاتنیا بەدەم بەستنەوەی لەچکەکەی سەریەوە دەنگێکی تووڕەی لێ بەرزبوەوە:

–چاوت لەم پیرەمێردە خەڵفاوە بێت، ئەم بەڵایە لەکوێوە بۆ گیانی ئێمە پەیا بوو؟ شێتو شبر.

هورتانس خانم، پیرە فریشتەی نەخۆش، گوێی لەو دەنگە ناخۆشە بوو، خەونە شیرینەکانی توانەوەو کەشتی جەنگی کەشتییەوانەکەیشی نوقمی ژێر ئاوبوو، کەبابو شەمپانیو ڕیشە عەتراویەکان ون بوون، جارێکی تر لەسەر قەرەوێڵەی مەرگی بۆن کردوویەوە کەوتە ئەو سەری دنیا، جووڵەیەکی بۆ هەستان کرد، وەك بیەوێت ڕابکات بەڵام کەوتەوە، دیسان بەهێواشیو دەنگێکی پڕلە سۆزەوە هاواری کرد:

من نامەوێت بمرم، نامەوێت...

زۆربا خۆی بە سەریا نووشتاندەوە، دەستە گەورە ڕەگاویەکەی خستە سەر ناوچاوی گەرمیو قژی لەسەر ڕووی لادا، چاوی کەلەچاوی باڵندە دەچوون پڕببوون لەفرمێسك، لەسەرخۆ وتی:

-هێور بە، ئازیزەکەم، هێور بە، من لێرەم، زۆرباکەی خۆتم، مەترسە، لەپڕا خەونەکە، وەك پەروانەیەکی گەورەی دەریا ڕەنگ، دیسان هاتەوە، بەباڵەکانی هەموو سەرتەختی نووستنەکەی داپۆشی، ئەو نەخۆشەی لەگیانەڵای مەرگدابوو دەستە گەورەکەی زۆربای گرت، لەسەرخۆ قۆڵی درێژ کردو خستیە گەردنی زۆرباوە کە سەری بەلایەوە نابوو، ژنە لێوی جووڵا:

-کاناڤارۆکەم، کاناڤارۆی چکۆلانەم....

ئەو خاچەی لەژێر سەرینەکەیدا بوو کەوتە سەرزەوی‌و شکا، دەنگی پیاوێك لەحەوشەکەوە هات، وتی:

-ها، هاوڕێ، برۆ مریشکەکە بخەرە مەنجەڵەکەوە ئاوەکە لەکوڵە.

من لە سوچێکی ژوورەکە دانیشتبووم‌و تاو تاوە چاوم پڕدەبوون لەفرمێسك. لەگەڵ خۆمدا دەموت: ئیتر ئەمەیە ژیان، شێواو، نەگونجاو، بێمەبەست، سووك، بێبەزەیی:

ئەم گوند نشینە کریتیە سەرەتاییانە، دەوری گۆرانی بێژێکی نەگبەتی پیریان داوە کە لەو پەڕی دنیاوە هاتوە، زۆر بەپەرۆشەوە سەیری مردنەکەی دەکەن، وەك ئەوەی مرۆڤێکی چون خۆیان نەبێت.

وەك باڵندەیەکی گەورەی ئەفسانەیی، بەپەڕی ڕەنگاڵەییەوە، کەوتبێتە کەناری دوورگەکەیانەوەو باڵی شکابێت‌و بۆتەماشاکردن لێی کۆبووبێتنەوە، یان تاوسێکی پیر، یان پیرە گوربەیەکی تووکن، یان ورچە ئاویەکی نەخۆش...

زۆربا بەهێمنی باسکی هورتانس خانمی لە دەوری گەردنی خۆی کردەوەو بەڕەنگی پەریوەیەوە هەستا، بەپشتی دەستی چاوی خۆی سڕی‌و کەوتەوە تەماشاکردنی نەخۆشەکە، بەڵام شتێکی بۆ دەرنەکەوت، چونکە فرمێسك نەی دەهێشت، جارێکی تر چاوە فرمێسکاویەکانی سڕی‌و ئەمجارەیان دیتی کە قاچە شل‌و شاوو ئاوساوەکانی دەجولێنێت‌و بەشێوەیەکی سەیر دەمی چەوت‌و چێڵ دەکات. یەك دووجار لەرزی‌و مەلافەکانی سەری کەوتنە سەر زەویەکە، جەستەی نیوەڕوتی نەخۆشەکە کە شەڵاڵی ئارەقەو ئاوسابوو، ڕەنگە زەردەکەی بەرەو سەوزی دەچوو دەرکەوت، وەك باڵندەیەك

سەری ببڕن قیژەیەکی توندو کورتی کرد، پاشان چاوە پڕ لەترسەکانی لێك ناو لە جووڵە کەوت.

تووتیەکە بازی دایە بەشی خوارەوەی قەفەزەکەوە، خۆی بەشیشەکانیەوە نووساند، تەماشای ئەو دیمەنەی کرد کە چۆن زۆربا دەستە گەورەکانی ناوەتە سەر خاوەنەکەی و بەخۆشەویستیەکی بێ ئەندازەوە پێڵوەکانی لێك دەنێت.

ژنە شین گێڕەکان بەرەو قەرەوێڵەکە بازرە قەیان بەست و لەبەینی خۆیدا کەوتنە ورتە ورت:

-دەی زووکەن، بجووڵێن، ژنە تەواو بوو...

لەکاتێکدا کەبەم لاو ئەولادا کەوتنە خۆ ڕاژەندن و بەمست لەسنگی خۆیان دەدا بانگێکی دورو درێژیان هەڵدا. ئەم خۆ ڕاژەندنە یەك ریتم و بێزار کەرە وردە وردە لەسەر خۆی بردن، خەمە زۆر کۆنەکانیان سەریان هەڵدایەوەو وەك ژەهر رژایە گیانیانەوە، پێستی دڵیان ترەکیو سروودی شین گێڕایان دەست پێکرد.

((ئەم جەستە ناسکەی تۆ شایانی ئەوە نیە لەژێر خاکدا بنوێت))

زۆربا چوە حەوشەکەوە، دەیویست بگری، بەڵام لەبەردەم ژنەکاندا شەرمی پێهات، بیرم کەوتەوە کە ڕۆژێك پێی وتم:

((من شەرمم بەوە نایەت بگریم، بەس لەبەردەم پیاودا، پیاو خۆمانەیە، وانیە؟ گریان لەبەردەم پیاودا عەیب نیە، بەڵام لەبەردەم ژندا هەمیشە دەبێت مرۆڤ خۆگرو ئازابێت، چونکە ئەگەر ئێمەیش بگرین ئەی ئەو نەگبەتانە چی بکەن؟ بێگومان دنیا ئاخر دەبێت)).

لاشەکەیان بەشەراب شت، پیرێژنە مردوو شۆرەکە دەرگای سندوقەکەی کردەوەو پۆشاکێکی پاکی تیا دەرهێنا، کراسەکەی گۆڕی و شووشەیەکی بچووکی کۆلۆنیای بەسەریدا پرژاند، مێشی ناو باخەکانی ئەوناوە لەلاشەکە وروکان، لەکونە لووت و دەوری چاوو چین ولۆکانی لالێویدا گەرایان خست.

دنیا بەرەو تاریکی دەچوو، لەخۆرئاواوە ئاسمان گەلێك پاك و هێور بوو، پەڵە هەورە سوورەکان، بەکەنارە ئالچتونیەکانیانەوە، لەسەر خۆ لەڕەنگە وەنەوشەییە تێرەکەی ئەو ئێوارەیەدا شەپۆلیان دەدا، بەردەوامیش بەوێنەی جیاواز جیاوازی کەشتی، قوو، گیاندارە

خەیاڵیەکان کە لەپارچەی ناسکو ئاوریشمی ڕیشەدارن وێنەکان دەگۆڕان. لای قامیشەکانی حەوشەکەوە، دەریای بەجۆشو خرۆش هاتوو لە دەرەوە دیاربو.

دوو قەلەڕەشی قەڵەویلکە لەسەر دار هەنجیرەکەوە باڵیان گرتو بەسەر زەوی بەردرێژکراوی حەوشەکەدا کەوتنە لەنجەولار، زۆربا تووڕە بوو، بەردێکی تێ گرتنو ڕاوینان.

لە گۆشەیەکی تری حەوشەکەدا، کۆمەڵێك لەچەکلەکانی ناودێ بەزمێکی وایان دروست کردبوو ئەوسەری دیارنەبێت: مێزێکی گەورەی چێشتخانەکەیان هاوردبوە دەرەوە، هەموو شوێنێك گەڕابوون‌و نان‌و قاپ‌و کەوچك‌و چنگاڵیان دۆزیبوەوە، گۆزەیەك شەرابیان لەژێر زەمینەکەوە هێنابوو، مریشکیان لێ نابوو، بەشادیو ئیشتیهاوە دەیان خوارد، لەگەڵیشیا، پێکیان لێك دەداو هەڵیان دەدا.

-خوا لێی خۆش بێت، هەرچیەکیشی کردوە، بکەوێتە بەر خێرو بێرەکەی.

-هەموو عاشقەکانی ببنە فریشتەو گیانی بەرەو ئاسمان بەرێکەن.

مانولاکاس وتی: کوڕینە، تەماشایەکی زۆربای پیرەمێرد بکەن کە بەرد لە قەلەڕەشەکان دەگرێت، داماوە بوەتە بێوە پیاو، واچاکە بانگی بکەینە لای خۆمان تا جامێك بۆ گیانی پاکی ((مریشکەکەی)) بنۆشێت.

ها! زۆربای ئازا، وەرە، هاوشاری تۆیش بەشداریمان بکە.

زۆربا سەری وەرچەرخاند، مێزەکەی بینی چی لەسەر دانرابوو، مریشکی ناو مەنجەڵەکان هەڵمیان لێ هەڵدەسیتا، شەرابی نێو پەرداخەکان دەبریسکانەوەو پیاوانی بەهەیکەلی خۆر بردوو دەستە سرەکانیان بەسەریانەوە بەستبوو لێوان لێو بوون لەبێ دەربەستیو گەنجیەتی خۆیان.

لەبەرخۆیەوە وتی: ها، زۆربا، ئاگاداری خۆت بە، ئەمە ئەو ڕۆژەیە خۆتیان پیشان بدەیت چ کەسێکیت!

زۆربا لێیان نزیك کەوتەوە، پەرداخێك شەرابی هەڵدا، ئینجا دوەم‌و سێیەمیشی یەکسەر هەڵداو ڕانە مریشکێکیشی بەسەردا کرد، ئەوان قسەیان لەگەڵدا دەکردو ئەو وەڵامی نەدەدانەوە. بەپەلەو هەڵپە تیکەی گەورەی دەگلاندو مژی قووڵی لێ دەداو

خامۆش بوو، تەماشای ئەو ژوورەی دەکرد کە هاورێ پیرەکەی تیاکەوتبوو، گوێی لەدەنگی شین گێڕەکان گرتبوو کە لەپەنجەرە کراوەکەوە دەهات، تاو تاوە دەنگەکان کپ دەبوون، هاوارێك دەهاتە گوێ، وەك ئەوەی لەگێرمەو کێشەی کردنەوەو داخرانی دەرگای دۆلاب‌و دەنگی پێی قورس‌و خێرای هات‌وچۆی کەسانێك بێت کەلەناو جەرگەی شەڕو شۆڕدابن وابوو.

دیسانەوە، دەنگی شین گێڕەکان لەسەر یەك شێوەی بێزارکەرو گونجاو وەك گیزەگیزی هەنگێك دەستی پێ کردەوە.

شین گێڕەکان لەگەڵ خوێندنەوەی درووەدەکاندا بەهەموو کون‌و قوژبنێکی ژوری مردوەکەدا دەگەڕان‌و هەڵپەی دۆزینەوەی شت‌و مەکیان بوو، چەکمەجەیەکی بچووکیان کردەوەو پێنج شەش کەوچکی بچووك، هەندێك شەکر، قوتوویەك قاوەو قوتوویەك شیرینی ڕەحەتەلوقمیان دۆزیەوە. میمکە لینۆ پەلاماری قوتوە قاوەکەو ڕەحەتەلوقمەکانیدا‌و دایکە مالاماتنیایش شەکرو کەوچکەکانی برد، دوودانە ڕەحەتەلوقمیشی فڕاندو تەپاندنیە ناو دەمیەوە، ئیدی ئەو شیعرانەی دەیوت لەبەینی ئەو هەویری شیرینیەوە بەشێوەیەکی نزم‌و نادیار دەهاتنە گوێ.

((گۆڕەکەت پڕبێت لە گوڵ‌و سێو لەبەر هەڵبێنەکەتەوە داکەوێتە خوارێ))

دوو پیرێژنی تر چوونە ناوژوورەکەوە، پەلاماری سندووقەکەیاندا، دەستیان تێ وەرداو چەند دەستەسرێکی بچووك‌و دووسێ خاولی‌و سێ جووت گۆرەوی‌و بەستەیەك گۆرەویان دۆزیەوەو خزاندیانە نێو بەرکیانەوە، ئینجا روویان لەمردوەکە کردو نیشانەی خاچیان کێشا.

دایکە مالاماتنیا کە پیرێژنەکانی بینی دەیانەوێت سندووقەکان تالآن بکەن ڕقی هەستا، بەمیمکە لنیۆی وت:

—بەردەوام بە، وامنیش دەگەم.

خۆیشی سەری کێشایە ناو سندوقەکەوە.

بەرگی کۆنی ئاوریشم، کراسێکی کۆنی ڕەنگ باینجانی، دەم پێی کۆنی سوور، باوەشێنێکی شکاو، چەترێکی هاوینەی ڕەنگاو ڕەنگی زۆر تازە.

لەناو سندووقەکەدا کڵاوێکی سێ گۆشەی کەشتیەوانی کە زوو پێشکەشیان کردبوو، کە تەنیا دەبوو لەبەردەم ئاوێنەدا لەسەری دەناو غەمگینو بەویقار لەئاوێنەکەدا تەماشای خۆی دەکرد.

یەکێك لەدەرگاکە نزیك کەوتەوە، پیرێژنەکان ڕۆیشتن، پوورە لنیۆ بەقەرەوێڵەی مردوەکەوە نووسایەوەو دەستی کردەوە بەسنگ کوتانو قیژەو هاوار:

((مێخەکی سووریش لەگەردنتا بێت...))

زۆربا ڕۆیشتە ژورێ، تەماشایەکی مردوەکەی کرد. هێورو ئارام، زەرد هەڵگەڕاوو مێشی تێ وروکابوو، بەو دەستانەوە کە وەك خاچی لێ کردبوونو بەشریتە باریکە مەخمەڵیەکەی دەوری ملیەوە درێژ درێژ کەوتبوو.

لەگەڵ خۆیدا بیری کردەوە: ((چنگێك خۆڵ، بەڵێ، چنگێك خۆڵ برسی دەبوو، پێدەکەنی، ماچی دەکرد، چنگێك خۆل بوو دەگریا، بەلام ئەی ئێستا چی؟ ئاخر کێ ئێمە دێنێتە سەرزەوی‌و کێ دەمانباتەوە؟)) تفی کردو دانیشت.

لەدەرەوە، لەحەوشەکەدا، بۆ سەماکردن لاوەکان کۆبووبوونەوە، فانوریو، چەنگ ژەنە بەهرە مەندەکە، لەدوای هەموویانەوە گەیشت، مێزەگەورەکەو تەنەکەی نەوتو تەشتو سەبەتەی جل شتنیان لابرد، جێگایان چاك کردو سەما دەستی پێکرد.

ریش سپیەکانی گوندیش دەرکەوتن، ئاپۆ ئاناگنوستی بەداردەستە درێژو چەوتو چەوێڵەکەی‌و کراسی هەراوی سپیەوە، کوندو مانولیوی قەڵەوو پۆخڵ، مامۆستای قوتابخانە قەڵەمدانێکی گەورەی لەمس دروست کراوی بەپشتێنەکەیەوە کردبوو، پەڕە ئوچیکێشی لەپشت گوێی نابوو، ماڤراندونی پیر لەوێ نەبوو، لەبەر ئەوەی لەژێر لێکۆڵینەوەی یاسادا بوو دابوویە کێوو هەڵاتبوو.

ئاپو ئاناگنوستی دەستی بڵند کردو وتی:

—منالینە، خۆشحاڵم بەبینینی هەمووتانو شادمانیشم بەوەی لەخۆشیا دەتان بینم، بخۆنو بخۆنەوە، خوا خێری داونەتێ، بەڵام هاوارمەکەن، چونکە ئەوە نابێت، ئەگینا مردوەکە دەی بیستێت، بەڵێ دەیبیستێت، خۆیشتان دەیزانن.

کوندو مانولنیو بۆ ڕوون کردنەوەی مەبەستەکە وتی:

—ئێمە بۆ ئەوە هاتووین شتو مەكەكانی ئەو خانمە مردوە دەست نیشان بكەین، بۆ ئەوەی بیبەشینەوە بەسەر هەژاراندا، ئێوە تێرتان خواردوەو خواردۆتەوەو ئیتر بەسە، هەموو ماڵەكە تالان مەكەن، تەماشای ئەمە بكەن.

ئەمەی وتو گۆپاڵەكەی دەستی بەمەبەستی هەڕەشەی كردن لێ ڕاوەشاندن.

لەدوای ئەوسێ ریش سپیەوە، دە دوانزە ژنی قژ بژو پێ پەتیو كۆنە لەبەر پەیدابوون، هەریەكەیان توورەكەیەكی خاڵی بەبن دەستەوەو زەمیلەیەكی بەكۆڵەوە بوو، هەموو هەنگاوی دزانەیان دەناو بێ ورتە نزیك دەكەوتنەوە. ئاپۆ ئاناگنوستی ئاوڕی دایەوە، كە ئەوانەی بینی تەقیەوە:

—ها!. نارەسەنانە، بۆ دواوە، دەی بۆ دواوە، مانای چی؟ هاتوون بۆ تالان كردن؟ هەمووشتەكان لێرە تۆماردەكرێن، یەكەیەكە، تۆمار دەكرێن، پاشان، بەپێی یاساو عەدالەت بەسەر هەژاراندا دابەش دەكرێت، وتم بڕۆنە دواوە، یاالله دەی.

مامۆستا قەڵەمدانە درێژە لەمس دروست كراوەكەی لەپشتێنەكەی كردەوە، پەڕە كاغەزێكی گەورەی والا كردو بەرەو دووكانە بچووكەكە كەوتە ڕێ تاشتەكان تۆمار بكات.

بەڵام لەو كاتەدا دەنگی ژاوە ژاوێكی زۆر هاتە بەرگوێ، وەك بەسەر كارتۆنە ئاسندا بكێشن وابوو، لەوە دەچوو بەكرەكان گلۆر بووبێتنەوەو كووپەكان بەریەك بكەونو بشكێن. لەچێشتخانەكەیشەوە هەراو زەنای تاوەو دەفرو كەوچكو چنگاڵ بەرز بووەوە.

كوندو مانولیوی پیر بەدەم ڕاوەشاندنی گۆپاڵەكەی دەستیەوە بەرەو ئەوێ چوو، بەڵام یەخەی كێ بگرێت؟ پیرێژنو پیاوو منداڵ بەپاڵە پەستۆ لەدەرگاكانەوە هاتو چۆیان دەكرد، لەپەنجەرەو سەر دیوارەكانەوە بەرەو دەرەوە فڕكان فڕكانیان بوو، لەهەیوانەكەوە خۆیان فڕێ دەدایە خوارێ، هەركەسێك هەر شتێكی بەردەست بكەوتایە لەمەنجەڵو تاوەو دۆشەكو كەروێشكو شتی تر دەی برد.. هەندێكیان دەرگاو پەنجەرەكانیان هەڵكەندبوو دابویان بەكۆڵیاندا، تەنانەت میمیتو پێڵاوەكانی خواڵێ خشبووی بەستبوە پەتێكەوەو لەملی خۆی كردبوو، كەدەت بینی وات هەست دەكرد هورتانس خانم سواری قەڵاندۆشكانی بوەو تەنیا پێڵاوەكانی دیارە.

مامۆستاکە تووڕە بوو، قەڵەمدانەکەی کردەوە بەپشتێنەکەیدا، پەڕە کاغەزە دەست لێ نەدراوەکەی پێچایەوەو بۆ ئەوەی وشەیەکی لەدەم بێتە دەرەوە، وەك ئەوەی سووکایەتی پێکرابێت پێی نایە ئەودیو دەرگاکەو چوو بەلای کاری خۆیەوە.

ئاپۆ ئاناگنوستی داماو هەر هاوار هاواری بوو، دەپاڕایەوەو بۆ ترساندنیان دارەکەی ڕادەوەشاند.

-ئابڕو چوونە، منالینە، ئابڕوچوونە، مردوەکە گوێی لە دەنگتانە.

میمیتو وتی: بڕۆم قەشە بانگ بکەم؟

کوندو مانولیو بە تورەییەوە وتی:

-کام قەشە، کەرە؟ ئەو ژنە فەرەنسی بوو، چاوت لێ نەبوو چۆن نیشانەی خاچی دەکێشا؟ کافرە بەچوار پەنجە ئەم کارەی دەکرد،[١٦٤] دەی، تابۆنی نەکردوەو گوندەکە بۆگەن نەبوە زوو بڕۆین بەخاکی بسپێرین.

میمیتو نیشانەی خاچی کێشاو وتی: خەریکە جەستەی پڕدەبێت لەکرم، سوێند دەخۆم وایە، تەماشای بکەن.

ئاپۆ ئاناگنوستی سەرە بچووكو نەجیب زادە هەڵکەوتوەکەی ڕاوەشاندو وتی:

-تۆ ئەمەت بەلاوە سەیرە، گەمژە؟ لەڕاستیا لەو ڕۆژەوە کەمرۆڤ لەدایك دەبێت پڕە لە کرم، بەڵام نایان بینیت، ئەوکاتە نەبێت کە هەست دەکەن مرۆڤەکە لەوەدایە بۆن بکات، ئیدی هەموویان، سپی سپی- وەك کرمی پەنیر- لەکونەکانیانەوە دەست بەهاتنە دەرەوە دەکەن.

ئەستێرە بەراییەکانی ئاسمان دەرکەوتن، ، هەر لە زەنگۆڵەی زیوی بچووك دەچوون کەلە هەوادا هەڵواسرابن،و شەویش بەتەواوی زرنگایەوە.

زۆربا قەفەزی تووتیەکەی لەسەرەوەی تەختە خەوەکە هێنایە خوارێ، باڵندە هەتیو کەوتوە ترساوەکە لە سوچێکی قەفەزەکەدا کزۆڵەی کردبوو، چاوی کردبوە چوارو تەماشای دەکردو لەهیچ تێ نەدەگەیشت، سەری نایە بن باڵیو گرژبوو.

---

[١٦٤] وەك جیاوازی نێوان شیعەو سونی، شیعە لەنوێژ کردندا دەست دەکاتەوەو سونی دەست دەگرێت. و

که زۆربا قەفەزەکەی هێنایە خوارێ تووتیەکە خۆی ڕاست کردەوە، ویستی شتێك بلێت، بەڵام زۆربا دەستی بۆ درێژ کردو لەبەر خۆیەوەو بەدەنگێك کە بیلاوێنێت وتی:

-بێدەنگبە، بێدەنگبە، لەگەڵ مندا وەرە.

زۆربا دانەوی‌و تەماشای مردوەکەی کرد، زۆری تەماشاکرد، قورگی پڕببوو، تەکانێکی دایە خۆی کە دانەوێت‌و ماچی بکات، بەڵام خۆی گرت، لەبەرخۆیەوە وتی: برۆ، ئامانەتی خوابیت.

قەفەزەکەی هەڵگرت‌و هاتە حەوشەکەوە، ئێمەی بینی‌و هاتە لای منەوە، باسکی گرتم‌و بەهێواشی بەگوێمدا چرپاند: بابڕۆین.

هێمن دەهاتە بەرچاو بەڵام لێوی دەلەرزی، من بۆ دڵدانەوەی وتم:

ڕێگای هەموومانە ، بەکینایە وتی: سەرخۆشیەکی چاك! بابڕۆین.

وتم: جارێ مەڕۆ، ئێستا تەرمەکە هەڵدەگرن، دەبێت چاوەڕێ بین.. تۆ خۆتت بۆ ناگیرێت؟

بەدەنگێکی کزەوە وتی: بۆچی، دەتوانم خۆم بگرم.

قەفەزەکەی لەسەر زەویەکە داناو دەستی وەك خاچ لێ کرد.

ئاپۆ ئاناگنوستی‌و کوندومانولیو بەسەری ڕووتەوە لە ژووری مردوەکە هاتنە دەرێ‌و نیشانەی خاچیان کێشا، لەدوایانەوە چوار کەس لەسەما کەران کە هێشتا گوڵی سوری نیشانیان بەپشت گوێوە بوو، هێشتا خۆش‌و نیوە مەست بوون‌و، هەریەکەیان لایەکی ئەو دەرگایەی گرتبوو کە مردوەکەی لەسەربوو.

لەدوای ئەوانەوە چەنگ ژەنەکە لەگەڵ چەنگەکەی‌و دە دوانزە پیاوی کەم تا زۆر سەرخۆشدا کەهێشتا دەمیان دەجووڵا، پێنج شەش ژن کە هەریەکەیان تاوەیەك یان کورسیەکی بەدەستەوە بوو، دەهاتن، لەدوای هەمویشیانەوە میمیتو بوو کەپێڵاوە کۆنەکانی خانمی لەمل کرد بوو. بەگاڵتە جاڕیەوە هاواری کرد: مرۆڤ کوژان، تاوانباران، مرۆڤ کوژان.

بایەکی گەرمو شێدار هەڵی کردبوو، دەریا لەهەڵچووندا بوو. چەنگ ژەنەکە پیشەکەی بەسەر سازەکەیدا هێناو دەنگەکەی : تازەو شادو تەنز ئامێز، لەو شەوە گەرمەدا دەنگی دایەوە.

((تۆ ئەی خۆرەکەم، بۆ وا زوو ئاوابوویت؟))

زۆربا وتی: ئیتر تەواو ، بابڕۆین.

-٢٤ -

بەناو كۆڵانە تەنگەبەرەكانی ناو گوندەكەدا بێدەنگ تێ پەڕین، ماڵەكان بێ چرابوون‌و بەشەو وەك پەڵەیەكی ڕەش دەردەكەوتن، لەشوێنێكدا سەگێك دەوەڕی‌و لەجێگایەكی تردا گایەك دەی بۆڕاند، ئاوازی خۆشی چەنگەكە وەك دەنگی ئاوی فوارەیەك كەسەردەكەوێت‌و دادەكەوێتەوە لەدوورەوە بایەكە دەی هێناو بەگوێی ئێمەیدا دەدا.

من بۆ ئەوەی دیواری بێدەنگیە قورسەكە بشكێنم پرسیم:

-زۆربا، ئەم بایە لەكوێوە هەڵدەكات؟ بای باشوورە؟

بەڵام زۆربا كە لەپێشەوە دەڕۆیشت‌و قەفەی تووتیەكەی وەك فانۆس بەدەستەوە بوو وەڵامی نەدایەوە، كەگەیشتمە كۆختی سەركەنار دەریاكە ئاوڕی دایەوەو پرسی:

-برسیتە، سەرۆك؟

-نا، زۆربا، برسیم نیە.

-خەوت نایەت؟

-نا.

-منیش هەروا، وەرە كەمێك لەسەر چەوەكە دابنیشین، دەمەوێت شتێكت لێ بپرسم.

هەردووكمان ماندو بووین‌و نەمان دەویست بنووین، بەهیچ جۆرێك نەمان دەویست تاڵی‌و ناخۆشی ئەو ڕۆژەمان لەدەست بچێت، لای ئێمە خەو هەڵاتن بوو لەچركەساتی پڕ لەمەترسی‌و شەرممان پێ دەهات بڕۆین بخەوین.

لەكەناری دەریا دانیشتین، زۆربا قەفەزەكەی خستە نێوان هەردوو چۆكی‌و ماوەیەكی زۆر بێ دەنگبوو، تەنێكی ئەفسانەیی وەك گیاندارێكی چەند چاو، بەكلكێكی لوولەوە، لەپشت چیاكەوە دەركەوت.

جارجارە ئەستێرەیەكی لێ دەبوەوەو دەكەوتە خوارێ.

زۆربا دزەنیگایەکی بۆ کرد، بەسەرسامیەوە دەمی کرایەوەو سەیری ئاسمانی کرد، وەك یەکەمجاری بێت ئاسمان ببینێت وابووز

لەبەرخۆیەوە وتی: دەبێت هەواڵی ئەو سەرە چیبێت؟

ماوەیەکی پێچو تابڕیاریدا قسە بکات.

بەدەنگێکی شکۆدارو هەڵچوەوە کە لەو شەوە گەرمەدا دەزرنگایەوە وتی:

–تۆ سەرۆك،، دەتوانیت پێم بڵێیت هەموو ئەم شتانە یانی چی؟

کێ دروستی کردوون‌و بۆ دروستی کردوون؟ بەتایبەتیش (لێرەدا دەنگی زۆربا لەرك و ترسا لەرزینی تیٚ کەوت) مرۆڤ بۆ دەمرێت؟

من وەك ئەوەی ئاسانترین‌و لەهەمان کاتدا سەرەکی ترین پرسیاریان لیٚ کردبێتم کە ڕوون کردنەوەی بۆ من کارێکی ئاسان نەبێت بەشەرمەوە وەڵامیم دایەوە: نایزان، زۆربا.

زۆربا وتی: نایزانیت؟

وەك هەمان ئەو شەوەی کەپێم وت من نازانم سەما بکەم‌و، ئەو ئەوەندەی بەلاوە سەیر بوو کە چاوی بچووك بوەوە، دیسان هەر چاوی وای لیٚ هاتەوە.

چرکە ساتێك هێور بوو، لەپڕا تەقیەوە:

–ئەی کەواتە ئەم هەموو کتێبە نەعلەتیە چیە کەدەی خوێنیتەوە، بەکەڵکی چی دێن؟ بۆ دەیان خوێنیتەوە؟ ئەگەر کتێب دەربارەی ئەم شتانە هیچ ناڵێت ئەی باسی چی دەکات؟

–باسی ئەو سەرگەردانیەی مرۆڤ دەکات کەناتوانێت وەڵامی ئەم پرسیارەی تۆ بداتەوە، زۆربا.

نا ئومێدانە پێی بەزەویدا کێشاو هاواری لیٚ هەستا:

–با وەلبن بەو سەرگەردانیەی خۆیانەوە.

لەم هاوارە ناکاوە تووتیەکە هەلوەێستەیەکی کردو، وەك یەکێك داوای هاوکاری بکات بانگی هەڵدا:

–کاناڤارۆ، کاناڤارۆ.

زۆربا مستێکی بە قەفەزەکەیدا کێشاو وتی: تۆ ئیتر بێدەنگ بە.

پاشان ڕووی لەمن کردو وتی:

–من دەمەوێت تۆ پێم بڵێیت ئێمە لەکوێوە دێین و بۆ کوێ دەچین؟

تۆ ساڵانێکە تەمەنی خۆت لەم کتێبە سیحراویانەدا سەرف کردوەو دەبێت شیلەی دووسێ هەزار کیلۆ کاغەزت چەشتبێت، باشە، چیت لەمە دەستکەوتوە؟

دەنگی زۆربا ئەوەندەی ئازارو نیگەرانی تیا بوو هەناسەی منی بەگیرهێنا، ئاه، چەندم پێ خۆشبوو بمتوانیایە وەڵامی بدەمەوە.

من بەقووڵی هەستم بەوەکرد کە بەرزترین ترۆپك کەمرۆڤ دەیەوێت پێی بگات نە زانستە نە مەزنی، نە چاکەیەو نە سەرکەوتن، بەڵکوو شتێکی گەورەترە، قارەمانانەترو نائومێد کەرتر، ئەویش:

ترسی پیرۆزە

زۆربا بەدوودڵیەوە پرسی: وەڵام نادەیتەوە؟

ویستم تێی بگەیەنم کەمانای ترسی پیرۆز چیە؟

–بڕوانە، زۆربا، ئێمە وەك کرمی بچووك واین، کرمی زۆر ورد، بەسەر گەڵایەکی بچووکی درەختێکی گەورەوەین، ئەو گەڵا بچوكو ئەم سەر زەویەی ئێمەیە، گەڵاکانی دی ئەو ئەستێرانەن کە تۆ شەوانە لەکاتی جووڵەیاندا دەیان بینیت، ئێمە بەسەر گەڵا بچوکەکەی خۆمانەوە بەڕێدا دەڕۆین، بەوردی لێی دەکۆڵینەوە، بۆنی دەکەین‌و دەزانین بۆنی خۆشە یان ناخۆشە، دەی چێژین‌و دەبینین دەخورێت، پیایدا دەکێشین دەبینین دەنگی لێ بەرز دەبێتەوەو وەك هەر بوونەوەرێك هاوار دەکات.

((هەندێك لەو مرۆڤانەی کە لە وانی دی ئازاترن دەگەنە ئەو سەری گەڵاکە، ئێمە لەوێوە، چاومان زەق‌و گوێمان هەڵخستوە، بەرەو لای بۆشاییەکە دەنوشتێینەوەو دەلەرزین: لەژێر پێماندا هەست بەهەڵدێرێکی سامناك دەکەین، دوور بەدوور دەنگی گەڵاکانی تری ئەم درەختە مەزنە دەبیستین، هەست دەکەین کە ئاوگی ڕوەك لەڕەگی درەختەکەوە سەردەکەوێت‌و دڵمان دەماسێت. ئێمەیش کە بەهەموو لەش‌و گیانمانەوە بەسەر هەڵدێرەکەدا چەماوینەتەوەو لەترساندا لەرزمان لێ هاتوە، لەو چرکە ساتە بەدواوە

دەست دەکەیت بە ....) لێرەدا وەستام، ویستم بڵێم: لەو چرکە ساتە بەدواوە شیعر دەست پێدەکات، بەڵام زۆربا تێ نەدەگەیشت، ناچار بێدەنگ بووم.

بەشڵەژاوی دەنگی زۆربا بەرز بوەوەو پرسی:

–باشە، چی دەست پێ دەکات؟ بۆ بێدەنگ بوویت؟

–..مەترسیەکی گەورە دەست پێ دەکات، زۆربا، کۆمەڵێك تووشی سەرەگێژە دەبن و وڕێنە دەکەن، هەندێك دەترسن و هەوڵ ئەدەن وەڵامێکیان دەست بکەوێت کە دڵنیایان بکات، بۆیە دەڵێن: ((خوا)) کۆمەڵێکیش لەوسەری گەلاکەوە زۆر خۆگرن و دلێرانە تەماشای هەڵدێرەکە دەکەن و دەڵێن: ((پێم باشە))

زۆربا ماوەیەکی زۆر بیری کردەوە، هەوڵی تێگەیشتنی دەدا، پاشان وتی:

–من بەردەوام بیر لە مەرگ دەکەمەوەو لێی ڕادەمێنم و لێی ناترسم، بەم ئاکارەوە هەرگیز ناڵێم: ((پێم باشە)) هەرگیز، نا، من هەرگیز مەرگم لا باش نیەو پێم قبووڵ ناکرێت.

بێدەنگ بوو، بەڵام زوو بێدەنگیەکەی شکاند:

–نا، من لەوانە نیم وەك مەڕ ملم بخەمە بەردەمی مەرگ و پێی بڵێم ((وەرە سەرم ببڕە بۆ ئەوەی زوو بڕۆمە بەهەشت))

من بەسەرسامیەوە گوێم لە زۆربا گرتبوو، ئەمە کام حەکیم و دانا بوو دەیویست شاگردەکانی فێربکات هەرشتێك کە فەرمانی یاسایە بەدڵ فراوانیەوە ملی بۆ کەچ بکەن و بەحوکمی زەرورەت ((بەڵێ))ی بۆ بکەن و ئەوەی جەبرە بیگۆڕن بەئیختیارو ئارەزووی ئازاد؟

ڕەنگە ئەمە تاقە ڕێگایەك بێت بۆ ڕزگار بوونی مرۆڤ، ڕێگایەکی سەختە، بەڵام هیچ ڕێگایەکی تر نیە.

ئەی کەواتە یاخی بوون چیە؟ ئایا بزاوتێکی غرور ئامێزو دۆنکیشوتانەی مرۆڤە بۆ زاڵ بوون بەسەر ئەو بڕیارانەدا کە جەبرین، مل پێکەچ کردنی یاساکانی دەرەوەیە بۆ یاسا ڕۆحیەکانی خودی مرۆڤ، بۆ ڕەت کردنەوەی هەموو ئەو شتانەیە کە هەن و بەدی هێنانی

دنیایەكی تازەیە، دنیایەكی پاكیزەترو ئەخلاقیترو چاكتر كە بگونجێت لەگەڵ یاساكانی دڵی خۆیداو جیاواز بێت لەیاسا نامرۆڤایەتیەكانی سروشت؟

زۆربا لێی ڕوانیم، زانی ئیدی قسەیەكم نەماوە لەگەڵیدا بیكەم، لەسەرخۆ قەفەزەكەی هەڵگرت تا تووتیەكە لەخەو هەڵنەسێنێت، لەپشت سەریەوە دایناو لێی ڕاكشا.

وتی: شەوباش، سەرۆك، ئیتر بەسە.

لەباشوورەوە بایەكی گەرمو توند هەڵی كردبوو، لە ئەفریقاوە دەهاتو سەوزەو میوەو سنگە كریتیەكانی پێدەگەیاند، من وام هەست دەكرد ئەم بایە بەسەر تەوێڵو لێوو گەردنی مندا تێ دەپەڕێتو مێشكم وەك میوەیەك دەقەڵەشێو دەماسێت.

نەم دەتوانیو نەم دەویست بخەوم، بیرم لەهیچ نەدەكردەوە، تەنیا هەستم بەوەدەكرد كەلەو شەوە گەرمەداو لە وجودی مندا یەكێك یان شتێك خەریكە پێ دەگات، من بەئاشكرا هەستم بەو ڕووداوە سەر سوڕهێنەرە دەكرد كە من بەردەوام لەگۆڕاندام، ئەوەی هەمیشە لەتاریكترینو قووڵترین شوێنی ئێمەدا ڕوودەدات وا ئەمجارە بەڕۆژی روناكو لەبەر چاوی خۆمدا ڕوویان دەدا. هەر بەو جۆرەی كە لە كەناری دەریاكەدا دانیشتبووم تەماشای ئەم موجیزەیەم دەكرد.

ئەستێرەكان كزبوون، ئاسمان ڕوون بووەوە، لەسەر ئەم زەویە روناكە، وەك نەخشەیەك ڕەنگ ڕێژیەكی چاكی بۆ كرابێت، چیاو درەختو باڵندە ئاویەكان دەركەوتن:

بەیان لەسپێدەدا بوو:

ڕۆژان تێپەڕین، گوڵە گەنمەكان پێگەیشتبوونو سەری پڕیان دانەواندبوو، زیك زیكەكان بەسەردار زەیتونەكانەوە زیكە زیكیان بوو، مێروە بە ورشەو پرشەكان لەبەر تیشكی خۆردا ویزە ویزیان دەكرد، هەڵم لەدەریاكە هەڵدەستا.

هەموو ڕۆژێك، لەبەرە بەیانەوە، زۆربا بێ ئەوەی هیچ بڵێت، دەچوو بۆ كێو. كاری سازدانی تەلەفریكەكە تا دەهات نزیكتر دەبووەوە، دار مێخەكانیان لەشوێنی خۆیاندا داكوتا بوو، سیم ڕاكێشراوو بەكرە بەسترابوو. شەوانە زۆربا شەكەتو ماندو دەگەڕایەوە، ئاگری دەكردەوەو خواردنی دروست دەكردو پێكەوە شێومان دەكرد، هەردووكمان لەبەئاگاهێنانەوەی شەیتانە ترسناكەكەی دەرونمان، وەك عەشقو مەرگو ترس خۆمان

دەپاراست. ئیتر هیچ کاتێك، ئەناوی بێوەژنمان دەهێنایە ناوەوە نە هورتانس خانمو نە خوا، هەردووکمان لە دوورەوە، لەبێدەنگیدا، لەدەریا رادەماین!

بە هۆی بێدەنگی زۆرباوە، مەسەلە سەرەکیەکان، بەلام لەهەمان کاتدا بێ هوودەکان لەناوەوەی مندا سەریان هەلدەدا، دیسان سنگم پڕدەبووەوە لە نیگەرانی، لەخۆمم دەپرسی: ئەم دنیایە چیە، چ مەبەستێکی لەخۆیدا هەلگرتووە ئێمە بەم تەمەنە کورتەوە، بەکام رێگادا دەتوانین پێی بگەین؟ زۆربا بانگەشەی ئەوەیەتی کە ئامانجی مرۆڤ ئەوەیە بەهۆی مادەوە بەختەوەر بێت، هی تر دەلێن بەختەوەری بەهۆی رۆحەوەیە، ئەم دوانە لە زەمینەیەکی تردا دەبنەوە بەیەك، بەلام بۆ؟ بەچ مەبەستێك؟ ئەی کە لەش دارزا شتێك لەوە دەمێنێتەوە کە ئێمە ناوی رۆحی لێ دەنێین؟ یان هیچی لێ نامێنێتەوەو، ئەم تینویەتیە بەردەوامەی ئێمە بۆ نەمری لەوەوە سەرچاوەی نەگرتوە کە ئێمە نەمرین، بەلکوو لەوەوەیە کە لەم تەمەنە کورتو تیژ تێ پەڕەی خۆماندا لە خزمەتی شتێکداین کە نەمریە؟

بەیانیەك لەخەو هەستامو دەمو چاوم شت، دەت وت زەوییش لەخەو هەستاوەو خۆی ئارایش داوە، چونکە لەتەرو تازەییدا شەوقی دەدایەوەو لەوە دەچوو تازە دروست بووبێتەوە، بەرەو گوندەکە بەرێ کەوتم، لەلای چەپمەوە دەریای نیلی ڕەنگ بێ جووڵەو کڕبوو، لای ڕاستمەوە، لەدوورەوە کێلگەی گەنم وەك لەشکری نێزە زێڕین بالایان کردبوو، بەلای دار هەنجیری کچی پیرۆزدا کە بەگەلای سەوز داپۆشراوو وردە هەنجیری گرتبوو تێ پەڕیم، بەپەلەو بێ ئەوەی ئاوڕ بدەمەوە بەلای باخی بێوەژنەکەدا رۆیشتمو چوومە نێو گوندەکە، ئێستا میوانخانە بچووكو چۆلەکە دەرگاو پەنجەرەی پێوە نەمابوو، سەگی بەرەلا دەچوونە نێو حەوشەکەیو دەگەڕانەوە، هەموو ژوورەکان خالی بوون، لە ژوری مردوەکەدا ئیتر نە قەرەوێلە هەبوو، نەسندوقو نەکورسی، تەنیا لە سوچێکدا تاکێك دەم پای کۆنو دڕاو مابووەوە، گولێنگەی سوری پێوە بوو، ئەم دەم پا نابووتە هاوڕێیەکی لە وەفابوو کە هێشتا شێوەی پێی خاوەنەکەی لەدەست نەدابوو، تەنانەت لەگیانی مرۆڤ دلسۆزتر بوو کە هێشتا پێی خۆشەویستو ستەم دیدەی لەیاد نەکربوو.

شەو درەنگ گەڕامەوە، زۆربا ئاگری كردبوەوەو خەریكی چێشت لێنان بوو، هەر كە بۆ سڵاو لێ كردنم سەری بەرز كردەوە تێ گەیشت لەكوێوە دەگەڕێمەوە، بڕۆی هێنایەوە یەك‌و دوای چەند ڕۆژ بێدەنگی ئەو شەوە گرێی دڵی كردەوەو كەوتە قسە كردن، ئاوازێكی وای دەدایە وتەكانی كە هەق بەوبێت، وتی:

—سەرۆك، ئازارەكان دڵم دەشكێنن‌و دەیكەنە دووكەرتەوە، بەلام دڵم هێند تیری خواردوەو هەمووی بۆتەزام‌و كون كون بوە، ئیتر وای لێهاتوە لەخۆیەوە زوو سارێژ دەبێت‌و شوێنەواری برینەكان نامێنن، سەرتاپای جەستەی من لەسەرمەوە تاپێم جێگە زامەو هەر لەبەر ئەمەیشە ئەوەندە بەرگە دەگرم.

من بە دەنگێك كەخۆم نەمزانی چۆن ئاوا دڵڕەقانە بەسەر دەمما هات وتم:

—زۆربا، تۆ بوبولینای داماوت زۆر زوو لەیاد كرد. ها!

زۆربا پێی ناخۆش بوو، دەنگێكی لێوەهات‌و زیاتر بڵندی كرد:

*ڕێگای نوێ‌و بەرنامەی نوێ! تازە من بیر لەوە ناكەمەوە كە دوێنێ چی ڕویداوە، قسەیش لەسەر ئەوە ناكەم سبەی چی ڕوودەدات، لای من تەنیا ئەوشتە مەبەستە كە ئەمڕۆو هەر لەم چركە ساتەدا ڕوودەدات.

بەخۆم دەڵێم: ((زۆربا ئێستا دەتەوێت چی بكەیت؟— دەمەوێت بنووم باشە چاك بنوو. —زۆربا ئێستا دەتەوێت چی بكەیت؟— دەمەوێت كاربكەم، —كەواتە باشە كاربكە. —زۆربا ئێستا سەرگەرمی چیت؟ —دەست لە ملانی ژنێكم— بادەست لەملانێیەكەت باش بێت، زۆربا ئەوكاتەی سەرگەرمی ئەم كارەیت شتەكانی تر لەبیربكە، چونكە بێجگە لەخۆت‌و ئەوژنە كەسی تر لەدنیادا نیە، دەی خەریكیبە))

هەر دوای كەمێك وتی:

—كە ئەو لەژیاندا بوو، واتا بوبولینا، ئەوەندەی من— منێك كە ئێستا لەگەڵتا دەدوێم، منی زۆربای پیرو پەك كەوتە— چێژم پێ گەیاندوە هیچ كاناڤارۆیەك ئەوەندەی چێژ نەداوەتێ، دیارە دەپرسیت بۆ؟ چونكە هەموو كاناڤارۆكانی دنیا، لەوكاتەدا كە لەگەڵ ئەودا ڕایان بواردوە بیریان لای كەشتیە جەنگیەكانیان، لای كریت، لای پاشاكانیان، لای پلەو پایەیان، لای ژنەكانیان بوە. بەڵام من هەموو ئەمانەم لەبیر خۆم دەبردەوەو ئەویش،

ئەو جندەیە، خۆی زۆرباش ئەمەی دەزانی، تۆیش ئەی زانای گەورەو گران، ئەوە بزانە، کەلای ژن هیچ لەزەتێك لەو لەزەتە گەورەتر نیە، گوێ لەمە بگرە بەڵکوو کەڵکی بۆت هەبێت(ژنی ڕاستەقینە زیاتر لەزەت لەوە وەردەگرێت کە خۆی بەپیاوی دەبەخشێت وەك لەو لەزەتەی کەخۆی لەپیاوی وەردەگرێت.(

چەمایەوە تا دار بخاتە ناو ئاگرەکەوەو بێدەنگ بوو.

من تەماشام دەکردو زۆر زۆرم خۆشی پێ دەهات، هەستم دەکرد ئەم دەقیقانە، بەسەر ئەم کەنار دەریا چۆڵو تەریکەوە، هەرچەندە سادەو ساکارە بەڵام زۆر بەنرخەو خاوەنی قوڵترین بەهای مرۆڤایەتیە، شێومان لەشێوی ئەو دەریاوانانە دەچێت کە دادەبەزێتە سەرکەنارە چۆڵو هۆڵەکانو بەماسی سەدەفـو پیازو بیبەر دروستی دەکەنو لەهەموو خۆراکێکی دی بەتام ترەو، بۆ توانای ڕۆحیی مرۆڤیش چ خواردنێکی تری ناگاتێ. ئێمەیش لێرە، لەم پەڕی دنیایە، لەدوو دەریاوانی کەشتی شکاو دەچووین.

زۆربا دوای بیر کردنەوە وتی: دووبەیانی ڕۆژی کردنەوەی دەزگای تەلەفریکەکەیە، ئیتر پێم زەوی ناگرێت، لە ئاسماندامو باڵم گرتوە. من هەواییەکمو بەسەر شانمەوە هەست بەخرە خڕی بەکرەکان دەکەم.

وتم: زۆربا، لەبیرتە لەکافیتریاکەی بەندەری ((پیرە))دا چ چەشێکت بەقولاپەکەتەوە کردبوو چۆنیش منی پێوەبووم؟ وتت گوایا باشترین گۆشتاو لێ دەنێیتو ڕێکەوت منیش گۆشتاوم لەهەموو خواردنێکی دی پێ خۆشترە. تۆ چۆن ئەمەت زانیبوو؟

زۆربا بە کەمە بێزاریەکەوە سەری باداو وتی:

—نازانم، سەرۆك، هەر لەخۆیەوە بەدڵما هاتبوو، هەر بەو جۆرەی کە لە گۆشەیەکی کافیتریا کەدا هێورو بەویقار دانیشتبووینو بەسەر کتێبێکی بچووکی بەرگ زێڕکفتەوە چەمابوویتەوە، نازانم چۆن،

بەلام لەگەڵ خۆمدا وتم دەبێت تۆ حەزت لە گۆشتاو بێت، وتم هەر لەخۆیەوە وام بەبیردا هات، ئیتر پێویست بەوە ناکات بەدوای بۆچیو لەبەر چیدا بگەڕێین:

بێدەنگ بوو، گوێی ڕاگرت، لەپڕا وتی:

—بێدەنگبە، یەکێك بەرەو ئێرە دێت.

دەنگی هەنگاوی گورجو هەناسە بڕکێی یەکێك دەهات، لەبەر ڕوناکی ئاگرەکە، قەشەیەك بەبەرگی دڕاوو سەری ڕووتو ڕیشی سوتاوو نیوە سمێڵێکەوە، لەبەردەممانداقوت بووەوە، بۆ نەوتێکی زۆری لێ دەهات:

زۆربا هاواری دەکرد:

–ها: خۆش هاتیت، باوە زەکەریا، ئەوە کێ تۆی بەم حاڵو ڕۆژە گەیاندوە؟

قەشە کە لە سەر زەویەکە، نزیك بەئاگرەکە گرمۆڵە بوو، چەناگەی دەلەرزی.

زۆربا خۆی بەسەریدا لار کردەوەو چاوی لێ داگرت، ڕاهیب وەڵامی دایەوە:

بەڵێ.

زۆربا بەدەنگی بەرز وتی:

–ئافەرین ڕاهیب، ئیتر لەوە دڵنیابە کە دەچیتە بەهەشت، ئەمە گومانی تیانیە، کە دەیش چیت تەنەکەیەك نەوتت بەدەستەوەیە.

ڕاهیب نیشانەی خاچی کێشاو وتی: لەسەر خوا.

–چۆنو کەی ڕوویدا؟ بۆم بگێڕەوە.

–ئای..! کاناڤارۆی برا، من میکایلی فریشتەم بینیو ئەو دەستوری دامێ، گوێ بگرە بۆت باس بکەم. بەتەنیا لەچێشتخانە دەرگا داخراوەکە دانیشتبوومو خەریکی فاسۆلیا پاك کردن بووم، هەموو باوکە ڕۆحانیەکان سەرگەرمی نوێژی عەسر بوونو دنیا کڕبوو، گوێم لەدەنگی باڵندەکان بوو وام دەزانی فریشتەن، تەواو دڵنیا بووم، هەموو شتێکم ئامادە کردبوو، چاوەڕوانی دەرفەت بووم، تەنەکەیەکم نەوت کڕیبوو، لەژێر مێزی پیرۆزی پەرستگای گۆڕستانەکەدا شاردبوومەوە تا میکایلی فریشتە پیرۆزی بکات.

((بەڵێ، دوێنێ دوای نیوەڕۆ فاسۆلیای سەوزم پاك دەکرد کەبیری بەهەشت لەسەری دامو بەخۆم وت:((ئەی پەروەردگاری من، عیسای مەسیح، کارێك بکە منیش شایانی بەهەشت بم، من ئامادەم لەچێشتخانەی بەهەشتا بۆ هەمیشە سەوزە پاك بکەم)) ئاوا، من بیرم لەوە دەکردەوەو فرمێسك بەچاوما دەهاتە خوارێ، لەپڕا بەسەر سەرمەوە دەنگی باڵ پێکدادانم گوێ لێ بوو، یەکسەر لە مەبەستەکە گەیشتم. من دەلەرزیمو سەرم دانەواند بوو، دەنگێکم هاتە گوێ کە دەیوت: ((زەکەریا، سەرت بەرز بکەرەوە، مەترسە، بەڵام من

لەرزێکی وام لێهاتبوو کەلەسەر زەویەکە کەوتم، دەنگەگە دووبارەی کردەوە:((سەرت بەرزبکەرەوە، زەکەریا)) من سەرم بڵند کردو بینیم دەرگا کراوەتەوەو میکایلی فریشتە لەبەر دەرگا وەستاوە، هەر بەو شێوەیەی کەبەسەر دەرگای پەرستگاکەوە وێنەی کرابوو، یەعنی بەباڵی ڕەش‌و پێڵاوی دارین‌و سورو کڵاو خوودەی ئاڵتونیەوە، بەڵام لە بری شمشێر مەشخەڵێکی داگیرساوی بەدەستەوە بوو، پێی وتم:((سڵاوت لێ بێت، زەکەریا، لەوەڵامدا وتم: من بەندەی خوام، چی دەفەرموویت؟ وتی: ئەم مەشخەڵە هەڵگیرساوە بگرەو دەستی خوات لەگەڵ((دەستم درێژ کردو هەستم بەسوتانی ناو لەپم کرد، بەڵام میکایلی فریشتە ون ببوو. من تەنیا لەپشت دەرگاکەوە، هێڵێکی ئاگرم لەئاسماندا بینی وەك ئەستێرە کشا)).

راهیب ئارەقەی دەم‌و چاوی سڕی، ڕەنگ بە ڕویەوە نەمابوو، وەك یەکێك لەرزی لێ هاتبێت دانە چۆقەی بوو.

زۆربا وتی: باشە، ڕاهیب، دوای ئەوە؟

—لەوکاتەدا باوکە رۆحانیەکان لەنوێژی عەسر دەگەڕانەوەو دەڕۆیشتنە ژووری نان خواردن، کەبەلای مندا تێ دەپەڕین سەرۆکی دێر، وەك من سەگ بم، لەقەیەکی پێداکێشام، باوکە رۆحانیەکانی دی دایانە قاقای پێکەنین، من هیچم نەوت.

لەدوای هاتنی فریشتە میکایلەوە هەوا بۆنێکی لێ دەهات لەبۆنی گۆکرد دەچوو، بەڵام کەس هەستی پێ نەدەکرد. هەموویان چوونە سەرمێزی نان خواردن، سفرەدارەکە لێی پرسیم:(( زەکەریا، بۆ نایەیت نان بخۆیت؟)) هەر وا بێ دەنگ‌و سەنگ بووم.

دومەتیوس، راهیبە بی موەکە وتی☹(نانی فریشتەکان بۆ ئەو بەسە)) جارێکی تر باوکە رۆحانیەکان دایانەوە پێکەنین، ئینجا من هەستام‌و بەرەو گۆڕستانەکە بەڕێ کەوتم، لەبەرپێی فریشتە میکالیدا لەسەردەم کەوتم، بەدرێژایی چەند سەعاتێك وام هەست دەکرد پێی لەسەر شانمە. کات وەك بروسکە تێ دەپەڕی، هەر ئاوایش سەعات‌و سەدە لەبەهەشتا تێدەپەڕن. گەیشتە نیوەی شەو، هەموو شوێنێك هێور بوو، ڕاهیبەکان چووبوون بنوون، من هەستام، نیشانەی خاچم کێشا، پێی فریشتەکەم ماچ کردو وتم:

((ئەوەی تۆ فەرمانت داوە دێتە دی)) تەنەکە نەوتەکەم هەڵگرت، سەرەکەیم کردەوە، هەندێك پەڕۆ کۆنەم لەجلەکانمەوە پێچاو هاتمە دەرێ.

شەوێکی ئەنگوستە چاوبوو، مانگ هێشتا هەڵنەهاتبوو، دێرەکە وەك دۆزەخ تاریك بوو، هاتمە حەوشەکەوە، بەپلیکانەکاندا سەر کەوتم، چوومە ژووری سەرۆکی دێرو نەوتم بەدەرودیوارو پەنجەرەیدا کرد، پاشان بەپەلە خۆم گەیاندە ژووری دومەتیوس، لەوێوە نەوتم بەژورو دالآنە درێژە لەدار دروست کراوەکەدا کرد، هەرتەواو وەك ئەوەی تۆ پێت وتبووم. پاشان چوومە پەرستگاکەوە، مۆمێکم بەچرای زەیتی مەسیح داگیرساندو ئاگرم لەدێرەکە بەردا))

راهیب هەناسەی گیراو بێدەنگ بوو، چاوی ئاگری لێ دەبووەوە، بەدەم نیشانەی خاچ کێشانەوە قریواندی:

-پەنا بەخوا! پەنا بەخوا، لەچاوتروکانێکدا بلێسەی ئاگر لەدێرەکەوە زمانەی کێشا، من هاوارم کرد: ئەمە بلێسەکانی ئاگری دۆزەخەو، هەڵاتم. چەندم توانا هەبوو دامە ڕاکردن و گوێم لەدەنگی زەنگ لێدان و قیژەو هاواری راهیبەکان بوو...

((رۆژبوەوە، خۆم لەدارستانەکەدا شاردبوەوە، دەلەرزیم، خۆر کەوتبوو، گوێم لەراهیبەکان بوو ژێر دەوەنەکانم بۆ دەگەڕان، بەڵام خوا پەڵە هەورێکی بەسەرمدا کێشابوو کە ئەوان منیان نەدەبینی، نزیکی خۆر ئاوا گوێم لەدەنگێك بوو وتی:((بگەرە کەنار دەریاو خۆت رزگار بکە)) من هاوارم کرد: ئەی فریشتە، ڕابەریم بکە، کەوتمە ڕێ، خۆیشم نەم دەزانی بۆ کوێ دەچم.

ئەوە هەر میکایلی فریشتە بوو کەجارێك، دەبوە هەورە بروسکەو جارێك وەك باڵندەیەکی ڕەشی نێو درەختەکان و یان لەشێوەی توولە رێیەکدا کە لە چیاوە بەرەو نشێوی بێتە خوارێ ڕێ نمایی دەکردم. منیش بەبڕواو هەموو هێزمەوە بەدوایدا ڕام دەکرد، وا ئێستا لەسایەی بەخشندەیی ئەوەوەیە کە تۆم دۆزیەوە، ئەی کاناڤارۆی ئازیز، ئیدی رزگارم بوو))

زۆربا هیچی نەدەوت، بەڵام پێکەنینێکی فرە، پڕ لە هەوەس و بێدەنگی هەموو سەروچاوی داگرتبوو، لە دەمیەوە تا گوێچکە پڕ لە موەکانی گرتبوەوە.

شێو ئامادە بوو، زۆربا لەسەر ئاگرەکەی هێنایە خوارێ.

لە ڕاهیبی پرسی: بەڕاست، زەکەریا((نانی فریشتەکان)) مانای چی؟

ڕاهیب نیشانەی خاچی کێشاو وەڵامی دایەوە: ڕۆح.

-رۆح؟ بە وتەیەکی دی یانی با؟ هاوڕێ، بامرۆڤ تێرناکات.

وەرە نان بخۆ، سوبی ماسیو هەندێك گۆشت، زۆرت کارکردوە، بۆ ئەوەی هێزت تێ بێتەوە، وەرە دەی نان بخۆ.

ڕاهیب وتی: برسیم نیە.

-زەکەریا برسی نیە، ئەی یوسف؟ یوسفیش برسی نیە؟

ڕاهیب بەدەنگێکی لەسەرخۆ، وەك دەرگا لەسەر نهێنیەکی گەورە بکاتەوە، وتی:

-یوسف، ئەویوسفە نەحلەتیە سوتا، سوپاس بۆ خوا.

زۆربا دایە پێکەنین: سوتاوە؟ چۆن؟ کەی؟ تۆ خۆت بینیت؟

-بەڵێ، کاناڤارۆی برام، هەر ئەو کاتەی من مۆمەکەم بەچرای مەسیح داگیرساند ئاگری گرتو سوتا، بەچاوی خۆم دیم کەوەك شریتێکی ڕەش بەپێتی ئاگرەوە لەدەممەوە چوەدەرێ، بڵێسەی مۆمەکەی بەرکەوتو، وەك مار پەپکەی خواردو بوو بەخۆڵەمێش. ☧ ڕەحمەتێك: وەك ئەوە وایە کەمن ئێستا چووبێتمە بەهەشتەوە.

لەپاڵ ئاگرەکەدا کە لەسەر ئەژنۆ دانیشتبوو هەستا:

-دەڕۆم لە کەناری دەریاکەدا دەنووم، وایان فەرمان پێ کردووم.

چەند هەنگاوێك بەرەو کەناری دەریاکە ڕۆیشتو پاشان لەنێو تارکیەکەدا ون بوو.

وتم: زۆربا، تۆ لەگیانی ئەو بەرپرسیاریت، ئەگەر ڕاهیبەکان بیدۆزنەوە لەناوی دەبەن.

-نای دۆزنەوە، سەرۆك، نیگەران مەبە، من باش لەم فرتو فێڵانە شارەزام. سبەینێ ڕیشی دەتاشم، قاتێك جلکی مرۆڤانەی لەبەر دەکەمو دەینێمە ناوکەشتی، تۆ گوێی پێ مەدە چونکە ئەوە ناهێنێت، بەڕاست گۆشتاوەکەی باشە؟ بەئیشتیهای تەواوەوە لەم نانی ئادەمیزادە بخۆو خۆت سەغڵەت مەکە.

زۆربا بەئیشتیهای تەواوەوە خواردیو خواردیەوەو سمێڵی پاك کردەوە، ئینجا ئارەزووی قسەکردنی هاتبوو.

وتی: سەرۆك. بینیت کە شەیتانەکەی مردبوو؟ ئێستا ئەو بێچارەیە تەواو خاڵی بۆتەوەو هیچی تیانەماوە، ئێستا ئەویش وەك خەڵکی تری لێ هاتوە.

بۆ چرکە ساتێك بیری کردەوەو لەپڕا وتی:

—تۆ لەو بڕوایەدایت، سەرۆك، کە شەیتانەکەی ناوەوەی ئەو هەر ..

وتم:

—بێگومان، بیری سوتاندنی دێرەکە چنگی لەهەناوی گیر کردبوو، کەدێرەکەی سوتاند ئاسودە بوو، هەر ئەو بیرەیش بوو دەیویست گۆشت بخوات، شەراب بخواتەوە، پێ بگاتو ببێت بەکار. خودی زەکەریا نەپێویستی بەگۆشت بوو نە بەشەراب، ئەو بەرۆژو گرتنو خەڵوەت کێشان پێی دەگەیشت.

زۆربا ئەم وتانەی لەمێشکیا هێناو برد، پاشان وتی:

—ڕاستە، منیش بڕوام وایە تۆڕاست دەکەیت، سەرۆك، من وا هەست دەکەم پێنج شەش شەیتانم تێدایە.

—ئێمە هەمووومان شەیتانمان تیایە، زۆربا، مەترسە، چەندە زیاتر بن باشتر، ئەوەندە بەسە کە هەموو ئەو شەیتانانە لەڕێگای جیا جیاوە بەرەو یەك ئامانج بچن.

ئەم قسانە کاریان لە زۆربا کرد، سەرە زلەکەی خستە نێوان هەردوو ئەژنۆیەوەو کەوتە بیرکردنەوە.

پاشان سەری بڵند کردو وتی: کاهم ئامانج؟

—من چوزانم زۆربا! توشتی گران لەمن دەپرسیت، چۆنت بۆڕوون بکەمەوە؟

—ئاسانتری بڵێ تاتێت بگەم. من تا ئێستا بەردەوام شەیتانەکانی خۆمم ئازاد کردوە کە هەرچیەکیان پێ خۆشە بیکەنو چ ڕێگایەکیان بەدڵە لەبەری بگرن، هەر لەبەر ئەمەیە کە هەندێك کەس من بەبێ شەرەف دەزانن و هەندێکی تر بەشەریف، هەندێك بەشێتم دەزانن و هەند[illegible] تر بە سلێمانی حەکیم. من ئەمانەو زۆرشتی تریشم، وەك زەڵاتەیەکی روسی وام کە هەموو شتێکی تیایە، جا ئەگەر دەتوانیت زیاتر بۆم ڕوون بکەرەوە، کام ئامانج؟

—زۆربا، من وادەزانم— ڕەنگە لەمەدا هەڵەیش بم—کە سێ جۆرە مرۆڤ هەن:

یەکەمیان ئەوانەن کە تاقە ئامانجیان ژیانی خۆیانە، یەعنی وەك خۆیان دەڵێن بخۆن‌و بخۆنەوەو عەشقبازی بکەن‌و دەوڵەمەند بن‌و ناوبانگ دەربکەن.

دوەمیان ئەوانەن کە ئامانجیان تەنیا دابین کردنی ژیانی خۆیان نیە، بەڵکوو ژیانی هەموو مرۆڤایەتیان مەبەستە، ئەمانە بڕوایان وایە کە مرۆڤ هەموو یەکێکن‌و هەوڵ دەدەن بۆ ئەوەی ڕووناکی بخەنە ناو هەموو یانەوە. ئەوەندەی بتوانن هەموو کەسێکیان خۆش بوێت‌و چاکەیشیان لەگەڵدا بکەن.

دەستەی سێیەمیش ئەوانەن کە دەیانەوێت لەژیانی هەموو ئەم گەردوونەدا هەبن‌و، دەڵێن ئێمە گشتمان، واتا مرۆڤو جانەوەرو گیاو ئەستێرەکان یەکێکین‌و، هەموو لەجەوهەری تاکین کە تووشی شەڕێکی زۆر سامناك هاتووین. کام شەڕ؟ گۆڕینی مادە بەڕۆح.

زۆربا سەری خوراندو وتی:

—سەرۆك، سەری من وشکە، بەئاسانی تێناگەم، خۆزگا دەت توانی هەموو ئەمانەت بە سەما تێ بگەیاندمایە.

من بە نیگەرانیەوە لێوی خۆم گەست، خۆزگا هەموو ئەم بیرانەم بەنائومێدیەوە بە سەما دەردەبڕی، بەڵام بەداخەوە کە شتێکی وام لەدەست نایەت‌و تەمەنم بەهەدەر چوو.

—یان بەلای کەمەوە دەتتوانی گشت ئەم قسانەم وەك چیرۆکێك پێ بڵێیت. سەرۆك، وەك حسەین ئاغا، حسەین ئاغا مێردێکی تورکی دراوسێمان بوو، پیاوێکی زۆر پیرو زۆر هەژار بوو، بێ‌ژن‌و منداڵ‌و بەتەنیا دەژیا، جلەکانی کۆن بوون بەڵام لەپاك‌و تەمیزیدا دەبریسکایەوە. خۆی جلەکانی دەشت‌و خۆراکی بۆ خۆی دروست دەکردو ژوورەکەی پاك دەکردەوە، شەوانە ئاسایی دەهاتە ماڵی ئێمە، لەگەڵ نەنکم‌و پیرێژنەکانی تردا لەحەوشە دادەنیشت‌و گۆرەوی دەچنی.

((ئەم حسەین ئاغایە پیاوێکی زۆر خوا پەرست بوو، ڕۆژێك منی خستە سەر ئەژنۆی‌و وەك بەرەکەتم بداتێ دەستی نایە بان سەرم‌و وتی:

ئالکسیس، ڕازێك هەیە دەمەوێت پێت بڵێم، تۆ هێشتا منداڵی‌و لەوە بچووکتریت شتێك تێ بگەیت، بەڵام کەگەورە بوویت تێ دەگەیت. گوێم لێ بگرە کوڕەکەم، خوای میهرەبان

کەسێکە نە لە حەوت تەبەقەی ئاسمان جێی دەبێتەوە نە لە حەوت تەبەقەی زەوی، بەڵام لەدڵی مرۆڤدا جێگای دەبێتەوە، بۆیە، دەستم بە داوێنت، ئالکسیس ((هیچ کاتێك دڵی کەس مەشکێنە))

من بێدەنگ گوێم لە قسەکانی زۆربا گرتبوو، لەگەڵ خۆمدا بیرم کردەوە: خۆزگا تەنیا ئەو کاتە زمانی قسەکردنم بپژایە کە بیرە زەینیەکانم بگەیشتنایەتە لووتکەی پێ گەیشتویی، واتا ببوو نایەتە چیرۆك، بەڵام تەنیا شاعیرێکی گەورە دەتوانێت بەو لووتکەیە بگات. یان میللەتێك دوای چەندین سەدەی گەشەکردن و ئارامی.

زۆربا لەجێگاکەی هەستاو وتی:

—دەڕۆم بزانم ئەو ئاگر خەرەوەیەمان چی دەکات و بۆ ئەوەی سەرمایشی نەبێت پەتویەکی بەسەردا بدەم، مقەستێکیش لەگەڵ خۆمدا دەبەم نەوەك پێویستم پێی هەبێت.

شتەکانی هەڵگرت و زەردەخەنەیەکی کرد، بەدرێژایی کەنارەکەدا بەڕێ کەوت.

مانگ هەڵاتبوو، روناکیەکی کەمی نەخۆش ئاسای بەسەر زەویدا پەخش دەکرد.

من بەتەنیا لەپاڵ ئاگرە کوژاوەکەدا قسەکانی زۆربام هەڵدەسەنگاند،

ئەو قسانەی پڕ بوون لە ماناو بۆنی گەرمی خاکیان لێ دەهات، هەستت دەکرد لە قوڵایی دڵیەوە هاتوون و هێشتا تەوشقە ئینسانیەکەیان تێدایە، هەموو قسەکانی من لەپەڕە کاغەز دروست کرابوون، لەسەرمەوە دەڕژانە خوارێ و بەزەحمەت دڵۆپە خوێنێکیان بەرکەوتبوو، خۆ ئەگەر نرخ و بەهایەکیشیان هەبێت ئەوە هەرهی ئەو دڵۆپە خوێنەیەو بەس.

لەسەردەم کەوتبووم و خۆڵەمێشە گەرمەکەم تێك دەدا، لەناکاوێکدا زۆربا گەڕایەوە، دەستی کەوتبوە ئەملاو ئەولای و ڕەنگی پەڕیبوو، وتی:

—سەرۆك، بێ تاقەت مەبە...

ڕاپەڕیمە سەرپێ، وتیەوە

—راهیبەکە مرد.

—مرد؟

بەسەر بەردێکەوە درێژ کەوتبوو، مانگ بەسەریەوە تافەتافی بوو، لەسەر ئەژنۆ دانیشتمو بەمقەستەکە کەوتمە هەڵپاچینی ڕیش‌و پاشماوەی سمێڵەکەی، من هەر دەم بڕی‌و ئەو هیچ نەدەجووڵا، چونکە گەرمی کارەکە ببووم سەریشم دایە بەرمقەست، ڕەنگە نیوکیلۆ تووکم لێ کردبێتەوە، لەپڕا بینیم وەك مەڕی بڕاوەی لێ هاتبوو، دامە قاقای پێکەنین، ڕام وەشاندو هاوارم لێ کرد: ((هێی، زەکەریای بەڕێز، هەستە تا موجیزەیەکی حەزرەتی مریەم ببینیت، هەستە، لەعنەتی)) بەڵام نەو، یارۆ ئەسڵەن بۆی نەجووڵا، دیسان ڕام وەشاندەوەو بێ‌سوود بوو، بەخۆم وت: ((پیرەمێردی بێچارە، ناشێ بەڵایەکی بەسەر هاتبێت، جلەکانیم کردەوە، سنگیم ڕووت کردو دەستم لەسەر دڵی نا، بەڵام ترپەی لێ بڕابوو، لەڕاستیا هەردەنگ نەبوو، ماتۆڕەکەی لەکارکەوتبوو.

زۆربا لەگەڵ قسەکردندا تادەهات زیاتر دەکرایەوە، چرکەساتێك لەمەوبەر مەرگ لەزمانی خستبوو، بەڵام زووگەڕایەوە سەرباری خۆی.

—ئێستا چی بکەین سەرۆك؟ من وای بەچاك دەزانم لاشەکەی بسوتێنین، ((ئەو کەسەی بە نەوت خەڵکی دەکوژێت، دەبێت خۆیشی بەنەوت بمرێت)) مەگەر وتەیەکی وا لە ئینجیلدا نیە؟ ئەی تۆ دەزانیت ئەو بەم جلە نەوتاویانەوە باش ئاگردەگرێت، هەروەکو یەهودا لەپێنج شەممەی پیرۆزدا.

بە نارەزاییەوە وتم: چیت پێ باشە بیکە!

زۆربا کەوتە بیرکردنەوەیەکی قووڵەوە، دوایی وتی:

—ناخۆشە، زۆریش ناخۆشە... ئەگەر ئاگری پێوە بنێم جلەکانی وەك مەشخەڵ دەسوتێن، بەڵام نەگبەتە خۆبێجگە لەپێست‌و ئێسقان هیچی تر نیە، لەبەر ئەوەیش کەزۆر لاوازە زۆری دەوێت ببێتە خۆڵەمێش، داماوە مسقاڵێك چەوریيشی نیە تا یارمەتی سووتانەکە بدات.

زۆربا سەری ڕاوەشاندو لەسەر قسەکانی ڕۆیشت:

—تۆ وابیر ناکەیتەوە کە ئەگەر خوا هەبوایە پێش بینی ئەم مەسەلەیەی دەکردو بۆ ئەوەی کارەکەی ئێمە ئاسان بێت ئەوی بەقەڵەوی‌و خەزو بەزەوە دروست دەکرد؟ تۆ دەڵێی چی؟

—من مەخەرە ناو ئەم کێشەیەوەو خۆت چۆنت بەدڵە وای بکە، بەڵام هەرچی زووتر چاکتر.

—لەهەموو چاکتر ئەوەیە کە لەم نێوانەدا موجیزەیەك ڕوبدات! دەبێت ڕاهیبەکان بڕوا بەوە بهێنن کە خوا خۆی دەوری سەرتاشی دیوەو دوای ئەوەی سەرو ڕیشی پاك پاك تاشیوە لەتۆڵەی سوتاندنی دێرەکەدا کوشتوویەتی.

زۆربا کەوتە سەر هەڵکڕاندن، وتم:

—وەلێ ئاخر چ موجیزەیەك؟ کامە موجیزە؟ گیر خواردنەکەت لێرەدایە، زۆربا.

مانگ لەشێوەی هیلالدا، بەرەنگی ئاڵتوونی یان سوورەوە، وەك پارچە ئاسنێکی سوورکراوەی ناو ئاگر لە ئاسۆدا بەرەو ئاوابوون دەچوو.

من ماندو بووم‌و ویستم بنووم، لەبەرەبەیاندا لەخەو هەستام، زۆربام لای خۆمەوە بینی خەریکی قاوەلێنان بوو، ڕەنگی پەڕیبوو، لەبەر ئەوەیش کە بەدرێژایی شەو نەنوستبوو چاوی سورو ئاوسا بوو، بەڵام لێوی ئەستووری کە هەر لەسابرێنی دەکرد زەردەیەکی شەیتانانەی لەسەربوو.

—من دوێ شەو نەنووستم سەرۆك، کارم هەبوو.

—چ کارێك، مەلعون؟

—خەریکی موجیزە بووم.

پێکەنی‌و دەستی خستە سەر لێوی

—پێت ناڵێم، سبەی ڕۆژی کردنەوەی دەزگای تەلەفریکەکەیە، ئەو بەرازە خیپشانە بۆ پیرۆزبایی‌و موبارەکی لێ کردنمان دێنە ئێرە، ئەوسا لەموجیزەی خانمە تۆڵە کەزۆر بەتوانایە ئاگاداردەبن.

قاوەی تێ کردو بەردەوام بوو:

—دەزانیت سەرۆك، ڕەنگە من بۆ سەرۆکایەتی کردنی دێر چاکبم، لەسەر گرەو دەیکەم، ئەگەر دێرێك بکەمەوە هەموو دێرەکانی تر بە داخستن دەدەم‌و مشتەریەکانیان بۆ خۆم دەبەم. فرمێسکت دەوێت؟ پارچە ئیسفنجێکی تەڕ دەخەمە پشت پەیکەرەکانەوە، ئەوسا هەموو قەدیسەکانم دەست دەکەنە گریان. دەنگی هەورە

بروسکەت دەوێت؟ لەژێر مێزی پیرۆزەوە ئامێرێکی میکانیکی دادەنێم تەرەقە بتەقێنێت. تارمایت دەوێت؟ دووڕاهیب کەجێگای بڕوا بن شەوانە مەلافە لەخۆیان دەپێچن و بەسەربانی دێرەکەدا دێن و دەچن، هەموو ساڵێکیش بۆ جەژنی مریەمی پاکیزە فەوجێك شەل و کوێرو ئیفلیج کۆدەکەمەوە کە دووبارە دنیا ببیننەوەو لەسەرپێ بوەستن، بەشێوەیەك بتوانن بۆ رێزی ئەو حەزرەتە سەما بکەن.

((بۆ پێدەکەنیت، سەرۆك؟ من مامێکم هەبوو هێسترێکی پیری پەیدا کردبوو کە لەسەرەمەرگدا بوو، هێسترەکە خوێڕی کرابوو تا لە نێو چیادا بمرێت، مامم هێسترەکەی هێناو هەموو بەیانیەك دەیبرد دەی لەوەڕاندو شەو بۆ ماڵەوەی دەهێنایەوە، کە خەڵکی لەرێگاو باندا دەیان بینی هاواریان لێ دەکرد: ((هێی، باوکە هارالامبۆس١٦٥ تۆ دەتەوێت چی لەم هێسترە پیرو مردوە بکەیت)) مامم وەڵامی دەدانەوە: ((ئەمە کارگەی پەین دروست کردنی منە)) بۆ منیش، سەرۆك، دێرکارگەی موجیزەیە.

١٦٥ Haralambos

-٢٥-

من تا لەتەمەندا بم سەر لەبەیانی ئەورۆژی یەکی ئایارە لەبیر ناکەم.

دەزگای تەلەفریکەکە تەواو ببوو، مێخ و سیم و بەکرەکان لەبەر ڕوناکی خۆری ئەو بەیانیەدا دەبریسکانەوە، قەدی گەورەی دارکاژەکان لە لووتکەی کێوەکەدا لیژنە کرابوون و کرێکارەکان لەو سەرەوە چاوەڕێی ئاماژەیەک بوون تا دارەکان بە تەلەفریکەکەوە ببەستن و بەرەو دەریا لێژیان بکەنەوە.

ئالآیەکی گەورەی یۆنانی لەسەر نووکی دار مێخی دەست پێکردنەوە، لەسەرچیاکەوەو، ئالآیەکی تر بە نووکی مێخی کۆتاییەوە، لەکەناری دەریاکەدا دەشەکانەوە. زۆربا لەبەردەم کوختەکەدا جلیکانەیەک شەرابی دانابوو، لەپاڵ جلیکانەکەدا کرێکارێك مەڕێکی قەڵەوی کردبوە شیشەوەو دەیبرژاند، بڕیاروابوو میوانەکان دوای کردنەوەو پیرۆزبایی کردنی دەزگاکە، بەخۆشی کارەکەمانەوە جامێك شەراب بخۆنەوە.

زۆربا قەفەزی تووتیەکەیشی هێنابوە خوارێ و لەسەر بەردێکی بەرز بەپاڵ مێخی یەکەمەوەی دانابوو.

بەخۆش نوودیەوە تەماشای تووتیەکەی دەکردو لەبەرخۆیەوە دەیوت:

وادەزانم خاوەنەکەی دەبینم.

مشتێك چوالە کێویلەی لە گیرفانی دەرهێناو خستیە بەردەمی.

زۆربا جلەکانی جەژنی : کراسی سپی دوگمە کراوە، چاکەتی سەوز، پانتۆڵی خۆڵەمێشی، پێڵاوی چەرمی پۆشیبوو. بێجگە لەوەیش، سمێڵە ڕەنگ بوردوەکەیشی بۆیە کردبوو.

وەك هەر سەرۆکێکی گەورە کە لەپێشوازی چەند سەرۆکێکی تردا بێت چو بوو بەپیر پیاو ماقوڵانی گوندەوە کە تازە لەرێگاوە دەگەیشتن، باسی ئەوەی بۆ دەکردن کە دەزگای تەلەفریکەکە چیەو چ سودێك بەناوچەکە دەگەیەنێت، پێشی دەوتن کە حەزرەتی

مریەمی پیرۆز بۆ بەدیهێنانی ئەم پڕۆژە مەزنە بە بەخشندەیی‌و زانایی خۆی ڕێ نمایی ئەوی کردوە، دەیوت: ئەمە کارێکی زۆر گرنگە، دەبوایە ئەندازە گیریەکی چاك بکرێت کە ئەمەیان مەسەلەیەکی زانستیە، بەدرێژایی چەند مانگێك مێشکی خۆم گوشی‌و بەهیچ ئەنجامێك نەگەیشتم، دیارە بۆ بەرهەم هێنانی کاری گەورە تەنیا بیری مرۆڤ بەس نیە، دەبێت بڕوات بەوە هەبێت کە دەبێت خوا کۆمەکت بکات. لەوکاتەدا بوو کە مریەمی پیرۆز منی لە ناخۆشیدا بینی‌و دڵی پێم سوتا، فەرمووی: ئەم زۆربا هەژارە مرۆیەکی چاکەو ئەم کارە بۆ بەرژەوەندی گوندەکە دەکات، من یارمەتی دەدەم‌و ئیتر((موجیزە ڕوویدا))

زۆربا وەستاو سێجار نیشانەی خاچی کێشا..

-بەڵێ، موجیزە ڕۆیدا. شەوێك لەخەودا ژنێکی ڕەشپۆشم بینی هاتە لام- مریەمی پیرۆزبوو- لەناودەستیدا رێگایەکی ئاسنینی هەوایی بچووك هەبوو، لەمە گەورەتر نەبوو، بەمنی وت: ((زۆربا، ئەوە من نەخشەی ئەو دەزگایەم بۆ هێناویت کەلە ئاسمان دروست کراوە، وەرە شوێنەواری ئەم لێژیە بگرەو بەرەکەتی منت لێ بێت)) ئەمەی وت‌و ونبوو، من لەخەو ڕاپەڕیم. بەرەو ئەو شوێنە ڕام کرد کەتیایدا خەریکی تاقی کردنەوە بووم. دەزانن چیم بینی؟ سیمەکە لەخۆیەوە ئەندازە گیر کرابوو، بۆنی بنێشتە تاڵی لێ دەهات‌و ئەوەی دەسەلماند کەدەستی پیرۆزی مریەمی پاکیزەی بەرکەوتوە.

کوندو مانولیو دەمی کردەوە تا شتێك بپرسێت لەناکاوا لە لاڕێیەکی بەردەڵانەوە پێنج ڕاهیبی هێستر سوار دەرکەوتن، شەشەم راهیبیش کە خاچێکی دارینی گەورەی بەشانەوە بوو لەپێشیانەوە دەڕۆیشت‌و هاواری دەکرد، چی دەوت؟ ئێمە هێشتا نەمان دەتوانی بەتەواوی تێی بگەین.

دەنگی سرودو درودمان گوێ لێ بوو، ڕاهیبەکان دەستیان لەهەوا دادەوەشاندو نیشانەی خاچیان دەکێشا، کە سمی هێسترەکان لەبەردی دەدا پڕیشکی لێ دەبوەوە.

ڕاهیبە پیادەکەیان کە ئارەقە لەسەر تاپای لەشی دەچۆڕی گەیشتە نزیکمان، زیاتر خاچەکەی بڵند کردو هاواری کرد:

-هۆ مەسیحیەکان موجیزە! هۆ مەسیحیەکان موجیزە!

وا باوکە رۆحانیەکان حەزرەتی مریەمی پاکیزەیان هێناوەتە ئێرە، کڕنووش بەرن‌و بیپەرستن.

لادێیەکان بەپەرۆشەوە، لەپیاوماقوڵەوە تا کرێکار هەموو رایان کردو بەدەم نیشانەیخاچ کێشانەوە دەوری راهیبیان دا، من لە لایەکەوە وەستابووم، زۆربا نیگایەکی خێرای کردم، چاوی گڕی لێ دەبوەوە پێی، وتم.

-سەرۆك، تۆیش نزیك بەرەوەو گوێ لەموجیزەی حەزرەتی مریەمی پاکیزە بگرە.

راهیبەکە بەپەلەو هانکە هانکەوە دەستی بەگێڕانەوەی ڕوداوەکە کرد:

-کڕنووش بەرن، ئەی مەسیحیەکان، گوێ بۆ موجیزەی خوایی ڕادێرن، شەیتانی لەعنەتی چوە ناوگیانی زەکەریای نەفرەت لێ کراوەوەو پێری دنەیدا کە نەوت بەدێری پیورزدا بکات.

لەنیوە شەودا چاومان بەبڵێسەی ئاگرکەوت‌وبەپەلە لەجێگاکانمان هەستاین، بارەگای سەرۆك دێرو ڕاڕەوو چەند ژورێك ئاگریان گرتبوو، کەوتینە زەنگ لێدان‌و داوای کۆمەکیمان کرد: ((یارمەتیمان بدە ئەی خانمی پیرۆزی تۆڵە))و هەموو کەوتینە ئاو پیاکردنی، لەبەرە بەیاندا، لەسایەی خوادا ئاگرەکە کوژایەوە...

((هەموو چووینە پەرستگاکەوە کەپەیکەری موجیزەی ئەوی تیایە، کەوتینە سەر ئەژنۆو هاوارمان لێ کرد: (( ئەی پاکیزەی پیرۆزی تۆڵە، ڕمەکەت دابێنەرەوەو بیکێشە بەتاوانباردا)) ئینجا هەمووومان لەحەوشەکەدا کۆبووینەوەو ئامادە نەبوونی زەکەریای یەهودا[١٦٦] سەرنجی ڕاکێشاین.

هاوارمان لێ هەستا: ((ئەمە زەریایە ئاگری لەئێمە بەرداوە، بەڵێ، ئەوە))و کەوتینە گەڕان بەدوایدا، ئەو رۆژە هەمووی گەڕاین، سووسەمان نەکرد، بەڵام ئەمرۆ لەبەرەبەیاندا جارێکی تر چووینەوە پەرستگاکە، دەزانن، ئەی برایان، چیمان بینی؟ موجیزەیەکی سەرسوورهێنەر، زەکەریا لەبەرپێی پەیکەری پیرۆزدا بێ گیان کەوتبوو، دلۆپێك خوێنی درشتیش بەنووکی ڕمەکەی مریەمی پاکیزەو پیرۆزەوە بوو.

---

[١٦٦] مەبەستی یەهودای ئەسخەریوتیە کە یەکێك بوو لەدوانزە هاوڕێکەی عیسای پاشان عیساه دایە دەستەوەو لەخاچ درا. -و-

گوندیەکان بەسەر سوورمانەوە کەوتنە ورتە ورت، وتیان: ئای خودایە، ڕەحممان پێ بکەیت.

ڕاهیبەکە کەتفەکەی قووت داو کەوتەوە قسەکردن:

–شتێکی لەوە سەرسووڕهێنەر ترمان بینی: کاتێك کە ویستمان لاشەی ئەو مەلعوونە هەڵبگرین واقمان وڕما، مریەمی پاکیزە مووی سەرو ڕیش‌و سمێڵی ئەوی وەك قەشەیەکی کاسۆلیك بەمقەست بڕیبوو.

من کە بەزۆر توانیم ڕێگا لەپێکەنینەکەم بگرم ڕووم بۆ لای زۆربا وەرگێڕاو بەهێواشی بەگوێمدا چرپاند: هەی مەلعون!

بەڵام زۆربا چاوی ئەبڵەق بووی بە کارەساتە سەیرە پڕ کردبوو لە جۆشی ئیمان‌و بڕیبویە ڕاهیبەکە، بەپەرۆشەوە لەپشت سەری هەموانەوە نیشانەی خاچی دەکێشا، گوایا کارەساتەکە سەرسامی کردوەو واقی وڕهێناوە. لەبەر خۆیەوە دەیوت: تۆ مەزنیت، ئەی خودای بەتوانا، تۆ مەزنیت، هەموو کارەکانیشت شایانی ستایشن.

هەر لەوکاتەدا ڕاهیبەکانی تر گەیشتن‌و لەوڵاخەکانیان دابەزین، باوکە ڕۆحانیە میواندارەکە پەیکەرەکەی بەدەستەوە بوو، چوە سەر بەردێك، خەڵکەکە کەوتنە پاڵ پێوە نانی یەکتری‌و بەرانبەر پەیکەری موجیزەی پاکیزە کڕنووشیان برد، دومەتیوسی قەڵەو سینی لەدەست گرتبوو، لەدواوە خێری کۆدەکردەوەو گوڵاوی بەسەرو چاوی گوندیەکاندا دەپرژاند، سێ ڕاهیبی تری لەدەور بوون، دەستە تووکنەکانیان بەسکیانەوە گرتبوو، ئارەقەیان دەڕشت‌و سروودی ئاینیان دەخوێندەوە.

دومەتیوسی قەڵەو وتی: ئێمە دەڕۆین بەدێهاتەکانی کریتدا دەگەڕێین، تا ئیماندارەکان کڕنووش بۆ پەیکەری حەزرەتی مریەم بەرن‌و چەندیشیان لەتوانادا بێت بماندەنێ. ئێمە پارەمان دەوێت، بەڵێ، پارەیەکی زۆر، بۆ ئەوەی بتوانین دێرە پیرۆزەکە چاك بکەینەوە.

زۆربا لەبەر خۆیەوە بۆڵەیەکی کرد: بەرازی پیسانە، ئەم هەڵەیشیان بۆخۆیان قۆستەوە.

–ئەی خەلیفەی پیرۆز، هەموو شتێك بۆ ڕێ‌و ڕەسمەکە ئامادەیە، هیوادارم پاکیزەی پیرۆز کارەکەمان لێ پیرۆز بکات.

خۆر هەندێك سەرکە تبوو، هەوا کون بڕو دنیا زۆر گەرم بوو، ڕاهیبەکان لەدەوری دارمێخێك کە نووکەکەی ئالای پێوە بوو کۆببوونەوە. بەقوڵە هەراوەکانیان ئارەقەی ناوچاویان دەسڕیو بۆ پیرۆزبایی کردن:

((خودایا، خودایا، دامەزراندنی پڕۆژەکە)) دەستیان بەویردو ئەوراد خوێندن کردبوو. بناغەی ئەم دەزگایە لەسەر بەردێکی پتەو ڕابگرە، بەڵکوو باو باران زیانی پێ نەگەیەنێت))

ئاوی پیرۆزیان لە دەفرێکی مس کردو پرژاندیان بەسەر: شتەکان، کەسایەتیەکان، مێخو وایەرو بەکرەکان، منو زۆربا پاشان بەسەر دێهاتیو کرێکارو دەریایشدا.

دوای ئەوە بەپارێزێکی زۆرەوە، وەك بڵێیت لەگەڵ ژنێکی نەخۆشدا سەروکاریان هەبێت پەیکەرەکەیان بەرزکردەوە، لەپاڵ قەفەزی تووتیەکەدا دایان ناو لەدەوری دانیشتن، لەلایەکی ترەوە، پیاو ماقوڵانی ناوچەکەو زۆربایان لەناوەڕاستا بوو، من لەنزیك کەناری دەریاکەوە بەهێمنی وەستابووم.

تاقی کردنەوەی دەزگاکە دەبوو بەسێ قەدی درەخت کە ڕەمزی سیانەی پیرۆز بوو ئەنجام بدرێت، پاشان داری چوارەمیشیان بۆ زیادکرد کەنیشانەی ڕێزلێنانی ((خانمی تۆڵە)) بوو.

ڕاهیبو گوند نشینەکانو کرێکارەکان نیشانەی خاچیان کێشاو لەبەرخۆیانەوە وتیان:

—بەناوی پیرۆزی— باوكو کوڕو روح القدس[١٦٧] و پاکیزەی پیرۆز—ەوە.

زۆربا چوستێکی کردو گەیشتە مێخی یەکەم، گوریسەکەی ڕاکێشاو ئاڵاکەی هێنایە خوارێ، ئەمە نیشانەیەك بوو کرێکارەکانی سەرلووتکەی کێوەکە چاوەڕێی بوون. هەموو ئامادەبوەکان بەرەو دواوە چوونو چاویان لە لووتکەی چیاکە بڕی.

سەرۆکی دێر بەدەنگی بەرز وتی: بەناوی باوك.

ئەوەی لەو چرکە ساتەدا ڕوویدا هەرگیز باس ناکرێت، چونکە کارەساتێکی بروسکە ئاسابوو، ئامادە بوەکان بە ئەستەم توانیان هەڵبێنو خۆیان ڕزگار بکەن، هەموو دەزگای

---

[١٦٧] مەبەست لەسێ کوچکەی پیرۆزە (الاب والابن وروح القدس) —و—

تەلەفریکەکە کەوتە تەکان‌و جوولاًن، قەدی دارکاژێك کە کرێکارەکان بەسیمی تەلەفریکەکەیانەوە بەستبوو ئەوەندە بەخێراییەکی شەیتانی بەرەو خوار بوەوەو کەوتە پریشك هاویشتن، پارچەی گەورە گەورەی دارەکە بەحەوادا چوو، کە دوای چەند چرکەیەك گەیشتە خوارێ بێجگە لەدارێکی نیوە سوتاو هیچی تری نەمابوەوە.

زۆربا نیگایەکی تێ گرتم، هەر لە نیگای سەگێك دەچوو لێی درابێت. راهیب‌و گوند نشینەکان بەپارێزەوە لەدواوە دانیشتن، وڵاخە بەستراوەکان کەوتنە جووتە هاویشتن، دومەتیوسی قەڵەو بەهانکەهانك خۆی بەزەویدا کێشاو لەترساندا هاواری کرد:

-خودایە ڕەحمم پێ بکەیت.

زۆربا بۆ دڵنیایی کردن دەستی هەڵبڕی‌و وتی:

-هیچ نیە، یەکەم دار هەروا دەبێت، ئێستا دەزگاکە رێك‌و پێك دەبێت، تەماشای بکەن.

ئاڵاکەی بەرز کردەوە، جارێکی دی ئاماژەی دانێ‌و بەپەلە خۆی بۆ دواوە گەڕایەوە.

سەرۆکی دێر بەدەنگێکی کەمێك لەرزۆکەوە بانگی هەڵدا:

بەناوی کوڕ (ابن).

دووەم دار بەرەڵا کرا، دار مێخەکان لەرزین‌و دارەکە خێرایی هاتنی خۆی وەرگرت، وەك بەرازی دەریا بەرزدەبوەوەو ڕاست بەرەو لای ئێمە دەهات، بەڵام زۆری مەودا نەبڕی کە لە ناوەندی کێوەکەدا بێ سەرو شوێن بوو.

زۆربا کەوتە بۆڵە بۆڵ، پڕ بەدەمی سمێڵی گەست‌و وتی:

-لەعنەت لە شەیتان، ئەم لێژیە نەحلەت لێ کراوە هێشتا باش تەرازو نەبوە.

بەپەلە بەرەو دارمێخەکە چوو، بزاوتێکی ڕکاویانەی کرد، بۆ نیشانەی دەست پێکردنی سێیەم تاقی کردنەوە ئاڵاکەی بەرەو خوار ڕاکێشا، راهیبەکان کە لەپشت هێسترەکانەوە خۆیان شاردبوەوە نیشانەی خاچیان کێشا. پیاو ماقوڵان بۆ هەڵاتن لەسەر پێ بوون.

سەرۆکی دێر بەدەم هەڵکردنی داوێنیەوە وتی: بەناوی روح القدس.

سێیەم درەخت قەدەکەی زۆر گەورە بوو، هێشتا بەتەواوی نەکەوتبوە ڕێ کە دەنگێکی زۆر ترسناکی لێوەهات.

زۆربا بەدەم چۆڵ کردنی شوێنەکەیەوە هاواری کرد.

-خۆتان بدەن بەزەویدا بەد بەختینە.

راهیبەکان لەسەر زەویەکە بەدەمدا کەوتن‌و گوندیەکان هەڵاتن.

قەدی دارەکە بازرەقەیەکی بەست، کەوتەوە سەر سیمەکە، گوررەیەك پریشکی لێ بوەوەو پێش ئەوەی توانیبێتمان شتێك ببینین چیاو کەنارەکە ڕوناك بوەوە، کەوتە شوێنێکی دوری نێو دەریاکەوەو ئاوو کەفاوێکی زۆری بەرزکردەوە.

دار مێخەکان وا کەوتبوونە لەرزین مرۆڤیان نیگەران دەکرد، زۆریان لار ببوونەوە، هێسترەکان هەوساریان پچڕو بەچوارلادا بڵاو بوونەوە.

زۆربا کە لە خۆیەوە نەی دەزانی چی‌دەکات هاواری کرد:

-هیچ نیە، مەترسن، هیچ نیە، ئێستا بەتەواوی دەزگاکە چاك‌و هاوسەنگ بوە. دەی. جارێکی تر ئاڵاکەی بردەوە سەرەوە، پێ دەچوو نائومێد بێت‌و پەلەی ئەوە بکات زوو کۆتایی بەکارەکە بهێنێت.

سەرۆکی دێر بەدەم ڕاکردنەوە منەمنێکی کردو وتی:

ئێستا بەناوی خانمی تۆڵەمانەوە.

قەدی چوارەمین دار بەرەڵا کرا، دەنگی ((قرچە قرچ)) ێکی ترسێنەر ئەو ناوەی گرت‌و پاشان جارێکی تر دەنگی (قرچە قرچەکە)) هاتەوە، هەموو دار مێخەکان وەك کۆشکێك لەمقەبا دروست کرابێت یەك بەدوای یەکتردا، هەرەسیان هێنا.

کرێکارو گوندیەکان‌و ڕاهیبەکان ڕایان دەکردو بەسەریەکدا دەکەوتن، دەلاڵانەوەو دەیان وت: خودایا، ڕەحممان پێ بکەیت.

تەڵاشە دارێکی گەورە بەر ڕانی دومەتیوس کەوت‌و بریندار کرد، پارچەیەکی تر زۆری نەمابوو چاوی سەرۆکی دێر دەربپەڕێنێت، گوندیەکان ون بوون، تەنیا پاکیزەی پیرۆز نەبێت کەلەسەر بەردەکەی خۆی ڕاست وەستابوو. ڕمەکەی بەدەستەوە بوو، بەنیگایەکی ساردی پڕ لە ویقارەوە تەماشای پیاوەکانی دەکرد، لەپاڵیا تووتیە داماوەکە کە پەڕە سپیەکانی ڕەپ وەستابوون، دەلەرزی‌و نیوە گیان ببوو.

ڕاهیبەکان پەیکەرەکەی مریەمی پاکیزەیان هەڵگرت‌و خستیانە بن دەستیان، دومەتیوس کەلەتاو زامەکەی دەیناڵاند لەزەویەکەیان هەستاند، هێسترەکانیان هێنایەوە، سواربوون‌و بۆی دەرچوون.

کرێکارێك کە شیشە گۆشتەکەی هەڵدەگێڕایەوە لەترسا لاشە مەڕەکەی جێ هێشتبوو، ڕای کردبوو، گۆشتەکە لەوەدابوو بسوتێت.

زۆربا کە نیگەرانیەکی سەخت دای گرتبوو هاواری کرد: مەڕەکە خەریکە دەسوتێت‌و دەبێتە خەڵوز.

بەپەلە گەیشتە سەری‌و شیشەکەی هەڵگێڕایەوە.

من لەپاڵیا دانیشتم، بێجگە لە من‌و زۆربا کەس لەکەنار دەریاکەدا نەمابوو.

زۆربا ئاوڕی لێدامەوە‌و نیگایەکی بێدەنگ‌و پڕ لە دوودڵی کردمنەی دەزانی ئەم کارەساتە چ کاریگەریەکی لەسەر من داناوە‌و کۆتاییەکەشی چۆن دەبێت.

چەقۆیەکی گرتە دەستی، دیسان بەسەرمەڕەکەدا نوشتایەوە، پلێکی لە گۆشتەکە کردەوە‌و نایە دەمی، زوومەڕەکەی لەسەر ئاگرەکە لابرد، شیشەکەی بەمەڕەکەوە پاڵدایە درەختێکەوە‌و وتی:

-چاك برژاوە، سەرۆك، چاك برژاوە، پلێکت بدەمێ؟

لەوەڵامدا وتم: شەراب‌و نانیش بێنە، من برسیمە.

بەرزە پێ لەجێگاکەی هەستا، جلیکانەکەی تا نزیك مەڕە برژاوەکە غلۆرکردەوە، باوەشێك نانی سپی‌و دوولێوانی هێنا.

هەریەکەمان چەقۆیەکمان هەڵگرت، دووپارچەی گەورەمان لە گۆشتەکە بڕی، دوو پارچە نانی گەورەیشمان کردەوە‌و بەتاسوقەوە کەوتینە خواردن.

-بڕوانە، سەرۆك، چەند خۆشە؟ لەناو دەمدا دەتوێتەوە! ئەم ناوە لەوەڕگای تیانیەو مەڕەکانیان گیای وشك دەخۆن، بۆیە گۆشتیان هێند بەتامە، من بێجگە لە جارێکی دی لەهەموو تەمەنمدا گۆشتی وا بەلەزەتم نەخواردوە.

لەبیرمە، سەردەمانێك، لەقژی خۆم، وێنەیەکی کڵێسای سوفیام چنی بوو، وەك نوشتە لەگەڵ خۆمدا هەڵمدەگرت، وابزانم پێشتر ئەمەم بۆ گێڕاویتەوە، چیرۆکێکی کۆنە.

-بیگرەوە، جارێکی تریشی بیگێڕەوە..

-وتم چیرۆکێکی کۆنە، سەرۆك، بیرکردنەوەیەکی سەیری یۆنانی، خەونێکی سەیری مرۆڤێکی شێت.

-باشە، زۆربا، باسی بکە، من پێم خۆشە.

-بەکورتی، ڕووداوەکە وابوو، دەبوو ئەو شەوە بولگاریەکان گەمارۆی ئێمە بدەن، ئێمە لەهەموو لایەکی چیاکەوە دەمان بینین دەوریان دابووین و ئاگریان کردبوەوە، بۆ ئەوەیش کەبمان ترسێنن دەستیان کردبوە تەپڵ لێدان و وەك گورگ دەیان لووراند، ژمارەیان نزیك بە سێ سەد کەس بوو، ئێمە هەموو بیست و هەشت کەس بووین، بێجگە لە کاپیتان روڤاس[١٦٨] ئەگەر مردبێت خوالێی خۆش بێت، ئەو فەرماندەمان و لاوێکی جوان بوو، پێی وتم:

((ها! زۆربا، مەڕەکە لەشیش بدە، وتم : کاپیتان، ئەگەر لەچاڵێکی ژێر زەویدا بیبرژێنین لەزەتی زۆرترە، وتی: چۆنت پێ خۆشە وای بکە. بەڵام دەست و بردکەچونکە برسیمانە، چاڵێکمان هەڵکەندو هەر بەپێستەکەیەوە مەڕەکەمان تێ خست، خەڵوزمان لەسەر داناو ئاگرمان کردەوە، نانمان لەتوێشە بەرەکانمان دەرهێناو دەوری ئاگرەکەماندا، کاپیتان روڤاس وتی: ((ڕەنگە ئەمە دوا مەڕی خواردنمان بێت! ئاخۆ کەسمان تیایە بترسێت؟)) هەموو دایانە قاقای پێکەنین و کەس وەڵامی نەدایەوە، هەموو مەتارەکانمان نایە سەرلێو((بەخۆشی تۆ، کاپیتان، دەبێت لەواندا دەست ڕاستی چاك هەبێت تا بتوانێت بمانپێکێت))

قومێکمان هەڵداو بوو بەدوو، مەڕمان لەچاڵەکە دەرهێنا، ئای خودا گیان! چۆن برژا بوو، سەرۆك، ئێستایش کەبیرم دێتەوە دەمم پڕدەبێت لە ئاو، لەناو دەمدا دەتوایەوە، هەروەك ڕەحەتەلوقم.

هەموو پەلاماری مەڕەکەماندا، کاپیتان وتی ((بەهەموو تەمەنم گۆشتی وابەتامم نەخواردوە، خوا ئاگادارمان بێت)) ئەو کە هەرگیز نەی دەخواردەوە بەقومێك هەموو

---

[١٦٨] Capetan Rouvas

لێوانەکەی هەڵدا، پاشان، فەرمانی دەرکرد: ((کوڕینە، گۆرانیەك لەگۆرانی چەتەکێویەکان بڵێین" ئەوان بەوسەرەوە وەك گورگ دەلورێنن، با ئێمە وەك مرۆڤ گۆرانی بڵێین، یاالله، گۆرانی دیموسی [١٦٩] پیر بڵێین.))

شەرابەکەمان بەپەلە هەڵداو پێکێکی ترمان بەسەردا کرد، ئینجا دەستمان کردە گۆرانی وتن، دەنگمان تادەهان بەرزتر دەبوو، لەدەربەندەکانەوە دەنگی دەدایەوە ((کوڕینە، من چل ساڵی تەواو چەتەی نێو کەژو کێو بووم، سەرم لەم ڕێگایەدا سپی کرد)) ئەوەندەیش خۆش‌و چالاك ببووین لەوەدا بوو هەموو شتێك بشکێنین، کاپیتان وتی: بەه ، بەه. چ خۆشیەکە! بەو مەرجەی بەردەوام بێت، باشە، ئالکسیس، تۆ تەماشایەکی پشتی مەڕەکە بکە، بزانە بەختمان چی دەڵێت؟)) بەچەقۆ پشتی مەڕەکەم کردەوەو ئاگرم هێنا تاباشتری ببینم، بەدەنگی بەرز وتم: ((نەگۆڕ دەبینم‌و نەمردوو) کوڕینە، ئێمە لەم تەنگژەیە بەسەلامەت دەردەچین)) فەرماندەکەمان کەتازە ژنی هێنابوو وتی: (خوا لەدەمت بژنەوێت، باهیچ نەبێت کوڕێك بخەمەوە، دوای ئەوە، چی دەبێت بابێت))

زۆربا پارچەیەکی لەلاتەڕافەی مەڕەکە بۆ خۆی لێ کردەوەو وتی:

–ئەویان باش برژا بوو، خۆ ئەمیان لەو کەمتر نیە.

وتم: زۆربا، مەی تێکە، پێکەکان لێوان لێوبکە باتا دوا چۆڕی بنۆشین.

دوای ئەوەی پێکەکانمان لێکدا شەرابمان هەڵدا، بەڕاستی شەرابێکی کریتی بەتام‌و جوان ڕەنگی وەك خوێنی کەروێشکی کێوی وابوو، وات دەزانی خوێنی زەویەو دەینۆشیت، چونکە مرۆڤ وای هەست دەکرد کە بوە بەدێو، دەمار پڕدەبوون لەهێزو دڵیش پڕدەبوو لە چاکە، بەرخ دەبوو بەشێرو، هەموو شتە بچووکەکانی ژیانی لەبیردەکران، چوار چێوە تەنگ‌و سنووردارەکان وردو خاش دەبوون، لەگەڵ مرۆڤو گیاندارو خوادا دەبوون بەیەك‌و لەگەڵ هەموو دنیایشدا یەکتان دەگرت.

وتم: زۆربا، بۆ ئێمەیش تەماشایەکی پشتی مەڕەکە بکەو بزانە بەختمان چی دەڵێت؟ دەی، بڕوانە.

[١٦٩] Le Vieax Dimos

زۆر بەوردی چەقۆی لەپشتی مەڕەکە خستەکار، تامی بربڕەکەی دەکردو لەڕوناکیەکەی نزیک دەخستەوەو لێی ڕادەما.

وتی: هەموو شتەکان باشن، سەرۆك، هەزار ساڵی تر دەژینو دڵیشمان وەك ئاسن وایە.

دیسان نوشتایەوەو کەوتە لێکدانەوەیو وتی:

–وای دەبینم کە سەفەرێکمان لەبەرە، سەفەرێکی دورودرێژ، لەکۆتایی ئەم سەفەرەدا ماڵێکی گەورە دەبینم، دەرگای زۆری تیایە، ڕەنگە پایتەختی وڵاتێك بێت، سەرۆك، یان دەشبێت ئەو دێرەبێت کە من دەبمە دەرگاوانیو وەك پێم وتیت دەست بڕی تیا دەکەم.

–تێکە بابخۆینەوە، زۆربا، ئەم پێشبینیانە وێڵکە، من خۆم پێت دەڵێم ئەو خانوەی دەرگای زۆری هەیە چیە، ئەوە زەویە بەگۆڕەکانیەوە، زۆربا، ئەوە کۆتایی سەفەرەکەیە، بەخۆشیت، ناڕەسەن.

–بەخۆشیت، سەرۆك، دەڵێن بەخت کوێرەو نازانێت بۆ کوێ دەچێت، لەڕێگا بەر خەڵکی دەکەوێتو بەسەر هەر کەسێکدا بکەوێت پێی دەڵێن بەختیار، خوا بەختی واببڕێت، ئێمە نامانەوێت، سەرۆك، وانیە؟

–نا، نامانەوێت، زۆربا، بەخۆشیت.

بەجووتە خواردمانەوەو لە مەڕەکەیش چی مابوەوە ئەویشمان خوارد. لامان دنیا سووکەڵە دەبوو، دەریا پێ دەکەنیو زەوییش وەك سەکۆی کەشتی لە تەکانو هاتو چۆدا بوو، دوونەوڕەس بەسەر وردە بەردەکاندا دەڕۆیشتنو وەك مرۆڤ لەگەڵ یەکتردا دەدوان.

من هەستام، هاوارم کرد:

–وەرە زۆربا، وەرە فێری سەمام بکە.

زۆربا ڕاپەڕیو دەمو چاوی گەشایەوە.

–سەما، سەرۆك؟ سەما؟ زۆر چاکە، دەی.

–با دەست پێ بکەین، زۆربا، من ژیانم گۆڕاوە، یاالله.

–لەپێشا سەمای زیمباکیکوت [١٧٠] فێردەکەم، سەمایەکی وەحشیانەی تایبەت بەشەڕە، ئێمەی بەرگری میللە پێش ئەوەی بچین بۆ شەڕ ئەم سەمایەمان دەکرد.

پێڵاوو گۆرەوییە ڕەنگ باینجانیەکەی داکەندو تەنیا کراسێکی لەبەرخۆیدا هێشتەوە، لەبەرئەوەی زۆری گەرمابوو ئەویشی داکەند، وتی:

–تەماشای پێم بکە، سەرۆك، باشی تەماشا بکە.

پێیەکی بردە پێشەوە، لەسەرخۆ دای بەزەویدا، پێیەکەی تریشی بردە پێشەوە، هەردووکیان بەتوندی تێك ئاڵانو دەنگ لەزەویەوە بەرزبوەوە.

شانی گرتمو وتی:

–دەی کوڕم، بەیەکەوە...

هەردووکمان دەستمان بەسەما کرد، زۆربا زۆر بەجیدیو هێورو میهرەبانیەوە جووڵانەوە هەڵەکانی منی ڕاست دەکردەوە، منیش غیزەتم پەیداکردبوو، هەستم دەکرد لەژێر پێ قورسەکانمدا باڵ ڕواوە.

زۆربا کە بۆ ڕاگرتنی ریتمی سەماکە چەپڵەی لێدەدا هاواری کرد:

–ئافەرین، کوڕم، ئافەرین، تۆ بۆ خۆت شتێکی سەیریت، ئیدی کاغەزو مەرەکەبدان بۆ دۆزەخ، ماڵو سامان بۆ دۆزەخ کانزاو دێر بۆ دۆزەخ، کە تۆ سەمافێربوویتو لەزمانی من گەیشتیت ئیدی چ ماوە بەیەکدی بڵێین!

پێ ڕووتەکانی بەسەر وردە بەردەکاندا کێشاو کەوتە چەپڵە لێدان، هاواری کرد:

–سەرۆك، من زۆرشتم هەیە پێتی بڵێم، لەهەموو تەمەنما کەسم وەك تۆ خۆش نەویستوە، زۆر شت هەیە پێت بڵێم بەڵام زمانم یارمەتیم نادات، بۆیە سەمات بۆ دەکەم، بڕۆ ئەولاوە نەك بەرت بکەوم، بۆ پێشەوە، ها! ها!

زۆربا چوو بە بەحەواداو دەستوپێی بوون بەباڵ، لەوکاتەدا کە ڕاست، بەرانبەر بەدەریاو ئاسمان، لەسەر زەویەوە بۆ ئاسمان بازرەقەی دەبەست هەر لەفریشتەیەکی یاخی بوو دەچوو، چونکە ئەم سەمای زۆربایە ڕێك بریتیبوو لە زۆرانبازیەکی

[١٧٠] Zeimbekiko

سەرسەختانە، لەوە دەچوو هاواربكات: ((تۆ، ئەی خوای بە توانا، دەتوانیت چی لەگەڵ مندا بكەیت؟ تۆ ناتوانیت هیچ لەگەڵ مندا بكەیت بێجگە لەوەی كە بمكوژیت، بمكوژە، قیروسیا، من داخی دڵی خۆمم ڕشتوەو ئەوەی دەمویست بیڵێم وتوومە، دەرفەتی سەما كردنیشم بۆ ڕەخساوە و ئیدی چ پێویستیەكم بەتۆ نیە))

كەتەماشای سەماكەی زۆربام دەكرد، بۆ یەكەمین جار تێ گەیشتم كە هەوڵو خەباتی خەونەكانی مرۆڤ بۆ ئەوەی بەسەر بارە قورسەكاندا زاڵ بن چ مانایەكی هەیە، ئافەرینم لە خۆگریو شادیو كیبریای كرد، پێی زۆربا بەو تینو تاوو شارەزاییەوە مێژوویەكی شەیتانانەی ئادەمیزادی بەسەر بەردەكانەوە دەنووسی.

كەمێك وەستاو تەماشایەكی دەزگای هەرەس هێناوی تەلەفریكەكەی كرد. خۆر بەرەو ئاوابوون دەچوو، سێبەرەكان درێژ دەبوونەوە، وەك لەپڕا زۆربا شتێكی هاتبێتەوە بیر چاوی كرایەوە، ڕووی تێكردمو بەبزاوتێكی ئاسایی دەستی نایەسەر دەمیو وتی:

—بەڕاست، سەرۆك، تۆ ئەو پڕیشكە ئاگرانەت بینی كە لەودێوە دەبوەوە؟.

بەجووتە دامانە پرمەی پێكەنین.

زۆربا پڕی دامێ، لەئامێزی گرتمو كەوتە ماچ كردنم، بە میهرەبانیەوە هاواری كرد: تۆیش پێدەكەنیت، سەرۆك؟ تۆیش پێدەكەنیت؟ ئافەرین، كوڕم.

لەكاتێكدا كەپێكەنین هەردوكمانی ماندوو كردبوو، ماوەیەكیش بەسەر بەردەكانەوە زۆرانمان گرتو یاریمان كرد، پاشان هەردووكمان كەوتینە سەر زەوی، لەسەر وردە بەردەكان پاڵ كەوتینو لەباوەشی یەكتردا خەومان لێ كەوت.

*　*　*

بەرە بەیان لەخەو ڕابووم، بەدرێژایی كەنار دەریاكە هەنگاوی گورجم بەرەو گوندەكە نا، دڵم لێی دەدا، مەگەر بەدەگمەن لەهەموو تەمەنما ئەوەندە هەستم بەخۆشیو شادمانی كردبێت، ئەمە خۆشیەكی ئاسایینەبوو، حاڵەتێك بوو لە شادمانیەكی پڕ لەشكۆو ناماقووڵو بێ پاساو، بەڵكو هەر بەتەواوی پێچەوانەی هەموو پاساوێك بوو،من هەموو شتێكم لەدەست چووبوو، پارە، كرێكار، دەزگای تەلەفریكو كامیون. ئێمە بەندەرێكی

بچووکمان دروست کردبوو کەلەوێوە خەڵوز ڕەوانە بکەین، وا ئیتر شتێك نەما بینێرین، هەموو شتێك لە دەست چوو.

لە ناوکاوێك لەوچرکە ساتەدا، بێ ئەوەی خۆم چاوەڕێم کردبێت، هەستم بە ڕزگاربوون کرد. وەك ئەوەی لەدوو توێی زەرورەتێکی قورس‌و تاریکدا ئازادیم دۆزیبێتەوە کە سەرگەرمی یاری بووبێت‌و منیش لەگەڵیدا کەوتبێتمە یاریەکەوە.

کاتێك هەمووشتەکان بەپێچەوانەی ویستی تۆوەن، چی لەو خۆشی‌و شادیە مەزنترە کە تۆ ڕۆحی خۆت تاقی بکەیتەوە، بۆ ئەوەی بزانیت دەتوانیت خۆگرو جوامێر بیت! وەك ئەوە وایە کەدوژمنێکی نادیارو زۆر بەهێز کە هەندێك بەخوای ناو دەبەن‌و هەندێك بەشەیتان، بۆسەی لێ گرتبێتین تا پەلامارمان بدات‌و لەناومان بەرێت، بەڵام ئێمە هەر نەکەوین‌و بەپێوە بوەستین. مرۆڤی ڕاستەقینە چەندە لە ناوەوەدا سەرکەوتووبێت، هەر بەو ئەندازەیە لەدەروە شکستی خواردبێت، هەست بەفیزو خۆشیەکی بێ وێنە دەکات‌و، ناخۆشیەکانی دەرەوە دەگۆڕێت بۆ بەختیاریەکی ئەوەندە مەزن کەناتوانیت تەعبیری لێ بکەیت.

چیرۆکێکم هاتەوە یاد کەشەوێك زۆربا بۆی گێڕابوومەوە:

((شەوێك، بەسەر لووتکەی بەفرینی چیایەکی مەکدۆنیاوە بایەکی ترسناك هەڵیکردبوو. ئەو کوختە چکۆڵەیەی خۆم تیا حەشاردابوو کەوتبوە لەرزین‌و دەیویست سەروبن بێت، بەڵام من زۆر باشم قایم کردبوو، بەتەنیا لەبەردەم زۆربا داگیرساوەکەدا دانیشتبووم، پێدەکەنیم‌و گاڵتەم بەباکە دەکردو بەسەریما دەگرماند: نابێت تۆ بێیتە کۆختەکەی منەوە، من دەرگات لێ ناکەمەوە، تۆ ناتوانیت ئاگرەکەم بکوژێنیتەوەو کوختەکەم سەرو بن بکەیت))

لەم قسانەی زۆرباوە فێری ئەوە ببووم کەدەبێت مرۆڤ چۆن هەڵسوڕێت‌و بە چ زمانێك لەگەڵ زەرورەتی کوێرو مل هوڕدا بدوێت.

بەکەنار دەریاکەدا خێرا دەڕۆیشتم، منیش لەگەڵ دوژمنێکی نادیاردا قسەم دەکردو بەسەریا دەم نەڕاند کە: تۆ نایەیتە ناو ڕۆحی‌منەوە، من دەرگات لێ ناکەمەوە، تۆ ناتوانیت ئاگری دەرونی من بکوژێنیتەوەو سەروبنم بکەیت))

هێشتا خۆر سەری لەچیاوە دەرنەهێنابوو، ڕەنگە شینو سەوزو پەمەیىو سەدەفیەکان لە ئاسمانو بەسەر دەریاکەوە یاریان دەکرد،لەو لاترەوە، لەنێو دار زەیتوونەکاندا، وردە وردە، باڵندە بچووکەکان لەخەو هەڵدەستان، بەگزنگی بەیان سەرخۆش بوونو دەیان چریکاند.

من بەپاڵ ئاوەکەدا دەڕۆیشتم کە ماڵ ئاوایی لەوکەنارە تەریکە بکەم، وێنەکەی لەمێشکمدا هەڵبکەنمو لەگەڵ خۆمیدا بەرم. لەم کەنار دەریایەدا بوومە هاوڕێی گەلێك لەزەتو خۆشىو ژیانیش لەگەڵ زۆربادا بەتەواوی دڵی کردبوومەوە، هەندێك لەوتەکانی ئاسودەییان بەگیانم دەبەخشی، ئەم پیاوە هەر بەغەریزە کۆكو بە ڕوانینی سادەی وەك هەڵۆی بەلاڕێ کورتو دڵنیاکاندا دەڕۆیشت، بێ ئەوەی بکەوێتە هەناسەبڕکێ دەگەیشتە لووتکەی هەوڵو خەباتو تەنانەت لەو لووتکەیەیشی تێدەپەڕاند.

کۆمەڵێك ژنو پیاو، بە سەبەتەی پڕو شووشە شەرابەوە تێ پەڕین، بۆ باخەکانی ئەو دەورانە دەچوون تا ئاهەنگی یەکی ئایاری لێ سازبکەن. دەنگی گۆرانی وتنی کچۆڵەیەك وەك فوارەی ئاوی زوڵاڵ بەرزبووەوە، کچۆڵەیەکی تر کە تازە بناغەی مەمکی دانابوو بە هەناسە بڕکێ بەبەردەممدا تێ پەڕیو چوە سەر بەردێکی بەرز، پیاوێکی ڕیش ڕەشی ڕەنگ پەڕیو توورە دوای کچەکە کەوتبوو، بەدەنگێکی ناقۆڵاوە هاواری لێ دەکرد:

وەرە خوارێ، وەرە خوارێ...

بەڵام کچۆڵەکە بەڕوومەتی گەشاوەیەوە باسکی بۆ دواوە برد، وەك خاچ لە پشتی سەریەوە هەڵیپێکان، لەسەرخۆ کەوتە لەراندنەوەی لەشە تەڕوبڕەکەیو دەستی بەگۆڕانی وتن کرد:

بەپێکەنینو گۆرانیەوە پێم بڵێ

بەعیشوەو نازەوە پێم بڵێ

پێم بڵێ خۆشم ناوێیت

بیڵێ .. من هیچ پێم ناخۆش نیە

پیاوە ڕیشنەکە بەسەریا نەڕاندی: وەرە خوارێ، وەرە خوارێ..

لەدەنگە گرەکەیدا هەندێك پاڕانەوەو هەندێك هەڕەشە هەبوو. لەپڕا قەڵەمبازێکیداو قاچی کچۆڵەکەی گرتو توند ڕایکێشا، کچۆڵەکە دەت وت چاوەڕوانی ئەوکارە ناجۆرو درندایە بووبێت بۆ ئەوەی هەستو سۆزەکەی دامرکێنێت دەستی بەگریان کرد. من خێراتر هەنگاوم نا، ئەودیمەنە کتو پڕانە خۆشیەکەی دڵمیان گوشی. پیرە فریشتەی دەریام هاتەوە بیر کە خڕوخەپانو عەتراویو لەماچو مووچ تێربوو لەژێر خاکدا نوستبوو، بێگومان ئێستا ئاوساوەو ڕەنگی سەوز داگەڕاوە، پێستی قەڵەشیوەو تەڕایی لەجەستەیەوە دایداوەو کرمی دەرداوە.

(سەری سوڕماوی خۆمم لەقاند، هەندێك جار زەوی نەرمو ناسك دەبێت، ئێمە سەرۆکی گەورەمان، واتا کرم دەبینین کەشەوو ڕۆژ لەکارگە ژێر زەمینیەکەیدا کاردەکات، ئێمە زوو ڕوو وەردەگێڕین، چونکە مرۆڤ لەتوانایدا یەتەماشای هەموو شتێك بکات تەنیا ئەو کرمە سپیو وردانە نەبێت.)

لەدەروازەی گوندەکەدا تووشی پۆستەچیەکە بووم، دەیویست فوو بە بووقەکەیدا بکات. زەرفێکی شینی کاغەزی بۆ درێژ کردمو وتی:

سەرۆك، ئەمە نامەی تۆیە.

من خەتە ناسکەکەی سەر زەرفەکەم ناسی، لەخۆشیاندا تەزوویەکم تێ گەڕا، خێرا بەناو گوندەکەدا تێپەڕیم، چوومە ناو باخی زەیتوونەکانەوەو بێ ئەوەی بتوانم دان بەخۆمدا بگرم نامەکەم کردەوە. نامەیەکی کورتو پوخت، یەکژەمی هەموویم خوێندەوە:

(ئێمە گەیشتووینەتە سنووری گورجستان، لەدەست کوردەکان ڕزگار بووینو هەموو شتێك ڕوولەچاکیە، ئێستا دەزانم بەختیاری یانی چی؟ چونکە تەنیا بەئەزموون ئەو پەندە کۆنەم بۆ سەلما کە دەڵێت: ((کامەرانی لەوەدایە کە ئەرکی خۆت بەجێ بێنیت، چەندە ئەرکەکە گران بێت کامەرانیەکە مەزنترە))

((تا چەند ڕۆژێکی دی ئەم مەخلووقە دەرکراوو گیان لەسەر لێوە دەگاتە —باگوم— منیش هەر ئێستا بروسکەیەکم بەم مانایە پێ گەیشتوە:

((کەشتیە بەراییەکان دەرکەوتوون))

لەرزەوە پاڵم بە تاشە بەردەکەوەدا، خەوەکە هێند ناخۆش بوو وەك شمشێرێك بۆ سەرم داهاتبێتەوە وابوو.

لەخەوەکەدا، خۆم بەتەنیا لە ئەسینادا بینی، بەشەقامی هێرمسدا[١٧١] سەردەکەوتم، قرچەی گەرمابوو، کەس بەسەر شەقامەکەوە نەبوو، دوکانەکان داخرابوون دنیا کە زۆر بێدەنگ بوو، ئەوکاتەی بەبەردەم کڵێسای کاپنیکارادا[١٧٢]تێ دەپەڕیم هاوڕێکەمم بینی، بەڕەنگی پەڕیوو هانکە هانکەوە لە گۆڕەپانی ((دەستوور))[١٧٣]ەوە دەهات، بەدوای پیاوێکی باڵابەرزی زۆر لاوازەوە بوو کە هەنگاوی لە هەنگاوی دێو دەچوو. هاوڕێکەم بەرگی ڕەسمی دیبلۆماسیانەی لەبەردا بوو، هەر کە لە دوورەوە چاوی کردم بەدەم هەناسە بڕکێوە هاواری لێ کردم:

–ها، مامۆستا، تۆ لەکوێیت و چی دەکەیت؟ چەند سەدەیەکە تۆم نەدیوە، وەرە ئەمشەو پێکەوە قسە بکەین.

منیش بەدەنگی بەرز، وەك ئەوەی هاوڕێکەم لەجێگایەکی زۆر دووربێت– چەندتینی دەنگ هەڵبڕینم تیابوو بۆ ئەوەی گوێی لێ بێت–وتم لەکوێ؟

–گۆڕەپانی کنکورد[١٧٤]، ئەمشەو سەعات شەش، لەکافیتریای((کاینی بەهەشت))[١٧٥]

لەوەڵامدا وتم: باشە، دێم.

ئەو بەئاوازێکەوە کە بۆنی لۆمەی لێ دەهات وتی: وا دەڵێیت، بەڵام نایەیت.

بەدەنگێکی بەرز وتم: بێگومانبە دێم، دەستت بێنە.

–پەلەمە.

–پەلەی چیتە؟ دەستت بێنە ، دەی.

---

[١٧١] Hermes

[١٧٢] Kapnikarea

[١٧٣] Constitution

[١٧٤] Concord

[١٧٥] La Fontaine du paradis

دەستی درێژ کرد، لەپڕا دەستی لە شانی بوەوە، کەوتە هەواو هات دەستی گرتم، من لەم پێك گەیشتنە ساردە زۆر ترسام، هاوارم کردو لەخەو ڕاپەڕیم.

ئەمە ئەوکاتە بوو کە قەلە ڕەشەکە بەسەر سەرمەوە هاتوچۆی بوو، دەت وت ژەهر بەلێوما دێتە خوارێ.

ڕووم لەخۆرهەڵات کردو چاوم لەئاسۆ بڕی، وەك بمەوێت دووری نێوانەکە کون بکەمو ببینم.. لەوە دڵنیا بووم کە هاوڕێکەم لەمەترسیدایە، سێ جار بەدەنگی بەرز ناویم هێنا:

–ستاڤریداکی[١٧٦]، ستاڤریداکی، ستاڤریداکی

وەك بمەوێت غیرەتی بدەمێ، بەڵام دەنگەکەم لەچەند هەنگاوێکی بەردەمی خۆمدا ون بوو لەهەوادا توایەوە.

ڕێی گەڕانەوەم لەپێش گرت، لەچیاکەوە بەرەو خوار بومەوە، دەمویست بەشەکەتیەکەم لە دەردو ئازارەکانم کەم بکەمەوە، نائومێدانە لە هەوڵی ئەوەدا بووم کە ئەو پەیامە نهێنیانەی هەندێك جار دەتوانن بڕۆنە ناو لەشەوە بگەن بەرۆحو لەخۆیدا خۆی بکاتەوە، لەناخی بوونمدا یەقینێکی سەرەتایی، لەعەقڵ قووڵترو بەتەواوی ئاژەڵیانە، منی لێوان لێو کردبوو لەترس، هەر تەواو وەك یەقینی هەندێك ئاژەڵ، وەك مەڕو مشك کەلەپێش ڕوودانی بوومەلەرزەدا هەستی پێ دەکەن، ئەوڕۆحی مرۆڤی سەرەتاییە کە هێشتا بەتەواوی لەسروشت جیانەبوەوەو.. لەمندا زیندو بوو، ڕێك وەك ئەوکاتەی کە هێشتا دەستی عەقڵ نەی شێواندبوو، ڕاستەوخۆ دەرکی بە حەقیقەت دەکرد.

لەبەرخۆمەوە وتم: هاوڕێکەم لەمەترسیدایە، لەمەترسیدایە، لەمەترسیدایە.. بێگومان دەمرێت، ڕەنگە هێشتا خۆی ئەمە نەزانێت، بەڵام من دڵنیام.

بەڕاکردن لە چیاکەوە بەرەو خوار بوومەوە، قاچم لەبەردێك هەڵکەوت، کەوتم لەگەڵ خۆمدا زیخم بەکێش کرد، هەستامەوە، دەستو قاچم ڕووشابوونو خوێنیان لێ دەهات، کراسەکەیشم دڕابوو، وەلێ هەستم بە ئاسوودەییەکی تایبەتی دەکرد، بەخۆم دەوت: ((هاوڕێکەم دەمرێت، دەمرێت)) قوڕگم تەواو گیرابوو.

[١٧٦] Stavri daki

مرۆڤی داماو، بەخەیاڵی خۆی، قەڵایەکی بەرزو سەختی بەدەوری وجوودە چکۆلەو ناچیزەکەی خۆیدا دروست کردوە کەکەس ناتوانێت بچێتە ناوی‌و بیگرێت، هەوڵ دەدات لەوێدا پەنابگرێ ورێك‌و پێکی‌و ئاسایشی بۆ دابین بکات‌و بتوانێت تیایدا بەختیاربێت، لەوقەڵایەدا هەموو شتێك ڕێ‌و شوێنی خۆی هەیە، واتا پێویستە یاسا سادەو سەپێنراوەکانی پەیڕەو بکرێت، لەنێو ئەو قەڵایەدا کەبەرانبەر بەتاڵان‌و بڕۆی بێ ئامانی نهێنیەکان سەخت دروست کراوە، یەقینە بچووك‌و بەهێزەکان، هەزار پێکان، بەهەمووڵایەکیدا دێن‌و دەچن‌و کەسێك نیە لەناویان بەرێت، تاقە دوژمنێکی سامناك‌و مەلعون هەیە ئەویش یەقینی گەورەیە، هەر ئەو یەقینە گەورەیەیە کە ئێستا دیوارەکانی بڕیوەو پەلاماری ڕۆحی منی‌داوە.

کە گەیشتمە کوختەکەی سەردەریا، بۆ هەناسەی نوێ هەودایەکم دا، بیرم کردەوە! ((هەموو ئەم پەیامانە لە ئەنجامی هەڵچوونی دەرونی خۆمانەوە سەرچاوە دەگرن، لەخەونماندا بەرگێکی جوان‌و سەرنج ڕاکێش لەبەردەکەن، هەر چۆنێك بێت ئەوە خۆمانین کە دروستیان دەکەین)).

کەمێك حەسامەوە، عەقڵ دڵمی هێنایەوە سەر خۆی، باڵی ئەو شەمشەمە کوێرە سەیرەی بڕی‌و بڕی تا کردی بە مشکێکی ئاسایی.

لەکوختەکەدا پێکەنینم بەسادەیی خۆم دەهات، شەرمم دەکرد کە ئاوا زوو بیرم کەوتە دوای ترسەوە. دووبارە کەوتمەوە ناو ژیانی ڕۆژانەوە، برسی‌و تینوو بووم، هەستم دەکرد لەپێ کەوتووم، ئەو شوێنانەی لەشم کە بەرد ڕوشاندبوونی دەسوتانەوە، کەچی هەستم بە ئاسوودەییەکی مەزن دەکرد، دوژمنە ترسناکەکە دیواری دەرەوەی قەڵای بڕیبوو، لەدوەمین خەتی بەرگری سەختی مندا گیری خواردبوو.

-٢٦-

ئیدی هەموو شت کۆتایی هاتبوو، زۆربا سیمو ئامێرو کامیۆنو وردە ئاسنو داری سەختمانی کۆکردبوەوە، لە شوێنێکی کەنار دەریاکەدا لەسەر یەکی دانا بوون، چاوەڕوانی کەشتی دەکرد بێتو باریان بکات.

وتم: زۆربا، ئەوشتانە بۆ خۆت، دیاری منن بۆ تۆ، سەرکەوتوبیت. زۆربا گەرووی گیرا، وەك ئەوەی ڕێگا لەگریانەکەی بگرێت وابوو لەسەرخۆ وتی:

-بۆ لەیەکتر جیادەبینەوە، سەرۆك، بۆ کوێ دەچیت؟

-دەڕۆم بۆ دەرەوەی وڵات، زۆربا، ئەو بزنەی لەناوەوەی مندایە هێشتا زۆری کاغەز ماوە کە بیخوات.

-کەواتە هێشتا چاك نەبوویت، سەرۆك؟

-بۆ نا، زۆریش، لەسایەی تۆوە، بەڵام من دەمەوێت بەهەمان ڕێگادا بڕۆم کەتۆ پیایدا ڕۆیشتوویت، یەعنی تۆ چیت بەگێلاس خواردن کرد منیش وا لەگەڵ کتێبدا دەکەم، هێند کاغەز دەخۆم لەدڵم بداتو بڕشێمەوەو ڕزگارم بێت.

-ئەی من بێ تۆ چی بکەم، سەرۆك؟

-خەم مەخۆ، زۆربا، ئێمە پێك دەگەینەوە، دەزانیت مرۆڤ خاوەنی چ توانایەکی مەزنە ڕۆژێکی تر نەخشەی پڕۆژەیەکی گەورە بۆ خۆمان دەکێشینو بەرگی کاری بۆ دەپۆشین، دێرێکی تایبەتی بەخۆمان دەکەین، بێ خواو بێ شەیتان، لەگەڵ خەڵکانێکی ئازاددا، تۆیش زۆربا، دەبیتە دەرگاوانیو وەك پوتروسی پیرۆز کلیلی کردنەوەو داخستنیت پێ دەبێت..

زۆربا لەسەر زەویەکە دانیشتبوو، پاڵی بەکوختەکەوە دابوو، ناوە ناوە پەرداخەکەی پڕدەکردو دەینۆشیو هیچی نەدەوت.

شەوداهاتوو شێومان كرد، بەدەم شەراب خواردنەوەوە دوا قسەمان كرد، سبەینێ بەیانی زوو لەیەكتر جیا دەبووینەوە.

زۆربا سمێڵی بادەداو شەرابی دەخواردەوەو بەردەوام دەیوت: بەڵێ، بەڵێ، بەڵێ.

ئاسمان پڕ لە ئەستێرەو شەو بەسەرمانەوە وەك ڕووبارێكی شین لەڕۆیشتنا بوو، لە ناوەوەماندا دڵمان حەزی بەسكاڵاو خەم هەڵڕشتن دەكرد، بەڵام هێشتا خۆیگرتبوو.

بیرم دەكردەوە ((بۆ هەمیشە ماڵ ئاوایی لەزۆربا بكەو بەوردی لەدەمو چاوی ڕابمێنە، چونكە ئیتر هەرگیز چاوت بەچاوی ناكەوێتەوە))

لەوەدابوو خۆم بخەمە سەر سنگە پیرەكەی‌و دەست بەگریان بكەم، بەڵام شەرمم پێ هات. ویستم پێ بكەنم، بۆ ئەوەی هەڵچوونە دەروونیەكەم بشارمەوە بەڵام نەمتوانی، گریان گەرووی گرتبووم.

تەماشای زۆربام دەكرد، گەردنی وەك گەردنی باڵندەی ڕاوی درێژكردبوو. بەبێدەنگی شەرابی دەخواردەوە، سەیرم دەكردو فرمێسكم لە چاو زابوو، بەڕاست ئەم نهێنیە جگەر سۆزە، ئەم ژیانە چیە ؟ مرۆڤەكان پێك دەگەن‌و وەك گەڵای درەختی دەم با لەیەكتری جیادەبنەوە، چاو بێ هوودە هەوڵی ئەوەیەتی كە سیماو دەمو چاوو لەش‌و ڕەفتاری كەسێك كە مرۆڤی خۆش دەوێت لای خۆی بهێڵێتەوە، بەڵام دوای تێپەڕبوونی چەند ساڵێك تەنانەت ئەوەی بیرناكەوێتەوە كە چاوی ئەوەی دیویەتی شین بوە یان ڕەش.

لەدڵەوە هاوارم لەخۆم كرد كە: ((دەبوو گیانی مرۆڤ لە برونز یان لە ئاسن بێت نەك لە با))

زۆربا بەردەوام دەیخواردەوەو سەرە گەورەكەی ڕەپ‌و ڕاست ڕاگرتبوو، دەت وت گوێی لە تەپەی چەند پێیەك گرتوە كە لەو تاریكە شەوەدا نزیك دەكەوتنەوە، یان لە قووڵترین نوختەی بووونیدا پاشەكشێیان دەكرد.

—بیر لە چی دەكەیتەوە زۆربا؟

—دەتەوێت بیر لەچی بكەمەوە، سەرۆك؟ لەهیچ.. وتم لەهیچ، من بیر لەهیچ ناكەمەوە.

دوای كەمێك دیسان پەرداخەكەی پڕ كردەوەو وتی:

-بەخۆشیت، سەرۆك.

پێکمان لێکدا، هەردووکمان هەستی ئەوەمان هەبوو کە ئەمە خەمێکی تاڵو سەخت بێتو زۆر بخایەنێت، یان دەبوو بگرین، یان سەر خۆش بین، یان بێ پەروا سەمابکەین.

من پێشنیازم کرد: زۆربا سەنتورەکەت بژەنە.

-زوو پێم وتوویت، سەرۆك، سەنتورلێدان دڵی خۆشی گەرەکە، من مانگێکی تر، دوومانگیتر، دووساڵی تر، نازانم چەندی تر، دەتوانم سەنتور لێ بدەم، ئەوسایش ئەو گۆرانیە دەچڕم کەچۆن دوو مرۆڤ بۆ هەتا هەتایە لەیەکدی جیا بوونەوە.

برزکامو بەسەریمدا خوڕی: بۆ هەتا هەتایە؟!

من بەناچاری قسەکەی زۆربام لەدڵی خۆمدا دەوتەوە، بەڵام چاوەڕێی ئەوەم نەدەکرد لەدەمی ئەوەوە بیبیستم، ترسام.

زۆربا کە بە زەحمەت تفی ناودەمی بۆ قووت دەچوو دووبارەی کردەوە:

بۆ هەتا هەتایە، ئەرێ بۆ هەتا هەتایە. ئەوەی کە وتت گوایا جارێکی دی یەکتری دەبینینەوەو دێر دروست دەکەین بێجگە لە دڵدانەوەی نەخۆشێك کە لەسەرە مەرگا بێت هیچی ترنیە، من ئەوانەم قبووڵ نیەو نامەوێن، ئەوە چ مانایەکی هەیە؟ بۆ من ژنم دڵخۆشیم بدەنەوە؟ بەڵێ، بۆ هەتا هەتایە.

من کە لەم سۆزە خەستەی زۆربا نیگەران بووم وتم:

-ڕەنگە هەر لێرە لەگەڵتا بمێنمەوە.. دەشێت لەگەڵتا بێم، من پیاوێکی ئازادم.

زۆربا سەری لەقاندو وتی:

-نا، تۆ ئازاد نیت، ئەو گوریسەی تۆی پێوە بەستراویتەوە کەمەکێك لەگوریسی کەسانی دی درێژترە، هەر ئەوەندەو بەس، تۆ، سەرۆك بەگوریسێکی درێژەوە بەستراویتەوە، دێیتو دەچیتو وادەزانیت ئازادیت، بەڵام ناتوانیت گوریسەکە ببڕیت، مرۆڤیش کە گوریسەکە نەبڕیت...

جەسوورانە وتم: ڕۆژێك ئەوە هەردەکەم.

بۆیە ئەمەم وت چونکە قسەکانی زۆربا برینێکی سارێژ نەبووی دڵمی کولاندبوەوەو هێنابویەوە سوێ.

زەحمەتە، سەرۆک، زۆر زەحمەتە، بۆ بەدیهاتنی کارێکی وا دەبێت کەمێک شێتیەتیت تیا بێت، بەڵێ شێتیەتی، تێدەگەیت؟ دەبێت سەر چڵی بکەیت، بەڵام تۆ عەقڵێکی توندو تۆڵت هەیە کە دەت بەزێنێت، عەقڵی مرۆڤ لە دوکاندارێک دەچێت حسابەکانی باش رابگرێت، ئەمەندەم داوەو ئەوەندەم دەست کەوتوە، ئەمیانم قازانجەو ئەویان زەرەر، دووکاندارێکی بچووکی حساب ڕاگرە، هەرچیەکی هەیە هەمووی ناخاتە ڕوو، هەمیشە شتێك دەهێڵێتەوە، گوریسەکە ناپچڕێنێت، نا، ئەو ناقۆڵایە گوریسەکەی توند گرتوە، چونکە ئەگەر لەدەستی دەربچێت تیا دەچێت، بەڵام ئەگەر تۆ گوریسەکە نەبڕیت پێم ناڵێیت چ تامێك لەژیان دەبەیت؟ تامی ((گوڵەکانی)) دەدات گوڵەکانی بێ تام، ئەوە وەك تامی ئارەق نیە کە دنیات بە هەڵگێڕاوەیی نیشان دەدات.

زۆربا بێدەنگ بوو، شەرابی بۆ خۆی تێ کرد، کەچی ڕایەکەی گۆڕی، وتی:

-داوای پۆزشت لێ دەکەم، سەرۆک، من لادێییەکی نەخوێندەوارم، وشەم بە ددانەوە دەنووسێت، وەك چۆن قوڕ بەپێوە دەلکێت، من نازانم ڕستەی جوان بڵێمو بەشانو باڵتا بێمە خوارێ، نا، ناتوانم، بەڵام تۆ لەقسەکانم تێ دەگەیت.

پێکەکەی هەڵداو تەماشای کردم.

لەپڕا وەك رکێك بەرکی گرتبێت هاواری کرد:

-تۆ تێ دەگەیت، ئەرێ، تۆ باش تێ دەگەیت، هەر ئەم تێگەیشتنەیشە کە نابوودت دەکات، ئەگەر تۆ تێ نەگەیشتو بوویتایە بەختەوەر دەبوویت، بۆ تۆ لەچیت کەمە؟ گەنجیت، هوشیاریت، پارەداریت، تەندروستیتو مرۆڤی چاکیت، ئیدی چی، کەمو کەسرت نیە، تەنیا یەك شتت نیە ئەویش شێتیەتیە، مرۆڤیش کەئەمەی نەبوو، سەرۆك..

سەرە زلەکەی لەقاندو بێدەنگ بووەوە.

زۆرم نەمابوو دەست بەگریان بکەم، ئەوەی زۆربا دەیوت ڕاست بوو، کەمناڵ بووم یەکپارچە هەڵچوونی شێتانەو ئارەزووی نائاساییم هەبوو، هەموو دنیا نەی دەتوانی لەخۆیم بگرێت، وردە وردەو لەگەڵ ڕەوتی زەماندا عاقڵتر بووم، سنوورم بۆ کارەکانم دانا، ئەرێم لە نەرێ جیاکردەوە، هەروەها مەسەلە ئینسانیەکانم لەمەسەلە خواییەکان جیاکردەوە، توند سەری دەزووی کۆلارەکەمم بەدەستەوە گرت تا با نەیبات.

ئەستێرەیەکی گەورەکشاو خەتێکی لە ئاسماندا دروست کرد، زۆربا ڕاچڵەکی‌و چاوی زەق کردەوە، وەك ئەوەی یەکەمجاری بێت ئەستێرەی کشاو ببینێت.

پێی وتم : ئەستێرەکەت بینی؟

—بەڵێ.

هەردووکمان بێدەنگ بووین.

لەپڕا زۆربا ملە درێژەکەی ڕێك بڵند کردو هەوای لەسنگی ئاخنی، هاوارێکی هۆڤیانەو نائومێدانەی دەست پێ کرد، هاوارەکە وردە وردە گۆڕا بۆ ڕازو نیازی ئینسانی، لە قووڵایی دەروونی زۆرباوە گۆرانیەکی کۆنی تورکی یەك ڕیتم، گۆرانیەکی پڕ لە ئازارو تەنیایی سەری هەڵدا، دڵی زەوی شەقی بردو ژەهرە خۆر هەڵاتیە زۆر شرینەکە بڵاوبوەوە، هەستم کرد گشت ئەو ڕاهێڵانەی کە هێشتا منیان بەمەزنی‌و ئومێدەوە دەبەستەوە قرچۆك بۆن‌و پسان:

ئی کیکلیك بیر تەپە اندا اوخیور

ئوخمەدا، کیکلیك، بنیم دردم یتیور. ئامان.. ئامان..

تا چاو بردەکات بیابانێکی بە لم داپۆشراوە، دنیا لە درەوشانەوەدایە، ڕەنگی پەمەیی‌و شین‌و زەردی لە خۆ گرتوە، دەمارەکانی لاجانگ لێ دەدەن، ڕۆح شێت گیرانە هاوار دەکات، زۆر بەوە کامەرانە کە هاوارێکی تر نیە وەڵامی بداتەوە. چاوم پڕ بوو لە فرمێسك.

دووکەو بەسەر تەپۆڵکەیەکەوە دەخوێنن

مەخوێنن، کەوەکان، من تەنیا خەمەکانی خۆمم بەسە، ئامان، ئامان

زۆربا بێدەنگ بوو، بە بزاوتێکی خێرا بەسەری پەنجەی ئارەقەی ناوچاوی سڕی، دانەوی‌و لەزەویەکە ڕاما.

دوای ماوەیەك لێم پرسی:

—ئەم ئاوازە تورکیە هی کام ئاهەنگە، زۆربا؟

—ئاهەنگی حوشترەوانە، حوشترەوان کە بەبیاباندا دەگەڕێت ئەو گۆرانیە دەڵێت.

ساڵانێك بوو لەبیرم کردبوو، وا ئەمشەو...

سەری بڵند کردو لێی ڕوانیم، دەنگی وشكو خەم گەرووی گرتبوو.

وتی: سەرۆك، کاتی نووستنت هاتوە، دەبێت بەیانی زوو هەستیتو بڕۆیت بۆ کاندیو سواری کەشتی بیت، شەوباش.

وتم: خەوم نایەت، لەگەڵتام، ئەمە دوا شەوە پێکەوە بین.

بەدەنگی بەرز وتی: هەر بۆیە دەبێت زوو کۆتایی بێت.

پەرداخەکەی هەڵگێڕایەوە، ئەمە نیشانەی نەخواردنەوەی بوو، پیاوانی ڕاستەقینە وان، یەکسەر واز لە جگەرەکێشان، شەراب خواردنەوەو قومار کردن دێنن، هەر تەواو وەك قارەمانە یۆنانیەکان، وەك پالیکار[١٧٧]

((دەبێت تۆ ئەوە بزانیت، باوکم پالیکارێکی لە ئازایەتیا بێ وێنە بوو، تەماشام مەکە، من لە ترسنۆکێك زیاتر نیم، بەتۆزی پێی ئەودا ناگەم، باوکم کۆنە یۆنانیەکی رەسەن بوو، کەدەستی دەگوشیت لەوەدابوو ئێسکەکانی ورد بکات، من جارجارە قسە دەکەم، وەلێ باوکم هەر دەیگرماند، دەی حیلاندو گۆرانی دەوت، مەگەر بەدەگمەن وشەیەکی ئینسانی بەدەمدا بهاتایە.

((باشە، ئەو مرۆڤە حەزی بەهەموو ئارەزوەکانی دنیا بوو، کەچی وای واز لێ دەهێنان دەت وت بەشمشێر دەیان بڕێت، بۆ نمونە: ئەوەندەی جگەرە دەکێشا دەت وت دووکەڵکێشی زۆپایە، بەیانیەکی زوو چوو بۆ زەوی کێڵان، کە گەیشت پاڵی بە پەرژینەکەوەدا، بەپەلە دەستی بۆ پشتێنەکەی برد تا کیسە تووتنەکەی دەربێنێو پێش دەست بەکارکردن جگەرەیەك بپێچێتەوە، کیسە تووتنەکەی دەرهێنا، بەڵام خاڵی بوو، لەبیری چووبوو لەماڵەوە تووتنی تێ بکات.

((لەداخا کەفی کەوتە لالێوو هاتە گوڕاندن، لەناکاوێکدا هەستاو بەرەو گوندەکە ڕایکرد، چاوت لێیە چەند ئارەزوەکەی بەسەردا زاڵ بوە، بەڵام هەر لەکاتی ڕاکردنداو لەڕێگا تەریق بوەوە–پێم وتویت مرۆڤ چ بوونەوەرێکی پڕ لەنهێنیە– کیسە تووتنەکەی دەرهێناو بەددانی تێکە تیکەی کرد، پاشان خستیە ژێر پێیەوەو تفی لێ کردو وەك گا

---

[١٧٧] Palikar چەکداری کێونشینی یۆنانیە کە بە ئازایەتی بەناوبانگن. ف

نەڕاندی: پیس، پیس، سۆزانی، ئیدی لەوسا بەدواوە ، تا کۆتایی تەمەنی لێوی بەرجگەرە نەکەوت.

((ئەمە کاری پیاوانی ڕاستەقینە، سەرۆك، شەوباش))

هەستاو بەشەقاوی فراوان کەوتە بڕینی کەنارەکە، تەنانەت ئاوڕیشی نەدایەوە، گەیشتە دوا نوختەی بینینی کەنارو لەسەر تاشە بەردێك ڕاکشا.

*　　*　　*

ئیتر من ئەوم نەبینیەوە، پێش بانگی کەڵەشێر وڵاخدار هێسترەکەی هێنا. سواربووم‌و کەوتمە ڕێ، ئەگەر بەهەڵەدا نەچووبم ئەو بەیانیە زۆربا لەپەنایەکدا خۆی گرتبوو تا تەماشای ڕۆیشتنەکەم بکات، چونکە نە بەسەر تاوێرە بەردەکانەوە بوو نە بۆ خوا حافیزییەکی ئاسایی هات، نەوەکا سۆزێك هەردووکمان بگرێت، بکەوینە گریان‌و دەست‌و دەستەسڕ ڕاوەشێنین‌و نەزرو نیاز بکەین.

جیابوونەوەیەك بوو وەك بەشمشێر کەرتت کردبێت وابوو.

لەکاندی برسکەیەکیان دامێ، وەرم گرت‌و ماوەیەکی زۆر بەدەستی لەرزۆکەوە سەیرم کرد، دەمزانی چ هەواڵێکی تیایەو، تەنانەت بە یەقینێکی سەیرەوە دەمزانی ژمارەی وشەو پیتی چەندەو ناوەڕۆکەکەی چیە، حەزم دەکرد پێش ئەوەی سەری پاکەتەکەی بکەمەوە بیدڕم، کە بزانم چیتیایە ئیتر خوێندنەوەی بۆ چیە؟

بەڵام بەداخەوە تا ئێستا ئێمە بڕوا بەڕۆحی خۆمان ناکەین، ئەو بەقاڵە پیرە یەعنی عەقڵ، گاڵتە بەڕۆحمان دەکات. وەك چۆن ئێمە گاڵتە بەپیرێژنە فاڵچی‌و جادوبازەکان دەکەین.

بە ناچاری بروسکەکەم کردەوە، لەتفلیسەوە هاتبوو، تا چەند چرکە ساتێك پیتەکان لەبەرچاومدا سەمایان دەکردو من هیچم بۆ چیا نەدەکرایەوە، بەڵام وردە وردە جووڵەیان لێ بڕاو کەوتمە خوێندنەوەیان:

((دوێنێ دوای نیوەڕۆ، بەهۆی نەخۆشی سیلەوە، ستاڤریداکی مرد))

*　　*　　*

پێنج ساڵ تێپەڕی، پێنج ساڵی دورو درێژو سامناك، زەمەنی ئەوماوەیە زۆر خێرا بوو، سنووری جوگرافیەکان کەوتنە سەماو وڵاتەکان وەك ئۆکۆردیۆن دەکشان‌و دەهاتنەوە

یەک، منو زۆربا بۆ ماوەیەک لەنێو باهۆزی ڕووداوەکاندا بووین، لەسێ ساڵی یەکەمدا جارجارە کارتێکی کورتیم پێ دەگەیشت.

جارێکیان لەچیای ئاتوسەوە، بەسەرکارتێکی مریەمی پاکیزەوە، دەرگاوانی بەهەشت، بەچاوە گەورەو غەمبارەکانییو چەناگەی پتەویەوە، لەژێر وێنەکەی مریەمدا، زۆربا بەقەڵەمە زبرو گەورەکەی کە کاغەزی دەدڕاند نووسیبووی:

ئێرە جێگای کارو کاسبی نیە، سەرۆک، ڕاهیبەکانی ئێرە تەنانەت کێچیش ناڵ دەکەن، من لێرە نامێنم))

دوای چەند ڕۆژێک کارتێکی دیکەی لەم جۆرە گەیشت:

((من ناتوانم بەم قەفەزی تووتیەوە، وەک سێرک بازە گەڕۆکەکان، دێر بەدێر بگەڕێم، بۆیە دام بە ڕاهیبێکی گاڵتەجاڕ، ئەم ڕاهیبە توکانەکەی[178] خۆی فێری درووەی ((خودایا بەزەییت پیاماندا بێتەوە)) کردوە، ئەو باڵندە بەد ڕەگەزە وەک ڕاهیبێکی ڕاستەقینە ئەو درووەە دەخوێنێت، بەجۆرێک کە مرۆڤ باوەڕناکات.

بێگومان ڕاهیبەکان ئەم درووەە فێری تووتیە بێچارەکەی ئێمەیش دەکات، ئاهـ.. ئەم تووتیە نەگبەتە لەتەمەنیا زۆرشتی سەیری دیوە! وائێستا دەبێت بە ڕاهیب. لەناخی دڵمەوە ماچت دەکەم.

باوکە ئالکسیوس، زاهیدی پیرۆز))

دوای شەش حەوت مانگ کارتێکی تریم لە ڕۆمانیاوە پێگەیشت، وێنەی ژنێکی قەڵەوو شانو مل ڕووت بوو، نوسیبوی: ((هێشتا زیندوم مامالیگا[179] دەخۆمو بیرە دەخۆمەوە، لەچاڵە نەوتەکاندا کاردەکەم وەک جرجی ناو ئاوەڕۆکان پیسو گەندەڵم، وەلێ گرنگ نیە، لێرە ئەوەی دڵو ورگ داوای دەکات زۆرە، بۆ پیرە قاڵتاچیەکی وەک من بەهەشتی

---

[178] Toucan باڵندەیەکی دەنووک درێژو پانە، پەڕەکانی ڕەنگاڵەییو جوانن. لەناوچە گەرمەکانی ئەمەریکادا هەن. (فەرهەنگی عەمیە)

[179] Mamaliga گۆشتاوێکی تایبەتی رۆمانیایە بەگەنمەشامی دروست دەکرێت.-ف-

سەرزەویە، تۆ لێم تێ دەگەیت، سەرۆك، شیرینیو شیرین زمان زۆرن ، سوپاس بۆخودا، لەکانی دڵمەوە ماچت دەکەم. ئالکسیس زوربیکو، جرجی ئاوەڕۆکان))

دووساڵێ تێپەڕی، ئەمجارەیان کارتێکم لە سربستانەوە پێ گەیشت:

((هێشتا ماوم، لێرە سەرمایەکە شەیتان دەیبەستێت، هەر لەبەرئەوە ناچاربووم ژن بێنم، پشت کارتەکە تەماشا بکە وێنەکەی دەبینیت، ژنێکی جوانو بچووکە، کەمێك سکی بەرزبۆتەوە، دەیەوێت بەدیاری زۆربایەکی چکۆلەم بۆ بێنێت، من کە لەپاڵیا وەستاوم هەمان ئەو بەرگەم لەبەردایە کە کاتی خۆی تۆ پێشکەشت کردبووم، ئەو ئەنگوستیلەیەی لەپەنجەمدا دەیبینیت هەمان ئەنگوستیلەی بوبولینای بێچارەیە– ئیدی رۆژگارە، خوا لێی خۆش بێت– ژنەکەم ناوی لیوبایە[١٨٠]، ئەو پاڵتۆیەی لەبەرمدایەو یەخەکەی کەوڵە رێویە جیازی ژنەکەمە، ماینێكو حەوت بەرازیشی لەگەڵ خۆیدا هێناوە، لەماینە ڕەسەنەکانە، دوومنداڵی لەمێردەکەی پێشووی هەیە، لەبیرم نەبوو پێت بڵێم کە بێوەژن بوو، من لە چیایەکی ئەم نزیکانە کانە بەردێکی سپیم پەیداکردوە، سەرمایەدارێکم هەڵفریواندوەو ئێستا شاهانە دەژیم. لەقووڵایی دڵمەوە ماچت دەکەم. ئالکسیس زوبیچ، کۆنە بێوە پیاو))

لەپشتی کارتەکەوە وێنەی زۆربا، دڵخۆشو کامەران، لەبەرگی زاوایەتیدا، بەشەوکڵاوێکی خوریو دار دەستێکی بچووکی دارە بەنو پاڵتاوێکی درێژی نوێوە، ژنێکی جوانی سلاڤیش کە زۆر زۆر تەمەنی بیستو پێنج ساڵ دەبوو، ماینێکی کێوی کەفەڵ پانو زۆریش ئارەزوو بزوێنو سەرکێش بوو، جزمەیەکی درێژ لەپێداو بەسەرو سنگی پڕەوە، قۆڵی لە قۆڵی زۆربادا بوو، لەژێر وێنەکەوە، بەهەمان خەتی گەورەو ناقۆڵاوە زۆربا نوسیبووی: ((من، زۆربا، هەمیشە مەسەلەیەکم هەیە کە ژنە، ئەمجارە ژنەکەم ناوی لیوبایە))

[١٨٠] Liubo

من تەواوی ئەوسالانە لەدەرەوەی وڵات لەگەشتو گوزاردا بووم، منیش هەر سەرقاڵی مەسەلەیەك بووم، بەڵام مەسەلەکەی من نە سنگو مەمکی پڕی هەبوو کەبمداتێ نە پاڵتاوو نە بەرازیش.

ڕۆژێك لەبەرلین بروسکەیەکم بەم مانایە پێ گەیشت: ((بەردێکی سەوزی زۆر گەورەم دۆزیوەتەوە، هەر ئیستا وەرە بۆ ئێرە. زۆربا)).

ئەم ڕووداوە لەسەردەمی گرانیە گەورەکەی ئەڵمانیادا بوو، مارکی ئەڵمانی ئەوەندە دابەزیبوو کەبۆ کڕینی کەمترین شت-بۆ نموونە بۆ کڕینی پولێکی پۆستە- مرۆڤ ناچاربوو ملیۆنان مارك بخاتە جانتاکەیەوە، گرانیو سەرماو خەڵکی جلیان دڕاوو پێڵاویان کون ببوو، ڕوومەتی سووری ئەڵمانی زەرد هەڵگەڕا بوو، بای سارد هەڵی دەکردو خەڵکی وەك گەڵای پایز بەسەر شەقامەکانەوە دەکەوتن، دایك پارچە لاستیکێکی دەدایە دەست مناڵە شیرە خۆرەکەی تا بیمژێو نەگری، شەوانە پۆلیس ئێشکی سەر پردەکانیان دەگرت نەوەکوو دایکەکان لەگەڵ منداڵەکانیاندا خۆ بخەنە ڕووبارەکانەوە کۆتایی بە ژیانیان بهێنن.

زستان بوو، بەفردەباری، لە ژوورێکی پاڵ ژوورەکەی مندا پرۆفیسۆرێکی خۆر هەڵات ناسی ئەڵمانی دەیویست خۆی گەرم بکاتەوە، یەعنی بەهۆی پەڕەمووچێکی درێژەوە کە کارێکی گرانی خەڵکانی خۆرهەڵاتی دوورە ، چەند شیعرێکی چینی، یان پەندو حیکمەتەکانی کۆنفوشیوس بنوسێتەوە، نووکی پەرەمووچەکەو ئانیشكو دڵی زاناکە سێ گۆشەیەکیان دروست دەکرد، بەدڵخۆشیەوە پێیوتم: تاچەند دەقیقەیەکی تر ئارەقە دەکەوێتە ژێر باڵمو گەرمم دەبێتەوە.

لەو ڕۆژە تاریکو ناخۆشانەدا بروسکەیەکی زۆربام پێ گەیشت. لەسەرەتاوە تووڕەبووم، لەکاتێکدا کە بەملیونەها مرۆڤ لەدەردو مەینەتیدا بوونو، تەنانەت لەتێك نانیان دەست نەدەکەوت لەمردن رزگاریان بێت، کەچی من بروسکەیەم پێ دەگەیشتو داوەتی ئەوە دەکرام هەزاران کیلۆمەتر ڕێگا ببڕم بۆ ئەوەی بەردێکی سەوزی جوان ببینم! بەدەنگە بەرز بەخۆم دەوت: ((خوا ئەو جوانیە ببڕێت کە دڵێکی نەبێت لەخەمی ئازارو مەینەتی خەڵکیدا بێت))

بەڵام ترسێك زوو دایگرتم، كە ڕكەكەم نیشتەوە هەستم كرد لەناوەوەی مندا بانگەشەیەكی تری نامرۆڤانە وەڵامی بانگەوازە نامرۆڤانە نەكەی زۆربا دەداتەوە، لەناوەوەمدا باڵندەیەكی كێوی هێلانەی كردبوو، باڵی پێكدا دەدا تادەربازبێت.

لەگەڵ ئەوەیشدا نەچووم، چونكە نەم وێرا، گوێم بەو بانگەوازە نادیارو زاڵمانەیەی ناو دەرونی خۆم نەداو كارێكی پڕ لە مەترسیو بێ عەقڵانەم نەكرد، من تەنیا گوێم بۆ ئەودەنگە شل كرد كە دەنگی مەنتیقو ساردو ئینسانیبوو، بۆیە قەڵەمەكەم هەڵگرتو نامەیەكم لەبارەی ئەوشتانەوە بۆ نووسی:

زۆربا وای وەڵام دامەوە:

((تۆ، سەرۆك، دوور لە گیانت هەر ڕەش نووسەكەی جارانیت، تۆی نەگبەت تەنیا جارێك ژیان دەرفەتی دایتێ بەردێكی سەوزو جوان ببینیتو نەت دی، بەشەرەفم زۆر جار وا ڕێك كەوتوە لەكاتی بێكاریمدا لەخۆم پرسیوە: ئایا دۆزەخ هەیە یان نا؟ بەڵام دوێنێ كە نامەكەی تۆم بەدەست گەیشت بەخۆم وت: ((بەڕاستی بۆ چەند كەسێكی وەك تۆی ڕەش نووسكەر هەر دەبێت دۆزەخ هەبێت))

لەوە بەدوا، ئیتر زۆربا نامەی بۆ نەنووسیم، كارەساتو ڕوداوی ناخۆشو تازەتر ئێمەی لەیەكدی جیا كردەوە، دنیا وەك مرۆیەكی بریندار یان سەرخۆش كەوتە تەپاو تلو هاورێیەتیو خەمە هاوبەشەكان تیا چوون. من زۆر جار لەگەڵ هاورێكانمدا باسم لەو رۆحە مەزنە دەكرد، هەموومان لە ڕەفتاری غرور ئامێزو دڵنیاو سەروی عەقلو مەنتیقی ئەو پیاوە خۆرسكە ئافەرینمان دەكرد. ئەو لووتكە بەرزە مەعنەوەیانەی كە ئێمە بە ساڵەهاو بە خەیاڵی زۆر دەبوو بیگەینێ ئەو بەبازێك پێی دەگەیشت، ئەوسا ئێمە دەمان وت: ((زۆربا گیانێكی مەزنە)) یان كە لەو لووتكانەیش تێدەپەڕی ئێمە دەمان وت : ((زۆربا شێتە)).

بەم شێوەیە، زەمان تێ دەپەڕی، شیرینی یادوەریەكان كەمەكێك ژەهراوی دەبوون، سێبەرەكەی دی، یەعنی سێبەری هاوڕێ ئازیزەكەم، بەسەر منەوە هەر سەنگی هەبوو، ئەو سێبەرە منی بەرنەدەدا، چونكە من خۆم نەم دەویست ئەو بەربدەم.

بەڵام من لەبارەی ئەو سێبەرەوە لەگەڵ كەسدا نەدەدوام، بەنهێنی قسەم لەگەڵ دەكردو بەهۆی ئەوەوە لەگەڵ مەرگا ئاشت دەبوومەوە، ئەو پردی نهێنی من بوو بۆ پەڕینەوە بەرەو كەنارێكی دی. كە گیانی هاورێكەم بەسەریا تێدەپەڕی من هەستم دەكرد ماندووو ڕەنگی پەڕیوە، تا ئەو ڕادەیەی كە نەیدەتوانی دەستم بگوشێت.

هەندێك جار بەترسەوە بیرم دەكردەوە: ڕەنگە هاورێكەم لەم دنیایەدا دەرفەتی ئەوەی نەبووبێت كۆیلایەتی جەستەی خۆی بگۆڕێت بەئازادی‌و سەقامگیریەك بەڕۆحی خۆی ببەخشێت، بۆ ئەوەی لەدوا هەناسەیدا تووشی ترسی مەرگ‌و فەنابوون نەبێت. وام بیر لێ دەكردەوە كە ڕەنگە بۆی نەڕەخسابێت ئەو نەمریەی كە لە وجودی خۆیدا هەبوو نەمری بكات.

بەڵام ئەو هەندێك جار هێزی دەدایە بەرخۆی– یان ئەوە من بووم كە لە پڕێكا بەمیهرو خۆشەویستیەكی فرەوەبۆ لای خۆمم ڕادەكێشا– ئەوسا وەك لاوێكی پڕ لە ئومێدو ئایندە دەهات‌و تەنانەت وام دەزانی بەسەر پلیكانەكانەوە دەنگی پێی دەبیستم.

زستانێك، بەتەنیا چوبوم بۆ چیاكانی ئینگادین[181]، لەوێ، لەگەڵ هاورێكەم‌و ژنێكی هاورێی هەردوكماندا چەند سەعاتێكی خۆشمان بەسەر برد. من هەر لەهەمان میوانخانە مامەوە كە ئەوسا لێی بووم. نوستبووم، تریفەی مانگ لەپەنجەرە كراوەكەوە بەژوور دەكەوت، هەستم دەكرد كە چیاو سنەوبەرە بەبەفر داپۆشراوەكان‌و شەوی هێورو شین دێنە ناو گیانی نووستووی منەوە.

هەستم بە بەختیاریەك دەكرد كە بەدەم ناوترێت، وەك بڵێی خەو دەریایەكی قووڵ‌و لەسەرخۆو شەفاف بێت‌و من شادو هێور لە ئامێزیدا پاڵ كەوتبم، هەستم ئەوەندە ناسك ببوو ئەگەر بەلەمێكی سەرئاو، هەزاران مەتر لەسەروی منەوە تێ بپەریایە لەشی دووكەرت دەكردم.

لە ناكاوێكدا سێبەرێكم كەوتە سەر، زانیم سێبەری كێیە، دەنگی پڕ بوو لەسەركۆنەكردن، وتی:

---

[181]Engadine

-نوستوویت؟

هەر بەهەمان ئاوازە وەڵامیم دایەوە:

-دەمێکە بەچاوەڕوان کراوی منت بەجێ هێشتوە، چەند مانگێکە گوێم لە زرینگەی دەنگت نیە، وێڵی کوێیت؟

-هەمیشە من لەپاڵتام‌و تۆ لە یادم دەکەیت، من ناتوانم بەردەوام بانگت بکەم، تۆیش خوا خواتە وازم لێ بهێنیت. ڕوناکی مانگ‌و درەختی بە بەفر داپۆشراوو ژیانی دنیا خۆشن، بەڵام نەکەیت منت لەبیر بچێت.

-تۆ خۆت دەزانیت کە هەرگیز من تۆ لەبیرناکەم، ڕۆژانی هەوەڵ کەتۆ لێم جیا بوویتەوە، من چیای بەرزو سەختم دەبڕی، لەشی خۆم ماندو دەکرد، شەوانی درێژم بەبێ خەو دەگوزەراندو بیرم هەر لای تۆ بوو. تەنانەت بۆ ئەوەی خەفە نەبم شیعرم دادەنا، بەڵام شیعرەکان هێند لاواز بوون شیاوی ئەو ڕەنج‌و زەحمەتکێشانەی من نەبوون، ئەمە دەست پێکردنی یەکێك لەو شیعرانەیە:

ئەو کاتەی کە تۆ بەپاڵ مەرگا تێ دەپەڕیت
من تەماشای قەدو باڵای هەردوکتانم دەکرد
کە چەندە نەرم‌و نیان بەلاڕێکاندا
وەك دوو مراوی کێوی کە بەرەبەیان لەخەو هەستابن دەڕۆیشتن

لە شیعرێکی تردا کە ئەویش ناتەواوە هاوارت لێ دەکەم:

دانەکانت لەیەکدی گیربکە، ئازیزەکەم، باگیانت دەرنەچێت پێکەنینێکی تاڵی کرد، دەم‌و چاوی لێ نزیك خستمەوە، کەڕەنگە پەڕیوەکەیم بینی ڕاچڵەکیم.

ئەو بەوشوێن چاوە خاڵی‌و بۆشەوە کەئیدی چاویان تیا نەمابوو، بەڵکوو لەباتی چاو پڕببوون لەخۆڵ ماوەیەك لێم ڕاما.

لەبەر خۆمەوە پرسیم: لەچی ڕاماویت؟ بۆ قسەناکەیت؟

دیسانەوە دەنگی وەك ئاخ‌و داخێکی دوور زرنگایەوە:

—ئاخ.. چی لەوڕۆحە ماوەتەوە کە دنیای زۆر لا بچووك بوو؟ تەنیا چەند شیعرێکی یەکێکی تر، ئەویش پەڕاگەندەو شلو شاو کە تەنانەت چوارینەیەکی لێ گەلآلە نابێت. من سەرگەردانی سەرزەویمو سەرلەوانە دەدەم کە هاوڕێم بوون، بەڵام ئەوان دڵیان داخراوە، ئیتر لەکوێوە بڕۆمە دڵیانەوە؟ چۆن بێمەوە ناو ژیان؟ من وەك سەگێك بەدەوری خانوویەکدا دەسوڕێمەوە کە هەموو دەرگاکانی داخراون، ئاه.. خۆزگا بمتوانیایە، بەئازادیو بێ ئەوەی وەك خنکاوێك خۆم بەلەشی گەرمو زیندوی ئێوەدا هەڵواسم بژیم.

فرمێسك لەچاویەوە دەرپەڕیو خاکی زەویەکەی کرد بەقوڕ. بەڵام زۆر زوو دەنگی خۆی گرتەوەو وتی:

—مەزنترین خۆشی کەتۆ لەتەمەنی خۆتدا بەمنت بەخشی بێت ڕۆژێکی جەژن بوو لەشاری زوریخ، لەبیرتە؟ تۆ ئەوڕۆژە پەرداخەکەت هەڵبڕی بەخۆشی منەوە بینۆشیت، لەبیرتە؟ یەکێکی تریشمان لەگەڵدا بوو.

وەڵامم دایەوە: بەڵێ، لەبیرمە، ئەوکەسە ئەوەبوو کە ئێمە پێمان دەوت خانمەکەمان...

هەردووکمان بێدەنگ بووین، چەند سەدە بەسەر ئەوەدا تێ پەڕیبوو؟ زوریخ، لە دەرەوە بەفر دەباریو ئێمە گوڵمان لەسەر مێزەکە دانابوو، ئێمە سیان بووین.

سێبەرەکە بەدەنگێکی تەنز ئامێزەوە پرسی:

—بیر لەچی دەکەیتەوە، مامۆستا؟

—لەزۆر شت ، لەهەموو شتێك...

—من بیر لەدوا وتەکانی تۆ دەکەمەوە، تۆ پێکەکەت بەرز کردەوەو بەدەنگی لەرزۆکەوە ئەم قسانەت بەزماندا هات: ((هاوڕێ، کەتۆ منالٚ بویت باپیرە پیرەکەت لەسەر ئەژنۆی دای دەنیشاندیتو لەسەر ئەژنۆکەی تری ئەو چەنگە کریتیەی دادەناو ئاهەنگی پالیکاری لێ دەدا، من ئەمشەو بەیادی تۆوە دەخۆمەوە، بەو هیوایەی چارەنووس کارێك بکات کەتۆ هەمیشەو هەر بەم جۆرە لەسەر ئەژنۆی خوا دابنیشیت)) بەداخەوە خوا زۆر زوو دوعاکەی گیراکرد.

من هاوارم کرد: گرنگ نیە، خۆشەویستی لەمەرگ بەهێزترە. ئەو زەردەخەنەیەکی تاڵی کردو هیچی نەوت" من هەستم دەکرد کە جەستەی ئەو لەگەڵ تاریکیدا دەبوو بەیەکو تێکەڵ بەشیوەنو ئاهوناڵەو گۆڵمەز بوو.

رۆژگارێك تامی مردن بەسەرلێومەوە مابوەوە، بەڵام دڵم ئاسوودە بوو، مەرگ بەڕوویەکی خۆش دۆستانەوە هاتە نێو ژیانمەوە، تەواو وەك هاوڕێیەك کە هاتبێت لەگەڵ خۆیدا ئێمە بەرێتو، بێ ئەوەی بێ تاقەت بێت لەگۆشەیەکدا چاوەڕێ بکات تاوەکوو ئێمە کارەکەمان تەواو بکەین.

بەڵام سێبەری زۆربا هەمیشە ئێرەیی پێ دەبردمو بەدەورمدا دەسوورا.

شەوێك لەماڵەکەی خۆمدا بەتەنیا لەکەنار دەریا، لەدورگەی ئاچینا[١٨٢] دابوم

هەستم بە بەختیاری دەکرد، هەردوولای پەنجەرەیەکی روو بەدەریا کرابوەوە. ڕوناکی مانگ دەهاتە ژورێ، دەریا هەناسەی هەڵدەکێشاو ئەویش بەختەوەر بوو، جەستەم لە ئەنجامی مەلەی زۆرەوە چێژی ماندو بونێکی زۆر خستبوویە خەوێکی قووڵەوە.

لەپڕا، لەنێو جەرگەی ئەم بەختەوەریەوە، لەکازێوەی بەیاندا خەوم بەزۆرباوە بینی، من بیرم نیە کە ئەو چی وتو بۆ هاتبوو، بەڵام کە بەئاگا هاتم دڵم لەترەکیندا بوو، بێ ئەوەی هۆیەکەی بزانم چاوم پڕبوو لەفرمێسك، ئارەزوویەك کە نەم توانی بەرەنگاری بوەستم زوو دەوری گرتمو گێڕامیەوە بۆ ژیانە دووکەسیەکەی سەر کەناری کریت. بۆ ئەوەی گوشار بۆ یادوەریەکانم بهێنم تاهۆشو هەستی خۆم کۆبکەمەوەو، هەموو ئەو قسەو دادو هاوارو بزاوتو پێکەنینو گریانو سەماکانی زۆربا بۆ ئەوەی لەفەرامۆشی رزگاریان بکەم بەیادی خۆم بهێنمەوە.

ئەم خولیایە هێند بەهێز بوو ترسام نەکا ئەمە ئاماژەیەك بێت کە لە شوێنێکی ئەم سەرزەویەدا، لەو ڕۆژانەدا، زۆربا لە گیانەڵڵادا بێت، چونکە رۆحی من بەجۆرێك لەگەڵ رۆحی ئەودا تێکەڵ ببوو کەوام دەزانی هەرگیز ئەوە نەدەشیا یەکێك لەئێمە بمرێتو ئەوی ترمان پەرێشان نەبێتو خەم وخەفەت داینەگرێت.

---

[١٨٢] Aegina

ماوەیەك لە نوسینەوەو کۆکردنەوەی ئەو یادوەریانەی کە لە زۆرباوە مابوونەوە دوودڵ بووم، ترسێکی منالأنە ئەوکی گرتبووم، بەخۆم دەوت: ((ئەگەر ئەمە بکەم مانای وایە بەڕاستی زۆربا لەبەردەم مەترسی مەرگدایە، دەبێت ئەو دەستەی کە دەیەوێت ئەو کارەم پێ بکات من بەرانبەری ڕابوەستمو خۆم بگرم))

دوو ڕۆژ، سێ ڕۆژ، هەفتەیەك، خۆم گرت، خۆم بەنووسینی ترەوە خەریك کرد، کەوتمە گەڕانو ڕۆیشتنو خوێندنەوەی کتێبی زۆر، بەم فێڵانە هەوڵی ئەوەم بوو ئەم خەونە نادیارە لاس بدەم. بەلأم بیری پەشۆکاوم بەخەستی قورسایی خۆی لەسەر زۆربا دانابوو.

ڕۆژێك لەبەرهەیوانی ماڵەکەمدا، لەپاڵ دەریاکە دانیشتبووم، نیوەڕۆ بوو، خۆر دەیبرژاند، منیش لەبەرانبەرمدا تەماشای بناری رووتو خۆشی سالامینم[١٨٣] دەکرد. لە ناکاوێکدا بەفیتی ئەو دەستە نادیارە پەڕەیەك کاغەزم هەڵگرت، لەسەر وردە بەردە داخەکە پاڵ کەوتمو دەستم کردە تۆمار کردنی هەڵسو کەوتەکانی زۆربا.

زۆر بەگەرمو گوڕی دەمنووسی، بەپەلە ڕابوردووم زیندو دەکردەوەو هەوڵی ئەوەم بوو هەموو وجودی زۆربا بهێنەمەوە یادو زیندوی بکەمەوە. لەبەر ئەوە من بەرپرسیاری لەناو چوونی بووم، بۆیە شەو ڕۆژ کارم دەکرد تا سیمای زۆربا وا بەرجەستە بکەمو وەك خۆیو بێ ڕتووشو دەست کاری بێت.

وەك جادووگەرە خێڵە وەحشیەکانی ئەفریقام لێ هاتبوو، کە لە ئەشکەوتەکاندا وێنەی باوکو باپیرانی خۆیان دەکێشن کە لە خەودا بینویانە، هەوڵ ئەدەن چەندە بۆیان بکرێت وەك خۆیان وێنەکەیان بکێشن تا ڕۆحی باوو باپیرانیان بتوانن بەئاسانی لاشەی خۆیان بناسنەوەو بچنە ناویەوە.

لەچەند هەفتەیەکدا ئەفسانەی زێڕینی زۆربا کۆتایی هات.

ئەو ڕۆژەیش هەر دوای نیوەڕۆ بوو کە دیسان لەبەر هەیوانی ماڵەکەم دانیشتبوومو تەماشای دەریام دەکرد، دەست نووسە تەواو کراوەکەم لەسەر ئەژنۆم دانابوو، هەستم بەخۆشیو ئاسودەیی دەکرد.

---

[١٨٣] Salamine دوورگەیەکی بچووکی یۆنانە لە خۆر ئاوای نیوە دوورگەی ئەسینادا. -ف-

دەت وت بارێکیان لەسەر شانم لابردوە، لە ژنێك دەچووم تازە منداڵەکەی لێ جیا بوو بێتەوەو لە باوەشی گرتبێت.

لەپشت چیاکانی پلوپونز[184] ەوە خۆرە یەکپارچە سوورەکە لەئاوابووندا بوو، سولا[185] ی کیژۆڵە گوندی کە نامەی بۆمن پۆست کراوی لەشارەوە دەهێنا، هاتە بەر هەیوانەکە، نامەیەکی دایە دەستمو بەڕاکردن گەڕایەوە، من تێگەیشتم، یان لانی کەم خۆم وا لەقەڵەمدا کە تێ گەیشتووم، چونکە هەر کە سەری نامەکەم کردەوەو خوێندمەوە نە لە جێگای خۆم بزوتم، نەهاوارم کردو بەلایشمەوە سەیر بوو، دڵنیابووم، دەبوو هەر لەو چرکەساتەدا کەمن دەست نوسەکە تەواو کراوەکەم لەسەر ئەژنۆی خۆم داناو تەماشای خۆرئاوابوونم کرد ئەم نامەیەم پێ بگەیشتایە.

لەسەرخۆو هێور نامەکەم خوێندەوە، نامەکە لە گوندێکی نزیك بە سکوپلیجەی[186] سربستانەوە هاتوەوەو بەئەڵمانیەکی شەق‌و شڕ نووسراوە، وامن وەری دەگێڕم:

((من مامۆستای گوندم‌و ئەم هەواڵە ناخۆشە بۆ ئاگاداریت دەنووسم. ئالکسیس زۆربا، کە لێرە کانزایەکی بەردی سپی هەبوو، یەك شەممەی ڕابووردو، لەسەعات شەشی دوای نیوەڕۆدا کۆچی دوایی کرد، لەسەرە مەرگا ئێمەی بانگ کردە سەرینی خۆی‌و بەمنی وت:

((وەرە ئێرەوە جەنابی مامۆستا، من هاوڕێیەکم هەیە ناوی فلان کەسە لە یۆنان، کە مردم بۆی بنووسە کە تا دوا دەقیقە هۆش‌و هەستم لای خۆم بوەو بیرم لای ئەوبوە، ئەوکارانەی کە کردوومن لە هیچیان پەشیمان نیم.

پێی بڵێ هیوادارم ژیانێکی خۆش بەسەر بەرێت، ئیتر کاتی ئەوەیش هاتوە کە عاقڵ بێت.

((-دووبارە گوێ بگرە، ئەگەر قەشەیەکم هاتە سەر بۆ ئەوەی ئیعترافاتم لێ وەربگرێت‌و دوعاو ویردم لەسەر بخوێنێت‌و ڕێ‌و ڕەسمی ئاینیم بۆ بەجێ بهێنێت، پێی بڵێ ملی خۆی بشکێنێت‌و بڕوات، چەندیشی پێ خۆشە نەفرەتم بۆ بنێرێت. من بەدرێژایی

[184] Peloponnes

[185] Soula

[186] Scopije

تەمەنم ئەوەندەم شت كردوە ئەوسەری دیارنیەو باوەڕیشم وایە هێشتا تەواوم نەكردوە. یەكێكی وەك من دەبوو هەزار ساڵ تەمەنی بكردایە، شەوباش))

((ئەمە دوا قسەی زۆربا بوو، پاشان یەكسەر هەستاو لەناو جێگاكەیدا دانیشت، لیفەكانی لاداو ویستی هەستێت، ئێمە ڕامان كرد تا بیگرین- لیوبای ژنیو منو چەند كەسێك لە دراوسێكان- بەڵام ئەو خۆی ڕاپسكاندو هەموومانی كەنار خست، لەسەر تەختە خەوەكەیەوە بازیدایە خواریّو خۆی گەیاندە بەر پەنجەرەكە، دەستی بەچوارچێوەكەیەوە گرتو پەنجەی لیّ گیركرد، تەماشای ئەملاو ئەولاو چیا دوورەكانی كرد، چاوی كردەوەو كەوتە پێكەنین، پاشان وەك ئەسپ حیلاندی، هەر بەو جۆرە كە وەستابوو، نینۆكی لەپەنجەرەكە گیركردو گیانی دەرچوو.

((لیوبای ژنی منی ڕاسپارد سلاویتان پیّ بگەیەنمو پێتان بلێم:

خوالێخۆشبوو هەمیشە لەبارەی تۆوە قسەی بۆ كردوە، وەسیەتیشی كردوە كەلەدوای مردنی سەنتورەكەی وەك یادگار بدرێت بەتۆ.

((لەبەر ئەمە، لیوبای ژنی تكات لیّ دەكات هەركاتێك دەرفەتی ئەوەت بۆ هەڵكەوت كە ڕێگات لەم گوندە بكەوێت شەولابدەیتە ماڵی ئەوانو لەویّ بخەویت، بۆ بەیانییش كە دەتانەوێت برۆن سەنتورەكە لەگەڵ خۆتاندا بەرن))

كۆتایی

| | |
|---|---|
| دالآنەکان | —دایە گەورە |
| تەلەفریك | مصعد سیم نقال |
| ماهی روغن نمك سور | ٢٣٧ ماسی سوێر کراو |
| لاپەڕە (٢٤٢) | پەڕاوێز ؟ |
| ٢٤٣ | جامی پیرۆز —کاس المقدس |
| تاکل وساریەن | داخۆران |
| گوڵی تاوس | گولی اکلیك جبل / گەڵاپەڕیم |
| گوڕە | دەنگی بەرزو توندو توورشە |
| هیجان | شاگەشکە. خۆشی لەڕادەبەدەر |
| | دەستی قرچ هەڵاتو |
| | گۆڵمەز |
| فیز | لووت بەرزی / لەخۆبایی بوون |
| دارمێخ | |
| ئاوگ | نسخ |
| جاحڤ | چاوزەق |
| شاحب | ڕەنگ پەڕیو |
| کومیتەچی | بەرگری میللی |
| هۆڤی | وەحشی |
| حلزون | لوول پێچ / هێلکە شەیتانۆکە |
| ل ٢٤٢ | ئاماژەی پەڕاوێزی تیایە بۆ لاپەڕەیەك لەفەسڵی دوودا ناوی (ڤینزیلوس) |
| ٣١٦ | ریشە —ارشە. ئەوەی |

# ZORBA



نیکۆس کازانتزاکیس

ڕۆمانی "زۆربا" لەشاکارە هەرە دیارەکانی نیکۆس کازانتزاکیسە، کە بۆ زۆربەی زمانەکانی دنیا وەرگێڕراوە، ناوی زۆربا کە پاڵەوانی سەرەکی ڕۆمانەکەیە وەك کەسایەتییەکی نائاسایی ژیانی باو بۆتە ڕەمزی هەرەدیاری ناو کەسانی کۆمەڵ و نیشانەیەك بۆ گیانی شکۆمەندی نوسەرو وڵاتی یۆنان.

وەرگێڕ